يوديت نيورينك

# شەهیدانی وێڵ

چۆن تیرۆریستە ئێرانییەکانی سەر بەسەدام حوسێن
بوونە باشترین دۆستی ئەمەریکا

وەرگێڕانی بۆ ئینگلیزی:

پ. س. ویلیەمز

وەرگێڕانی بۆ کوردی:

لێژنەیەک لە دەزگای ئاراس

ناوی کتێب: شەهیدانی وێڵ
نووسینی: یودیت نیورینک
وەرگێڕانی بۆ ئینگلیزی: پ. س. ویلیەمز
وەرگێڕانی بۆ کوردی: لیژنەیەک لە دەزگای ئاراس
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٦٩٨
هەڵەگری: بەدران ئەحمەد حەبیب
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: مەلا شاخەوان
چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٨
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە ١٠٧ی ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

# پێڕست

# پێشەکی

## قوربانیدانێکی ئاگراوی بۆ سەرکردەکە

ئەو ژنانەی دەوروبەری چەپڵە و هەلهەلە لێ دەدەن. وەک مەشخەڵێکی گڕگرتوو چەند مەترێک دەلەنگێتەوە و دێت و دەڕوات بەر لەوەی لە بەردەم باڵیۆزخانەی فەرەنسا لە شاری لەندەن بکەوێتە سەر زەوی. ئافرەتەکانی دەوروبەری هەوڵ دەدەن بەلافیتەکانی دەستیان جەستە گڕتێبەربووەکەی دامرکێننەوە. ئاگر جلوبەرگی بڕیبوو و گۆشتەکەی دەسووتاند. ئەو بڕیاری دابوو بەهێز بێت بەڵام ئازارەکە زۆر گەورە بوو. ئازارەکە زۆر لەوە گەورەتر بوو کە پێیان گوتبوو. پاش پێنج ڕۆژ لەو ڕووداوە نەدا حەسەنیی ٢٥ ساڵان لە ئاکامی برینە سەختەکانی سووتانی لە یەکێک لە نەخۆشخانەکانی لەندەندا گیان لە دەست دەدات.

ئەم کچە شۆخە چەند ڕۆژێک بەر لە ئێستا وەک نارەزاییی دەربڕین بەرامبەر دەستگیرکردنی سەرکردایەتیی موجاهدینی خەلق لە پاریس خۆپێشاندانی لە بەردەم باڵیۆزخانەی فەرەنسا لە لەندەن ئەنجام دا. لە ١٧ی حوزەیرانی ٢٠٠٣دا پۆلیسی فەرەنسا سەرکردەی نەدا، کە مریەم ڕەجەوییە، لەگەڵ ١٦٠ ئەندامی تری سەرکردایەتیی موجاهدینی خەلقی بەگومانی تیرۆر و ساختەکاری دەستگیر کرد. لە ئەنجامدا لە چەندین شاری ئەورووپا خۆپێشاندان سازدران کە بەشداربووان داوای دەستبەجێ ئازادکردنی مریەمیان دەکرد.

"ئێمە ژیانی خۆمان بۆ بەرگریکردن تەرخان کردووە" لە یەکێک لە خۆپێشاندانەکاندا نەدا ئەمەی بەیەکێک لە کەناڵە تەلەفزیۆنییەکان گوتبوو. ئەو پێوەندیی بەڕیزەکانی موجاهدینەوە کردبوو بۆ ئەوەی ڕێژیمی پیاوە ئاینییە شیعەکان لەسەر دەسەڵات لاببات. پاش ئەو دیمانەیە و لە ڕاگەیاندنێکدا بۆ ڕۆژنامەکان نەدا ئاشکرای کردبوو کە دەمێکە "بیرۆکەی خۆسووتاندن" لە نێو خۆیاندا تاوتوێ دەکەن. هەر ئەو ڕۆژە و کاتێک زۆربەی خۆپێشاندەران ڕۆیشتنەوە، نەدا بەنزین بەخۆیدا

دەکات و ئاگر لە گیانی خۆی بەر دەدات.

شەوی پێش ڕووداوەکە نەدا پارچە شیعرێکی بۆ ستایشی مریەم ڕەجەوی نووسیبوو. تیایدا هاتبوو "لە پێناو پاراستنی تۆ لە هەر شەڕانگێزییەک گیانی خۆم بەخت دەکەم".

نەدا تەنیا کەس نییە کە ئامادەیە گیانی خۆی لە پێناو مریەم ڕەجەویدا بەخت بکات. لە ڕۆژانی پاش دەستگیرکردنی مریەم ڕەجەوی نزیکەی ١٠ ئەندامی موجاهیدینی خەلق ئاگریان لە گیانی خۆیان بەر دا و دووانیان گیانیان لە دەست دا. بەڵام حاڵەتی نەدا مایەی سەرنجی خەڵکێکی زۆر بوو، لەوانە من. باشە بۆچی کچێکی شۆخ و شەنگ، کە لە کەنەدا گەورە بووە و ئەندازیاری کۆمپیوتەرە، لە ڕۆژێکی هاویندا ئاگر بەر دەداتە گیانی خۆی بۆ ئەوەی دڵسۆزیی خۆی بۆ سەرکردەکەی بسەلمێنێت؟ چۆن مرۆڤ وا گێل و نەفام دەبێت و باوەڕ بەوە دەکات کە مردنی ئەو ئازادکردنی سەرکردەکەی خێراتر دەکات؟ ئاخر مرۆڤ چۆن وا دەبێتە شەهیدێکی خەڵەتێنراو؟ پاشان چۆن خەڵکێک لە ڕێکخراوێکدا بوار دەدەن شتی لەم جۆرە ڕوو بدات: قوربانیدانی گەنجێکی خاوەن پاشەڕۆژێکی گەش؟

وەک نووسیارێکی بەشی ڕۆهەڵاتی ناڤین لە ڕۆژنامەی Trouwی ئەڵمانی، چەند جارێک ڕێگەم بەلای موجاهدینی خەلقدا کەوتووە، موجاهدینی خەلق بەهۆی وێنەکانی ئەشکەنجەدراوانی ئێرانی کە سالانێک بوو ئەندامانی ئەو ڕێکخراوە لە خۆپێشاندانەکانیاندا بەرزیان دەکردەوە و پارەی کۆمەکیان بۆ ئەو "قوربانییانەی ڕێژیمی دیکتاتۆری ئێران" کۆ دەکردەوە، لای زۆربەی خەڵک ناسران.

زۆر خەڵک هەر ناوی ڕێکخراوەکەیان نەدەزانی یا بەشێوازی دەیانگوت - یان بەهەڵە لەگەڵ بەرگریی ئیسلامیی ئەفغانستانیان تێکەڵ دەکرد. موجاهدینی خەلق، کە بەمانای موجاهیدینی گەل دێت، ڕێکخراوێکی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانە بەرەو ڕێبازێکی ئاینی هەڵدێرا و خاوەن سوپایەکی باش مەشق پێکراوە. ئەم ڕێکخراوە لە لایەن یەکێتیی ئەورووپا و ئەمەریکاوە خراوەتە نێو لیستی گرووپە تیرۆریستەکانەوە، بەڵام تا ئێستا لە ژێر چەندین نازناوی تردا هەر چالاکە. ئەم ناوبانگە نەرێنییەی ڕێکخراوەکە پارێزکارە نوێیەکانی ئەمەریکا لە لەباوەش گرتنی وەک ڕێکخراوێکی

ڕزگاریخواز سڵ ناکەنەوە بەو ئومێدەی ڕێژیمی مەلاکانی ئێران لە تاران وەدەر بنێن، هەر ئەو ناوبانگەش وای کرد هەندێ سیاسەتوانی ئەورووپایی لە بەرگریکردن لەو ڕێکخراوە و هەوڵدان بۆ لابردنی لە لیستی ڕێکخراوە تیرۆریستەکان سڵ نەکەنەوە.

یەکەمین جار کە ڕێم کەوتە لای موجاهدینی خەلق چەند ساڵێک بەر لە ئێستا بوو، کاتێک لە یەکێک لە کۆبوونەوەکانی تایبەت بەئێران لە شاری ئەمستەردام کۆوارێکیان خستە نێو دەستم. کۆوارەکە تا ئێستا لە کتێبخانەکەمدایە و بەبێ ئەوەی دووبارە تەماشای بکەمەوە دەزانم بەرگەکەی وێنەی ئافرەتێکی لەسەرە بەلەچکێکی سوورەوە و پێدەکەنێت، مریەم ڕەجەوی سومبولی موجاهیدینی خەلق.

هەر لە سەرەتاوە ئەم ڕێکخراوە منی خاپاند و پاش چەند ساڵێک، کە کۆنە ئەندامێکی ئەم ڕێکخراوەم دواند حەزم دەکرد زیاتر لە بارەی ڕێکخراوەکە بزانم. ئەویش بەدووروودرێژی مێشک شووشتنەوە و سەرکوتکاریی نێو ڕێکخراوەکەی بۆ من باس کرد.

ئەو کۆنە ئەندامە کە زیندانی کرابوو نەک تەنیا لەبەر ئەو ڕەخنانەی ئاراستەی سەرکردایەتیی کردبوون، بگرە لەبەر ئاشکراکردنی نهێنییەکانی ڕێکخراوەکە پاش دەرکردنی، ئەمەش وای کرد ماڵەکەی لە شاری ئارنهایمی هۆڵەندا ببێتە ئامانجی پەلامارەکانی ڕێکخراوەکە. ئەوەبوو ماڵەکەیان تاڵان کرد، بەڵام هەر خۆی بەدەستەوە نەدا. لە کۆتاییدا هاوسەرەکەی لەبەر هەڕەشەکانی ڕێکخراوەکە خۆی کوشت. لەو ڕۆژەوە بڕیاری دا چی تر بێدەنگ نەبێت لە بارەی سەرکردەی ڕەهای ڕێکخراوەکە مەسعود ڕەجەوی، هاوسەری مریەم ڕەجەوی، کە چەند ساڵێکی تەمەنی خۆی لە پێناویاندا بەخت کرد و ئێستاش زۆر پەشیمانە کە وای کردووە.

زۆر زەحمەتە قسەکانی ئەو کۆنە ئەندامە بسەلمێنرێن: ئەو یەکەم کەس بوو لە جیهاندا باسی بارودۆخی "ناو" ئەو ڕێکخراوە بکات. بەڵام ئاخافتنەکانم لەگەڵ ئێرانییەکانی تر وایان لێ کردم کە جگە لە باوەڕهێنان بەقسەکانی ئەو کۆنە ئەندامە هیچی ترم بەدەستەوە نەبێت. بەڵام ئێستا کە تەماشای ئەو ڕۆژانە دەکەم، بۆم دەردەکەوێت قسەکانی ئەو کابرایە تەنیا دڵۆپێک بوون لە دەریایەک.

خۆپێشاندانەکەی بەردەم نووسینگەی کۆواری Trouw لە نیسانی ١٩٩٩دا کاتێک

وتارێکم لەسەر ئەو کۆنە ئەندامە بڵاو کردەوە، بۆ من مایەی سەرسوڕمان بوو، ئەو هەموو تەلەفۆنانەی بۆ من کران لە لایەن ژنانی دەم بەگریانی ئێرانییەوە. لە پێوەندییەکان بەمنیان دەگوت تۆ نەتدەزانی کە دیمانەت لەگەڵ سیخوڕێکی ئێرانیدا کردووە، ئەو ڕێژیمی مەلایان چەند ستەمکارە و چۆن منداڵان و ئافرەتان لە زیندانەکانی ئێراندا ئەشکەنجە دەدرێن؟ ئەو ئافرەتانە هیچیان نەبوو. تەنیا ئەوە نەبێ کە من هەڵە بووم و ئەوانیش ڕاست.

قسەکردن لەگەڵ کەسانێک کە خۆیان زۆر بەڕاست دەزانن نائومێدت دەکات، بەتایبەتی ئەگەر تۆ تەواو دڵنیا بێت کە ئەوان لە خشتە براون و بەردەوام بۆیان ڕوون بکەیتەوە کە حکوومەتی ئێران خراپیی خۆی هەیە، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە کە لە ئاست کرێتییەکانی ناو موجاهدینی خەلقدا بێباکانە بێدەنگ بین.

هەر جارەی وتارێکی ڕەخنەئامێزم لەسەر موجاهدین لە Trouw بڵاو بکردایەتەوە ئەوان هەمان کاریان لەگەڵمدا دەکرد. ئەوان بەشێوەیەکی ڕێکخراو بەتەلەفۆن هەڕەشەیان لێم دەکرد، لایەنگرانی ئەو ڕێکخراوە لە پێوەندییەکاندا فێر کرابوون بەمن بڵێن چۆن ناوی سەرکردە شیرینەکەیانم خستووەتە نێو قوڕەوە. هەرچەندە نەیاندەزانی مەسەلە چییە. منیش بەسەرسوڕمانەوە دەمگوت: "ئەمە چ جۆرە یانەیەکە؟". ئەم ڕێکخراوە مارێکی ئەفسووناویی چەند سەرە ڕق بڵاو دەکاتەوە و ترس لە دڵان تۆو دەدات، یاخۆ برێتییە لە کۆمەڵە خەڵکێک ڕوحی خۆیان تەسلیم بەسەرکردەیەکی تەرەس کردووە؟ مرۆڤ چۆن ئاوا توندڕۆ دەبێت و وەک نەدا، گیانی خۆیان لە پێناو سەرکردەکەدا بەخت دەکەن؟ ئەم گرووپە چیت لێ دەکات تا بتکاتە تیرەبی (Zombie مردووی زیندوو کراو- لە باوەڕی جادووگەرانی ڤودو- وەرگێڕ) یاخۆ ڕۆبۆتێک؟ من لە میانەی سەردانێکی گەڕان بەدوای ڕاستییەکاندا بۆ ئێران لە ۲۰۰٤دا، پێوەندیم بەژمارەیەک کۆنە ئەندامی تری موجاهیدینی خەلق لە تاران کرد، کە بەسەرسوڕمانەوە بەمنیان دەگوت ئەوان لەو وڵاتەی مەلایان دەتوانن بەئازادی بسووڕێنەوە. ئەوان ئازادانە قسەیان لەگەڵدا دەکردم و ڕێکخراوی خۆیانیش هەبوو و خەریکی دووبارە بنیاتنانی ژیانی خۆیان بوون.

بەڵام ئەوەی زیاتر کاری لە من کرد، ئەو کۆنە ئەندامانە چەند مرۆڤی ئاسایی

بوون. کە ئەوانم دەدیت هەندێ برادەرە ئێرانی و عەرەبەکانی خۆمم وەبیر دەهاتنەوە. ئەوان ئایدیالیست بوون، یاخۆ بەلای کەمەوە زۆربەیان وا بوون. کەسانێکن خەبات لە پێناو دوارۆژێکی ڕۆشنی وڵاتەکەیاندا دەکەن، کەسانێکن تێکەڵەی هزری مارکسیزم و ئیسلامی لە ئایدیۆلۆجیای موجاهیدینی خەلق ڕایانی کێشابوو. ئەوان منداڵی سەردەمی حوکمی دیکتاتۆریی شای ئێران بوون و پاشان منداڵی حوکمی ئەو مەلایانە بوون کە شایان دەرپەڕاند. بەڵام لە ڕاستیدا وایان لێ هات بکەونە داوی دیکتاتۆرییەکی تر - دیکتاتۆریی مەسعود ڕەجەوی. ئەو کۆنە ئەندامانە خەڵکانێک بوون بینییان چۆن ئەو ڕێکخراوە لە بەرچاویان بووە تایەفەیەک بێ ئەوەی هیچیان پێ بکرێت بۆ ڕاگرتنی ئەم گۆڕانکارییە.

هەموو کەسێک نەیدەزانی چۆن ئەم گۆڕانکارییە ڕووی دا. من لەگەڵ ئەواندا هەوڵم دا ئەو خاڵە بدۆزینەوە تیایدا ڕێکخراوەکەیان بوو بەتایەفەیەک sect و پەردە لەسەر ئەوە هەڵماڵین چۆن ئەندامانی ڕێکخراوەکە لە کاتی خۆیدا درکیان بەم گۆڕانە نەکرد. ئەوان چۆن لە بەرگریکارەوە بوونە تیرۆریست؟ بۆچی کاتێک هەڵەکانی خۆیانیان بەدی کرد وەک دەبەنگێک لەسەر هەمان ڕێباز چەند ساڵێک بەردەوام بوون. پێکەوە لەگەڵیان باسی ئاواتی پێوەستبوون و بوون بەئەندامی خێزان، شکۆدارکردنی سەرکردە و تەواوی پەڕاوێزکردنەکانی تیایدا دەژیان کرد.

ئەم کتێبە بریتییە لە هەوڵی من بۆ تێگەیشتن. تایەفە لە هەموو کات و وڵاتاندا هەبوونە. لە وڵاتانی تریشدا گرووپگەلی سیاسی هەن ئەگەر لە نزیکەوە سەیریان بکەین زیاتر شایانی ئەوەن ناوی تایەفەیان لێ بنێین. حاڵەتی هاوشێوەی سەرنجڕاکێشیش لە نێو گرووپە ئیسلامییە توندڕۆکاندا هەن لە شێوازی ناونووسکردن (تجنید) و مێشک ئاودانندا.

مەبەست لە وشەی تایەفە لێرەدا چییە؟ باشترین پێناسەم بۆ ئەو وشەیە لە سەنتەری بەریتانیای زانیارییەکانی ئۆلەکان دۆزییەوە. لە پێناسەکەدا هاتووە تایەفە "زۆرلێکردنی دەروونی بۆ ناونووسکردن بەکار دەهێنێت و دەستبەرداری ئەندامەکانی نابێت و مێشکیان ئاو دەدات، کۆمەڵگەیەکی بژاردەی تۆتالیتاری دروست دەکات و دامەزرێنەر - یاخۆ سەرکردەکەی ئەو جڤاتە بەخۆی خۆی دەستنیشان دەکات و

کەسێکی ئۆلییە، مەسیحییە، لێپێچینەوەی لەگەڵ نەکراوە و کاریزمای هەیە: تایەفە بۆ کۆکردنەوەی کومەکی دارایی باوەڕی بەگوتەی "ئامانجەکان پاکانەی ئامرازەکان دەکەن" هەیە. سامانی تایەفەش بەکەڵکی ئەندام یان جڤاتەکەی نایەت".

لە گوتەکانی ئەوانەی ڕاستەوخۆ لە نێو ڕەوشەکەدا بوون دەردەکەوێت ناوی تایەفە پڕ بەپێستی ڕێکخراوەکەی مەسعود ڕەجەوییە. بەڵام ئاخۆ چەندان تیرە هەن خاوەنی سوپای مەشق پێ کراوی خۆیانن و ئامانجیان ڕووخاندنی ڕێژیمێکی بەدە بۆ ئەوەی سەرکردەی خۆیان بخەنە سەر کورسیی دەسەڵات - بەبێ ڕێزگرتن لە ژیانی ئەو هاووڵاتییانەی گوایە بەرگرییان لێ دەکەن؟ کاتێک بۆ مەبەستی ئەم کتێبە لە نزیکەوە لە ئایدیۆلۆجیا و مێشک ئاودانی موجاهیدینی خەلقم کۆڵییەوە، لەو وێکچوونە حەپەسام کە لە نێوان موجاهیدینی خەلق و گرووپگەلی وەک قاعیدەدا بینیم - کە زۆر وتارم لەسەر ئەوانیش لە کۆواری Trouw بڵاو کردبوو - هەیە. کۆنە موجاهیدینی خەلق، کە بینینێکی تازەیان لە بارەی جیهانێک هەیە بۆ ئەوان شتێکی نەناسراوە، ئەوانیش هۆشدارییان دایە من لە بارەی ئەو وێکچوونانەی لە نێوان پیاوکوژانی قاعیدە و چەکدارانی موجاهیدینی خەلقدا هەن. هەردوو جۆر ڕۆبۆتن، بەڕەهایی خۆیان بۆ ئامانجە پیرۆزەکە تەرخان کردووە و زۆر ترسناکن.

سەرەڕای ئەوەی ئەمەریکا و ئەورووپا موجاهیدینی خەلق وەک گرووپێکی تیرۆریستی قەدەغەکراو دەژمێرن، موجاهیدینی خەلق تا ئێستاش لە وڵاتانی ڕۆئاوا هەن و زۆر چالاکن. بوونیان لە ژێر هەمان ناوی خۆیاندا نییە بگرە لە ژێر نازناوی وەک (ئەنجوومەنی نیشتیمانیی بەرەنگاری) و ناوگەلی لەم جۆرەیە. لە چەندین وڵاتیش تا ئێستا خەڵکی نوێ ناونووس دەکەن. بەدوای کەسانی وێڵی مافی پەنابەریی سیاسیدا دەگەڕێن، چونکە ناچارن و بۆ ئەو ڕێکخراوە ئامانجی باون. ئەندامی ئەم ڕێکخراوە تا ڕادەیەک لە شوێنی تایەفەییدا دەژین - پیاو و ئافرەت بەجیا - و لە ژێر دەسەڵاتێکی توندا دەژین. منداڵانی ئەندامە نوێیەکان دەدرێنە خێزانی تر، کە هەمیشە دڵسۆزی ڕێکخراوەکەن. زۆر لەو دایک و باوکانەی ڕێکخراوەکەیان بەجێ هێشتووە بێهوودە هەوڵ دەدەن دووبارە منداڵەکانیان لەو خێزانانە بستێننەوە.

ئەم کتێبە بۆ لەناوبردنی ئەو ڕێکخراوە نەنووسراوە. من چالاککار نیم. ویستی زانیاری وەدەستهێنان کە کاری ڕۆژنامەوانیم بەڕێوە دەبات بووە هەوێن و تەنیا هاندەرم بووە. دەمویست بزانم ئەو شتەی ئەو خەڵکانە وەگەڕ دەخات چییە. ئەوەی وای کرد من ڕاوێژ بەکۆنە ئەندامانی تایەفەی موجاهیدینی خەلق بکەم هۆیەکەی بۆ چۆنیەتیی کارکردنی تایەفەکە دەگەڕێتەوە. چونکە تەنیا ئەو کەسانەی تایەفەکەیان بەجێ هێشتووە دەتوانن باسی ئەو ڕاستییانە بکەن کە لە پشتی ئەو وێنە بەڕێزەوەیە پێشانی جیهان دەدرێ.

لەم کتێبەدا گوتەکانی ئەو پیاو و ئافرەتانەی بەم دواییە، یاخۆ بەر لە ماوەیەک لە ڕیزەکانی موجاهیدین هەڵاتوون. یەکێک لەوانە سیاسەتوانێکی هۆڵەندییە و ئەندامی پارتی سەوزی هۆڵەندایە و کۆنە ئەندامی پەرلەمانە بەناوی فەرەح کەریمی، کە لە هەشتاکاندا چوار ساڵ ئەندامی موجاهیدینی خەلق بوو. کاتێک هاتە نێو بواری سیاسەتی هۆڵەنداوە نهێنییەکانی نەدرکاند، پاش ٢٠ ساڵ لە دەرچوونی لە ڕیزەکانی موجاهیدین ئینجا قسەی کرد. جاری وا هەیە خەڵک نازناو بەکار دەهێنن، چونکە ڕێکخراوەکە هەڕەشە و پەلاماری ئەو کەسانە دەدات ڕیزەکانی بەجێ دەهێڵن.

ئەمانەش تەنیا کەس نین بەشێوەیەکی چڕ قسەم لەگەڵیاندا کردووە، بەڵام باشترین سەرچاوەی زانیاری بوونە لە بارەی پێشهاتە ڕاستەقینەکانی نێو موجاهیدینی خەلق. چیرۆکەکانیان، کە جاری وا هەبوو زۆر کەسی بوون، زۆربەی جار لە لایەن کەسانی ترەوە دەسەلمێندران کە لە ڕیزەکانی موجاهیدی خەلق هەڵاتبوون، لە پاڵ چەند کتێبێکی بەردەست لەسەر ڕێکخراوەکەی مەسعود ڕەجەوی. لەوەش زیاتر لە ئایاری ٢٠٠٤دا ڕێکخراوی چاودێریی مافی مرۆڤ ڕاپۆرتێکی بەناوی (No Exit = تەڵەزگە) لە بارەی موجاهیدینی خەلقەوە بڵاو کردبووەوە کە بەتەواوی لەگەڵ ئەنجامەکانی مندا کۆک بوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەر جارێک بۆم لوابێت هەوڵم داوە بۆچوونی لایەنی بەرامبەریشم خستووەتە ڕوو، بەڕێگەی بەکارهێنانی خواستەنی (اقتباس) لە نامە و بڵاوکراوەی ڕۆژنامەوانی و بڵاوکراوەکانی باڵی سیاسیی موجاهیدینی خەلق و ئەنجومەنی نیشتیمانیی بەرەنگاری.

من لەگەڵ کۆنە ئەندامەکان لە ماڵەکانی خۆیان و نووسینگەکانیان و لە کۆنفراسەکاندا لە هۆڵەندا و ئەڵمانیا و فەرەنسا و تەنانەت ئێرانیش قسەم کردووە. حکوومەتی ئێران بەتەواوی هاوکارییان کردووم لە بارەی دیمانەکردن لەگەڵ کۆنە ئەندامانی موجاهیدین لە ئێران. بەیانییەک کۆنە موجاهیدێکیان لە زیندان هێنایە دەرەوە بۆ ئەوەی دیمانەی لەگەڵدا بکەم. هەموو دیمانەکانی ئێران بەبێ ئامادەبوونی ئەفسەرانی هەواڵگری یا دەزگاکانی تری حکوومەتی ئێرانی ئەنجام دراون - لە ڕاستیدا من بەتەنیا و بەنهێنی لەگەڵ کەسەکەدا دانیشتووم. من لەو باوەڕەدام تەنانەت لە ئێرانیش کۆنە ئەندامانی موجاهیدین ئازادانە لەگەڵم دواون، بەزیندانییەکەشەوە، کە ئەمە مایەی سەرسوڕمانی ئەویش بوو. بەڵام پێویستە ئەوەش بڵێم کاتێک ویستم ئەم کتێبە لە ئێران بەچاپ بگەیەنم حکوومەتی ئێران ڕێگەی پێ نەدام.

سەرەتا باسی سەرەتاکانی موجاهیدینی خەلق دەکەم، کاتێک لە سەردەمی شا ڕێکخراوێکی بەرگریی سیاسی بوو. پاش چەند ساڵێک لە شۆڕشی ئیسلامیی ئێران موجاهیدین کەوتە ململانێ لەگەڵ ئایەتوڵڵا خومەینی. پاش هەڵاتنیان لە ئێران، بەسەرکردایەتیی مەسعود ڕەجەوی دەستیان دایە شەڕی چەکداری دژی خومەینی، یەکەم جار لە پاریس و پاشان لە سەربازگەی تایبەت لە عێراقەوە شەڕی لە دژی حکوومەتی مەلاکانی ئێران بەهاوکاریی سەدام حوسێنی سەرکۆماری عێراق بەرپا کرد. پاشان باسی ئەوە دەکەم چۆن ڕێکخراوەکە بووە تایەفەیەک و ڕێبازی مەسعود ڕەجەوی لە ڕاستیدا تەنیا باسی شکۆمەندی و گرینگیی شەهیدبوون دەکات.

هەروەها باسی دزینی منداڵ دەکەم، کە چۆن منداڵان لە عێراق لە دایک و باوکیان جیا دەکرانەوە. ئەو منداڵانە، کە بەشێکی گرینگی ڕێکخراوەکەن، دەبرانە ئەورووپا. دواتر دەبنە ئەندامی داهاتووی ڕێکخراوەکە و هەروەها هۆی سەرەکیی هەڵاتنی ئەندامان لە ساڵانی نەوەتەکان بەدواوە، کە هەندێکیان دەگیران و دوور لە چاوی ئەندامە دڵسۆزەکان زیندانی دەکران. ڕامان لە چیرۆکەکانی کۆنە ئەندامان بۆمانی دەردەخات چۆن پێوەستی ڕێکخراوەکە بوون و چۆن دووچاری مەیلەکانی هەڵاتن دەبوون. چۆن توانییان لە ڕۆبۆتێکەوە دیسان ببنەوە مرۆڤی ئاسایی، مرۆڤی خاوەن

بنووسیبا ئازادکردنی مسۆگەر بوو. بەڵام کاتێک ئاشکرابوو ئەوانەی ئازاد دەکرێن دووبارە هەوڵی پێوەندیکردنەوە بەموجاهیدین دەدەن، ئەوسا ئازادکردنی زیندانییان زەحمەتتر بوو. پاشان وای لێ هات زیندانییانی ناچار دەکرد لە بەردەم کامێرای تەلەفزیۆن پاکانە لە موجاهیدین بکەن و سەرکۆنەی ڕێکخراوەکە بکەن بەر لەوەی ئازاد بکرێن. ژمارەیەک لە ئەندامانی موجاهیدین سوودیان لەو دەرفەتە وەرگرت بۆ ئەوەی لە ئێران ڕابکەن و لە هەندەران دووبارە پێوەندی بەموجاهیدینەوە بکەنەوە.

هەر کەسێکیش کە توانیی بەم شێوەیە ڕا بکات بەبێ مەبەست سەرنجی ڕێژیمی ئێرانی بۆ لای ئەندامانی خێزانەکەی دەبرد کە لە پاش خۆی لە ئێران بەجێیانی هێشتووە. لە ئێرانیش بۆم دەرکەوت کە هەر کوڕێک یا کچێک بڕیاری دابێت بچێتە ڕیزەکانی موجاهیدین ئەوە بڕیارەکەیان دەرەنجامێکی درێژخایەنی بۆ خێزانەکەی هەبووە - کە ئەمەشیان هۆیەکی ترە ڕق و کینەی موجاهیدینی بۆ ڕێژیم لە جاران زیاتر دەکرد. خێزانەکانی هەڵاتووەکان دەخرانە ژێر چاودێری و، دەزگای هەواڵگریی حکوومەت بەردەوام بەتەلەفۆن پێوەندیی پێوە دەکردن بۆ ئەوەی زانیاری لە بارەی چالاکیی کوڕ و کچ و خوشک و براکانیان لە هەندەران بدەن. جاری وا هەبوو پاڵەپەستۆ دەخرایە سەر ئەندامێکی خێزانەکە بۆ ئەوەی هەڵاتووەکە قایل بکات بگەڕێتەوە ئێران. لە ساڵانی هەشتاکان کە ئەندامانی موجاهیدین تەلەفۆنیان بۆ خێزانەکانیان دەکرد و داوای پارە و یارمەتییان لێ دەکردن بۆ ئەنجامدانی چالاکیی ڕێکخراوەکانیان، ئەوا دەزگاکانی هەواڵگری دەیانزانی و ئەندامانی خێزانەکەیان بەتۆمەتی یارمەتیدانی ڕێکخراوێکی قەدەغەکراو دەستگیر دەکرد.

لە کۆتاییدا ئەو موجاهیدانەی لە زیندان ڕزگار دەبوون بۆیان ڕوون دەبووەوە کە ماڵوێران بوونە، چونکە بۆیان نەبوو خوێندن تەواو بکەن و لە پیشەی خۆیاندا کار بکەن یا لە هیچ پۆستێکی حکوومەتدا کار بکەن و دەخرانە ژێر چاودێرییەوە. خێزانەکانی خۆیان و دۆست و برادەرانیان لێیان دەترسان. هاوسەری مینە لێی جیا بووبووەوە چونکە نەیدەتوانی و پێی شەرم بوو چی تر ژیان لەگەڵ کۆنە زیندانییەک بەسەر ببات کە زۆرگێ کراوە و ئیهانە کراوە. سەرەڕای ئەوەی مینە توانیی ژیانێک بۆ خۆی وەک بازرگانێک پێک بهێنێ، بەڵام تا چەند ساڵێک لێی قەدەغە کرابوو

له زیندانەکانی خومەینی ڕۆژانە زیندانییان تا مردن ئەشکەنجە دەدران. بۆ وەدەستهێنانی دانپیانانی کوڕان و کچان باوکان ئەشکەنجە دەدران. مینە لە لایەن توندڕۆ ئاینییەکان و کەسانی وەک دەڵێت شێت ئەشکەنجە دەدرا، کە تەنیا بۆ چێژ وەرگرتن ئەشکەنجەیان دەدا. "ئەوان دەیانزانی ناتوانن هیچ زانیارییەکم لێ وەرگرن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەشکەنجە دەدرام. کە جارێکیان پێیانم گوت خوا نەیگوتووە کە ئێوە خەڵک ئەشکەنجە بدەن زۆریان لێم دا".

مینە دڵنیایە زۆر کەس وەک ئەو بێ تاوان بوون. زیندانەکان پڕ بووبوون لە کچی گەنج، کە دەڵێنیش کوشتنی پاکیزان تاوانە، ئەوانەی لە زیندان ئازاد کرابوون دەڵێن گوایە ئەو کچانە زۆرگێ دەکران پاشان دەکوژران. مینەش دەیگوت بەڵگەی بۆ ئەم قسانە بەدەستەوەیە. یەکێک لە پاسەوانەکان دەچێتە ماڵی یەکێک لەو کچە کوژراوانە و ١٠ هەزار ڕیال وەک شیربایی دەداتە دایک و باوکی کچەکە. ئەویش لە بری مارەکردنی کچەکەیان و کونکردنی بەر لەوەی گوللەبارانی بکەن.

ئەوسا زیندانییەکان ڕۆژانە ژمارەی هاوڕێ گوللەبارانکراوەکانیان ئەزبەر دەکەن، ئەویش لە کاتی ژمەی ئێواران کە گوێیان لە دەنگی گوللەکان دەبوو. بەقسەی مینە، ئەو کاتەی ئەو لە زیندان بوو لە زیندانی ئەڤین لە تاران، ڕۆژانە لانی کەم ١٠ پۆل زیندانی گوللەباران دەکران. لە ڕۆژی خۆپێشاندانەکەی ٢٠ی حوزەیران و بەژیانەوەی خەباتی چەکداری و بەردەوامبوونی لە ساڵانی ١٩٨١ تا ١٩٨٥دا ژمارەی کوژراوەکان لە نەیارە سیاسییەکانی خومەینی گەیشتە ١٢ هەزار قوربانی. سێ بەشی ئەم ژمارەیەش ئەندام و هاوسۆزانی موجاهیدینی خەلق بوون.

مرۆڤ چۆن و تا چەند دەتوانێ بیروباوەڕی خۆی بپارێزی ئەگەر دووچاری ئەشکەنجە و دەستدرێژی بێت؟ مامی یاسر، کە ٨ ساڵی بەڕێ کردووە لە زیندانێکی ئێرانیی پیس و پۆخڵدا، چۆن ڕزگاری بوو؟ زۆر لە ئەندامانی موجاهیدین، وەک مینە و کۆنە ئەندامانی تری موجاهیدین بۆمیان باس کرد، لە زینداندا تووشی گومان دەبوون.

کێ لەو زیندانییانە بەئاشکرا ڕای گەیاندبا کە نایەوێت چی تر ناوی لەگەڵ ڕێکخراوەکە تێکەڵ بکرێت ئەوە بەر لێبووردن دەکەوت. لە ڕاستیدا ئەوەی پاکانەی

هەشت ساڵ زیندان دەکرێت. بەختەوەرە کە نەکوژرا، بەڵام هەمان بەختەوەری مینەی برای نەگرتەوە کە بەهۆی چالاکبوونی لەگەڵ موجاهیدین لە سێدارە درا. مینە بۆم باس دەکات کە وەک ئافرەتێک هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ ڕێکخراوەکەدا نەبووە، بەڵام براکەی هێناوەتەماڵی خۆی بۆ ئەوەی لە موجاهیدین هەڵی بگەڕێنێ. هەر ئەو هۆیەش بوو وای کرد ئەو نەکوژرێت و تەنیا ١٤ مانگ زیندانی بکرێت.

پاش ساڵی ١٩٨١ ژمارەی نەیارانی حکوومەت لە زیندانەکانی ئێران زیاتر بوو، بەڵام زۆربەی ژوورەکانی زیندانەکان یاخۆ پڕترین ژوورەکان موجاهیدینی تێدابوون. هەندێ جار ژمارەی زیندانییان ئەوەندە زۆر دەبن کە لە ژوورەکانی زیندان جێگەیان نابێتەوە و ناچار دەکرێن بەنۆبەت لە ڕێڕەوەکاندا بخەون. مینە باسی ئەشکەنجەدان و لە سێدارەدرانی ڕۆژانە دەکات. ئەوسا چیرۆکی وا باس دەکرا کە موجاهیدینی خەلق دەیان ساڵی تر هەر دەمێنێتەوە. هەر ئەمەشە هۆی ئەو هەموو ڕق و کینەی موجاهیدینە بۆ ڕژێمی ئێران. نەختە نەختە بۆم ڕوون بووەوە بۆ برا و خوشک و خوشکەزا و برازا و جاری واش هەبوو تەواوی خێزانێک دەهاتنە ڕیزی موجاهیدین: بۆ ئەوەی تۆڵەی خوێنی ئازیزەکانیان بکەنەوە.

"پەروانە کچێکی نەشمیل بوو" مینە لە ئۆفیسی خۆی لە تاران لەگەڵم دانیشتبوو دەیویست باسی چیرۆکی خۆیم لەگەڵ ئافرەتانی موجاهیدین بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام بەمەرجێک ناسنامەکەی ئاشکرا نەکەم. ئەو توانیی بەزەحمەتێکی زۆرەوە لە بواری کاری بازرگانیدا کار بکات و ببێتە بازرگانێکی سەرکەوتوو، بەڵام نایەوێت خۆی بخاتە مەترسییەوە.

کاتێک دەرگای ژووری نووسینگەکەی دادەخات لەچکەکە لە سەری دەکاتەوە و لە کاتی قسەکردندا گەمەی پێ دەکات. "پەروانە ئەشکەنجە درا و دەستدرێژیی کرایە سەر و منیان بەزۆر هێنایە ئەوێ بۆ ئەوەی تەماشایان بکەم. چاومیان بەستبوو بەڵام پاسەوانەکان دەیانزانی کە پێم دەکرێت کەمێک ببینم و گوێم لە هاتوهاواری پەروانە دەبێت" بەدەنگێکی ئاسایی قسەی کرد و پاشان گوتی: "پاسەوانەکان تەنانەت ڕۆژانی پشوویانیش کە هەینی بوو، بۆ ئەشکەنجەدان و دەستدرێژیکردنە سەر پەروانە دەهاتنە زیندان".

دەخاتەوە، بۆمی ڕوون دەکاتەوە چۆن بۆی دەرکەوت کە مەسعود ڕەجەوی تەنیا دەسەڵاتی تایبەتی خۆی لا گرینگ بوو و چۆن ئەو هەموو کوشتارەی دەستی زۆرداری بۆ ڕاکێشانی ئەندامی نوێ پێویست بوو. ئەو لەم بارەیەوە دەڵێت: "گەنج بریندار دەکران و دەستگیر دەکران و لە سێدارە دەدران. ئەو گەنجانە بۆ ڕەجەوی شەهید بوون و لە پرۆپاگەندەی خۆی دژ بەخومەینی بەکاریانی دەهێنا. مەبەستیش لێرەدا ئەوەبوو: ئەگەر بێتو بەشێک بیت لە موجاهیدینی خەلق واتا تۆ ئامادەیت گیانی خۆت لە پێناو دۆزەکە بکەیتە قوربانی. ئەمەش بۆ من ئەوپەڕی شێتی بوو".

زۆر کەسی تر ناچارانە هەر لەسەر باوەڕکردن بەهاتنی شۆڕشێکی نوێ مانەوە. ئەوانەش هەست بەلەخشتەبراوییەکی مەزن دەکەن کە پاش مانگێک دەبیستن مەسعود ڕەجەوی لە پاریسەوە ڕای دەگەیەنێت "تەنیا سوودی خۆپێشاندانەکانی ٢٠ی حوزەیران ئاشکراکردنی کارەکتەری ڕاستەقینەی خومەینی بوو بۆ گەلی ئێران". تۆ بڵێی خەڵک لەو خۆپێشاندانە بەکوشت دران و دووچاری ئەشکەنجە کران بۆ ئەم مەبەستە: وەک پرۆپاگەندەیەک بۆ موجاهیدینی خەلق لە دژی ڕێژیمی خومەینی کە موجاهیدین لە سەرەتا بەپەرۆشەوە پشتگیریی لێ کرد؟

زۆر لە ئەندامانی موجاهیدین پاش ئەو ڕاگەیاندنە باسیان لە بوونی ناپاکی کرد. کۆنە ئەندامێکی موجاهیدین کە لە ئێران مابوو لەم بارەیەوە بەمنی گوت: "ڕەجەوی ئێمەی ناردە خۆپێشاندان و خۆی ڕای کرد". کە مەلاکان بەرپەرچی موجاهیدینیان دایەوە هیچ جیاوازییان لە نێوان پیاو و ئافرەت و منداڵدا نەکرد. جاری وا هەبوو خەڵک دەستگیر دەکران وەک مامی یاسر چونکە ڕۆژنامەیەکی موجاهیدینیان پێ بووە. هەندێک جار تەواوی خێزانێک دەستگیر کراون و لە سێدارە دراون - بەمنداڵ و پیرەکانیشەوە - چونکە هاوسۆزیی خۆیان بۆ موجاهیدین دەربڕیوە.

ئەم سەرکوتکارییەش زۆر بەئاشکرا ئەنجام دەدرێت وەک جۆرێک لە تاکتیکەکانی چاخە تاریکەکانی ناوەڕاست. بەڵام کاتێک هەست کرا زۆربەی ئێرانییەکان هاوسۆزییان بۆ ئۆپۆزسیۆن زیاد دەبێت، ئەوسا لە سێدارەدانی نەیارەکان بەنهێنی لە زیندانەکاندا ئەنجام دەدران.

مامی یاسر یەکێکە لەو موجاهیدینەی بەر تۆڵەی خومەینی دەکەوێت. بۆ ماوەی

هەزاران گەنجی بەشدار لە خۆپیشاندانی ٢٠ی حوزەیران دەستگیر دەکرێن لەگەڵ هەموو کەسێک کە هەر جۆرە پێوەندییەکی بەڕێکخراوەکەوە هەبوبێت، لەوانەش تەنانەت ئەندامانی خێزانەکانی ئەندامانی موجاهیدینی خەلق دەستگیر دەکرێن. لە کۆتاییی ساڵی ١٩٨١ ژمارەی لە سێدارەدراوەکان دەگاتە ٢٥٠٠ کەس.

بۆیە هەر لەو کاتەوە ٢٠ی حوزەیران کراوە بەڕۆژی یادکردنەوەی موجاهیدینی خەلق. ئەو ڕۆژە وەرچەرخانێک بوو لە مێژووی ڕێکخراوەکە. ئەوە بوو هەوڵی موجاهیدین بۆ بەکارهێنانی خۆپیشاندانێکی جەماوەری بۆ بەرپاکردنی شۆڕش شکستی هێنا. سەرەڕای دژایەتیی فرەوان بۆ دیکتاتۆری ئیسلامی موجاهیدین نەیانتوانی پشتگیرییەکی تێری ئێرانییەکان وەدەست بێنن بەشێوەیەک کە توانای دووبارەکردنەوەی ڕووداوەکانی ١١ی شوباتی ١٩٧٩یان پێ ببەخشێت.

بناغەی جەماوەریی موجاهیدین، وەک ئەرڤەند ئیبراهیمیانی شیکەرەوە پاش ١٠ ساڵ لەو ڕووداوە لە کتێبەکەیدا (موجاهیدینی ئێران، ١٩٨٩) دەڵێت: لە نێو بازرگانی بچووکی سەربەخۆ بوو، کەواتە خاوەن دوکانەکانی بازاڕ و ڕۆشنبیرەکان. جەماوەری فرەوانتری جووتیار و هەژار و کرێکاران هەر پشتی خومەینییە قارەمانەکەی خۆیان گرتبوو یان ئەوەتا بڕیاریان دابوو پشتگیریی کۆمۆنیستەکان و گرووپە چەپڕۆکانی تر بکەن. بەبێ پشتگیریی ئەم توێژانەش هیچ یاخیبوونێک لە ئێران سەر ناگرێت.

"ڕەجەوی ئێمەی بەکار هێنا" ئەمە قسەی ئەو گەنجانەیە بۆ دانانی ئەم کتێبە بۆم دوان. ئەمانە خۆیان دایە دەست وتارە بەسۆزە وروژێنەرەکانی ڕەجەوی و کاریزماکەی کە بواری دەدا جەماوەری فرەوان ڕاپەڕێنێ، هەستی شۆڕشگێڕییان جۆش بدا. "لە سەرەتادا ئەمە شتێکی خۆش بوو چونکە بەشێک بووین لە بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕ. بەڵام کەس بەئێمەی نەگوت پاشان چەند ترسناک دەبێت"، ئەوە ڕۆژنامەنووسێکی ئێرانییە لە سەردەمی قوتابییاتیدا لایەنگری موجاهیدین بوو بەم شێوەیە باسم بۆ دەکات و ڕوونی دەکاتەوە چۆن مەترسییەکانی ئەم کارەی تەنیا پاش کوشتنی خۆپیشاندەرانی خۆپیشاندانەکەی ساڵی ١٩٨١ بۆ ئاشکرا بوون. هەر لەو ڕۆژەوە ئەو ڕۆژنامەنووسە خۆی لە موجاهیدین دوور

خۆپێشاندەر دەکوژرێن و ٢٠٠ بریندار دەکرێن و سەدانی تر دەستگیر دەکرێن. بەڕێوەبەری زیندانی ئەڤین بڕیار دەدات ٢٣ لە گیراوەکان دەستبەجێ لە سێدارە بدات. چەند کچێکی هەرزەش لە نێو لە سێداردراوەکان دەبن.

بەپێچەوانەی سالّی ١٩٧٩ ڕۆژانی پاش ئەو خۆپێشاندانە ئارام دەبن. پاشان ٥٠ دەستگیرکراوی تر لە سێدارە دەدرێن. سەرۆک بەنیسەدر ناچار دەکرێت دەست لە کار بکێشێتەوە. لە کۆتاییی مانگی تەمووز بەنیسەدر لەگەل مەسعود ڕەجەوی بەیەکەوە بەرەو پاریس ڕا دەکەن. ئا لەم نشێوە لە ناکاوەدا موجاهیدین بڕیاری دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری دەدەن، بەلاّم ئەمجارەیان دژی خومەینی کە زۆر کرداریانە لە سەرەتا پشتیگیرییان کرد. سەربازانی موجاهیدین، ئەمجارەیان لە ژێر سەرکردایەتیی مووسا خیابانی دەستەڕاستی ڕەجەوی خەباتی نهێنی دەکەن. ئەوسا و لە ٢٨ی حوزەیران تەقینەوەیەک لە بارەگای پارتی شۆڕشگێڕی ئیسلامی کە خومەینی سەرکردایەتیی دەکات ڕوو دەدات و لە ئەنجامدا ٧٠ کەس دەکوژرێن کە یەکێک لەوانە ئایەتوڵڵا بەهەشتیی دەستەڕاستی خومەینی بوو. هەرچەندە تا ماوەیەک ئەنجامدەرانی تەقینەوەکە ئاشکرا نەکرابوون، بەلاّم هەموو خەلّک پەنجەی تاوانبارکردنی ئاراستەی موجاهیدینی خەلق دەکرد. کەچی پاشان بەبەلّگە دەردەکەوێت ئەنجامدەران لایەنگرانی شا بوون. تا ئێستاش ڕاستییەکانی ئەم ڕووداوە یەکلا نەکراونەتەوە.

پاش ئەم ڕووداوە ڕاونانی موجاهیدینی خەلق دەستی پێ کرد. بنکە نهێنییەکانیان، کە پاش سەرنەکەوتنی هەلّمەتەکەیان لە مانگی حوزەیران بۆی کشابوونەوە، ئاشکرا کران و چەندین ئەندام ناپاکییان لێ کردن. مووسا خیابانی دەکوژرێت لە ئەنجامی ڕووداوێکی دزین لە بارەگاکەیدا و هەروەها هاوسەری مەسعود ڕەجەوی، ئەشرەفیش دەکوژرێت. تەنیا کوڕەکەیان مستەفا ڕزگاری دەبێت. ئەویش بەدوای باوکیدا دەگاتە پاریس و پاشان دەچێتە کەمپی ئەشرەف و پاشان کەمپی ئەشرەف کە بەناوی دایکییەوە کراوە بۆ عێراق دەگوازرێتەوە.

لە هاوینی ١٩٨١دا خوێنی شەهیدان جۆگەلە دەکات، ئەو خوێنە موجاهیدی وەک حەسەن عیزەتی و یاسری کوڕی دەیان سالّی تر خەبات لە پێناو تۆلّەکەیدا دەکەن.

نزیک بووبوو دیسان لێیان تێک درا. ئەوەتا سەرکردەکەیان مەسعود ڕەجەوی بڕیاری کۆتاییی داوە کە شۆڕشێکی تر بەرپا بکات بۆ ئەوەی ئەویش بەشی خۆی لە مێژووی ئێران بۆ تەرخان بکرێت. لە هاوینی ١٩٨١ موجاهیدینی خەلق هەستیان کرد لە لووتکەی جەماوەریبووندان. زۆر لە ئێرانییەکان دەیانویست ئەو حەزیایە بکوژن کە لەگەڵ شۆڕش بۆیان دەرکەوت و لەوە زیاتر هیچیان نەدەویست. بەهۆی تیرۆری میلیشیا ئیسلامییەکان، وەک پشکنینی خانووەکانی خەڵک و گەڕان بەدوای شت و ڕەفتاری ناموسڵمانانە و سانسۆر و نەبوونی بەشداریکردنی سیاسی و هەموو جۆرێکی پێشکەوتن هاووڵاتییانی ئێرانی زۆر بێزار کردبوو. تۆ بڵێی ئەوان شۆڕشیان کرد بۆ ئەوەی بەم حاڵە بژین؟ گەنجان، بەتایبەتی توێژەکانی مامناوەندی و خوارەوەی کۆمەڵگە دڵیان بۆ لای موجاهیدین ڕۆیشتبوو کە مارکسیزم و ئیسلامی تێکەڵ بەیەک کردووە. گەنجانی توێژی خوارەوەی کۆمەڵگە هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ ڕێکخراوەکە ڕا نەهاتن. دەیانبینی کە کاریزما و وتە ئاگرینەکانی ڕەجەوی دادیان نادات. بەڵام بۆ هەندێ لە گەنجان، ڕەجەوی و شوێنکەوتووانی تەنیا ڕکابەری ڕاستەقینەی ڕێژیمن، وەک هەندێ لە کۆنە ئەندامانی موجاهیدین لە میانەی ئەم کتێبە بۆم باس دەکەن و دەڵێن: "ئێمە ڕژاینە سەر شەقامەکان و هاوارمان کرد ئازادیمان دەوێ. ئامادەش بووین لێدان بەدەستی پیاوانی حکوومەتەوە بخۆین بۆ ئەم مەبەستە".

ئینجا لە ئاداری ١٩٨١ەوە شەقامەکان دەبنە گۆڕەپانی گەنجەکان. بەهەزاران گەنج لە خۆپێشاندانەکان لە چەندین شاری ئێراندا ئەم نارەزاییەی خۆیان دەردەبڕن. لووتکەی ئەم بارودۆخەش لە ٢٠ی حوزەیرانی هەمان ساڵدا دەبێت، کاتێک جەماوەری ئێران بەدەنگ بانگەوازەکەی موجاهیدینی خەلقەوە دێن و خۆپێشاندان ساز دەدەن و هوتافی "بڕوخێ دیکتاتۆرییەتی مەلاکان" دەچڕن.

"دەبێ ئەو حکوومەتە دەست لە کار بکێشێتەوە" ئەمەیان داوای ٥٠٠ هەزار تا یەک ملیۆن خۆپێشاندەر لە ڕۆژێکدا لە تاران دەبێت. بێگومان باوکی یاسر و مامی لەو خۆپێشاندانە بەشدار دەبن. حکوومەتیش کاردانەوەی دەستبەجێ و توندی دەبێت و هەموو ئەو خۆپێشاندەرانە بە"دوژمنی خودا" ناو دەبات. لە ئەنجامدا ٥٠

چونکە ئەوان زۆر پراگماتی بوون خۆپێشاندانەکانی گرووپە چەپڕۆکانی تریان پشتگوێ خست کە داوای چاکسازییان دەکرد لە بوارەکانی زەویوزاری کشتوکاڵی و ئازادیی ڕۆژنامەوانی و لابردنی یاساکانی لەچک پۆشینی ئافرەتان لە دەزگا حکوومییەکاندا. کەچی ئەوان بەدەنگ داوایەکی خومەینییەوە دەچن بۆ بەشداریکردن لە خۆپێشاندانێکی سەرتاسەری دژی ئەمەریکا: هەردوو لایان خۆیان لە هوتاف لە دژی "شەیتانی گەورە" یەکتریان گرت.

لە مانگی ١٠ی ١٩٧٩ موجاهیدینی خەلق بەدڵگەرمی لە داگیرکردنی باڵیۆزخانەی ئەمەریکا و دەستبەسەراگرتنی ٥٢ بارمتەی ئەمەریکایی بۆ ماوەی ٤٤٤ ڕۆژ بەشدارییان کرد. کۆنە ئەندامانی موجاهیدین لە بارەی ئەو ڕووداوانەوە دەڵێن: "دروشمەکە ئەوە بوو: ئێران دەکەینە گۆڕستانی ئەمەریکاییەکان، دەیکەینە ڤێتنامێکی تر". پاش چەند ڕۆژێک لە کۆتایی کێشەی بارمتە ئەمەریکاییەکان موجاهیدین بەشانازییەوە ڕای دەگەیەنن کە "ئێمە یەکەمین هێز بووین بەبێ سێ و دوو پشتیوانیمان لە داگیرکردنی سەنتەری سیخوڕیی ئەمەریکا کرد".

لەسەر ئاستی سیاسی موجاهیدینی خەلق نەیانتوانی پێگەیەک بۆ خۆیان بگرن، خومەینی ڕێگەیانی نەدەدا. لە ساڵی ١٩٨١ سەرکردە ئاینییەکان خزانە نێو ململانێیەکی دەسەڵات لەگەڵ یەکەمین سەرۆکی هەڵبژێردراوی وڵات ئەبولحەسەن بەنیسەدردا. لە هەمان کات پەلامارەکانی میلیشیای ئاینیی وەک حزبوڵڵا و باسیج بۆ سەر بنکە و بارەگاکانی موجاهیدینی خەلق و ڕێکخراوەکانی ئافرەتان و قوتابییەکانیان ڕووی لە زیادبوون کرد. دەستگیرکردنی ئەندامانی موجاهیدین و کوشتنیان زیاتر بوو. سەرکردە ئاینییەکانی نزیک لە خومەینی بەئاشکرا بەموجاهیدینی خەلقیان دەگوت موناقیقینی خەلق و بەکافرەکان ناویان دەبردن. لە بەرامبەر ئەوەشدا موجاهیدین مەلاکانیان بەوە تاوانبار دەکرد کە شۆڕشەکەیان دزیوە و دەیانەوێ ڕێژیمێکی دیکتاتۆری فاشیست لە ئێران دابمەزرێنن. هەردوو لا دوژمنایەتیی خۆیان ئاشکرا کرد و تا ئێستاش بەهەمان ناو یەکتری تاوانبار دەکەن.

ڕەنگە دایک و باوکی یاسر ئەوسا نائۆمێدییەکی زۆر دایانی گرتبێت، چونکە ئەو کۆمەڵگە نایابەی کە ساڵانێک بوو خەونیان پێوە دەدیت و دروستکردنی وا لێیان

خومەینی، کە ئەوسا دوور خرابووەوە و لە پاریس دەژیا. هەردوو لا هێزی خۆیان کرد بەیەک و توانییان لە مانگی شوباتی ١٩٧٩دا سوپای شا بشکێنن. ئەوە بوو دەستیان بەسەر بنکەکانی پۆلیس و ئەمبارە زەبەلاحەکانی چەک و تەقەمەنی و بنکە سەربازییەکاندا گرت و ڕۆڵێکی گرینگیان لە شەڕی نێو شەقامەکاندا بینی کە لە ١١ی شوبات ڕوویان دا و بوونە هۆی دەرکردنی شا لە ئێران.

شۆڕش بووە ڕاستی. ئایەتوڵڵا خومەینیش وەک ڕزگارکەرێکی مەزن گەڕایەوە تاران. بەڵام لەو کاتەی گەلی ئێران لەسەر شەقامەکان ئاهەنگیان دەگێڕا ململانێیەکی تر لەسەر دەسەڵات دەستی پێ کردبوو: لە نێوان ئایەتوڵڵا و موجاهیدینی خەلق. "ئەو کوڕە ناوی لێ ناوە سەرکردە" خومەینی بەم شێوەیە قسەی کرد پاش ئەوەی مەسعود ڕەجەوی سەردانی کردبوو. بێگومان تاکە سەرکردە دەبوایە ئایەتوڵڵا خومەینی خۆی بێت، وەک لە ڕۆژانی پاشتر ئاشکرا بوو.

سەرەتا ڕەجەوی خۆی بەدڵسۆزی خومەینی پیشان دا. خومەینیش تیرەکانی خۆی دەوەشێنێت و هەوڵی کودەتایەک لە ناو شۆڕشەکەی خۆیاندا لە دژی کۆمۆنیستان دەدات و ڕەجەویش بەپەلە فەرمانی بەرپاکردنی شەڕی چەکداری دژی ئەو دەردەکات. هەر لەبەرئەوەش موجاهیدین چەکێکی تریان خستە دەستی خومەینی تاوەکو ناویان لێ بنێت دژەشۆڕگێڕ و توانایان پێی دا کۆنترۆڵیان بکات.

هەرچەندە دایک و باوکی یاسر و هاوڕێکانیان نایانەوێ دان بەوەدا بنێن کە جەنگە ئایدیۆلۆجییە درێژخایەنەکەیان لەو ساتەدا لەنگەری گرت و کۆتایی هات. چونکە لەو ڕۆژەوە ئەوان ڕۆڵی نەیارانی سیستەمی نوێیان نواند و ئیتر نەیانویست هیچ بەشدارییەک لە کۆمەڵگەدا بکەن، ئەمەش بەڕێگەی دوودڵییان و چوونە پێش و پاشیان لە حکوومەتەکەی مەهدی بازرگان و حکوومەتە سێبەرییەکەی خومەینیدا. هەردوو کەمپی ناوبراو پلە و پایەیان پێشکێشی ئەوان دەکرد. نووسینگەکانیان پڕبوون لە پۆستەرەکانی خومەینی و میدیاکانیان زۆر ئەرێنییانە لەسەر ئایەتوڵڵایان دەنووسی. پاشانیش نکۆڵی لەم ڕاستییە دەکەن، بەڵام موجاهیدینی خەلق پێکەوە لەگەڵ خومەینی کاریان دەکرد. چونکە ئەو پاش هەموو شتێک زۆر لە بەشێکی ئایدیۆلۆجیاکەیان، کە ئیسلامی سیاسییە، دوور نییە.

ساڵی ١٩٧٥دا بۆ ناو ڕیزەکانی موجاهیدین. کە پرسیارم لە هادی کرد لەم بارەیەوە، گوتی: "من مرۆڤێکی ئایندار بووم و دژی ڕێژیمی دیکتاتۆر بووم. شا هەموو دەرووەکانی بە ڕووماندا داخستبوو و تاکە ڕێگە بۆمان مابوو خەباتی چەکداری بوو. ئایدیۆلۆجیاکەی من، بەمنی گوت، کە دەبێت یارمەتیی جەماوەر بدەم لە ڕاپەڕینیان دژی دیکتاتۆری و هاوپەیمانەکانی شا، ئەمەریکاییەکان".

یەکێک لە سەرکردەکانی ئەو سەردەمە کە لە سەرەتاوە دیاربوو مەسعود ڕەجەویی قوتابیی زانستیی سیاسی بوو، کە ساڵی ١٩٧٢ تاقە گەورە سەرکردەی موجاهیدین بوو کە لە لایەن ڕێژیمی شا لە سێدارە نەدرا. لەو کاتەی ڕەجەوی لە زیندان سزای هەتاهەتاییی بەسەر دەبرد، ئەندامە ئاساییەکانی موجاهیدین وەک باوکی یاسر لەگەڵ دایک و باوک و خوشک و برا زیندانی و لە سێدارەدراوەکان دەستیان دایە خەباتی چەکداری دژی شا. وەک ئاشکراش دەبێت ئەکرەمی دایکی یاسر هەر لەو کاتە دەبێتە ئەندامێکی چالاکی موجاهیدین و لە پەلامارەکانیان و خۆپێشاندانەکانی سەر شەقام لە دژی حکوومەتدا بەشداری دەکات. لە ئابی ١٩٧٢دا ئەکرەم سەرکردەی پۆلیسی تاران دەکوژێت و پاش چەند ساڵێکیش بەڕێوەبەری زیندانی کۆمیتە دەکوژێت. ئەوکات ئەمەریکاییەکانیش ئامانجی پەلامارەکان بوون و لە نێوان ساڵانی ١٩٧٣ تا ١٩٧٦ شەش ئەمەریکایی کە سێیان سەرباز بوون کوژران. کوشتنی ئەو ئەمەریکاییانە تەنیا هۆ بوون کە وایان کرد موجاهیدینی خەلق پاش ٢٠ ساڵ لەو ڕووداوانە لە لایەن ئەمەریکاوە بخرێتە نێو لیستی گرووپە تیرۆریستەکانەوە. وتەبێژی موجاهیدینی خەلقیش گوتی ناکرێت کوشتنی ئەو شەش ئەمەریکاییە بخرێتە ئەستۆی مەسعود ڕەجەوییەوە چونکە ئەوسا ئەو لە زیندان بوو.

ئەو کاتەی مەسعود ڕەجەوی لە زیندان بوو بەرگر لە دژی ڕێژیمی شادا دەلەنگی. پاش پاڵەپەستۆی دەرەکیی زۆر و خۆپێشاندانی نێوخۆییی فرەوان، شا ناچار دەبێت سەدان زیندانیی سیاسی لە نێوان ساڵانی ١٩٧٧ و ١٩٧٩دا ئازاد بکات و زۆریش لەو ئازاکرداوانە موجاهیدینی خەلق بوون. مەسعود دوایین کەس بوو کە تەنیا سێ هەفتە بەر لە ڕووخانی شا ئازاد کرا. ئا لەو کاتەدا هاوڕێکانی ڕەجەوی و زیندانییە ئازادکراواکان دەستیان بەخۆپێشاندان کردبوو لەگەڵ گرووپەکانی تر وەک ئایەتوڵڵا

خۆ فەرەح کەریمی کە ئافرەتێکی گەنجە زۆر ئاینپەروەریش نییە بەڵام بڕوای بە"ئیسلام وەک تیۆرییەکی شۆڕشگێڕانە" هەیە. ئەو لە بزووتنەوەی میراتگرانی عەلی شەریعەتی، کە بیرۆکەکانی دەبنە سروشێکی گرینگی موجاهیدینی خەلق، چالاک دەبێت. فەرەح ساڵێ پاش ئامادەبوون لە چەند سیمینار و وانەیەکی "سەنتەری بڵاوکردنەوەی باوەڕەکانی شەریعەتی" لە ١٩٨٢دەبێتە ئەندامێکی چالاکی موجاهیدینی خەلق. فەرەح، شەریعەتی بەئاینزانێکی ڕزگاریخواز دادەنێت. "ئەو کابرایە دوو جۆر ئیسلامی ڕووبەڕووی یەکتری کردەوە. ئەو ئیسلامەی سەرکردە ئاینییە پارێزکارەکان بانگەشەیان بۆ دەکرد بەئیسلامی خەلیفەکانی دادەنا، یاخۆ ئیسلامی توێژی فەرمانڕەوا: باوەڕێک کە جەماوەری بەنەزانی هێشتەوە بۆ ئەوەی بەئاسانی کۆنترۆڵی بکات. (...) و، ئیسلامی ڕاستەقینە کە خەبات لە پێناو دادپەروەری و یەکسانی و نەهێشتنی هەژاریدا دەکات".

فەرەح کەریمی تاقە کەس نەبوو خۆی لە نێو ئەو باوەڕەدا دەبینی. لەو ساڵانەی شەریعەتی لە تاراندا وانەی دەگوتەوە جەماوەرێکی زۆری لە دەوری خۆی کۆ دەکردەوە و موجاهیدینی خەلقیش بۆ بەکێشکردنی ئەندامی نوێ بۆ خۆیان سوودیان لە وانەکانی ئەو وەردەگرت. بەڵام ئەوەی ڕاست بێت لە ساڵی ١٩٧٢دا زۆر تەنگیان بەشەریعەتی هەڵچنی تا ناچاریان کرد ئێران بەجێ بهێڵێت و لە ئەنجامدا لە ساڵی ١٩٧٧دا و لە بارودۆخێکی گوماناویدا لە لەندەن ماڵئاواییی لە دنیا کرد، مردنی ئەو ناوبانگی لە لایەن گەنجانی سەرکوتکراوی ئێران گەورەتر کرد. فەرەح دەڵێت: "شەریعەتی مرۆڤێکی بێ وێنەی سەردەمی خۆی بوو. ئەو چەند لایەنێکی مارکسیزم و بوونگەری (وجودیە) و بزووتنەوەی دژی کۆلۆنیالیی جیهانی سێیەمی ئاوێتەی یەکتری کرد. پەیامی شەریعەتی، وەک فەرەح دەڵێت: "بریتی بوو لە: هەموو شتێک کە خەڵکانی تر خەبات لە پێناو وەدەستهێنانی دەکەن، لە ئاینی ئیسلام هەمانە. هاوکاری، یەکسانی، سەربەستکردن ئەمانەمان هەموو لە ئاینی ئیسلامدا هەیە".

تۆ بڵێی ئەو ڕێبازە بێت حەسەن عیزەتیی باوکی یاسری بۆ ڕیزەکانی موجاهیدین ڕاکێشابێت؟ یاخۆ، بۆ ئەو، مەسەلەکە بریتی بوو لە ڕاپەڕین لە دژی حکوومەتە بێزراوەکەدا؟ چونکە ئەو ڕقە هۆی سەرەکیی چوونی هادی شەمس حایری بوو لە

پێشکێش کرد، کە دەکرێت لەگەڵ قەشە کاتۆلیکە یاخیبووەکانی ئەمەریکای لاتین بەراورد بکرێن کە خاوەن باوەڕێکی ڕزگاریخواز بوون. ئەوان وەک موجاهیدین خەباتیان لە پێناو ڕووخاندنی سەرمایەداری و ئیمپریالیزم دەکرد. بۆ موجاهیدینی خەلق ئەو خەباتە لەبەرئەوە بوو چونکە شا خۆی کردە گەمەی دەستی ئەمەریکاییەکان: موجاهیدین گلەیی ئەوە دەکەن کە ئەم کارەی شا بۆشاییی نێوان بژارەی دەوڵەمەندەکانی ئێران و جەماوەری ڕەشوڕووتی فرەوانتر کرد.

حەسەنی باوکی یاسریش بێگومان دڵی بۆ لای ئەو چاککارانەی جیهان کە شۆڕش بەتەنیا چارەسەر دادەنێن، ڕۆیشتووە. ئەوان ویستیان ڕێژیمی شا بەحکوومەتێک بگۆڕن بەرپرسەکانی لە بەردەم گەل بەرپرسیار بن. ئەندامانی موجاهیدینیش تەواو بڕوایان بەو ڕۆڵەی خۆیان هەبوو. لە ساڵی ١٩٧١دا کاتێک شا سەرکردەکانی موجاهیدینی دەستگیر کرد، چونکە پلانی ڕاپەڕینی چەکدارییان بۆ لابردنی ڕێژیمی شا ئاشکرا بوو، باوەڕە بەتینەکەیان گوڕی زیاتری پێ بەخشرا و سەرکردەیەکیان بەدادوەرێکی دادگەی شای گوتبوو: "ڕێکخراوی موجاهیدین خەبات دەکات چونکە ئێران فێری کردوون ئەرکی پیرۆزی موسڵمانی ڕاستەقینە ئەوەیە خەڵک لە زۆرداری ڕزگار بکات. تاکە هیوامان ئەوەیە خوێنی خۆمان لە پێناو گەلەکەمان ببەخشین. ئەگەر من سینگی خۆم بۆ گوللەی جەللادەکانی ئێوە واڵا کرد، ئەوسا دەزانم من بەشداریم لە ڕزگاکردنی گەلی ئێراندا هەبووە".

فەرەح کەریمی کە لە ساڵی ١٩٩٨ دەبێتە ئەندامی پەرلەمانی هۆڵەندا (تاوەکو ٢٠٠٦ ئەندام بوو)، ئەم بیروباوەڕە لە نێو کتێبەکەی (فەرەح کەریمی و کریس کلیمنس: نهێنییەکانی ئاگرەکە: ئەرینا ٢٠٠٥) ڕەنگ دەداتەوە و وەسفی ئەوە دەکات چۆن لە ١٩٨١دا بۆ ماوەی هەفتەیەک گیرابوو بێ ئەوەی هیچ کەسێک شوێنی گیرانەکەی بزانێت. ئەویش لەو بارەیەوە دەڵێت: "من لەگەڵ خۆمدا دەمگوت مردنی من لە پێناو دۆزێکی پیرۆزە. من دەبم بەشەهید و (......) ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە منی لە تێکشکان دەپاراست. ئەو بیرۆکەیەی کە ژیانی من بەبەراورد لەگەڵ ئەو ئامانجە شتێکی گرینگ نییە و قوربانیدانی من ڕێگە بۆ ڕزگارکردنی گەلی ئێران خۆش دەکات".

ڕاپەڕینی دژ بەڕێژیمی شا لەگەڵیاندا بووە. ئەو کات سەردەمێکی پشێو بوو کە تیایدا ژمارەیەک گرووپی بەرهەڵستکار بەنهێنی چالاک بوون. ئایەتوڵڵا خومەینی و سەرکردە شیعەکانی تر سەرنجی جەماوەری بڕوادارانی دڵسۆزیان ڕادەکێشا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆمۆنیست و لیبراڵەکانیش چالاک بوون. موجاهیدینی خەلقی ئێران لەساڵی ١٩٦٥ لە لایەن سێ ئەندازیاری ئێرانییەوە دامەزراوە و تەنیا ڕێکخراو بوو کە مارکسیزم و ئیسلامی یەکخستبوو.

ئەمە بەقسە ئاسانە: یەکخستنی ئیسلامی شیعە لەگەڵ مارکسیزم کارێکە سەر ناگرێت مەگەر بەشێکی ئایدیۆلۆجیای مارکسیزم بخەیتە ناو تەنەکەی زبڵەوە: ئەویش وەک موجاهیدین دەڵێن "فەلسەفە"کەیەتی. چونکە باوەڕنەبوونی مارکس بەبوونی ڕوح و ژیانەوەی پاش مردن و قسەکەی کە دەڵێت ئاین تلیاکی گەلانە، ئەمانە بێگومان هەمووی بەکەڵک نایەن. لە لایەکی تر موجاهیدین بانگەشەی ئەوە دەکەن کە محەمەد پێغەمبەر (د.خ) نەک تەنیا ئاینێکی نوێی دامەزراند بگرە گەلێک (ئوممە) یا کۆمەڵگەیەکی نوێی دامەزراند. موجاهیدین وێنای کۆمەڵگەیەکی نوێ دەکەن بێ توێژ و بێ هەژاری و گەندەڵیَ و شەڕ و ستەم و نایەکسانی و سەرکوتکاری - کۆمەڵگەیەک زۆری لەوە تێدایە مارکس بانگەوازی بۆ دەکرد.

بەبۆچوونی موجاهیدین هێنانە کایەی ئەم جۆرە کۆمەڵگەیە هۆی ئەو شەڕە سەختانەی پاش مردنی پێغەمبەر (د.خ) بوو. ئیمامی عەلی (س) و ئیمامی حوسێن (س) - کە جێگری شەرعیی پێغەمبەری خودان بەبۆچوونی شیعەکان - شۆڕشیان لە دژی خەلیفە (سوننە)کان بەرپا کرد چونکە ناپاکییان لە "مەبەستی ڕاستەقینەی ئەو ئوممەیە" کرد. شۆڕشی ئەو دوو ئیمامە بزووتنەوەیەکی بەرهەڵستکارانە بوو و یەکەمین ململانێی ئاینیی چەکدار بوو کە موجاهیدین دەیانەوێ لاسایی بکەن. شەهیدبوونی ئیمامی حوسێن (س)، کە لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی لە شەڕێکی دژواردا دژی هێزەکانی خەلیفەی ئەمەوی کوژران، موجاهیدین کردیان بەنموونەی خۆیان.

زۆر لە موسڵمانانی ئێران موجاهیدینی خەلق بەڕێکخراوێکی سەرنجڕاکێش دەژمێرن، چونکە یەکەمین ڕێکخراوی ئێرانی بوو ڕاڤەیەکی شۆڕگێڕانەی بۆ ئیسلام

تەرخان کردووە. هەر لە ساڵی ١٩٩٢وە بەنهێنی پاسەوانی یەکێک لە زیندانەکانیان بوو، زیندانێک کە زۆربەی ئەندامانی ڕێکخراوەکە نازانن هەیە. ڕەخنەگران لە مەسعود ڕەجەوی لەو زیندانە زیندانی دەکرێن. یاسر پاش دەمەقاڵەکەی لەگەڵ باوکی ئەم نهێنییە دەزانێت. دەرەنجام یاسر لەو شوێنە زیندانی دەکرێت کە پێشان لەگەڵ دایک و باوکی پشووی هەفتانەی تیادا بەسەر دەبرد، بەڵام شوێنەکە لە وەتەی منداڵەکان لە ساڵی ١٩٩١ گوازرابوونەوە بەکار نەهاتبوو. ئەمجارەیان باوکی بووە پاسەوانی ئەو زیندانەی یاسر. "خواردنی بۆ من دەهێنا و وەک هەر زیندانییەکی تر ڕەفتاری لەگەڵدا دەکردم. هەر نەیدەویست چیی تر بمدوێنێ. ئەو هەستی بەشەرمەزارییەکی مەزن دەکرد چونکە کوڕەکەی دەیەوێ کەمپ بەجێ بهێڵێت".

لە کۆتاییدا یاسر بۆی دەکرێت لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤دا لە پاش ڕووخانی سەدام حوسێن و باڵادەستبوونی ئەمەریکاییەکان لە عێراق، لە کەمپی ئەشرەف ڕا بکات. کە دەگەڕێتەوە کۆلۆن هەوڵ دەدات ئەو ژیانە "ئاسایییەی" زۆر خەونی پێوە دەبینی دووبارە وەدەست بهێنێتەوە. دەست بەخوێندن بۆ وەدەستهێنانی بڕوانامەی ئامادەیی دەکات و دووبارە ڕوو لە تۆپێن دەکاتەوە بۆ ئەوەی گەنجایەتییە ونبووەکەی وەدەست بهێنێتەوە. ئەمەش باش بۆ من دەردەکەوێت کە ڕێکخستنی ژوانێک لەگەڵی ئاسان نەبوو چونکە زۆربەی کاتەکانی بۆ برادەرانی خۆی تەرخان کردووە و لە کۆتاییدا ژوانەکەمان بووە پێوەندییەکی تەلەفۆنیی دوورودرێژ.

هەوڵ دەدەم وێنای باوکی یاسر بکەم. ئەویش بەپشت بەستن بەو چیرۆکانەی لە چەندین کۆنە ئەندامی موجاهیدین بیستبووم کە لەگەڵ ئەودا قسەیان کردبوو، لە ئەنجامیشدا، چونکە ناتوانم دیمانەی لەگەڵدا بکەم، تەنیا دەتوانم شێوەی ژیانی ئەو کابرایە شی بکەمەوە. چەند ساڵێکە سەدام حوسێن ڕووخاوە، کەچی کەمپی ئەشرەف هێشتا وەک قەڵایەک ماوە و لەوێ سەرکردەکانی موجاهیدین فەرمانڕەوان. بەسەدان لادەر لە گۆشەیەکی کەمپەکەدا زیندانی کراون، بەڵام باوکی یاسر وەک یاسر دەڵێت لە ناویاندا نییە.

بێگومان حەسەن عیزەتی کە ساڵانێکی زۆرە لەگەڵ موجاهیدینە، بووەتە موریدی ڕێکخراوەکە، ئەو هەر لە سەرەتای دامەزراندنی موجاهیدین لە حەفتاکان و

نەوەک هەڵویستە نەرێنییەکەی بۆ ئەوان بگوازێتەوە. بەڵام لە نێو پێگەییواندا یاسر بەگەنجێکی زۆر نەشمیل دێتە بەرچاو، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی کە چەندین ساڵە هیچ پێوەندییەکیان لەگەڵ هیچ ژنێک نەبەستووە - هەرچەندە لە کۆبوونەوەی تێکەڵاوی هەفتانەدا ئافرەت دەبینن - چونکە ژنان کۆنترۆڵی سەرکردایەتیی موجاهیدینی خەلقیان بەدەستەوە گرتووە.

"بۆ ئێوە لە ڕۆئاوا ڕەنگە ئەمەیان زۆر بێزارکەر نەبێت، بەڵام لە کولتووری ئێمەدا وایە" یاسر دەڵێت لە بارەی ئەو پیاوانەی ویستیان لێی بچنە پێش. بەورییاییەوە پرسیارم لێ کرد ئەگەر شتێکی بەسەر هاتبێ نەخاسمە کە زۆر بەتووڕەیی و سەرسەختی ئەم کردارانە ڕەت دەکاتەوە. لە وەڵامدا یاسر بەوپەڕی قێزەوە گوتی: "بەڕاستی دەبوایە لەو جۆرە کەسانە زۆر ئاگام لە خۆ بێت، نەوەک لاقەم بکەن. ئەوان کاتێ دەخەوتم لێم نزیک دەبوونەوە و کاتێک لە خەو ڕادەپەڕیم دەبوایە هەموو جارێک بەشەڕ خۆمیان لێ ڕزگار بکەم".

ئەوانەی یاسر بە"نێربازەکان- gay" ناویان دەبات - نێرباز نەبوون بەڵکو بەدوای دەلیڤەیەکدا بۆ تێرکردنی.ویستە سێکسییەکانیان دەگەڕان - ئەمەشیان هۆیەکی تر بوو کە یاسری هان دا ڕا بکات. هەر بۆیە سەرکردەکان لە ساڵی ۲۰۰۳دا یاسریان ناردە لای باوکی، بەو هیوایەی کوڕەکەی بهێنێتەوە سەر هۆشی خۆی. "سەرەتا نەرمیی لەگەڵمدا نواند،" ئەوە لە بارەی باوکی دەڵێت کە یاسر گەیشتە لای لە ماڵێکی گرووپێکی موجاهیدین. بەڵام نەرمیی چی؟ "بەمنی گوت دایکم مردووە و دەبێ تۆڵەی خوێنی ئەو بستێنم. بەڵام من پێم گوت من ژیانم لەگەڵ موجاهیدینی خەلق پێ خۆش نییە: ئێمە ئێستا لە سەدەی بیست و یەکەمدا دەژین! من ژیانێکی نوێی ئاساییم گەرەکە، ژیانێکی بێ شەڕ. پێم گوت ڕقم لە ئایدیۆلۆجیای موجاهیدینە و مردن یان چوونە ئێرانم پێ خۆشترە لە مانەوە لەم کەمپەدا."

ئینجا باوکی یاسر زۆر تووڕە دەبێت و هەڕەشەی ئەوە دەکات گڕ لە خۆی و یاسر بەر بدات. "ئەو سەرکردەیەکی پلە بەرز بوو بۆیە وا تووڕە بووبوو." یاسر بەم شێوەیە باسی ڕەفتاری باوکی دەکات. "گەیشتنم بۆ کەمپی ئەشرەف یەکەمین و دوایین ساتی مانەوەی باوکم بوو لەگەڵمدا". باوکی یاسر ژیانی خۆی تەنیا بۆ ڕێکخراوەکە

یارمەتیی خەڵکی ئێران بدەم لە ماڵاکان و تلیاک و هەژاری ڕزگاریان ببێت. ئێستا کە جارێکی تر ئازادانە بیری لێ دەکەمەوە بۆم دەردەکەوێت بەڕاستی ئەو کارەیان مێشک شووشتنەوە بوو. بەڵام بەڕاستی نازانم لەو دوو ڕۆژەی لە کۆڵۆن بووین چی ڕووی دا."

پاش گەڕانەوەی بۆ کەمپی ئەشرەف لە عێراق لەگەڵ ١٤ گەنجی تر مەشقی سەربازییان پێ دەکرێت بۆ ئەوەی ساز بکرێن بۆ بەشداریکردن لە فەیلەقی گەنجانی موجاهیدین. لە بارەی باوکییەوە پرسیارم لێی کرد: ئایا ئەو زۆر وێڵ و سەرگەردانی دیتنی باوکی نەبوو، پاش ئەو هەموو ساڵە؟ بەڵام بارودۆخ لە جیهانی میلیشیاگەریی وەک موجاهیدین بەم شێوەیە بەڕێوە ناچێت. دەبێ یاسر چاوەڕێ بکات. پاش دوو هەفتە لە گەیشتنی بۆ کەمپەکە یاسر باوکی دەبینێت.

"دڵخۆش بووم کە بینیم و ئەویش دڵخۆش بوو و زۆر شانازیی بەمنەوە دەکرد".

ئەو شانازییەی باوکی یاسر کە کوڕەکەی بووەتە سەربازێکی ڕێکخراوەکە هەر زوو هەڵدەگەڕێتەوە و دەبێتە شەرمەزاری، چونکە وەک پێشبینی دەکرا، یاسر حەز لە هیچ شتێکی کەمپی ئەشرەف ناکات. ئەو بیری یاریی تۆپێن و میوزیک و برادەرەکانی بەتایبەتی ئەو ئازادییە کەمەی هەیبوو دەکات. موجاهیدین پێشوەختە پێیان نەگوتبوو پیاوان و ئافرەتان بەجیا دەژین و هاوسەرگرتن و سێکس قەدەغەن و چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکرێت کە بۆ داهاتووی ئێران دەستبەرداری هەموو شتێک بێت. ئەمەش مانای ئەوەیە دڵداری و دۆستایەتی و ڕەخنە و زانیاری هەموویان قەدەغەن. هەموو شتێک لێرە بەوردەکاریی سەربازییانە ڕێک خراوە: کێ چی دەکات و کەی، ژەمەکان لە چ ساتێک دەبن، کەی مۆڵەتیان پێ دەدرێت تەماشای کەناڵی تەلەفزیۆنی موجاهیدین بکەن و کەی بۆیان هەیە وەرزش بکەن. لە پاش هەموو ئەوانەش ڕێگەیەکی تری دوورودرێژی لە ئازارچەشتن دەست پێ دەکات. پاش شەش مانگ یاسر بەسەرکردەکەی دەڵێت کە خوازیارە کەمپەکە بەجێ بهێڵێت، پاشان چەندین جار ئەو داواکارییەی پێ ڕادەگەیەنێت. جاری یەکەم داواکارییەکەی فەرامۆش دەکەن، بەڵام لە فەیلەقی گەنجانەوە بۆ سوپای موجاهیدین دەیگوازنەوە. ئەمەش ڕەنگە وەک هەوڵێک بووبێت بۆ ئەوەی نەهێڵن لەگەڵ گەنجانی تر قسە بکات

"ئەوان بۆ ماوەی دوو ڕۆژ قسەیان لەگەڵدا دەکردم بۆ ئەوەی قایل ببم" یاسر گوتی لە بارەی قسەکردنی لەگەڵ سەرکردەکەدا. "پێکەوە من و ئەو سەرکردەیە لە نووسینگەی خۆی لە شاری کۆلۆن دانیشتبووین". یاسر ڕوونی دەکردەوە کە ئەو چۆن ئەو کاتە هەوڵی دەدا خۆی قایل بکات بەقسەکانیان، بەڵام بێ سوود بوو. لەم بارەیەشەوە گوتی: "نازانم چیم لێ هاتبوو، بەڵام پاش دوو ڕۆژ بڕیارم دا بچمەوە بۆ عێراق. ئەو منداڵانەی لە خانەی منداڵان منیان دەناسی شاگەشکە بوون کە منیان لە عێراق بینی. من دوایین کەس بووم کە پێشبینییان دەکرد لەوێ بیبینن".

تۆ بڵێی ئەم هەرزەکارە سەرکێشە سەری بۆ ئەو پاڵەپەستۆیە دانەواندبێت کە خرابووە سەری بۆ ئەوەی ئەرکی شەڕ لە دژی مەلاکانی ئێران ئەوانەی دایکیان کوشت بەجێ بگەیەنێت؟ ڕەنگە قایلکردنی منداڵەکانی تر بەم ئەرکە پاش چەند ساڵ مێشک ئاودانیان ئاسانتر بێت. دایک و باوکانی بەخێوکەر - کە لایەنگری موجاهیدینی خەلقن - زانیاریی زۆریان بەسەر ئەو منداڵانەدا باراندووە لە بارەی پیرۆزیی مەسعود ڕەجەوی و نائومێدیی خەمناکی خەڵکی ئێران و ڕۆڵی پیرۆزی موجاهیدینی خەلق لە خەبات بۆ ڕزگارکردنی وڵاتەکەیان. بەڵام چۆن ئەو گۆڕانکارییە بەسەر کوڕێکی لاساری وەک یاسردا هات، کە هەمیشە لە بەرامبەر ملکەچیدا دەجەنگا و بەردەوام پارێزگاریی لەو بڕە ئازادییەی خۆی دەکرد؟ یاسر خۆشی نازانێت چۆن، وەک زۆربەی ئەوانی تر کە لە ڕیزەکانی موجاهیدین هەڵاتوون نەیانزانی و تێی نەگەیشتن، چۆن قبووڵیان کرد بۆ نێو ئەو ڕێکخراوە ڕابکێشرێن. ئاشکرایە ئەو ملکەچییە بۆ چەندین هۆکاری جیاواز دەگەڕێتەوە. بیرۆکەی سەرەکی لە کاری ڕێکخراوەکە دووبارەکردنەوەی بەردەوامی بیرۆکە بنچینەییەکانیەتی و تاودان و هاندانی هەستی تۆڵەسەندنەوە و سەرکردەپەرستی و بەکارهێنانی شێوازە ژیرەکانی دەستکاریکردنی سایکۆلۆجییە.

"بەڕاستی مێشکم شۆرابووەوە" یاسر ئێستا ئەم شتە دەزانێت، بەڵام لەو کاتە تەواو باوەڕی بەو شتانە هەبوو کە دەیکرد. یاسر گوتی: "منیان هێنایە بارەگای موجاهیدینی خەلق لە پاریس و لەگەڵ چوار هەرزەکاری تر بۆ ماوەی دوو هەفتە وانەمان لە بارەی ئایدیۆلۆجیای موجاهیدینی خەلق وەرگرت. من دەمویست

وەک ئەکتەری سینەما ئال پاچینۆم هەبێ یاخۆ درێژی بکەم، ئەمەشیان لێم قەدەغە کرد و سزا درام. تەنانەت جارێکیان بەڕێوەبەری قوتابخانە پرچی بڕیم."

پاش ساڵێک لە مانەوەی یاسر لە ئەڵمانیا، ئەڵمانیا دەستی لە کاروباری موجاهیدین وەردا و خانەی منداڵانی خستە ژێر چاودێریی حکوومەتەوە. ئەوسا ئەو ماڵەی یاسر بۆی گوێزرایەوە ئازادیی زیاتری هەبوو. لەو ماڵە نوێیە تەنانەت بۆی هەبوو برادەری کچیشی هەبێت. بەڵام پاش ساڵێک دیسان یاسریان گواستەوە و ئەمجارەیان بۆ خانەیەکی تایبەت بەهەرزەکارانی تەمەن ١٦- ١٨ ساڵان. ئەو کات تۆپی پێ بووە شادەماری ژیانی یاسر. یانەکانی تۆپی پێی ئەڵمانی وێڵ بوون بەدوای یاسردا و شەڕیان لەسەری دەکرد، چونکە بینییان یاریزانێکی بەهرەدارە.

"ئەگەر لە یاری بەردەوام بوومایە ئێستا دەبوومە ناوێکی مەزن" بەدڵنیاییەوە بەبێ هیچ فیز و فۆرتەیەک ئەوەی گوت. "دەشمتوانی پارەیەکی زۆر کۆ بکەمەوە" ئەمەی بەپەشیمانییەوە گوت، بەڵام ئەو باش دەزانێت هێشتا تروسکەی هیوایەک ماوە و یەکسەر پاش گەڕانەوەی بۆ کۆلۆن دەستی بەمەشقەکانی خۆی کردووەتەوە.

کە یاسر ئەم قسانەی بۆم دەکرد لە نێو شەقامێکی پڕ لە ئۆتۆمبێلی کۆلۆن پیاسەمان دەکرد. کە پێم گوت من پارەی تاکسییەکە دەدەم فشەی بەقسەکەم هات. تێکتە کۆنەکانی کە چەند مانگی بەسەردا چووبوو دەرهێنا و دانەیەکی دایە من و گوتی: " با لە لات بێت ئەگەر چاودێرەکە هات". دیاربوو هێشتا یاسر بەتەواوی لە یاسا و بەهاکانی ژیانی ئەڵمانەکان، کە ٣ ساڵ بوو لەگەڵیاندا دەژیا، تێ نەگەیشتبوو. تێبینیم کرد کە ئەو حەز دەکات لەجیاتی زمانی ئەڵمانی بەئینگلیزی قسە بکات، بەتایبەتی کاتێک قسە بەرەو ئاقاری پرسە گرینگەکان دەڕوات.

لە ساڵی ١٩٩٤دا ژنە سەرکردەیەکی موجاهیدینی خەلق یاسر دەخاتە ژێر باڵی خۆی کە ڕەنگە ئەوکات منداڵێکی ئاوارە بووبێت. ئەوسا موجاهیدینی خەلق ئەو منداڵانەیان دەهێنایەوە کە لە ساڵی ١٩٩١دا لە کەمپەکانیان لە عێراق گواسترابوونەوە بەمەبەستی بەشداریکردن لە مەشقی سەربازی بۆ ئەوەی ببنە سەرباز لە سوپای موجاهیدین. ئەو کاتە یاسر ١٧ ساڵان بوو و دەبوایە بگەڕێتە باوەشی ڕێکخراوی دایک لە عێراق.

زۆر کەمتر دەبێت. چونکە ئەو منداڵە جەرگی تۆ نییە". بەڵام وەک من دەیبینم ئەو لە عێراقیش چەند ساڵێکی لە کەمپ بەسەر برد و لە لایەن ئافرەتگەلێکەوە بەخێو دەکرا کە "جەرگی" ئەوانیش نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەر شانازی بەدایک و باوکی خۆیەوە دەکات کە بەدەگمەن دەرفەتی بۆ دەرەخسا لە سەردەمی منداڵیدا لەگەڵیاندا بژیت.

لاسارێکی وەک ئەو سکاڵا لە دایک و باوکە بەخێوکەرەکەی دەکات لە لای موجاهیدینی خەلق. ساڵێک پاش ئەوە دەیگوازنەوە ژێر سەرپەرشتیی لایەنگرێکی تری موجاهیدین و هاوسەرەکەی، بەڵام هەمان چیرۆک دووبارە دەبێتەوە. "نەمتوانی لەگەڵیاندا بژیم. هەمیشە کێشەم لەگەڵیاندا هەبوو. ئەوانم خۆش نەدەویست – ئەوانیش خراپ رەفتاریان لەگەڵ دەکردم!" بەم شێوەیە پاش ١٣ ساڵ یاسر بەتوورەیی باسی بەخێوکەری دووەمی دەکات.

پاش ساڵێک دیسان دەیگوازنەوە بۆ خێزانێکی تر، ئەم جارەشیان بەبێ سوود. "ئەم خێزانەیان گەندە بوو. هەمیشە لێیان دەدام!" پاش ساڵێکی تر یاسریان ناردە ئەڵمانیا کە چەند خانەیەکیان بۆ بەخێوکردنی منداڵان هەبوو. بەڕاستی نەیاندەزانی چی لەو یاسرە بکەن. لە کۆتاییدا یاسر خۆی لە خانەیەکی بێ خۆشەویستیی بەخێوکردنی منداڵاندا دۆزییەوە کە بەندوباری تیایدا توندە و منداڵان ناچار دەکرێن کارەکانی ناوماڵ بکەن و ڕۆژی چەند سات‌ێک تەماشای کاسێتی ڤیدیۆیی سەرکردەکەیان مەسعود ڕەجەوی بکەن و، یاریکردنی دەرەوەشیان لێ حەرام کرابوو. موجاهیدین هەوڵ دەدەن تا بکرێ منداڵان لە ژیانی ئاسایی کۆمەڵگەی ئەڵمانی دوور بخەن. یاسر دەڵێ: "من ١٤ ساڵان بووم و یارێکی کچم هەبوو. ئەمەش شتێکی قەدەغەکراو بوو. من لەسەر ئەوە سزا درام. بۆمان نەبوو سەیری کەناڵی MTV بکەین. دەبوایە تەنیا سەیری پرۆگرامەکانی موجاهیدین بکەین".

کاتێک دەردەکەوێت ئەو یاریزانێکی باشی تۆپی پێیە، لە هەلاوێردنێکی تایبەت یاساکانی خانەی منداڵان نایگرنەوە. بواری پێ دەدرێت زیاتر لە منداڵەکانی تر لە خانەکە بچێتە دەرەوە بۆ ئەوەی ڕاهێنانی تۆپێن بکات. بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئەو هەر لاسار و یاخی بوو. یاسر بەگلەییەوە دەڵێت: "پاش چەند ساڵێک ویستم گەمەی تۆپێن لەگەڵ دۆستانی قوتابخانەمدا بکەم، بەڵام نەیانهێشت. من دەمویست پرچی

چاودێریی چەند ئافرەتێکی بەرپرس لە سەرپەرشتیکردنی منداڵانی ڕزگاریخوازەکان.

لە ساڵی ١٩٨٨دا یاسر هەشت ساڵان بوو کە دایکی لە پەلامارێکی سەرنەکەوتووی موجاهیدین لە ئێران کوژرا. لەوەش بەدواوە زۆر بەدەگمەن چاوی بەباوکی دەکەوت. لە پشووەکانی هەفتەدا خێزانێکی تر سەرپەرشتیی یاسریان دەکرد. لە سەرەتای ساڵی ١٩٩١دا یاسر ماڵئاوایی لەو خێزانەش کرد، چونکە موجاهیدینی خەلق بڕیاری دا منداڵەکان لە کەمپەکە بگوازنەوە بەبیانووی دەستپێکردنی شەڕی دووەمی کەنداو.

یاسر باس دەکات چۆن ئەو و ٦٠ منداڵی تر بەپاس لە عێراقەوە کە لە حاڵەتی شەڕدا بوو بۆ وڵاتی ئوردن گوازرانەوە. ئەمەریکاییەکان ئامانجە سەربازییە عێراقییەکان و کۆشکەکانی سەدامیان بۆمباران دەکرد. ئەو پاسە وەک یاسر دەیگوت پڕ بوو لە منداڵی هەڵاتوو.

هەر لەو ساتەوە وەک دەردەکەوێت ژیانی یاسر بۆ چەند بەشێک دابەش دەبێت. لە ساڵی یەکەم و لە تەمەنی ١٠ ساڵی یاسر دەگاتە وڵاتی کەنەدا بۆ ماڵی کابرایەکی لایەنگری موجاهیدینی خەلق و هاوسەرە کەنەدییەکەی. بەڵام پێ دەچێت یاسر منداڵێکی چەتوون بووبێت و دایک و باوکە بەخودانکەرەکەی بێ هیوا کردبێت. "باش خواردنم نەدەخوارد، ئەو چێشتەی ژنی کابرا لێی دەنا بۆم نەدەخورا. حەزم لە چێشتی ئەو نەبوو. چونکە بەردەوام برسیم بوو خواردنم لە دوکانەکان دەدزی".

ئەوسا یاسر نەک تەنیا یادی چێشتی ئێرانیی دەکرد کە لە کەمپی موجاهیدین دروست دەکرا، بەڵکو یادی ڕێکوپێکی و دیسپلینی ئافرەتە ئێرانییەکەی دەکرد کە لە کەمپەکەدا سەرپەرشتیی دەکرد. یاسر گوتی: "کێشەم لەگەڵ دایک و باوکی بەخودانکەرم زۆر بوون. زۆر جاریش سزایان دەدام، بەڕاستی سزایەکی قورستر لەوەی کە لە کەمپ دەمان دی". منیش پرسیارم لێ کرد: کەواتە تۆ منداڵێکی بێ ناز بووی؟

بەڵام نەخێر ئەو شیکردنەوەی تایبەتیی خۆی هەبوو بۆ ئەمە. گوتی: "کاتێک ناچار دەبی مامەڵە لەگەڵ منداڵێکدا بکەیت کە هی خۆت نەبێ، ئەوا ڕادەی لێبووردەییت

یاسر تەمەنی ٢٤ ساڵانە و بەدرێژاییی ئەو تەمەنە ئەندامێکی موجاهیدینی خەلق بووە. ئەو لەو تەمەنەی ئەندامیەتییە ئەوەندەی دیبوو بۆیە برینە دەروونییەکانی هیچ دەرمانێکیان نییە. کە توانیشی بەشێوەیەک لە شێوەکان خۆی لەم قەدەرە ڕزگار بکات - کە ئەمەیان تەنیا تێچەسپانێکە لە لای من دروستی دەکات پاش چەند ساتێکی دانیشتن لەگەڵیدا - ئەوە تەنیا بۆ کارەکتەرە لاسارەکەی دەگەڕێتەوە. ئەو لەجیاتی ئەوەی ببێتە یاریزانێکی تۆپی پێ وەک حەزی لێ بوو، لە تەمەنی ٢٤ ساڵیدا سەرباز و ڕزگاریخوازێکی بنکەوتووە کە ناچارە سەرلەنوێ تاقیکردنەوەکانی خوێندنی ئامادەیی تەواو بکات بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی ئامادەیی تاکو لە کۆتاییدا بتوانێت ژیانێکی ئاسایی بەسەر ببات. ئەمەش هەمووی تەنیا لەبەرئەوەیە دایک و باوکی ئەندامی موجاهیدینی خەلقن.

یاسر دووبارە و سێبارە ملکەچی سۆزی والا بۆ ئەو گرووپە دەبێت کە ژیانی ئەو دیاریی کردبوو. ئەو لەگەڵ ئەم گرووپە لە سەرەتاکانی تەمەنیدا فێر کرابوو کە دەبێت خەبات لە پێناو ڕزگارکردنی ئێرانییە هەژارەکان لە دەستی مەلاکان - ئەو سەرکردە شیعانەی لە ساڵی ١٩٧٩وە حوکمێکی زۆرداریان لە ئێران دامەزراندووە، بکات. ئەو بەخۆی چەندین ساڵ باوەڕی تەواوی بەو قسانە هەبوو. هەروەها دایک و باوکیشی، کە لە ساڵانی هەشتاکاندا ئێرانیان بەجێ هێشتبوو و لەگەڵ کوڕەکەیان لە کەمپەکانی موجاهیدینی خەلق لە عێراقدا جێگیر بوون و لەوێ خەباتی چەکدارییان لە دژی مەلاکانی ئێران دەکرد. بەڕێنوێنیی سەرکردەیان مەسعود ڕەجەوی سوپایەکیان پێک هێنا و هاوکاریی سەدام حوسێنیان دەکرد لە شەڕ دژی نیشتمانەکەیان و لە چەندین هێرش بۆ سەر خاکی ئێران بەشدار بوون.

خێزانەکەی عیزەتی لە کەمپی ئەشرەف، گەورەترین کەمپی موجاهیدینی خەلق لە عێراق، دەژیان. وەک زانراویشە لەو کەمپە ژیانی ئاسایی بۆ هیچ خێزانێک نەبوو. یاسر لەم بارەیەوە گوتی: "هەفتانە تەنیا ڕۆژ و نیوێکمان پێکەوە بەسەر دەبرد. ئەویش لە پاش نیوەڕۆی پێنجشەممەوە تاوەکو ئێوارەی ڕۆژی هەینی. بەیەکەوە لە یەکێک لە ژوورەکانی خێزانەکان، کە لە بەشێکی تایبەت بەخێزانەکان لە کەمپەدا هەبوو". ڕۆژانی تری هەفتەش لە بەشی تایبەت بەمندالان لە کەمپەکە دەژیا لە ژێر

# پشکی یەکەم

## ئەوانەی لەگەڵ ئێمەدا نین، دژی ئێمەن

"باوکم بەسەرمدا نەڕاندی: ئەگەر بڕۆی ئاگر لە هەردووکمان بەر دەدەم. زۆر لەوە تووڕە بووبوو کە من دژی ڕێکخراوەکە بووم. بەلای ئەوەوە ڕێکخراوەکە زۆر لە کوڕەکەی خۆی گرینگتر بوو. ئەو زۆر پێی نەنگی بوو من دژایەتیی ئەو مەسعود ڕەجەوییە بکەم کە ئەو بەڕادەی پەرستن خۆشی دەویست."

یاسر عیزەتی چاوپرسییانە کەبابەکەی بەردەمی خۆی دەخوارد، من و ئەو لە چێشتخانەیەکی ئێرانیی شاری کۆلۆنی ئەڵمانیا پێکەوە دانیشتبووین. پرسیارم لێی کرد، پاشان باوکت چیی بەسەر هات؟ یاسر پاش ماوەیەکی کورت لەو قسانەی لەگەڵ باوکیدا و لە مانگی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤دا ڕیزەکانی موجاهیدینی بەجێ هێشت.

یاسر لە وەڵامدا گوتی: "نەخێر، هیچی بەسەر نەهات پاش ئەوەی توانیم ڕا بکەم. بێگومان هیچی لێ نەهات. ئەو تەنیا ئەو قسانەی بۆ ترساندنی من بوو. پاش ئەوە هیچ قسەیەکی تری پێم نەگوت". یاسر یەکێکە لە چەندین کەس کە من بۆ ئەم کتێبەم قسەم لەگەڵیاندا کردووە. هەر ئاخاوتنێکیش بۆ خۆی مەتەڵێکی ترە، چونکە موجاهیدینی خەلق ئەوە نین کە دێنە بەرچاو. بەڵام ئاخاوتنەکان چەندیان ڕاستن و چەندیان ڕقی کەڵەکەبوون؟ ئاخۆ کام بەش لە چیرۆکەکان تەنیا خەیاڵی خەڵکن بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن؟ ئاخۆ چی دەشارنەوە چونکە زۆر ئازاریان دەدات؟ ئەوەی منی نارەحەت دەکرد ئەوە بوو هەمان پرسیاری پاش هەر ئاخاوتنێک بوو: بۆچی کۆنە ئەندامەکان قایل بوون بەم شێوەیە لە لایەن ڕێکخراوەکەوە ساز بکرێن و بۆچی لە کۆتاییدا بەخۆشیان خەڵکی تریان بەهەمان شێوە بۆ ڕێکخراوەکە ساز دەکرد؟ وەک دیاریش کەوت وەڵامی ئەم پرسیارەیان پێ نەبوو.

بڕیاری خۆی؟ پشکەکانی کۆتاییی باسی شێوازەکانی ناونووسکردن لە موجاهیدینی خەلق دەکەن و وێکچوونە سەرنجڕاکێشەکانی ئەو شێوازانە لەگەڵ شێوازگەلی گرووپە توندڕۆکانی موسڵمانی سوننە لە ناونووسکردنی ئەندامی نوێدا . هەروەها لەو پشکانە ئاماژە بەوێکچوونەکانی نێوان ئەو دوو گرووپە لە شێوازەکانی مێشک ئاودانی ئەندامان و چۆنیەتیی بەڕێوەبردنی ڕیکخراوەکە دەکەم. لە بەشی کۆتاییشدا باس لەوە دەکەم چۆن گرووپێکی تیرۆریست و دوژمنێکی سەرسەختی ئەمەریکا لە لایەن موحافیزکارە نوێیەکانەوە وەک جێگرەوەیەکی ڕێژیمی ئێران دادەنرێت.

پاسپۆرت دەربهێنێت. لە ساڵی ١٩٨٨دا مینە جارێکی تر دەستگیر دەکرێت و مانگ و نیوێک دەخرێتە زیندان و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکرێت. ئێستاش ساڵی جارێک تەلەفۆنی بۆ دەکەن "دەیانەوێت لێم دڵنیا بن" وەک مینە دەڵێ. ئەم ئافرەتە بازرگانە بەدەم سڕینەوەی فرمێسکی شەرمەزارییەوە، پێم دەڵێت برینە دەروونییەکانی هێشتا ساڕێژ نەبوونە. "من هەستەکانی خۆم لە دەست داوە. ئەوەی منی ڕاگرت خۆ ماندووکردن بوو لە کار. بەڵام تا ئێستاش هەستێکی کرێتم لا ماوە کە دەبێت تۆڵەی خۆم بکەمەوە تا ئەو هەستەم نەمێنێ. بەڵام من تۆڵەسەندنم گەرەک نییە".

پێویستیی تۆڵەسەندنەوە کاردانەوەیەکی مرۆڤە. بۆ مینەش هەر وایە چونکە هیچ پێوەندییەکی بەموجاهیدینەوە نەبووە. من پێم وایە کۆمەڵگەی ئێران و ئەندامانی هەست بەرزی خێزان و دۆستان و پزیشکی دەروونی کەمێک خەمەکانی مینەیان کەم کردووەتەوە. بەڵام بۆ موجاهیدین، کە ئەندامەکانیان وەک گرووپێک پێکەوە دەژین، ئەو ئالییەتە کەڵکی نییە. بۆ ئەو ئەندامانە تۆڵەسەندنەوە دەبێتە هاندەر و هۆی سەرەکیی ژیانیان، ئەمەشمان بەئاشکرا لە شێوەی بەخێوکردن و پێگەیاندنی یاسردا بینی.

هەزاران موجاهید لە هەشتاکان لە زیندانەکانی ئێران ئازاد کران. ڕەنگە لەبەرئەوە ئازاد کران کە نەیانویست ڕوحی خۆیان لە کاتی لێکۆڵینەوەکان بەدەستەوە بدەن، بەڵام پێ دەچێ زیاتر لەبەر شانس بووبێت. وەک مامی یاسر زۆر بەشانس بوو کە بۆی لوا پاش هەشت ساڵ بگەڕێتەوە باوەشی خێزانەکەی خۆی، لەبەرئەوەی لە سێدارەدانی موجاهیدین تا چەند ساڵێکی تری پاش ئازادکردنی هەر بەردەوام بوون.

ئەو موجاهیدانەی ئازاد کراون ڕووبەڕووی جیهانێکی نامۆ دەبنەوە. زۆربەیان بەڕاستی ئاگایان لەوە نەبوو کە موجاهیدینی خەلق پاش چوونی مەسعود ڕەجەوی بۆ پاریس خەباتی چەکداری لە دژی خومەینی ڕاگەیاندووە. بۆ نموونە مەسعود تەیبی کە لە ساڵی ١٩٨٢ ئازاد کرابوو کە لە کۆلۆن دیمانەم لەگەڵێ کرد بەمنی گوت کە چۆن پاش ئازادکردنی تەواو سەری لە گۆڕانکارییەکانی بارودۆخ سوڕمابوو. "نەمتوانی یەک ئەندامێکی موجاهیدین ببینم، هەموو ئەوانەی لە زیندان بوون لەگەڵم

و ئازاد کران، خۆیان حەشار دابوو. هەموو ژمارە تەلەفۆنەکانیان وەلامیان نەبوو". تەیبی هەر لە کاتی شۆڕشەوە لە ١٩٧٩ ئەندامێکی موجاهیدین بوو، ئەوسا لەسەر شەقامەکان بەدەم فرۆشتنی ڕۆژنامە و نامیلکە ئەندامی نوێی بۆ موجاهیدینیش ناونووس (تجنید) دەکرد. پاش ئازادکردنی بۆ ماوەی دوو ساڵ خۆی حەشار دا. "زۆر بەختەوەر بووم کە دەنگی ئێستگەی موجاهیدینم بیست. ئەوسا زانیم کە ڕێکخراوەکەم لە خەبات بەردەوامە".

محەمەد حوسێن سوبحانی بڕیاری موجاهیدین بەڕاگەیاندنی خەباتی چەکداری بەهەڵەیەکی مەزن و ستراتیجیایی دەژمێرێت. "من ئەو کاتە پڕ بەدڵ ئەو بڕیارەم لا پەسند بوو. بەلام نەدەبوایە ئەم بڕیارە توندڕۆیە وەربگرین. دەبوایە پلە بەپلە هێز و توانای خۆمانمان زیاتر بکردایە. سەرەتا پلە و پایەیان بەئێمە بەخشی، بەلام ڕەجەوی هەموو دەسەلاتی دەویست. دەبوایە لەگەڵ خومەینی کارمان بکردایە".

بەپێی سوبحانی بڕیاری هەڵگرتنی چەک بڕیارێکی دیموکراتییانە نەبوو. منیش گەیشتمە قەناعەتێک کە لەو بڕیارە بەدواوە زۆربەی بڕیارەکانی موجاهیدین بەبێ بەشداربوونی ئەندامەکانی وەرگیراون. لە بارەی خەباتی چەکداری سوبحانی دەڵێت: "ئەمەیان گۆڕانێکی گرینگ بوو لە تاکتیکەکانمان، بەلام زۆر لە ئەندامان درکیان بەوە نەدەکرد. ئەو بڕیارە بەرەنجامی زۆر گەورەی لێ کەوتەوە، چونکە پاش ئەو بڕیارە بارودۆخی ئاسایش زۆر بەخێرایی گۆڕا و ئێمە خۆمان بۆ ئەو شتە ئامادە نەکردبوو. هەر لەبەرئەوەش زۆر لە ئەندامانی ئێمە دەستگیر کران".

هەروەک زۆربەی ئەوانەی ئازاد کران، تەیبیش ماوەیەکی زۆر خۆی حەشار دابوو. ئەوسا کاتێکی ناخۆش و سەخت بوو، چونکە مەسعود ڕەجەوی و گەورە بەرپرسانی موجاهیدین خۆیان گەیاندبووە پاریس، دەبوایە ئەندامانی ئاساییی خۆیان خۆیان بپارێزن. فەرەح کەریمی باسی "ژیانی نهێنی"ی خۆی دەکات لە ساڵی ١٩٨٢ بوو، لەگەڵ هاوسەرەکەی فەڕووخ لە ئەپارتمانێکی بچووک لە تاران و دەڵێت: "ماڵەکەمان بووە ناونیشانێک کە دەکرا ئەندامانی موجاهیدینی لێ حەشار بدرێن. دەبوایە ئێمە تا پێمان بکرێت بەئاسایی ڕەفتار بکەین بۆ ئەوەی سەرنجی کەس بۆ خۆمان ڕانەکێشین". کاتێک کە ئەندامێک لەوانەی دەیناسن دەستگیر کرا، ماڵی خۆیان

بگواسنەوە بۆ ئەپارتمانێکی تری گەورەتر و ناو ناسنامە و بەڵگەی بۆ ئەم کارە بەکار هێنا. "بەفەرمی هەردووکمان وەک ژن و مێردێکی گەنج دەناسراین، لە کاتێکدا لەگەڵ ئێمە دوو خێزانی تر و منداڵێک لە ئەپارتمانەکە دەژیان".

هەموو سەرکردەکانی تری موجاهیدین کە لە ئێران مابوونەوە بەقاچاغ ئاودیوی ئەوروپا کران. ئەوانەی مانەوەش شەڕی پارتیزانییان لە ئێران دەکرد. " فەرەح لە کتێبەکەی دەنووسێت "بڕوام وا بوو کە ڕێژیم جگە لە زمانی چەک هیچ زمانێکی تر تێ ناگات". هەروەها لە کتێبەکەی ئاشکرای دەکات و دەنووسێت: "ستراتیجیای چەک هەڵگرتنم لا پەسند بوو نەک لەبەرئەوەی زۆر باوەڕیم پێ هەبوو، بگرە لەبەرئەوەی هیچ جێگرەوەیەکی ترم شک نەدەبرد".

کەریمی لە تاران دەمێنێتەوە و لە باوەڕەدا دەژی کە "ڕێژیم ئێستا نا کەمێکی تر هاورنگ دەدات. تەنیا پەیام کە لە موجاهیدین پێمان گەیشت ئەوەبوو کە ئیمڕۆ یا سبەی شۆڕشی مەزن هەڵدەگیرسێنین".

بەڵام لە ڕاستیدا بزووتنەوەی موجاهیدین لاواز و گۆشەگیر دەبێت و پارەشی لێ دەبڕێت. لە پایزی ١٩٨٢دا کە ئەوسا فەرەح کەریمی سکپڕ بوو و ڕۆژی منداڵبوونی نزیک دەبێت بەخۆی و مێردەکەیەوە بەڕێگەی کوردستانی عێراقی "ئازادکراو"دا دەگەنە عێراق و لەوێشەوە بۆ ڕۆئاوا ڕا دەکەن. زوو لە پاش شۆڕش لە ١٩٨٠ شەڕێکی خوێناوی لەگەڵ عێراق هەڵدەگیرسێت. هەندێ لە ناوچەی کوردنشینەکانی سەر سنووری ئێران- عێراق لە خاکی ئێران دەکەونە ژێر دەستی عێراقییەکان و، موجاهیدین لەو ناوچەیەی ناویان لێ ناوە "ناوچەی ئازادکراو" جێگیر دەبن. منیش پێم وایە ئەمەیان وەسفێکی تاڵە، چونکە لە ڕاستیدا ناوچەکە لە ژێر دەستی دوژمنە، عێراق. ئەم بارە بواری بەموجاهیدین دا دووبارە خۆیان لە نزیک سنووری ئێران ڕێک بخەنەوە و دەرفەتی بۆیان ڕەخساند بنکەیەکی بەردەوامیان لە عێراقدا هەبێت.

مەسعود خودابەندە، کە چەندین ساڵ بەرپرسی پێوەندییەکانی موجاهیدینی خەلق بوو بۆمی باس کرد کە لە ساڵی ١٩٨٢ ئێزگەیەکی پەخشی ڕادیۆیی لەو "ناوچە ئازادکراوە" دامەزراند کە بۆ ئەو موجاهیدانەی لە ئێران مابوون ئاراستە کرابوو، کە ئێرانییەکان پاش ساڵێک ناوچەکەیان گێڕایەوە ژێر دەستی خۆیان، خودابەندە

بەخورتی خۆی و ئێستگەکەی پەخشی قورتار کرد و هاتە کوردستانی عێراق. ئینجا لەو کاتەوە ڕادیۆی موجاهیدین پەخشی خۆی لە ناو عێراق درێژە پێ دەدات. ئەو ڕادیۆیە بۆ موجاهیدین گرینگ بوو، چونک سەرەڕای مەترسییەکان و سەرکوتکردن کە لە ئێران هەر بەردەوامە، هەوڵی ناونووسکردنی ئەندامی نوێ هەر بەردەوامە. عەلی قەشقەوی لە ١٩٨٥ کە تەمەنی ١٩ ساڵان بووە پێوەندیی بەموجاهیدینەوە کردووە. عەلی هۆی چوونە ڕیزی موجاهیدینی بەم شێوەیە باس کرد و گوتی: "لە گاتی شەڕی عێراق – ئێران بوو. هیچ جۆرە ئازادییەکمان نەمابوو. مەلاکان زۆر بەرهەڵستکاریان کوشت".

موجاهیدینیش یەکەوسەر عەلییان خستە کار. "من و برادەرێکم پرۆپاگەندەمان دەکرد." کە لێم پرسی ئەم کارەیان برێتی بوو لە چی، بەمنی گوت کە هەردووکیان شەوان دروشمی موجاهیدینیان لەسەر دیوار و شوێنە گشتییەکانیان دەنووسی و لەگەڵ برادەرەکەی بڵاوکراوە و نامیلکەکانی لە پاریس دەهاتن بەسەر خەڵکیان دابەش دەکرد. پێوەندیش لەگەڵ بارەگای موجاهیدین لە فەرەنسا بەتەلەفۆنە، سەرەڕای هەموو مەترسییەکانی پێوەندیکردن بەتەلەفۆن، عەلی دەستگیر نەکرا و تا ساڵی ١٩٨٩ کە موجاهیدین داوایان لێ کردووە بچێتە لایان لە عێراق.

هەرچەندە سەفەرکردنی مەسعود ڕەجەوی بۆ پاریس شکستێکی تاڵ بوو بۆ موجاهیدین، بەڵام سوودی ئەوە بوو کە ڕەجەویی کردە تاکە سەرکردەی ڕاستەقینەی موجاهیدین. بۆ شوێنکەوتووانی ڕەجەوی بووە "میراتگری شەهیدان". کاتێک لە ئێران بوون موجاهیدینی خەلق مەکتەبی سیاسیی هەبوو و لەوێ مەسعود خیابانی بەهاوشانی ڕەجەوی دادەنرا، بەڵام کە چوونە پاریس ئەوە نەما. ئێستا ڕەجەوی بووە تاکە سەرکردە.

یەکەمین کاری ڕەجەوی لە پاریس پێکەوە لەگەڵ سەرۆکی پێشوو بەنیسەدر – کە لەگەڵی لە ئێران ڕایان کرد – پێکهێنانی ئەنجوومەنی نیشتیمانیی بەرەنگاری (ئە. ن. ب) بوو. پارت و گرووپەکانی تریان کە لە ئێران دەرکرابوون هێنایە نێو ئەو ئەنجوومەنەوە. دەبوایە ئەو ئەنجوومەنە پشتگیری بۆ خۆی دابین بکات و خۆی وەک تاکە جێگرەوەیەکی ڕێژیمە کرێتەکەی خومەینی پێشان بدات، ئەمەش بەو بۆچوونە

کە پشتگیرییەکە لە ئەنجامدا ئەنجوومەنەکە لە داهاتوویەکی نزیکدا بێنێتە سەر دەسەلات.

ئەم سیاسەتە زوو سوودەکانی بەدیار کەوتن هەرچەندە لە ڕاستیدا هەرگیز نەبووە هۆی دەسەلات وەدەستهێنان. بەلام کە ڕەجەوی خۆی وەک سەرکردەی ئێرانییە دەرکراوەکان پێشان دا، دەیتوانی بەئاسانی هاوڕێکانی تری بانگی ئەورووپا بکات. کە دەگەیشتنە ئەورووپاش مافی پەنابەرییان لە وڵاتەکانی ئەورووپا پێ دەبەخشرا و هەندێکیان ڕێکخراوی قوتابیانیان دادەمەزراند یاخۆ لەو ڕێکخراوانەی هەبوون کاریان دەکرد و، ئەوانی تر دەچوونە لای لە پاریس. لە گەڕەکی ئوڤرێ - سور - ئوویس بارەگایەکی نوێی موجاهیدین دادەمەزرێت. مەسعود ڕەجەوی نەک تەنیا سەرکردەی موجاهیدینە بگرە سەرۆکی ئەنجوومەنی بەرگریشە. ئەوسا ڕۆئاوا بایەخێکی زۆری بەئۆپۆزسیۆنێکی یەکگرتوو لە دژی ڕێژیمی خومەینی دەدا، چونکە هەر لە سەردەمی داگیرکردنی باڵیۆزخانەی ئەمەریکا و دەستبەسەراگرتنی بارمتەکان لە ١٩٧٩وە ئایەتوڵڵا خومەینی بایەخدانی ڕۆئاوای لە دەست دا. جگە لەوەش پرەنسیپ و بیرۆکەکانی موجاهیدین هێشتا لە ئەورووپا نەناسرابوون. لە پاڵ ئەوەشدا کۆبوونەوەی ڕەجەوی لەگەڵ ئەو سەرکردە سیاسییانەی کە لە میدیاکان زۆر ناسرابوون وای کرد کە موجاهیدین بناسرێن و بۆ نموونە لە کۆبوونەوەی ساڵانەی پارتی کرێکارانی بەریتانیا و پارتە دیموکراتە مەسیحییەکانی ئەڵمانیا و ئیتالیا و پارتی کۆمۆنیستی یۆناندا بەشدار بن. کە موجاهیدین سکاڵایەکیان لە دژی "ڕێژیمی خوێنمژی چاخەکانی ناوەڕاستی ئێران" بەرز کردەوە توانییان ١٧٠٠ واژوو لەوانە واژووی چەندین سیاسەتوانی ئەورووپایی و سەرۆک سەندیکاکان و مامۆستایانی زانکۆ کۆ بکەنەوە. پاش چەند ساڵێکیش توانییان ٥٠٠٠ واژوو بۆ هەمان سکاڵا کۆ بکەنەوە.

ئەوانەی سکاڵاکەیان ئیمزا کردبوو پێیان وابوو کە ئەوان سکاڵایەکی سادەیان ئیمزا کردووە، بەلام بۆ موجاهیدین ئەم کارەیان تەنیا بۆ مەرامی جوانکاریی وێنەکەی خۆیان بوو. لەو چەند ساڵەش ڕەجەوی شەو و ڕۆژی بەیەکەوە دەنا بۆ ئەوەی وێنەی ئۆپۆزسیۆنێکی ئێرانی دیموکرات و یەکگرتوو پێشانی جیهان بدات.

ئەوە بوو لە دیمانەکانی لەگەڵ ڕۆژنامەکانی لۆمۆندی فەرەنسی و گاردیانی بەریتانی و واشنتۆن پۆستی ئەمەریکایی ڕەجەوی جەخت لەسەر دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە سیاسییەکان دەکاتەوە.

بەڵام ئەو وێنەیەی ویستیان پێشانی بدەن لەگەڵ ڕاستییەکانی ناو موجاهیدین یەک ناگرنەوە. چونکە ئایدیۆلۆجیای ناو موجاهیدین هەر بریتی بوو لە خەبات لە پێناو کۆمەڵگەیەکی ئازادی بێ توێژ لە ئێران و تاکە ڕێگە بۆ هێنانە دیی ئەم کۆمەڵگە خەیاڵییە شۆڕشە. ئەو دیموکراسییەی ڕەجەویش پێوە دەنازێ، بەپێی قسەکانی هەندێک لە کۆنە ئەندامەکانی موجاهیدین کە دیمانەیان لەگەڵیان کرد، لە هیچ کارێکی موجاهیدین لە هەشتاکان بەدی ناکرێت.

کۆمیتەی ناوەندی کە لە ٥٠٠ ئەندام پێک هاتبوو کە بەڕەسمی سەرکردایەتیی موجاهیدینی خەلقیان دەکرد، لە ڕاستیدا تەنیا بڕیارەکانی مەسعود ڕەجەوی جێبەجێ دەکەن. محەمەد حوسێن سوبحانی لەو بارەیەوە دەڵێت: "من ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندی بووم، بەڵام نەمدەزانی بەڕاستی مەسەلە چییە".

ڕەجەوی نەیدەتوانی بگەڕێتەوە بۆ ئێران بۆیە هیچ جێگرەوەیەکی تری لە بەردەستدا نەبوو جگە لەوەی ببێتە جێگرەوەیەکی نایابی مەلا دڵڕەقەکانی ئێران. هەر بۆیەش پێویست بوو دەست بخاتە نێو دەستی گرووپە ئێرانییەکانی تر، هەرچەندە کەلێنێکی بەرینی نەبوونی متمانەی لەگەڵیاندا هەبوو. ئەنجوومەنی نیشتیمانیی بەرەنگاریش بۆ پێکانی ئەو ئامانجانە ئامرازێکی گرینگ بوو.

ڕەجەوی بۆ ئەوەی پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ سەرۆکی پێشوو بەنیسەدر لە تشرینی یەکەمی ١٩٨٢دا فەیروزەی کچی بەنیسەدر مارە دەکات. ڕەجەوی پێویستی بە بەنیسەدر هەبوو بۆ ئەوەی سەرکردایەتیی ئەنجوومەنی نیشتیمانیی بەرەنگاری هەر بەدەست خۆیەوە بێت. هەموو کەسێک دەیزانی کە ئەو ژنهێنانە تەنیا بۆ بەرژەوەندییە: چونکە ئەوسا هاوسەرەکەی ئەشرەف تەنیا هەشت مانگ بوو کوژرابوو.

بەڵام ڕەجەوی متمانەی نە بەژنە نوێیەکەی و نە بەخەزووری هەبوو، بەپێی قسەکانی خوابەندە. ئینگلیزییەکەی خوابەندە زۆر ڕەوانە ئەویش چونکە ماوەیەکی

دریژ بۆ خوێندن لە بەریتانیا مابووەوە و هەر لەوێ وەک قوتابییەک تەنانەت بەر لە شۆڕشی ئێران پێوەندیی بەموجاهیدینەوە کردبوو. لە لەندەن بۆ پاریس دەگوازێتەوە و وەک ئەندامێکی دەزگای هەواڵگری مەسعود ڕەجەوی داوای لێ دەکرێت چاودێری فەیروزە و باوکی بکات.

فەیروزەش ئافرەتێکی گەنجی کەللەڕەق بوو کە نەیدەویست ڕەجەوی پێی بڵێ ئەمە بکە و ئەوە نەکە. بەنیسەدریش تا دەهات خۆی لە زاواکەی دوور دەخست هەرچەندە بەیەکەوە لە ئێران ڕایان کردبوو. ڕەجەویش خوازیار بوو بایەخ بەمیکانیزمێک بدات بۆ ئەوەی پێگەی خەزوورەکەی لە نێو ئەنجوومەنی نیشتیمانی لەق بکات کە تا ئەو کات وەک جێگرەوەیەکی خومەینی بوو، چونکە ئاراستەی بەرگریی ئێرانی زوو لاواز بوو. لە نێو ئەنجوومەنی نیشتیمانیی بەرەنگاریش ئەو لایەنانەی کە لە تینووێتیی ڕەجەوی بۆ دەسەلات بێزار تا دەهات ململانێیان لەگەڵی زیاتر دەبوو.

لە ساڵی ۱۹۸۳دا دەمەقاڵێیەکی توند لە نێوان ڕەجەوی و خەزووری ڕووی دا. پێش دەمەقاڵێیەکە ڕەجەوی ماوەی ٥ سات کۆبوونەوەی لەگەڵ وەزیری دەرەوەی عێراق تاریق عەزیز کردبوو. ئەمەش بەنیسەدری زۆر تووڕە کرد. نەک تەنیا لەبەرئەوەی عێراق دوژمنە و سەربازی ئێرانی ڕۆژانە لە مەیدانی شەڕی دژی عێراق دەکوژرێن، بگرە ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە ئەم شەڕە دەرفەتێکی بۆ خومەینی دابین کردووە کە هێز و دەسەلاتی خۆی زیاتر بکات. بۆ بەنیسەدر دانیشتنی خومەینی بەئاسوودەیی لەسەر کورسیی دەسەلاتی ئێران هەموو خەتای عێراقە.

بەقسەی بەنیسەدر ئەم کۆبوونەوەیە لەگەڵ تاریق عەزیز لە داهاتوودا زۆر بەگران لەسەر ڕەجەوی دەوەستێ. خۆ ئێرانییەکان ئەمەی بۆ لە بیر ناکەن کە ئەو دەستی ناوەتە نێو دەستی دوژمن. "بەداخەوە ڕەجەوی تێ نەدەگەیشت کە ئەو پێی ناکرێ لە تارانەوە بچێتە بەغدا و پاشان بۆی هەبێت حوکمی ئێران بکات. هیچ ئێرانییەک ئەمەی لا قبووڵ نییە" ئەمە قسەی سەرۆکی پێشووی بەنیسەدرە لە دیمانەیەکی لەگەڵ ڕۆژنامەوانێکی فەرەنسایی لە ۲۰۰٤دا.

ئەم کۆبوونەوەیەی ڕەجەوی زۆر لە ئاوارە ئێرانییەکان نیگەران دەکات. تۆ بڵێ ئەمەیە هۆی ئەوەی کە ڕەجەوەی دەتوانی خۆی و هاوڕێکانی لە پاریس بەخێو بکات

و شاندەکانی خۆی بۆ هەموو پارچەکانی جیهان دەنێرێت و تا ئێستاش توانای هەیە سەربازەکانی خۆی لە کوردستانی عێراق بهێڵێتەوە؟ ئایا سەدام حوسێن مووچەکەی دەدات؟ بەنیسەدر ئەم دەست تێکەڵکردنەی لەگەڵ دوژمن ئەوەندە پێ ناخۆش دەبێت لە ئەنجامدا لە ئەنجوومەنی نیشتیمانیی بەرەنگاری دەکشێتەوە و لەگەڵ ئەویش پارتێکی کوردستانی ئێرانیش دەکشێتەوە.

موجاهیدینی ئاسایی وەک دایک و باوکی یاسر هیچ شتێک لەو بارەیەوە نازانن. تەنیا چەند کەسێک لە ناو موجاهیدین بەم هاوکاریکردنەی دوژمن دەزانن. کاتێک موجاهیدین باسی کوردستان دەکەن، کە چەکدارەکانیان لەوێنە، خەڵک بەهەڵە تێ دەگەن کە باسی کوردستانی ئێران دەکەن. تەنیا ئەوانەی دەتوانن لە ئەورووپاوە بۆ ئەوێ سەفەر بکەن – وەک مەسعود خودابەندە کە ئێزگەی پەخشەکەی بردە ئەوێ – ڕاستییەکە دەزانن. بەڵام ئەو چەندە کەسە ئەوەندە لە ڕەجەوی نزیکن نهێنییەکە دەپارێزن. لەبەرئەوەی ڕەجەوی زۆر باش دەزانێت کە هاوکاریکردن لەگەڵ ئەندامانی خۆیشی زۆر مشتومڕ هەڵدەگرێت وەک هاوکاریکردن لەگەڵ هاووڵاتییانی ئێرانیدا کە دەیانەوێت ئازاد بکرێن.

ئەوسا لە ناو موجاهیدین مێشک ئاودان شێوەیەکی گرینگ وەردەگرێت. ئەندامانی موجاهیدین لە ئەورووپا دەخرێنە نێو خانەکانی موجاهیدین و لەوێ پێویستە ئەندامەکان ڕۆژانە لە "دانیشتنەکانی ڕاپۆرتدانی ڕۆژانە" ئەو چالاکییانەی ئەنجامیان داوە بەبەرپرسەکانیان بڵێن، هەر بەرپرسێک لەوانە گرووپێکی ٥– ٢٠ ئەندامی هەیە. ئەندامەکان لە خانەکان بەدرێژایی ڕۆژ کار دەکەن و هیچ پێوەندییەکیان لە جیهانی دەرەوەی ڕێکخراوەکەیان نابێت.

لە ئێرانیش خەباتی چەکداریی نهێنیی جارانی ڕێکخراوەکە بەسەرکردایەتیی عەلی زارکێش بەردەوام بوو و تەنیا پەلاماری بچووکیان ئەنجام دەدا. بوونی ڕادیۆی موجاهیدیش کە لە عێراقەوە پەخش دەکات گرەنتیی ئەوە دەکات ئەندامانی موجاهیدین لە کار و چالاکییەکانی موجاهیدینی ناو ئێران ئاگەدار بکاتەوە، بەڵام ئەو سەرکوتکارییەی لە نێو موجاهیدین لە ئەورووپادا هەبوو لە ئێران نەبوو.

هەر لەبەرئەوەش ئەو ئەندامانەی لە ئێران مانەوە لە ساڵی ١٩٨٥ لە پەیامەکانی

موجاهیدین تێ نەدەگەیشتن. بێگومان مامی یاسریش بەهەمان شێوە لەو پەیامە نەدەگەیشت: سەرکردە مەزنەکەیان بەتەمایە مریەم ئازۆدانلۆ مارە بکات. ئەو کات ڕەجەوی لە پۆستی "مسؤول أول" کرایە بەرزترین بەرپرس یاخۆ سەرکردەی ئاینی "ڕەهبەر" بگرە تەنانەت بە"ئیمام حال"یش، ئیمامی ئێستا ناویان دەبرد. مریەمیش کرایە جێگری ڕەهبەر. بەم هاوسەرگیرییەی مەسعود - مریەم ئافرەتان لە نێو ڕێکخراودا لەگەڵ پیاوان یەکسان بوون، ئەمەش بەسەرەتای "شۆڕشی ئایدیۆلۆجیایی" نێو موجاهیدین و گەلی ئێران و هەموو جیهانی ئیسلامی ناو دەبرێت.

دەسەڵاتە بەرزەکانی موجاهیدین، مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی بەهەموو هێزیان پشتگیری لەو بڕیارە دەکەن، ئەمەش پەیامێکە بۆ دەست و پێوەندەکانی موجاهیدین. لەوە زیاتر ئەو هەردوو دەسەڵاتە دەڵێن کە گوایە، لەبەرئەوەی مریەم و مەسعود لەو پۆستە نوێیە بەیەکەوە کار دەکەن و جاری واش هەیە بەتەنیا دەبن و لەبەرئەوەی لە ئاینی ئیسلامدا ڕێگە نادرێت ژن و پیاوێک بەتەنیا لەگەڵ یەکتری بن، بۆیە ئەوان بڕیاریان داوە هاوسەرگیرییەکە پێک بهێنرێت. تۆ بڵێی کۆمیتەی ناوەندی بڕیارێکی لەم شێوەیەی دەرکردبێت؟ سوبحانی لەو بارەیەوە دەڵێت: "نەخێر، تەنیا چەند ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندی بەم شتەیان دەزانی. تەنیا نزیکەی ٢٠ ئەندامی بەشی سیاسیی کۆمیتەی ناوەندی یاخۆ با بڵێین بژارەی کۆمیتەکە ئەم ڕاگەیاندنەیان ئیمزا کرد. ئەوانی تر وەک من لە میدیاکان ئەم هەواڵەیان زانی".

سوبحانی وەک زۆربەی ئەندامانی تری موجاهیدین ئەوەندەی لە بارەی مریەم ئازۆدانلۆ دەزانی کە خێزانی هاوڕێیەکی نزیکی ڕەجەوییە کە ناوی مەهدی ئەبریشەمچی بوو. مریەم لەگەڵ هاوسەرەکەی و کچەکەیان ئەشرەف لە ساڵی ١٩٨٢ لە ئێران بۆ پاریس هەڵاتن. پاش مارەکردنی لە لایەن ڕەجەوی لە ئاداری ١٩٨٢دا بووە هەوێی فەیروزە، بەڵام خۆی وەپێش خست تا خۆی کردە یاریدەری ڕەجەوی.

مێردی مریەم، مەهدی ئیبراهیم ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو و برادەرێکی زۆر نزیکی ڕەجەوییە. مریەم و مەهدی لەبەر جەنجاڵیی کاری ڕێکخراوەیی زۆر یەکتری نابینن و پێوەندییان لاواز دەبێت.

مـريەمی بەرزخـواز و نەشـمـيل و مـێـينە تا درەنگانی شـەو لەگـەڵ ڕەجـەوی کـار دەکـات. ئەو بەتەواوی خـۆی بۆ ڕێکخـراوەکـە تەرخـان کـردووە، بـەڵام بێگـومـان پێـوەندييـەکی سـێکسـيش لـە نێـوان ئەو و ڕەجـەويدا دروست بووە. چونکـە ئەوانەی هەردووکـيانی بەيەکەوە لە کـار ديبـوو لەو ڕاسـتـييـە دڵنيـا بوو. تەنانـەت بەرپرسی هەواڵگريی مـوجـاهـيـدين مـەسـعـود خـودابەندە لە ڕاپۆرتێکيـدا لە سـاڵی ۱۹۸۳ دەنووسـێت کـە ڕەجـەوی مـريەمی سکپـڕ کـردووە و لە ئەنجـامـدا مـريەم لـە پاريس بەهاوکاری ساڵـحی برای خودابەندە کە پزيشکە، کۆرپەکە لەبار دەبەن. کـاتێکيش هاوسـەرايەتيی مـريەم لەگـەڵ ڕەجـەوی لە سـەرەتای سـاڵی ۱۹۸۵دا ڕادەگـەيەنرێت دەنگۆی ئەوە هـەبوو کە چەند مـانگێکە مـريەم لەگـەڵ مـەهدی هـاوسـەرکـەی لـە ماڵ نەخـەوتووە. لە کـۆتـايی سـاڵی ۱۹۸٤دا فـەيروزەيی ئـەم شـتـە بـۆ ڕەجـەوی ئـاشکرا دەکات، ڕەجەويش لە ئەنجامدا داوا لە ئەبريشـەمـچی دەکات بەهـەمـان شێوە لەگـەڵ مريەمدا ڕەفتار بکات بۆ ئەوەی ڕێگە بۆ "شـۆڕشە مەزنە"کەی باس کرا خۆش بکات. بەهـانەی هـەموو لايەکـيش بۆ ئەم کارە ئەوە بوو کە تـەنانـەت پێغەمـبەری خوا محـەمـەد (د.خ) بەهـەمـان شێـوە هـاوسـەری تازە تەڵاقدراوی کـوڕە بەخـێـوکراوەکەی خۆی مـارە کـردووە. بەڵام ئەندامـانی مـوجـاهـيـدين و خـەڵکی دەرەوەی مـوجـاهـيـدين باسی ئەم ڕيسـوابوونە دەکەن. خـەڵک بەکـارێکی ناپاکی دادەنێن: حـاڵەتەکـە لێرەدا ژنی گـەنجی خاوەن منداڵ و مێردەکە کە دۆستێکی نزيکە، ئەمانەش هـەمووی تابوون لە کولتووری ئێرانيـدا. ئەو نموونەيەی کـە هێنايانەوە لە بـارەی پێـغـەمـبـەر تەواو پێـچـەوانەی ئەو حـاڵەتە بوو. کـەچی کـەسـانێکی تـر ئەم کـارە بەڕەوا دەزانن و بـاسی شـا دەکـەن چۆن ڕێگەی دا ژنەکەی خۆی تەڵاق بدات بۆ ئەوەی ئافـرەتێکی تر مارە بکات و کوڕێکی لێ هـەبێت، ئەوانەی ئەم قـسـانەيان دەکـرد لە لايەن ڕەجـەوييـەوە لە سـەرەتای مـانگی شـوباتدا بانگـهێـشت دەکـرێن بۆ ئاهـەنگێکی مـەزنی هـاوسـەرايەتی و بـەم شـێـوەيە ڕێککەوتنيان لەگەڵ ڕەجەويدا پتەوتر دەبێت.

زۆر بيـريان لەوە دەکـردەوە کـەوا مـريەم ئازۆدانلـۆی چ شـتـێکی پێـيـە بۆ ئەوەی ئەوەندە مرۆڤێکی تايبەت و لە موجاهيدينی تر جياواز بێت و بۆچی لە نێو ئەو هەموو خەڵکە ئەو ببێتە سەرکردەی هاوکار co-leader. کاتێک مريەم ناوی خۆی کردە مريەم

ڕەجەوی، ژنی ئەبریشەمچی بوو هەر ناوی خۆی بەکار دەهێنا، ئەوسا ئەم لایەنە فێمێنیستانە تەواوی پرۆسەکەیان خستە ژێر گومانێکی زۆرەوە. چونکە وەک زۆر لە کۆنە ئەندامانی موجاهیدین بەشانازییەوە بەمنیان دەگوت کەوا لە کۆمەڵگەی ئێمەدا ئافرەتان جگە لە هاوسەرەکانی پزیشکان و ژەنەراڵەکان، پاش هاوسەرایەتیش هەر ناوی خۆیان بەکار دێنن. بۆیە کە مریەم ناوی خۆی گۆڕی ئەویش بەقەدەر هاوسەرایەتییەکەی مشتومڕی نایەوە. ئەو کارەش بەڕەسمی وەک چالاکییەکی فێمینیستانە پێشان درا و پێگەی ئافرەتانی لە نێو ڕێکخراوەکەدا لە هی پیاوان بەرزتر کرد و هەموو ئەندامەکانی پیاو بەرپرسێکی ئافرەتیان بۆ دانرا. لە پراکتیزەکردنیشدا ئەم کارە بووە هۆی پەیدابوونی دوو سیستم: بەرپرسە ڕەسمییەکان هەموویان ئافرەت بوون، بەڵام هەموو بڕیارەکان لە خوار ئەوانەوە لە لایەن پیاوەکانەوە دەردەکران.

هۆی ئەم هاوسەرایەتییە بووە مایەی مشتومڕی درێژخایەن لە لای ئەندامانی موجاهیدین و چاودێرەکانی دەرەوەش. دیارە لەسەر بنەمای پێوەندیی سێکسیی پێشتر بووە. وا دیارە مریەم پێوەندیی خۆشەویستیی لەگەڵ سەرکردەی مەزندا هەبووە. ئەم بۆچوونە لە تەماشاکردنی فیلمی ئاهەنگی بووک گواستنەوە کە بڵاوکرانەوە بەڕوونی دەردەکەوێت. بەڵام بۆچی پێوەندییەک ئەوە ماوە درێژە بەنهێنی بمێنێتەوە کەچی هەردووکیان بڕیار دەدەن بیکەن بەهاوسەرایەتی کە ئەوەندە گۆڕانکاری و دەرەنجامی بۆ ڕێکخراوەکەیان لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، لە کاتێکدا کەس بەوانی نەزانیوە. تۆ بڵێی مریەمی تێنووی دەسەڵات توانیبێتی گەف (ابتزاز) لە خۆشەویستەکەی بکات؟ یان ڕەجەوی پێویستی بەمریەم هەبوو وەک ئامرازێک بۆ ئەوەی ڕێکخراوەکەی خۆی بۆ تیرەیەک بگۆڕێت؟

ئەم پەیامە بۆ خەڵکی ئێران وەک گورزێک وا بوو. موجاهیدە زیندانیکراوەکان کە هەواڵەکەیان لە زاری پاسەوانی هاوسۆز بیستبوو بڕوایان نەدەکرد. بەتایبەتی عەلی زارکەش سەرکردەی موجاهیدین لە ئێران، کە ئەم کارەی بەئاڵوگۆڕکردنی بێ شەرمانەی هاوسەران ناوبرد. ڕەجەویش دەیزانی ئەم بۆچوونە بۆ یەکێتیی ناو ڕێکخراوەکەی چەند ترسناکە بۆیە بڕیار دەدات عەلی بێتە لای لە پاریس. کە دەگاتە

ئەوێ ڕەجەوی لە پۆستەکەی خۆی لای دەبات و مریەم لە شوێنی ئەو دادەنێت، ئینجا لەو کاتەوە مریەم ئۆپەراسیۆنەکانی موجاهیدین لە ئێران بەڕێوە دەبات. هەر لەو ڕۆژەوەش عەلی زارکەش هیچ پلە و بەرپرسیاریەتییەکی بەبەهای نادرێتێ لە ناو موجاهیدین و لە ١٩٨٨دا لە بارودۆخێکی گوماناویدا دەمرێت.

لە ناو ئێرانیش بیرکردنەوە و لێکدانەوەی هاوسەرایەتیی ڕەجەوی و "شۆڕشی ئایدیۆلۆجیایی" وا لە هەندێک خەڵک دەکات ڕیزەکانی موجاهیدین بەجێ بهێڵن. لە پاریس دەستەخوشکی ئەشرەف ڕەبیعیی خێزانی کۆچکردووی ڕەجەوی لەگەڵ گرووپێک لە سەرپێچکاران (منشقین) کە پڕوپاگەندە لە دژی ڕەجەوی دەکەن و بەوە تاوانباری دەکەن موجاهیدینی کردووەتە تیرەیەک بۆ پاراستنی کەسایەتی خۆی.

بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بەهۆی ئەو "شۆڕش"ەوە ڕەجەوی زیاتر کۆنترۆڵی خەڵکەکە دەکات. من ئەو بۆچوونەم لا دروست بووە کە ئەو تۆڵەی سەرنەکەوتنی کودەتاکەی خۆی لە ئێران لە خەڵکی دڵسۆزی خۆی دەسێنێتەوە. ڕێکخراوەکە بەتەواوی گۆڕا. ئیتر ڕێکخراوێکی خاوەن سەرکردەیەکی ڕەها نییە. موجاهیدین دەبێتە تیرەیەک تیایدا هەموو شتێک لە دەوری بەژن و باڵای سەرکردەکەیدا دەسووڕێتەوە و سەرکردەش ئامانجە سیاسییە ڕەسەنەکان، کە کاتی خۆی کەسانی وەک باوکی یاسریان ڕاکێشا، تەنیا بۆ ناونووسکردنی ئەندامی نوێ بەکار دەهێنێت.

ئەمەش بەئاشکرا لە شێوەی سەپاندنی بڕیاری هاوسەرایەتی و "شۆڕشەکە" بەسەر ئەندامان لە کۆبوونەوە جەماوەرییەکاندا دەردەکەوێت. کە ئەم کارەش هەموو جارێک بەخۆشی نەدەکرا. هادی شەمس حایری باسی چەند هەفتەیەکی پاش هاوسەرایەتیی سەرکردەیم بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "هەر کەسێک لەو شۆڕشەی باس دەکرا تێ نەگەیشتبا دەردەکرا، ئێمەش ئەم شتەمان پێ خۆش نەبوو، بۆ نموونە من لەو شۆڕشە تێ نەگەیشتبووم. ناچار دەبوایە شتێک قبووڵ بکەین کە هێشتا لێی تێ نەگەیشتبووین. ئەم شۆڕشە پاکمان دەکاتەوە و لە ئەنجامدا زیاتر دەمانگونجێنێت بۆ ئەوەی واقیعبینانە شەڕی خومەینی بکەین".

پاش ماوەیەک بۆ هادی شەمس حایری دەردەکەوێت کە لەو ساتە بەدواوە موجاهیدینی خەلق بەڕاستی بووە تیرەیەک. "بووە ڕێکخراوێکی خاوەن

سەرکردەیەکی ڕۆحی. دەبوایەش خۆت بدەیتە دەست ئەو ڕاستییە. ئیتر خاوەنی هیچ شتێکی خۆت نەبوویت. ئەوەی هەتە تەنیا ئەرک و بەڵێنەکانە، هیچ مافێکت نییە. ڕێکخراوەکە بووە ئاینێک بۆ خۆی، دەبوو بەبێ ئەوەی بپرسی بۆچی تەنیا ئەوە شتانە بکەیت کە لێت چاوەڕوان دەکران".

پاش ئەو هەموو ساڵە هادی بەم شێوەیە قسەم بۆ دەکات. بەڵام ئەوسا ئەندامانی وەک حایری و باوکی یاسر تەنیا ئەوە تێ دەگەیشتن کە ڕێکخراوەکەیان شتێکیان لێ داوا دەکات ئەوان تێی ناگەن. ئەوان نەیاندەزانی کە بەشێکن لە بزووتنەوەیەک لە ڕێکخراوەوە بەرەو بوون بەتیرە ملی دەنا. ئەوان ڕێک لە نێو پرۆسەکەدا بوون و دڵسۆزی ئامانجە سیاسییەکەیان بوون کە بریتی بوو لە ڕزگارکردنی گەلی ئێران لە ستەمکاری.

لەو کاتەی قەیرانی ناو موجاهیدینی خەلق ئاشکرا دەبێت، حکوومەتی ئێران ئەو هەلە دەقۆزێتەوە و هەڵمەتێکی پڕوپاگەندەی خۆی لە دژی ئەو "مونافیقانەی" موجاهیدین دەست پێ دەکات. لە میانەی ئەو پرۆسەیەشدا ڕەجەوی متمانەی هاوولاتیی "ئاسایی" ئێرانی و هەروەها پشتگیریی سیاسیی خۆی لە ئەورووپا لە دەست دەدات. دوور نییە زۆر خەڵک لەو کاتە وایان لێک دابێتەوە: ئەگەر ڕەجەوی ئاوا بەئاسانی پرۆسەی دیموکراسی لە ناو ڕێکخراوەکەی خۆیدا پێشێل بکات، ئەو کابرایە چی دەکات ئەگەر هاتو توانیی دەسەڵات لە ئێران بگرێتە دەست؟ و، ئەگەر موجاهیدین وەک نیمچە خوایەک بیپەرستن، ئەوە ئەگەر گەڕانەوە بۆ ئێران دەبێ چی بکەن؟ ئەگەر ئەوان نەفرەت لە هەموو ئەوانە بکەن کە لەگەڵیان ناکۆکن و بە"تیرۆریست" و "مشەخۆر" و "تەرت = زبڵ" ناویان ببەن، ئەگەر دەسەڵات بگرنە دەست تۆ بڵێی چی بەئۆپۆزسیۆن بکەن؟ لە هەموو ئەو پرسیارانەش گرینگتر: ئەو کۆمارە ئیسلامییەی ئەوان چ جیاوازییەکی لەگەڵ کۆمارەکەی خومەینیدا دەبێت؟

ئەو هەموو لێکدانەوەیە ڕۆڵی خۆیان هەبووە کاتێک فەرەنسا لە ساڵی ١٩٨٦دا بڕیاری دا پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ کۆماری ئیسلامیی خومەینی دەست پێ بکاتەوە و باشتریان بکات. فەرەنسا وەک ئاماژەیەکی نییەت باشی بۆ تاران داوا لە ڕەجەوی و هەڤاڵانی دەکات فەرەنسا بەجێ بهێڵن. بەڵام ئەم کرانەوەیەی فەرەنسا و

ئێران تەمەن درێژ نابێ و، دەرەنجامی زۆر مەزنی بۆ موجاهیدین لێ دەکەوێتەوە. چونکە کاتێک ڕەجەوی بەدوای وڵات و پەناگەیەکی تردا دەگەڕێت لە ئەوروپا ڕاستییەکی تاڵی بۆ ئاشکرا دەبێت کە ئەو لە هیچ وڵاتێکی ئەوروپادا جێگەی نابێتەوە. لەو کاتانەدا پێوەندی بەسەدام حوسێنەوە دەکات و ئەویش پشت و پەناگەی بۆ مسۆگەر دەکات. موجاهیدین لە ڕووی ڕەسمییەوە دەڵێن کە ئەرکەکەیان لە ئەوروپا تەواو کردووە و، ئێستا ڕۆئاوا بەتەواوی ڕووی ڕاستەقینەی ئایەتوڵڵا خومەینی دەناسێت. هەروەها ڕایدەگەیەنن بۆیە ڕەجەوی هەڤاڵانی خۆی دەهێنێتە عێراق تا لە گۆڕەپانی شەڕیان لە ئێران نزیک بن. بەڵام لە ڕاستیدا پاش پێنج ساڵ شکستهێنانی شۆڕشی کۆنترا ئاسای موجاهیدین ئەوان لە هەموو کاتێک زیاتر لە ئامانجەکانیان دوورتر بوون. هەر لە کاتی دەرکردنی ئەو بڕیارەوە قەبارەی بێ متمانەیی و گومانی گرووپەکانی تری ئۆپۆزسیۆنی ئێران و زۆربەی سیاسەتوانانی ڕۆئاوا ڕوو لە زیادبوون دەکات.

ڕۆژ بەڕۆژیش دابڕانی سیاسیی موجاهیدین زیاتر دەبێت. ئەوان لە مێوانداریی عێراق بوون لەو کاتەی شەڕێکی خوێناویی لە دژی هەمان ئەو وڵاتە بەرپا کردبوو گوایە موجاهیدین خەبات لە پێناو ڕزگارکردنی دەکەن. وەڵامدانەوەی موجاهیدینیش بۆ ئەو تاوانبارکردنانە تەنیا نەفرەت لێکردن و تاوانبارکردن بوو، کە بەشێکی ژیانی یاسر عیزەتی بوون. "ئەوانەی لەگەڵ ئێمە نین، دژی ئێمەن" موجاهیدین ئەمەیان بەیاسر دەگوت کاتێک باسی بەجێهێشتنی ڕیزەکانی موجاهیدینی دەکرد. ئەم دروشمەش وەک ئاشکرایە دۆستی زۆرت بۆ پەیدا ناکات.

# پشکی دووەم

## سوپای تایبەتیی سەدام حوسێن

"گوێ بگرە" یاسر پێم دەڵێت و قەڵەمەکەم لە دەست وەردەگرێت. بەچەند هێڵێک نەخشەی کەمپی ئەشرەفم بۆ دەکێشێت. "ئێرە دەروازەکەیە و لێرە خانەکانی خێزانەکانە کە من تیایاندا دەژیام". هەروەها نەخشەی گۆڕستانی شەهیدانی بۆم کێشا و قەڵاکانی پاسەوانان کە حکوومەتی عێراق لە دەوری ئەو کۆمەڵگە فرەوانەی دانابوون تا ڕۆژی ڕاونانیان لە لایەن هێزەکانی ئەمەریکاوە لە ئاداری ٢٠٠٣ دا. هەر لە نەخشەکەدا ئەو گۆشەیەم بۆ دەستنیشان دەکات لە کەمپەکە کە لە سەرەتای ٢٠٠٥ەوە بۆ ماوەیەکی درێژ، بەسەدان ئەندام لە ژێر پارێزگاریی ئەمەریکا دوور لە ٣٠٠٠ ئەندامی تر لە سەرکردە و دڵسۆزەکانیان دەستبەسەر کرابوون.

نەخشەکە زۆر سادەیە، بەڵام پاشان یاسر شتێکم بۆ ڕوون دەکاتەوە کە هیچ ئەندامێکی تری موجاهیدین نەیتوانیوە بۆمی ڕوون بکاتەوە، چونکە کەسیان بەتەواوی نەخشەی کەمپەکەیان نەدەزانی. لەبەرئەوەی کەمپەکە شوێنێک نییە مرۆڤ بۆ پیاسەیەک سەرێکی لێ بدات. بەڵام یاسر بەخوێنگەرمیی گەنجانەی خۆی ئەم کارەی بۆ من کرد. مرۆڤ ئەگەر لە شوێنێکدا ژیا دەتوانێ بزانێت شوێنی حەوانەوەی خۆی لە کوێیە و گۆڕستانەکە دەکەوێتە کوێ و مەشقەکان لە کوێ دەکرێن و سەرکردەکان لە کوێ دەحەوێنەوە. بەڵام کە بەئۆتۆمبیل بەو ڕێگەیەی تەک کەمپەکەدا دەڕۆیشتین ئەوەندەم نەبینی کە یاسر نەخشەکەی کێشابوو، ڕێگەکە بەغدا و ناوچە کوردییەکەی باکوری عێراق دەبەستێتەوە. شوێنی کەمپی ئەشرەف یەک سات بەئۆتۆمبیل لە بەغداوە دوورە و دەکەوێتە سنووری ناوچەیەکی بەپیتی نزیک ڕووباری دیجلە و بیابان و لە ساڵی ١٩٨٦دا بنکەیەکی سەربازیی کۆنی سوپای عێراق بوو، لەو شوێنەدا شارێک قیت کرایەوە نزیکەی ٥ تا ٧ هەزار کەسی لێ دەژیان و بەتەواوی لە جیهانی دەرەوە دابڕابوون. شوێنەکە دەکرێتە بنکەیەکی

سەربازی و هەر یەکەیەکی سەربازیی موجاهیدین لە نزیکەی ١٢٠ کەس پێک دەهێنرێت و هەر یەکەیەکیش چێشتخانە و ڕێستۆرانتی خۆی دەبێت. یەکەکان تێکەڵاون پیاو و ئافرەتیان تێدایە، بەڵام شوێنی حەوانەویان لێک جیایە و لە ڕێستۆرانتیش مێزەکان جیا کراونەتەوە. سەربازگەکە نەخۆشخانەیەک و گۆڕستانێک و چەندین نووسینگە و گەراجێکی ئۆتۆمبیل و بنکەیەکی وەرزشی و قوتابخانەیەکی لێیە. هەروەها هۆڵێکی مەزنی کۆنفرانسەکانی لێیە ٦ هەزار کەس دەگرێ. لە سەربازگەکە چەند پەیکەر و تەلارێکی بەناوبانگی عێراق کۆپی کراون بەڵام بەشێوەیەکی بچووکتر. بێگومان دامەزراوەی سەربازیشی لێیە چونکە کەمپی ئەشرەف شوێنی مەشقی موجاهیدینە لەسەر شێوازەکانی شەڕ.

ڕەجەوی لە ساڵی ١٩٨٦دا گەیشتە ئەوێ و زۆربەی موجاهیدینی خەلقی لە ئەوروپاوە لەگەڵ خۆیدا هێنا. لە پاش خۆی و بەمەبەستی بەردەوامبوون لەسەر ناونووسکردنی ئەندامی نوێ و سەرکردایەتیکردنی لایەنگران، ڕەجەوی گرووپێکی بچووک بەجێ دەهێڵێت. هەروەها ئەو ئەندامانەی لە ئێران بوون فەرمانیان پێ دەدرێت بێنە عێراق چونکە چالاکیی بەرگری لە ناو ئێران بوونی نەمابوو.

ئەو کات دایک و باوکی یاسریش لەو کەمپەدا بوون. ئەوانیش مەشقی سەربازی دەبینن و لە ١٩٨٧دا ڕەجەوی بەشانازییەوە ئەو سوپایە بەناوی لەشکری ڕزگاریخوازی نیشتیمانی (ل. ر. ن) پێشانی جیهان دەدات. هێزەکە پیاوانی بەبەرگی سەوزی سەربازی و ئافرەتانی بەسەرپۆشی سوور و کەسکەوە، بەتانک و زرێپۆش و ڕاجیمەی ئەمەریکایی و بەریتانی و ڕووسیی سوپای سەدام حوسێن لە کەمپی ئەشرەف نمایشی سەربازییان کرد. سەرکردایەتیکردنی ئەو سوپایە لە لایەن مریەم ڕەجەوییەوە سەرنجی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ڕادەکێشێت، هەروەها هەبوونی ڕۆڵێکی چالاک و بەرچاوی ئافرەتانیش لە نێو سوپاکەدا کە یەکەی تایبەت بەخۆیان هەبوو و ئافرەت سەرکردایەتییانی دەکرد. ئەو کاتە میدیای نێودەوڵەتی بەو کارەی موجاهیدین سەرگەرم بووبوو و یارمەتیدەری ڕەجەوی بوو ئەم پەیامە ئاراستەی مەلاکانی ئێران بکات: "ئەمەیە هێزی بەرگری کە دەبێت حیسابی بۆ بکەن."

دەبێ ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ لە کەمپێکی سەربازیی وەک ئەو کەمپە چۆن بووبێت.

ئاخۆ ئافرەتان چۆن لە ژینگەیەکی نێرینەی لەو جۆرەدا دەژیان. ژیانێکی تاڵ بوو، بەدفەڕ بوو، وەک میترا یوسفی دەڵێت، ئەو پرسیارەم لە کۆبوونەوەیەکی کۆنە ئەندامانی موجاهیدیندا لێ کرد. میترا لە ساڵی ١٩٩٤دا ڕێکخراوەکەی بەجێ هێشتبوو چوار کتێبی لە بارەی ئەزموونە زاخاوییەکەی traumatic خۆی لە عێراقدا نووسیبوو. کاتێک باسی ئەو ئەزموونە دەکات لە حەژمەتی ئەو کارانەی سەرکردەکان بەو گەلەیان کرد حاڵێکی دژوار دەیگرێت.

میترا دەڵێ لە کەمپی ئەشرەفدا ڕۆژی کار بەنوێژکردنی بەیانیان لە سات ٤ی بەیانی دەست پێ دەکات و پاشان خوێندنی ناوی ئامادەبووان و پاش ئەوە خواردنی بەیانیان. ئینجا کاتی کارکردن دەست پێ دەکات. "دەبوایە ئامێرەکان پاک بکەینەوە" میترا بەئاخ هەڵکێشانێکەوە قسەم بۆ دەکات "ئەمەش کارێکی قورس بوو، چونکە دەبوایە تانک و زرێپۆشەکانمان بەپەڕۆ پاک بکردایەتەوە تا دەبریسکانەوە". کە منیش سەرسوڕمانی خۆم بۆ ئەو قسەیە پێشان دا دووبارەی کردەوە و گوتی: دەبوایە تانکەکانیشمان ببریسکاندایەتەوە. من لە مەبەستی ئەو کارە ناگەم، بەڵام میترا دەزانێت و بەمن دەڵێت: "بۆ ئەوەی بێ کار نەوەستین".

بەردەوام کارێکت پێ دەکەن کە حەزت لێی نییە. کاتێ میترا داوا دەکات کارێکی تر بکات کە لێی شارەزایە داواکەی ڕەت دەکەنەوە. "من دەمویست خوێندن و نووسین بکەم کەچی کاری چێشت لێنانیان پێم سپارد". میترا دەبوایە چەند نۆبەتێک لە چێشتخانە کاری بکردایە بۆ ئامادەکردنی نانی بەیانییان و فراڤین و شێو بۆ یەکەی سەربازیی خۆیان کە ١٢٠ پیاو و ئافرەت بوون.

عەلی قەشقەوی کە لە ١٩٨٩دا لە ئێرانەوە دێتە کەمپی ئەشرەف قسەکانی میترا لە بارەی ئەو کەمپە پشتڕاست دەکاتەوە. عەلی بۆی ئاشکرا دەبێت ژیانی کەمپەکە تەنیایی زیاترە لە ژیانی خەباتی نهێنی کە لە ئێران دیبووی. عەلی بەتایبەتی ئەو کەشوهەوا سەربازییە ساردوسڕەی وەبیر دێتەوە، کە هەر لە بەرەبەیانەوە تاوەکو نیوەی شەو بەردەوامیی هەبوو. "لافیتەیەک لە شوێنەکەمان هەبوو کە هەموو ئەرکەکانی ڕۆژی لەسەر دیاری کرابوو. من تانکەکانم خاوێن دەکردەوە و چاودێریم دەکرد، ئەگەریش پاک بوونایە دەبوایە بەفڵچەیەکی ددان شووشتن مەکینەی

تانکەکەم پاک بکردایەتەوە ئەگەریش ئیشی تر نەبوایە ئەوا منیان دەنارده بیابان بۆ گیا هەڵکەندن".

مەگەر ئێمە باسی سوپایەک ناکەین کە دەبوایە ترسی بخستایەتە دڵی ئایەتوڵڵا خومەینی؟ پرسیار لە کۆنە ئەندامی تری موجاهیدین دەکەم کاریان لە کەمپی ئەشرەف چی بوو، زۆربەیان باس لە کاری وەک ژماردنی بزمار و لەم جۆرە کارانەی کاتی زۆریان دەوێت و مرۆڤ بێزار دەکەن. یەکێک لەوانەی لە مەشقێکدا بزمار دەژمێرێ پرسیار دەکات بۆچی دەبێت ئەم کارە بەدەست بکەین و پێشنیازی ئەوە دەکات کە یەک جار ١٠٠ بزمار بکێشن و کێشەکەی دیار بکەن و بەهۆی کێشان ژمارەی بزمارەکان دیاری دەکرێ و پرۆسەکە خێراتر دەبێت. لە ئەنجامدا خاوەنی ئەو پێشنیازە سەبارەت بەو داهێنانەی لە بیرکردنەوەدا سزا دەدرێت.

ئەندامێکی تر باسی ئەوەم بۆ دەکات کە ئەو بنکە سەربازییانەی موجاهیدین لە عێراق دایمەزراندوون بەردەوام لە گۆڕاندا بوون و هەمیشە یەکەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگوازرانەوە. موجاهیدین پسوولەیان هەبوو بۆ کارپێکردنی بێ سوود. چونکە ئەوسا جۆری کارەکە گرینگ نییە بگرە گرینگ سەرقاڵکردنی ئەندامانە بۆ ئەوەی بیر لە هیچ شتێک نەکەنەوە.

جگە لەوەش دەبوایە ئەندامی موجاهید لەسەر ئەوە ڕابهێنرێت کە مەسعود ڕەجەوی زۆر بەرز و نێزیکە لێی. چونکە مەسعود ڕەجەوی لە کاتی نانی نیوەڕۆ قسەیان لەگەڵ دەکات، ئەویش بەڕێگەی پەخشکردنی یەکێک لە وتارەکانی و لە کاتی نانی ئێوارانیش وتارێکی تری پەخش دەکرا و لە کاتی کۆبوونەوەی شەوانیش کاسێتی وتارێکی تری پەخش دەکرا. هەندێک جار موجاهیدین لە هۆڵی کۆنفرانسەکان کۆ دەکرانەوە بۆ ئەوەی لە پەخشێکی ڕاستەخۆدا چالاکییەکانی مریەم و مەسعود ببینن. ئا لەو کاتانەدا ئامادەبووان لەسەر پێ ڕادەوەستن و بانگ دەکەن "ئێران- ڕەجەوی، ڕەجەوی - ئێران" و چەپڵە لێ دەدەن.

وەک چۆن یاسر عیزەتی باسی کرد ژیانێکی ڕاستەقینەی خێزانی بۆ موجاهیدین لە کەمپی ئەشرەفدا نەبوو. میترا یوسف کە خاوەنی دوو منداڵ بوو پێمی گوت هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری دەویست تاوەکو منداڵەکانی خۆی دەبینی. منداڵان لەو کەمپە لە

جۆرە قوتابخانەیەکی تایبەتدا دەژیان و هەر لەوێش دەخەوتن. بۆیە خێزانەکانیان تەنیا ڕۆژانی پشووی هەفتە دەیانتوانی لە شوێنێکی تایبەت، کە بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کرابوو، بیانبینن. یاسریش بەهەمان شێوە دایک و باوکی خۆی -ئەشرەف و حەسەن-ی بەو شێوەیە دەبینی. "ڕێکخراوەکە نەیدەویست ئێمە زۆر یەکتری ببینین و هەر جارە و بەبەهانەیەک کۆتاییان بەکۆبوونەوەی ئێمە دەهێنا." چونکە ژیانی خێزانی ئەندامانی لە گرینگیدان بەئامانجی سەرەکیی ڕێکخراوەکە، کە مەسعود ڕەجەوی بوو، دوور دەخستەوە.

لەوەش زیاتر کە خێزانت هەبێت دەبێتە ئامانجی ئیرەیی چونکە ژمارەی پیاوان لە کەمپەکەدا لە ئافرەت زۆر زیاتر بوو. وەک یاسریش دەڵێ سەرەڕای هەموو چیرۆکەکانیان لە بارەی ئازادکردن و ڕزگارکردنی ئافرەتان هەتا ساڵی ١٩٨٩ ئافرەت لە نێو موجاهیدین وا تەماشا دەکرا کە دیارییەکە بۆ ئەو پیاوانە هەڵگیراوە کە کارەکانی خۆیان باش ئەنجام دەدەن. بەڵام ئەگەر ڕەجەوی لەو پیاوانە ڕازی نەبوو دەتوانێت بەئاسانی ئەو ئافرەتانەیان لێ بسێنێتەوە. ئەگەریش باسی بەڵێنەکان بکەین ئەوا لەوێ هیچ بەهایەکیان نەبوو. چونکە هاوسەرایەتیی نێو موجاهیدین لەسەر شێوەی سیغە بوو کە لە نێو شیعەکاندا باوە، ئەم هاوسەرییە بەئاسانی هەڵدەوەشێندرێتەوە. کەمبوونی ژمارەی ئافرەتان لە نێو موجاهیدین دەبێتە هۆی خراپ ڕاڤەکردنی یاساکانیان وەک میترا باسی دەکات: "بەڕەسمی لە یاسای موجاهیدیندا ئافرەت بۆی نییە مارە بکرێت تا نەگاتە تەمەنی ٢١ ساڵی، بەڵام لە ڕاستیدا کچانی تەمەن ١٦ساڵیش مارە دەکران."

شووکردنی مریەم بەڕەجەوی و "شۆڕشی ئایدیۆلۆجیایی"ی ساڵی ١٩٨٥ جەخت دەکەنەوە کە هەموو ئافرەتانی موجاهیدین لە ژێر دەستی ڕەجەویدان. ماوەیەکی کورت پاش گەیشتنی موجاهیدین بۆ عێراق، پێوەندیی سێکسی و سکپڕیش بەهەمان شێوە قەدەغە کران. چونکە بەبۆچوونی ئەوان منداڵان سوپا دوا دەخەن. میترا یوسفی گوتی هەموو ژنەکان حەبی نەهێشتنی سکپڕییان دەخوارد، ئەگەریش ژنێک بەهەڵە سکپڕ بایە ئەوا وەک کارەساتێک وابوو. "ئەوسا وتارێکی دووردرێژیان بەسەرتدا دەگوت کە زۆر سەرشۆڕکەر بوو. نەشدەکرا منداڵەکە لە بار ببرێ

لەبەرئەوەی ئیسلام ئەو کارەی حەرام کردووە". ژنەکە پاشان لە قوژبنێکی دابڕاوی کەمپەکەدا منداڵی دەبوو. "بەبێ چاودێریی تەندروستی. ڕێگەش نەدەدرا باوکی کۆرپەکە لەو کاتەدا ئامادە بێت. ژنان وەک سەگ مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرا".

گێڕانەوەی میترا زۆر لە پەیامە ڕەسمییەکەی موجاهیدین جیاوازە کە پەیامێکی زۆر ئافرەت دۆست بوو. لە ساڵی ١٩٨٦دا هەموو ژنان لە پیاوەکان بەرزتر کران، وەک ڕاستکردنەوەی تای تەرازووی ستەمکاریی سەدان ساڵەی دژ بە ژنان وەک موجاهیدین دەڵێن. «ئەو کات هەر نێرینەیەکی موجاهیدین مێیینەیەک بەرپرسی بوو».

پاش گەیشتنی ڕەجەوی بۆ عێراق چاودێرییەکەی توندتر کرد. ئەوسا دەبوایە ئەندامان لە دانیشتنەکانی "ڕاپۆرتدانی ڕۆژانەیان"دا ڕاپۆرتێک لە بارەی چالاکیی ڕۆژانەیان پێشکێش بکەن کە چییان کردووە و چی ماوە و بیریان لە چی کردووەتەوە و تەنانەت خەونیان بەچییەوە دیوە. ئەم دانیشتنانە ئامرازی گرینگ بوون بۆ کۆنترۆلکردنی ئەندامان و بەشێکی بنچینەیی ڕێبازی ڕەجەوین. لە پشکی داهاتوودا بەشێوەیەکی فرەوانتر باسی لێوە دەکەم.

لە کۆتاییی ساڵی ١٩٨٦دا ڕەجەوی دیموکراسی لە ناو دەبات، کە هەر لە سەرەتاوە کاری پێ نەدەکرا، ئەویش بەئاسانی کە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی ناردەوە ماڵ و ٥٠٠ ئەندامی دڵسۆزی خۆی لە جێگەی ئەوان دامەزراند. لەو کۆمیتەیەش ژنان پلەکانیان لە سەرووی پلەکانی پیاوانەوە بوو: لەبەرئەوەش ڕەجەوی ١٢ ئافرەت لە ئەنجوومەنی ناوەندیی سەرکردایەتی دادەمەزرێنێت. پاشان ١٢ ئافرەتی تر لەو ئەنجوومەنە ناوەندییە دادەمەزرێنێت.

بەپێی چیرۆکەکانی میترا یوسفی لە بارەی دەستکاریکردنی ژنان لە کەمپی ئەشرەفدا، ڕەنگە مەیلی ئەوەت هەبێ لە بیری خۆتی بەریتەوە کە کاتی گەیشتنی موجاهیدین بۆ عێراق شەڕێکی خوێناوی لەگەڵ ئێران هەبوو. هەر ئەو شەڕەش بوو وای لە سەدام حوسێن کرد بەباوەشی کراوەوە پێشوازییان بکات و سەربازگە و بنکەکانی خۆی بخاتە بەردەستیان. چونکە پیاوانی ڕەجەوی دەتوانن زانیاری لەسەر جموجۆڵ و ژمارە و پلانەکانی سوپای ئێرانی بۆ کۆ بکەنەوە.

بەدوای ئەو ئەندامانەدا دەگەڕام کە دەیانتوانی باسی ڕۆڵی موجاهیدینم لەشەڕی سەدام دژی مەلاکان بۆ بکەن. ئەو شەڕەی لە ١٩٨٠ەوە تا ١٩٨٨ درێژەی کێشا، بەهاوکاریی نهێنیی سەرۆکی ئەمەریکا، ڕۆناڵد ڕێگن، کە مەلاکانی پێ مەترسییەکی زۆر گەورەتر بوو لەو دیکتاتۆری عێراق کە گەلی خۆی تەپەسەر دەکرد.

لە تاران چاوم بەهەریەک لە سەمەد نەزاری و حوسێن فورقانی کەوت کە هەردووکیان بووبوونە دۆستی یەکتری لە پاش ئەوەی کە ڕیزەکانی موجاهیدینیان بەجێ هێشتبوو. دیار بوو موجاهیدین سوودیان لە هەردووکیان وەرگرتبوو لەو ئۆپەراسیۆنە سەربازییانەی بۆ یارمەتیی سەدام حوسێن ئەنجام دەدران. نەزاریش ئەو چالاکییانەی باش لە بیرە. "من فەرماندەی یەکەیەک بووم کە کاری کۆکردنەوەی ئەم جۆرە زانیارییانە بوو." سەمەد نەزاری لە ساڵی ١٩٨٥ لە ئێرانەوە هاتبوو بۆ کوردستانی عێراق و پێوەندیی لەگەڵ موجاهیدیندا کردبوو و پاش ساڵێک دەچێتە لای ڕەجەوی لە کەمپی ئەشرەف. پاش ئەوەی لە چەند پلە و پایەیەکی بەرز لە کۆمیتەی ناوەندیدا کار دەکات لە ساڵی ١٩٩٢ موجاهیدین بەجێ دەهێڵێت. لە دانیشتنێکماندا لە تاران پێم دەڵێ: "سەرەڕای ٣٥ ئۆپەراسیۆنی سەربازیم لە دژی ئێران" بەئاسوودەیی وەک دوکاندارێک لە زێدی خۆی لە باکوری ئێران ژیان بەسەر دەبات. بەپێی قسەکانی نەزاری ئەو زانیارییانەی یەکەگەلی وەک یەکەکەی ئەو کۆیان دەکردەوە بۆ شەڕەکە زۆر گرینگ بوون. "سەیری من بکە وەک بەڵگەیەکی زیندوو. زانیارییەکانی ئێمە یارمەتیی عێراقییەکانی دەدا بڕیار بدەن. ئێمە زانیاریی گرینگمان پێ دەدان. چونکە لەو کاتانە سەدام داوای یارمەتیی موجاهیدینی دەکرد کە پێی وابوو خەریکە لەو شەڕەدا دەدۆڕێنێ. ئەو کارەمان ناپاکیی سیاسی بوو، ئێمە وڵاتی خۆمان دەفرۆشتە سەدام حوسێن".

موجاهیدین لە ماوەی نێوان ١٩٨٦ – ١٩٨٨دا چەند جۆرە هێزێکی سەربازییان لەسەر سنووری ئێران چالاک بوو و لە چەندین شوێنی دەڤەرەکەدا ئێزگەی گوێ هەڵخستنیان هەبوو کە پڕبوون لە ئامێری عێراقی. بۆ ئەوەی بتوانن لە ناو ئێران بەبێ ئەوەی بناسرێن زانیاری کۆ بکەنەوە جلوبەرگی سەربازی ئێرانییان دەپۆشی یاخۆ خۆیان وەک خەڵکی ناوچە سنوورییەکان پێشان دەدا. "ئێمە پێوەندیمان

بەسەربازە ئێرانییەکانەوە دەکرد و تا بۆمان دەکرا قسەمان لەگەڵیاندا دەکرد تاوەکو قایلمان دەکردن ڕێگەمان بدەن وێنەی شوێنەکان بگرین. جاری واش هەبوو قایل نەدەبوون و ئێمە بەدیل دەمانگرتن و زانیاریمان لێیان وەردەگرت. تەنانەت بارەگایەکی نهێنیمان لە ناو خاکی ئێراندا هەبوو. ئێمە تەنیا زانیاریی سەربازیمان کۆ نەدەکردەوە بگرە زانیاریی ئابووریش وەک دیاریکردنی شوێن و پێگەکانی پاڵاوگە نەوتییە نوێیەکان."

بەبۆچوونی نەزاری پرسیاری گرینگ لێرەدا ئەوەیە ئایا ئەو هاوکارییە زۆر پێویست بوو یان نا؟ چونکە کاتێک سەدام بەرەو دۆڕان بوو لە شەڕەکەدا سەرۆک ڕۆناڵد ڕێگن فەرمانی دا CIA نەک تەنیا چەک و تەقەمەنی بگرە وێنەی مانگە دەستکردەکانیش لە بارەی پێگە و جموجۆڵی سوپای ئێرانی پێ بدەن. بەڵام وەک بۆم دەرکەوت زانیارییەکانی موجاهیدینیش ڕۆڵێکی گرینگیان لە ڕێڕەوی شەڕەکەدا هەبووە کە سەدام نەیدەتوانی تێیدا سەربکەوێت. سەدام بەو هەموو زانیارییانەی دەستی دەکەوتن دەیزانی ڕێک لە کوێ گازی ژەهراوی بەکار بهێنێت بۆ لەناوبردنی سەربازە هەرزەکارەکان کە ئێران بەکاریانی دەهێنا و ئامادەبوون لە پێناو خوا و نیشتیماندا خۆیان بەکوشت بدەن.

پێم سەیر نییە کە نەزاری دەڵێت ئەو هاوکاریکردنەی عێراق لە لایەن موجاهیدینەوە چقڵێک بوو لە چاوی ئەو موجاهیدانەی ئاگەداری ئەو جۆرە هاوکاریکردنە بوون. "بڕوامان بەسەدام و سیاسەتەکانی نەبوو. ئەو شەڕی دژی برایەکانمان لە ئێران دەکرد. هەر ئەو هۆیەش بوو پاشان پاڵی بەزۆر کەسەوە نا ڕیزەکانی موجاهیدین جێ بهێڵن". ئەو جۆرە کەسانە دەهاتنە عێراق بۆ ئەوەی بتوانن لەوێوە دژی ڕێژیمی خومەینی شەڕ بکەن، نەک بۆ ئەوەی بەدرێژاییی ساڵ لە شەڕێکی خوێناویدا لەگەڵ دوژمن شەڕی هاونیشتیمان و خزم و کەسوکار و دراوسێکانیان بکەن.

ڕەجەوی دەیویست بەوە هاوڕێکانی قایل بکات کە سەدام حوسێن پاداشتی چاکیان دەداتێ بۆ ئەو ئۆپەراسیۆنانەی مشتومڕی زۆریان دەنایەوە. ڕەجەوی زۆر جار بەیاوەرانی دەگوت "ئەگەر لەگەڵ عێراقییەکان کارمان کرد لە بەرامبەردا

ئەوانیش یارمـــەتیـــمـــان دەدەن و چەک و تفـــاقی زیاترمـــان دەدەنێ." لە بارەی بەکارهێنانی گازی ژەهراویش لە شەڕەکاندا، ڕەجەوی توانیی خەڵکی خۆی قایل بکات کە عێراق نییە ئەو کارە دەکات بگرە مەلاکانی ئێرانن دەیکەن.

ئەم "تاوانەی" مەلاکان چەندین ساڵ لە ناو موجاهیدیندا باس دەکرا. زۆر لەوانەی ڕیزەکانی موجاهیدینیان بەجێ هێشتبوو ترس و باوەڕنەبوونی خۆیان دەردەبڕی، کاتێک کە لە ناو موجاهیدینەوە دەهاتنە جیهانی دەرەوە و دەیانزانی ئەوان یارمەتیی سوپایەکیان داوە گازی ژەهراویی دژی گەل و نیشتیمانی خۆیان بەکار هێناوە و ئەو تاوانەشی بەیارمەتیی زانیارییەکانی موجاهیدین کردووە.

شەڕی عێراق ئێران دەرفەتێکی بۆ موجاهیدین ڕەخساند تا ڕێزەکانی خۆیان بەژمارەیەک لە دیلە ئێرانییەکانی شەڕ دەوڵەمەند بکەن. لە کۆنفرانسێکی کۆنە ئەندامانی موجاهیدیندا لە پاریس چاوم بەیەکێک لەو دیلانە بەناوی ئیدوارد کەوت کە مەسیحییەکی ئێران بوو. ناوبراو بۆمی باس کرد: "لە عێراق گەورە بەرپرسانی موجاهیدین دەهاتنە ئەو کەمپانەی ئێمە لێیان زیندان کرابووین. جلوبەرگیان پێمان دەدا و ئێمەیان دەبردە کەمپی ئەشرەف. من هیچم لە بارەیانەوە نەدەزانی و پیم وابوو ئەوان ڕزگاریخوازن."

ئەو کاتە ئیدوارد ٩ ساڵ بوو وەک دیلی شەڕ لە کەمپێکدا ژیانی بەسەر بردبوو، دۆخی نائومێدی کاری لە دەروونی کردبوو. بەگوتەی ئیدوارد نزیکەی هەزار دیل بڕیاریان دا بچنە پاڵ موجاهیدین بۆ ئەوەی لە دەردەسەریی ژیانی نێو کەمپی دیلەکان ڕزگاریان بێت. بەلام بۆ ڕەجەوی ئەمە ڕێگەیەکی ئاسان بوو بۆ ئەوەی ژمارەی سوپا ڕزگاریخوازەکەی خۆی بەسەربازی خاوەن ئەزموون زیاد بکات.

ئەم هاوکارییەی ئەمەریکا و موجاهیدین بۆ سەدام، خومەینیی لە گۆشەیەک پەستا تا ناچار بوو لە هاوینی ١٩٨٨دا پێشنیازی ئاگربەست بۆ سەدام بکات. قوربانییانی شەڕ لە هەردوو لا ژمارەیان بەسەدان هەزار بوون. کەچی مەسعود ڕەجەوی بەتوندی دژی ئەم ئاگربەستە بوو. چونکە ئەو لەوە دەترسا ئاشتی یارمەتیی خومەینی بدات خۆی بەهێزتر بکات و لە ئەنجامدا ئەستەم ببێت ئەو بتوانێ لە خاکی عێراقەوە هێرش بکاتە سەر ئێران. بۆیە مۆڵەت لە سەدام حوسێن وەردەگرێت بۆ ئەوەی

هێرشێکی گەورە بکات بەر لەوەی سەدام بەڕەسمی ئاگربەستەکە مۆر بکات.

موجاهیدین ئۆپەراسیۆنێکی سەربازیی مەزن ئەنجام دەدات بەناوی ڕووناکیی هەتاهەتایە و تووشی شکستێکی مەزن دەبێت. ئەوان بەهاندانی مەسعود ڕەجەوی کە لە ئارامیی بنکەی سەرکردایەتییەوە قسەی دەکرد سەرگەرم دەبن و بەهێزێکی ٥ هەزار سەربازی هێرشیان کردە سەر ئێران و توانییان چەند سەد کیلۆمەترێک بچنە ناو قووڵاییی خاکی ئێرانەوە بەر لەوەی ئێرانییەکان ڕایان بکێشنە ناو بۆسەیەک. لە ئەنجامدا هەزار یان ڕەنگە نزیکەی ٣ هەزاریان دەکوژرێن. ئەکرەمی دایکی یاسری تەمەن ٨ ساڵانیش لە نێو کوژراوەکان بوو.

پاش ئۆپەراسیۆنی ڕووناکیی هەتاهەتایە موجاهیدین تووشی حەپەسان دەبن. ئەوانەی لە شەڕەکە ڕزگاریان بوو برینەکانی خۆیان تیمار دەکرد و خەمی هاوڕێ کوژراوەکانیان دەخوارد. بەڵام ڕەجەوی بواریان ناداتێ خەمیش بخۆن. بگرە دەستبەجێ دەیانخاتە گەڕ و ئاهەنگیان بۆ ساز دەکات بۆ ئەوەی "سەرکەوتنە مەزنەکەیان" بەجیهان ڕابگەیەنێت. ئەو ئەندامانەی هاوسەرەکانیان لەو شەڕەدا لە دەست دا فەرمانیان پێ دەدرێت دووبارە هاوسەر بۆ خۆیان بگرن. باوکی یاسر نەیتوانی هاوسەرێکی نوێ بۆ خۆی پەیدا بکات.

لە حوزەیرانی ١٩٨٩دا ئایەتوڵڵا خومەینی دەمرێ. ئەمەش دەبێتە نیشانەی کۆچکردنی دوژمنی تایبەتیی ڕەجەوی، ئەو پیاوەی هەموو ڕک و کینەی موجاهیدینی ئاراستە دەکرا. ئەمەش بۆ ڕەجەوی کاتێکی ناخۆش دەبێت: ساڵانی ساڵە ئەو و هەڤاڵانی باسی ڕێژیمی ستەمکاری خومەینیان دەکرد. ئەوان نەیاندەتوانی خۆیان لە خومەینی کە سومبولی خراپە بوو لە لای ئەوان دوور بکەنەوە.

ئەو کۆچکردنە کۆتایی هێنان بوو بەباروودۆخێکی ئێستا status quo، یاخۆ بەو واتایەی کە هەردوو پیاو بەسوود وەرگرتن لە یەکتری توانییان دەسەڵاتی خۆیان بپارێزن. من گەیشتمە ئەو باوەڕە کە هەردوو لا سوودێکی زۆریان لە دوژمنایەتیی نێوانیان وەرگرت، بگرە بەوپەڕی تواناوە هەوڵیان دەدا ئەو دوژمنایەتییە بمێنێت، یان قووڵتری بکەن. ئەم حاڵەتە لە بارەی ڕەجەوەی زۆر ئاشکرا و ڕوون بوو. چونکە دڵڕەقیی ڕێژیم ئەو هەموو کوشت و کوشتارەی لە ڕێزەکانی لایەنگرانی موجاهیدین

کرا بەشێوەیەکی پێکەنیناوی یارمەتییانی دەدا ئەندام و لایەنگری نوێ ناونووس بکەن. هەروەها ئەو بارە شادەماری ژیان و مانەوەی ئامانجەکانی ڕێکخراوەکە بوو.

بەڵام بۆ ئێرانییەکان گەفوگوڕی موجاهیدین لە هەندەران و پەلامارەکانیان لە دژی نیشتیمانی دایک تەنیا جێ پێی خومەینییان خۆشتر و قایمتر کرد. تینوویەتیی ڕەجەوی بۆ دەسەڵات و هەژموون ڕێگەی نەدا ئۆپۆزسیۆن خۆی یەک بخات و لە ئەنجامدا ببێتە هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە بۆ سەر ڕێژیمی دەسەڵاتدار.

خۆشبەختانە ئەو بارودۆخەی ئێستای بەتەمابوو کۆتاییی پێ بێت دیسان بەهاتنی جیگرەوەی خومەینی، خامینەئی - کە ئەویش لە پەلامارێکی موجاهیدیندا بەسەختی بریندار بووبوو - بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو درێژەی پێ درا.

لەو کاتەی دەنگوباسی مەرگی خومەینی دەگاتە ڕەجەوی، ئەم خەریکی درێژەدان بەفرەوانکردنی تیرەکەی خۆی دەبێت. ڕەجەوی سەرقاڵی دانانی بەشی داهاتووی "شۆڕشی ئایدیۆلۆجیایی" دەبێت. ئەم بەشە، کاریگەریی گرینگی لەسەر ژیانی یاسری منداڵ دەبێت. یاسر لە وەتەی دایکی کوژرابوو بەدەگمەن باوکی خۆی دەبینی، لە کاتی پێڕەوکردنی بەشی نوێی ئایدیۆلۆجیاکە بەتەواوی لە باوکی دای دەبڕن.

ڕەجەوی بەئەنقەست ئەم قۆناغەی پلانەکانی خۆی زەحمەت کردبوو و بەشێلوویی داڕشتبوو. یەکەم کار لەو قۆناغە ئەو "هاوسەرکردایەتییەی" کە لەگەڵ "هاوسەرێتییەکە" هاتبووە ئاراوە هەڵدەوەشێندرێتەوە. ڕەجەوی نێوی "سەرکردەی ئایدیۆلۆجیی باڵای بەرگریی ئێران" بەخۆی دەبەخشێت، واتە نەک تەنیا سەرکردەی موجاهیدین، بگرە ئەمجارەیان فەرماندەی سوپای ڕزگاریخوازی نیشتیمانی و سەرۆکی ئەنجوومەنی نیشتیمانیی بەرەنگاریشە. مریەم ڕەجەوی دەبێتە ئەمینداری گشتیی نوێی موجاهیدینی خەلق. ڕەجەوی خۆی دەباتە سەرووی هەمووان و هەر بۆیەش بۆ هیچ کەسێک لە ئەندامە ئاساییەکان نییە لەمەو دوا باس لە کار و کردەوەکانی بکات.

لە تشرینی یەکەمی ١٩٨٩، کاتیک باوکی یاسر و ئەندامانی تر چەندین شەو لەگەڵ یەکتری تا درەنگانی شەو تاوتوێی دەرەنجام و کارتێکردنەکانی ئەم گۆڕانکارییە نوێیانەیان دەکرد پێشهاتێکی تری نوێتر لێیان زیت دەبێتەوە. پێیان

دەگوترێ شکستهێنانی ئۆپەراسیۆنی ڕووناکیی هەتاهەتایە خەتای ئەوان بوو لەبەرئەوەی بەتەواوی خۆیان بۆ ئۆپەراسیۆن و بۆ سەرکردە تەرخان نەکردبوو. ئەمەش لەبەرئەوەی هاوسەرەکانیان و ئارەزووە سێکسییەکانیان بوونە کۆسپێک لە نێوان ئەوان و سەرکردەیان. بەم شێوەیە خێزاندارەکانی نێو موجاهیدین فەرمانیان پێ دەدرێت جووت جووت لە بەردەم هەڤالانی تردا ئەنگوستیلەکانیان تەسلیم بەیەکتری بکەنەوە و بەتوندیش سەرزەنشتی یەکتری بکەن. هەر لەو ڕۆژەوە سێکس بەهەموو شێوەیەک لە ناو موجاهیدیندا قەدەغە دەکرێت.

بەڵام بەرهەڵستکاری بۆ ئەم ڕێسایە زۆر فرەوان دەبێت و دوو هاوسەر دەستبەرداری ئەو کارە بێ سوودە دەبن و بەبێ ئەوەی لەگەڵ یەکتری قسە بکەن گۆڕەپانەکە چۆڵ دەکەن و لە شوێنی حەوانەوەی خۆیاندا مان دەگرن. بەڵام بەرپرسەکانیان دەتوانن ڕایان بگۆڕن و لە ژوورەکانیان بیانهێننە دەر و بەم شێوەیە پاڵەپەستۆ بۆ سەر ئەوانی تر بهێنن بۆ ئەوەی ڕێساکە جێبەجێ بکەن. هەر کەسێکیش کە قایل نەبێت فەرمانەکە جێبەجێ بکات هەموو ئەندامانی تر وەک گولێک خۆی لێ دوور دەکەنەوە و ئابڵووقەی دەخەنە سەر.

میترا یوسفی بۆم باس دەکات چۆن پاڵەپەستۆیان خستە سەری ئەو کارە بکات و ئەو گوێڕایەڵ نەدەبوو. "چوومە لای بەرپرسەکەم و پێم گوت: خەڵکی ئێران گەر بەم کارەیان زانی چی دەڵێن؟ ئێ خۆ تەڵاقدان هەمیشە شتێکە نەرێنییە. من چی تر نامەوێ وەک ئەندامێک بمێنم".

ڕۆژی دواتر مێردەکەی ئەنگوستیلەکەی بۆ دەگێڕێتەوە. کە هەر گوێڕایەڵ نابێت دەیبەنە شوێنیکی تایبەت. "لەوێ پیاو و ئافرەتێکی لێ بوو. هەردووکیان ئەندامی پلە بەرز بوون. ژنەکە دەستی بەلێدانم کرد تا هەموو شوێنیکی جەستەمی ڕەش و شین کردەوە. ئەو ژنە دیاربوو بەتایبەتی بۆ لێدانی ژنان ڕاهێنرابوو، چونکە لە ڕێکخراوەکە نەدەبوو پیاو و ئافرەت دەست لە یەکتری بدەن. لە کاتی لێدانەکەدا لەچکەکەم کەوتە خوار بۆیە پیاوەکە لەو شوێنە نەما. ئەو بۆی نەبوو قژم ببینێ بەڵام بۆی هەبوو کە بەلێدان دەمشێلن تەماشام بکات!"

ئەندامەکانی تر کە گوێڕایەڵی ئەم فەرمانە نەبوون لەو زیندانانەی هەر نەیاندەزانی

هەن، لەنگەریان گرت. تەنانەت ژنانی سکپڕ و هاوسەران لەگەڵ منداڵەکانیان خرانە زیندانەوە. لە نێو زیندانییەکاندا موجاهیدینی پلە بەرزیش هەبوون و هەندێکیان پاش ئەوە بڕیاریان دا بچنە کەمپێکی خراپی ئاوارە کوردەکانی ئێران لە ڕومادی و لەگەڵ موجاهیدین نەمێننەوە.

یەکێک لەوانە هادی شەمس حایری بوو کە قایل نەبوو هاوسەرەکەی تەڵاق بدات هەرچەندە خێزانەکەی قایل بووبوو بڕیارەکە جێبەجێ بکات و لە ئەنجامدا کرایە بەرپرسی مێردەکەی. "ژن زۆر بوون بۆچی دەبێت خێزانی خۆم تەڵاق بدەم؟ خەڵک دەیانگوت ڕەجەوی بەدوای ژناندا دەگەڕێت. کەچی لە وەڵامی ئەم قسانە بەئێمەیان گوت "ئەمانە بیری چەپەڵن. ئەوەی دەیکەین هەنگاوێکی پێویستە لە شۆڕشەکەمان بۆ ئەوەی یارمەتیی ئافرەتان بدەین پلە و پایەی بەرزتر وەربگرن".

سەرکردەکان توانییان هاوسەری حایری قایل بکەن خۆی تەڵاق بدات و بەشی حایریش بۆ ماوەی سێ مانگ ژوورێکی زیندان بوو بەر لەوەی لە ساڵی ١٩٩٢دا بەڕێگەی کەمپی ئاوارەکان لە ڕومادی خۆی بگەیەنێتە هۆڵەندا.

ئەندامە لێدراوەکان ناچار دەبن دەستبەرداری بەرهەڵستکاری خۆیان بن، کاتێک لە سەروبەندی سەپاندنی ئەو بڕیارەدا ڕێکخراوەکە بڕیارێکی تر دەدات و منداڵەکانیشیان لێ دوور دەخاتەوە. لە کاتی شەڕی کەنداودا بەسەدان منداڵی موجاهیدین و لەوانەش یاسر عیزەتی، بەڕێگەی ئوردن دەنێردرێنە ڕۆئاوا.

پاش ئەو کارە موجاهیدین فرەوانترین شەپۆلی دەست لە کار کێشانەوە بەخۆوە دەبینێت. پاش ئەوە کۆنە ئەندامەکان لە دەرەوەی ڕێکخراوەکە زاریان دەکرێتەوە و باسی بەسەرهاتی خۆیان دەکەن. موجاهیدینیش پاڵەپەستۆی زیاتر و زیاتر بەکار دەهێنێت بۆ ئەوەی ئەندامەکانی خۆی ڕابگرێت و سەری سۆلینەکە قایمتر بکات. جاری وا هەبوو خەڵکیان بەساڵان زیندان دەکرد و کەسانی وەک حەسەنی باوکی یاسر پاسەوانی دەرگەی زیندانیان بوون.

کەشوهەوای سیاسی لە عێراقدا بەرەو گۆڕان دەچێ. لە ئابی ١٩٩٠دا سەدام قومار بەپشتیوانیی ئەمەریکا دەکات و کوێت داگیر دەکات. ئەمەریکاییەکانیش هەڕەشەی بەکارهێنانی هێز دەکەن ئەگەر دەستبەجێ نەکشێتەوە.

ئاشکرا بوو پێوەندیی نێوان سەدام و مەسعود ڕەجەوی توندوتۆڵ بووبوو، بەڵام ئایا ئەو کاتە سەدام توانیویەتی داوای یارمەتی لەم دۆستە چاکەی خۆی بکات کە ئاشکرا بوو ئەو سەرکێشییەی خەریکە بەخێرایی ڕووەو ماڵوێرانیی دەبات. محەمەد حوسێن سوبحانی، کە ئەوکات ئەندامێکی دەستەی پاسەوانانی ڕەجەوی بوو و بێگومان لە سەرچاوەی بڕیارەوە نزیک بوو، بەبەڵێ وەڵامی ئەو پرسیارەی دایەوە.

سوبحانی دەڵێت: "کە سەدام کەوتە ژێر پاڵەپەستۆی ئەمەریکاییەکان بۆ ئەوەی لە کوێت بکشێتەوە داوای یارمەتیی لە ڕەجەوی کرد. بەڵام ئێمە تەنیا لە ڕووی لۆجیستییەوە دەمانتوانی یارمەتیی بدەین و یارمەتیمان دا لە گواستنەوەی دیلە کوێتییەکان بۆ عێراق. سەدامیش بەمە قایل بوو".

کە ئەمەریکاییەکان لە کانوونی دووەمی ١٩٩١دا عێراقیان بۆمباران کرد بۆ ئەوەی سەدام ناچار بکەن لە کوێت دەربچێت ڕەجەوی، سوبحانی دەڵێت، بەهانای دۆستەکەیەوە دێت. "چونکە ئامانجە ستراتیجییەکانی هەردوو لا لەو بارەیەوە یەکیان دەگرتەوە". پاش ئەوە خۆپێشاندانەکانی شیعە و کورد لە باشوور و باکوری عێراق هەڕەشەیان لە سەدام کرد. "ئەوەی گرینگ بوو لای ڕەجەوەی ئەوە بوو ئۆپۆزسیۆنی عێراقی – لەوانە سەرکردەکانی کورد تاڵەبانی و بارزانی و سەرکردەی شیعەکان ئایەتوڵڵا ئەلحەکیم – پێوەندییان لەگەڵ ئێراندا هەبوو." بۆیە بەبۆچوونی ئەو سەرکەوتنی ئۆپۆزسیۆن مانای کۆتایی هاتنی پەنادانی ڕەجەوی بوو لە عێراقدا.

هاوکاریکردنی سەدام لەو کاتانەدا تا چ ڕادەیەک بوو؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە کاسێتگەلێکی ڤیدیۆییدا دەدۆزمەوە پاش گرتنی بەغدا لە ٢٠٠٣دا کەوتنە بەردەستان. وەک دیارە لەو کاسێتانە موخابەراتی عێراقی وێنەی چەند کۆبوونەوەیەکی نێوان بەرپرسانی پایە بەرزی موجاهیدین و بەرپرسانی عێراقییان بەکامیرایەکی نهێنی گرتووە، بەهەمان شێوەش وێنەی کۆبوونەوەکانی نێوان ڕەجەوی و یاوەرانی سەدامیان گرتبوو. لەو کاسێتانەدا دەبینرێت موجاهیدین جانتایەکی پڕ لە دۆلار و جانتایەکی تریش پڕ بەڵگە و دۆکیومێنتە مۆرکراوەکانی ڕێککەوتنەکەیە لە بارەی ئەو چەکانەی موجاهیدین سەدام بەموجاهیدینی دەدات، وەردەگرن.

له کاسێتێکی تریشدا، ڕەجەوی لەگەڵ سابیر کە گەورە ئەفسەرێکی سەدامە و ڕەجەوی لە وەڵامی ستایشی ژەنەراڵەکە بۆ ئەو یارمەتییەی ڕەجەوی بۆ عێراق لە شەڕی کەنداودا پشتگیریی خۆی بۆ سەدام حوسێن دەردەبڕێ. ڕەجەوی لەو کاسێتەدا دەڵێت: "پێم وایە پێوەندییەکانمان تەنیا سیاسی نین" و باسی پێوەندیی برایانەی خۆی و سەدام دەکات و پاشان دەڵێ: "ئەوەی دژی ئێوەیە دژی ئێمەیە و بەپێچەوانە. ئاسایشی هەردوو لامان یەکە. کە گوررزێک لە ئێوە دەدرێت ئەوە لە هەردوو لامان دەدرێت." هەروەها دەڵێ پێویست ناکات سەدام سوپاسی بکات بۆ یارمەتییەکە چونکە: "بەرژەوەندیی هەردووکمان وەک یەکە و تێکەڵ بەیەکترە". هەروەها بەژەنەراڵەکە دەڵێت: "بەسەدام ڕابگەینە کە ئێمە لە ماڵی ئێوەین و هەر لەگەڵتان دەبین و تا دەسەڵاتمان هەبێت لاتان دەمێنینەوە". سوپاسگوزاریی سەدام لە جێی خۆیدا بوو. ئەگەر تا ئێستا گومانم مابێت لەبارەی ڕۆڵە گرینگەکەی موجاهیدین لە شەڕی دژ بەئێران، ئەو گومانانە پاش دەرپەڕاندنی سەدام لە کوێت و سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی عێراق دەبن بەڕاستی. بگرە لەوەش بەهێزتر: ئەگەر پشتگیریی موجاهیدین نەبوایە خەڵکی ڕاپەڕیو سەدامیان لەسەر حوکم لادەبرد.

ئاژانسی دەنگوباسی موجاهیدینی ئێران ئاماژە بۆ ئەو قسانە دەکات و بە"درۆی شاخدار" ناویان دەبات. بەڵام من ئەو قسانەم بەدیمانەکانم لەگەڵ هاووڵاتییان و سەربازانی عێراقی پشت ئەستوور دەکەم کە لە نزیکەوە ئاگەداری پشتگیریی موجاهیدین بوون بۆ سەدام لە کاتی ڕاپەڕینەکە، هەروەها بەقسەکانی کۆنە ئەندامانی موجاهیدین کە ڕاستەخۆ دەستیان لەو ڕەوشەدا هەبوو. ئەگەر موجاهیدین نەبوونایە کورد دەیانتوانی لە ١٩٩١دا بگەنە بەغدا و شیعەکانیش دەیانتوانی پێشڕەویی خۆیان تەواو بکەن و بگەنە بەغدای پایەتەخت، ئەمەش دەبووە هۆی ڕووخاندنی ڕێژیم لە ساڵی ١٩٩١دا. سوپاس بۆ موجاهیدین سەدام توانیی ١٢ ساڵی تر لەسەر دەسەڵات بمێنێتەوە. هەر بۆیە شتێکی لە ناکاو نەبوو کە لە ساڵی ٢٠٠٧دا وەزارەتی دادی عێراقی بڕیاری دا ڕێکخراوی موجاهیدین ڕاونرێن لەبەر "ڕۆڵی ئەو ڕێکخراوە لە کوشتنی هاووڵاتییانی عێراقیدا."

بێگومان ئەمەریکاییەکان ئەوسا ڕۆڵێکی دوولایەنەیان گێڕا، لە لایەک ڕێگەیان دا

سەدام حوسێن کۆپتەرەکانی بەکار بهێنێت، ئەویش لە دژی خەڵکی ڕاپەڕیو بەکاری هێنان. بەڵام یارمەتییەکەی موجاهیدین زۆر لەوە گرینگتر بوو.

وێنەکانی شەڕی کوێت: ئەمەریکاییەکان هێرشیان کردە سەر سوپای سەدام حوسێن لە کوێت ئەویش ڕێگەی بەغدای گرتە بەر. لەو کاتەدا هاوپەیمانان ئاگربەستیان پێشکێش بەسەدام کرد. پاش ئەو ئاگربەستە و لە ٢٨ی شوباتی ١٩٩١دا ڕاپەڕینی شیعەکان لە بەسرا لە سەرەتای مانگی ئادار دەست پێ دەکات. سوپای سەدام ئەوکات لەوپەڕی شپرزەییدا بوو، سەربازە کورد و شیعەکان هەڵدەهاتن و سوپاکە تووشی زەرەری مەزن بووبوو. بەڵام سەدام سەرکەوتووانە دەتوانێ هێزەکانی گاردی کۆماری لەگەڵ ئەو سەربازانەی لە کوێت ڕزگاریان بوو بەکار بهێنێت. بەگوتەی محەمەد حوسێن سوبحانی لە باشووری عێراق موجاهیدین کە هەر لەوێ بوون یارمەتیی لۆجستیی سەدام دەکەن. ئەندامانی تری موجاهیدین کە دیمانەم لەگەڵیاندا کرد قسەکانی سوبحانی پشتڕاست دەکەنەوە. سوبحانی دەگێڕێتەوە لەو هاوکاریکردنەدا تیمگەلی موجاهیدین کە لە سێ کەس پێک هاتبوون یەکێکیان زمانی عەرەبیی دەزانی، بەکار دەهێنران. "ئەم تیمانە چاودێریی ناوچەکانیان دەکرد و قسەیان لەگەڵ خەڵک دەکرد بۆ ئەوەی بزانن ئێرانییەکان هاتوونەتە نێو عێراق بۆ ئەوەی سەرکردایەتیی ئەو ڕاپەڕینە بکەن یان نا. ئێزگەی گوێگرتنیشمان هەبوون. هەموو ئەو زانیارییانەشمان دەدایە سوپای عێراق".

ئێرانییەکان دزەیان کردبووە ناوچەکانی باشووری عێراق بەڵام سەدام بەهاوکاریی ئەو زانیارییانەی لە موجاهیدینەوە بۆی دەهاتن توانیی لە شەڕێکی خوێناویدا ڕاپەڕینەکە کپ بکاتەوە. ئەوە بوو سەدان هەزار هاووڵاتیی شیعە خرانە گۆڕە بەکۆمەڵەکانەوە.

موجاهیدینیش لە باشوور قوربانییان دا. لە کەربەلا یەکەیەکی سەربازییان بەتەواوی لەناوبرا. سوبحانی لەو بارەیەوە دەڵێ: "نەمانتوانی لاشەکانیشیان بدۆزینەوە و پاش ماوەیەک گۆڕی بێ لاشە بۆ کوژراوەکان لە کەمپی ئەشرەف دیاری کران". بەبۆچوونی من ڕەنگە ئەو موجاهیدانەشی یارمەتیی سەدامیان دەدا لە کۆتاییدا لە یەکێک لە گۆڕە بەکۆمەڵەکانی سەدام حوسێندا گیرسابنەوە.

دەبێ ئەم کارە هەواڵگرییەی موجاهیدین کردی تا چەند بۆ ڕێکخراوەکەی ڕەجەوی گرینگ بێت؟ بەڕای من گرینگییەکەی دیار نییە. بەڵام لەوە گرینگتر ئەوە بوو ئەوکات سەدام دەیتوانی خۆی بۆ لێدانی شیعە ڕاپەڕیوەکان و دووبارە ڕێکخستنەوەی سوپاکەی تەرخان بکات، چونکە موجاهیدین لە باکور بەربووبوونە گیانی کوردەکان.

لەو کاتەی سوپای سەدام سەرقاڵ بوو لە باشوور، سەربازە کوردەکان، یاخۆ پێشمەرگە، بەبێ هیچ شەڕێک دەستیان بەسەر گوند و شار و شارۆچکە کوردەکاندا دەگرت، کاتێکیش سەربازانی سەدام یاخۆ گەورە بەرپرسانی دەهاتنە پێشیان یان دەکوژران یان شاربەدەر دەکران. سەربازان (مەبەستی پێشمەرگەیە – وەرگێڕ) بێگومان لە هەموو ناوچەکان پشتیان بەیارمەتیی هاوولاتییانی کورد گەرم بوو. بەڵام لە ڕۆیشتنیان بۆ بەغدا موجاهیدین دێنە پێش. ڕێڕەوی کوردان لە سنووری ناوچەی کورد کۆتایی دێت، ئەویش لە نزیک ناوچەکانی خانەقین و جەلەولا و دووز و کەرکووک و کفری و کەلار. موجاهیدین، کە ناوی ئەو ئۆپەراسیۆنەی خۆیانیان نابوو (مورڤەرید، واتە مرواری) بەگوتەی سوبحانی نزیکەی دوو هەزار چەکداری خۆیان هێنابووە گۆڕەپان.

لە کۆتاییی ٢٠٠٤دا سەردانێکی عێراقم کرد بۆ ئەوەی سەر لە گۆڕەپانی ئەو شەڕە بدەم و بەچاوی خۆم ببینم و دڵنیا بم کە ئەو ئۆپەراسیۆنە ئەوەندەی کۆنە ئەندامانی موجاهیدین باسیان لێوە دەکرد گرینگ بوو. کورد دەڵێن هێرشەکەی موجاهیدین بۆ سەریان لە ١٩٩١دا ڕێگرێکی لە ناکاو بوو، چونکە چەکدارانی ڕەجەوی تا ئەو کات بێلایەن بوون. ئەوەش وای لە کورد کرد ڕێگەی خالس – بەغدا بگرنە بەر، کە کەمپی ئەشرەفی لەسەر ئەو ڕێگەیەیە. چونکە بەمەزەندەی ئەوان ئەو ڕێگەیە بەرگریی کەمترە.

بەڵام موجاهدین بەشێوەیەکی زۆر توند خۆیان دەسەلمێنن. ئەمەش هەڵسەنگاندنی هەموو لایەنەکانی بەشداری ڕەوشەکەیە. گوندنشینە کوردەکانی زیان لێکەوتوو دوای ئەوە بە"جاشی تاوانباری سەدام حوسێن" وەسفیان دەکەن. موجاهیدین شەلم کوێرم جیاوازی لە نێوان هاوولاتی و پێشمەرگەدا ناکەن. پەلاماری شارەکان دەدرێت بەبێ ئەوەی بوار بدرێتە هاوولاتییانی سڤیل پەناگە بۆ خۆیان دابین بکەن. ئەگەر ڕایانیش

بکردایە ئەوا هەر دەکوژران. جگە لەوە موجاهیدینی باش مەشق پێ کراو بەتانک و دۆشکەکانیانەوە بەراورد ناکرێن لەگەڵ پێشمەرگەدا کە بەچەکی سووک چەکدار بوون. لە کەلار موجاهیدین بەرگی کوردی دەپۆشن و وێنەی تاڵەبانی بەرز دەکەنەوە و لاسایی هێزە کوردەکان دەکەنەوە. بەم شێوەیە بۆیان دەکرێ بچنە نێو قووڵایی ناوچە گوندنشینە کوردەکان و لە ئەنجامدا کۆتایی بەهەر ڕاپەڕینێک لەو ناوچەیەدا بهێنن. زۆر خەڵکی بێ دیفاع دەکوژرێن.

من دەمەوێ بزانم بۆچی موجاهیدین بەمجۆرە دڵڕەقییە ڕەفتار دەکەن. ئەوان هیچیان لەگەڵ کورددا نییە، یان هەیانە؟ ئەو کۆنە ئەندامانەی لەو شەڕانەدا بەشدار بوون بۆم دەگێڕنەوە کە پێیان گوترابوو ئەوان شەڕ لە دژی گاردی کۆماری ئێران دەکەن نەک لە دژی کوردی عێراقی. ئەو کوردانەی موجاهیدین بەدیلیشی گرتبوون بەپێشمەرگە ناو نابرێن بگرە بەجاشی ئێران. چونکە لە لای موجاهیدین ئەم کارە هیچ گومانێکی تێدا نییە: ئەمانە ئێرانین و هاتوونە بیانکوژن.

لە ڕاگەیەنراوە ڕۆژنامەییەکانی موجاهیدینی پاش ئەو ڕووداوانە، باس لە هاتنی حەفت فیرقەی سوپای ئێرانی کە ژمارەیان نزیکەی ٧ هەزار چەکدار بوو بۆ ناو خاکی عێراق بەمەبەستی لەناوبردنی موجاهیدین دەکرا. بۆیە موجاهیدین بەو توندییە شەڕیان دەکرد. ئەوان شەڕی مان و نەمانیان دەکرد.

کورد کە ڕووداوەکانی ئەوسا دەگێڕنەوە دان بەوەدا دەنێن کە ڕاستە لە ناوچەکەی ئەوانیش ئێرانییەکان دزەیان کردبوو و پارتە کوردەکان هاوکارییان دەکردن. بەڵام ژمارەی ئێرانییەکان زۆر لەو ژمارانە کەمتر بوون کە موجاهیدین باسی دەکەن. بەقسەی کورد ئێرانییەکان دەیانویست یارمەتیی ڕاپەڕینەکەیان بدەن بۆ ئەوەی پشێوی زیاتر بێت و لە ئەنجامدا دوژمنەکەیان سەدام حوسێن لاوازتر بێت. هەروەها لە سەرچاوە گشتییەکانی تریش نەمتوانی هیچ بەڵگەیەک بدۆزمەوە کە گوتەکانی موجاهیدین پشتڕاست بکەن کە گوایە ٥٠ هەزار ئێرانی لە ئاداری ١٩٩١دا سنووریان بەزاند و هاتنە ناو خاکی عێراق. کەچی کۆنە ئەندامانی موجاهیدین سوێندیان بۆ من دەخوارد کە بەچاوی خۆیان دەیانبینی ئێرانییەکان شان بەشانی پێشمەرگە شەڕیان دەکرد. ئەو حاڵەتە ڕەنگە بەڕاستی بارودۆخەکەی زۆر ئاڵۆز کردبێ. میدیای ئێرانیش دۆخەکەیان بەوە ئاڵۆزتر کرد کە لە دەنگوباسەکانیاندا

لێدوانی فەرماندە سەربازییەکانی خۆیان بڵاو دەکردەوە و باسی بەشداریی خۆیان لە ڕاپەڕینی کوردان دەکرد و دەیانگوت "مافی ئێمەیە بەتوندی شەڕ لە دژی موجاهیدین بکەین". من پێم وایە حکوومەتی ئێران ئەم پڕوپاگەندەیەی بڵاو کردەوە تا هاووڵاتییانی خۆی بەبەشداریکردنی ئێران لە ڕاپەڕینەکانی عێراق قایل بکات، لەو کاتەی هیچ شەڕێک لە دژی سەدام لە ئارادا نەبوو. بەڵام ڕەجەوی ئەمەی قۆستەوە و بەکاری هێنا بۆ ئەوەی چەکدارانی خۆی بێنێتە نێو شەڕەکە.

هەر بۆیە ڕەجەوی فەرمانی بەهێزەکانی خۆی دا لە کفری بۆ ئەوەی پێشڕەویی هێزە کوردەکان ڕاگرن چونکە ئەو هێزانە لە ڕاستیدا هێزی پاسدارن. سەربازانی ئێران وەک سوبحانی دەڵێت جلوبەرگی کوردییان پۆشیبوو. "بگرە ڕەجەوی زیاتر هانی هێزەکانی ئێمەی دا کاتێک ژیرانە توانیی ڕووداوی کوژرانی سەرکردەیەکی موجاهیدین لە دووز بەکار بهێنێ."

ئەم چیرۆکە وەک ڕوونکردنەوەیەکە بۆ ئەو ڕووداوە سەیرانە کە کورد بۆمیان گێڕایەوە. موجاهیدین لە دووز تووشی شکست دێن و دەکشێنەوە بەڵام کورد ڕاویان نانێن. کەچی موجاهیدین لەجیاتی ئەوەی بۆ سەربازگەی خۆیان بکشێنەوە، لە شارۆچکەکە دەردەچن و دووبارە دەگەڕێنەوە و پەلاماری دەدەنەوە و بۆ ماوەی چوار ڕۆژ ئابڵووقەی شارەکە دەدەن، پاشان کۆنترۆڵی شارۆچکەکە دەکەن. من ئێستا تێ گەیشتم: گەڕانەوەیان لەبەرئەوە بوو فەرمانیان پێ کرابوو بگەڕێنەوە و پەلاماری شارەکە بدەن و تۆڵەی خوێنی سەرکردەکەیان بکەنەوە.

دیارە شاری دووز بۆ موجاهیدین گرینگ بوو وەک لە وەڵامی پرسیارمدا حوسێن فورقانی پێم دەڵێت، لەبەرئەوەی کەمپی ئەشرەف دەکەوێتە دامێنی شاخەکانی ناوچەکەوە و دەتوانرێ لەوێوە بۆمباران بکرێت. فورقانی لە بیریەتی چۆن شەڕێکی دەستەویەخەیان کرد لەوێ. "ئەوەندە خەڵکمان کوشت لەوێ. ئافرەت و منداڵ. بەتانک دەچووینە نێو ماڵەکان".

فورقانی و سەمەد و نەزاری بەرپرسی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانی ناوچەی کوردستان بوون. ئەو دوو برادەرە کە لەسەر مێزێک دانیشتبوون لە تاران، گێڕانەوەکانی یەکتری پشتڕاست دەکەن و قسە بەیەکتری دەبڕن و قسەکانی یەکتری

تەواو دەكەن. بەسەرگەرمی و خوێنگەرمی یارمەتیم دەدەن ئەو وردەكارییانەی كوردی عێراق بۆمیان باس كرد ڕوونتر دەكەنەوە بۆ ئەوەی لێیان تێ بگەم و ئەم ڕاستییانە بەرز بنرخێنم.

بۆ نموونە لە بارەی شەڕە ناهاوسەنگەكەی دووز كە تیایدا چەكی قورس لە دژی هاووڵاتییانی سڤیل و پێشمەرگە بەبێ پێویست بەكار هێنران، فورقانی بەدەم سەربادانەوە دەڵێت: "دوكانێكمان بینی داخرابوو و كونێك لە دەرابەكەیدا كرابوو و لوولەی تفەنگێكی لێ دەرهاتبوو و تەقەی لە تانكەكەمان دەكرد. ئێمەش دەستمان كردەوە و هەموو بینایەكەمان خاپوور كرد كە بان دوكانەكە ماڵێكی لێ بوو، ماڵەكەشمان ڕووخاند. بەئێمەیان گوتبوو ئەمانە هەموویان ئێرانین. ئەوسا هێشتا متمانەی تەواومان بەڕەجەوی هەبوو."

منیش لەو قسانە دەكەومە گومان. چۆن بڕوایان بەو قسانەی ڕەجەوی كردووە؟ ئایا خەڵكی شارەكە بەئێرانی دەچن؟ تۆ بڵێی هەموو ئەندامان بەیەك جار و لەبەر ڕقی مەلاكان وا كوێر بووبن؟

نەزاری دەڵێ موجاهید هەبوو هەر ئەو كات بۆی دەركەوت چەواشە كراوە. "ئەوانە زانییان ئێمە ئەو شەڕە لە دژی هاووڵاتییان دەكەین و یەكسەر چەكی خۆیان دانا. زۆر ئەندام لەو ساڵە وازیان لە موجاهیدین هێنا. چونكە بەكارهێنانمان لە دژی هاووڵاتییان لە دیدی زۆربەمان دوایین شتی چاوەڕوانكراو بوو."

تا ئەمڕۆش لە ئەورووپا ئەوە دەگێڕنەوە كە موجاهیدین هاووڵاتیی سڤیلیان بەتانك پان دەكردەوە. دەگوترێ كە مریەم ڕەجەوی فەرمانی بەهێزەكانی دابوو: "گوللە خەسار مەكەن كوردەكان بەتانك پان بكەنەوە و گوللەكانتان ئاراستەی گاردی شۆڕشگێڕی ئێران بكەن". هەروەها ئەو چیرۆكە لە ڕاپۆرتەكانی ڕێكخراوی مافی مرۆڤیشدا باس دەكرێت. ئەگەر خواستنەكەم دروست بێت، ئەو كات كوردی عێراق وەك گاردی شۆڕشگێڕی ئێرانیی دوژمنی موجاهیدین بوو. هەر بۆیەش موجاهیدین بەم شێوەیە شەڕیان لەگەڵیاندا دەكرد و چاك دەیانزانی چییان دەكرد، هەرچەندە ڕەنگە هەندێ ئەندامی موجاهیدین لە چەند ئاستێكی دیاریكراودا چەواشە كرابن بەوەی ئەوانەی شەڕیان لەگەڵدا دەكەن سەربازی ئێرانین بەجلی كوردییەوە. بەڵام

دیسان بۆم دوویات دەبێتەوە کە هزری مرۆڤ بەئارەزووی خۆی شتەکان هەڵدەبژێرێ و هزری ئەندامانی موجاهیدینیش بەهەمان شێوە، ئەوەی حەزی لێ بێت باوەڕی پێ دەکات.

حوسێن فورقانی "دانیشتنی ڕۆژانەی ڕاپۆرتدان"ی وەبیر دێتەوە کە لە ناوچەی دووز بوون – ئەو دانیشتنانە ڕۆژانە بەردەوام بوون – لەو دانیشتنانەدا سەربازێک ڕەخنە لە خۆی دەگرێت چونکە تۆپێکی نەتەقیوە بۆیە ناچار بووە بەتۆپێکی تر ئامانجی خۆی بپێکێت. "فەرماندەکەی بەو سەربازەی گوت: ئەمە شتێکە هیچ عەیبی تێدا نییە. تۆ دەتوانی بەهەموو شتێکی بەردەستت بیانکوژی، خۆ دەتوانی بەدۆشکەش بیانکوژی."

پاشان باسی شەڕێک دەکات لە شاخەکانی نزیک کفریدا و چۆن کوردەکانیان بەمووشەکی کاتیۆشا و بەدۆشکە لەناوبرد. لە وەسفی شاخەکاندا لە پاش شەڕەکە دەڵێت: "زیاتر لە هەزار کوردمان بەو مووشەکانە پارچە پارچە کردبوو." کفری بۆ ماوەی ١٠ساڵی پاش ئەو شەڕە وەک سنوورێک لە نێوان ناوچەی فیدراڵی کورد و عێراقی سەدام حوسێن دەمێنێتەوە، ئەمەش گرینگی و پێویستیی کۆنترۆڵکردنی ئەو ناوچەیە لە ١٩٩١دا دەردەخات.

لەسەر ڕێگەی نێوان کفری و کەلار چەند ڕۆژێک لە پاش ئەو شەڕە خوێناوییەی فورقانی باسی کرد، پاسێک کە ٢٠ سەرنشینی تێدابوو دەسووتێندرێت. کوردەکان بەمنیان گوت هەموو سەرنشینەکانی پاسەکە تیایدا دەسووتێن و کەسیان ڕزگاری نابێت. دیارە فورقانی ڕووداوی ئەو پاسەی لە بیرە و بەزەردەخەنەیەکی تاڵەوە دەڵێ: "بەئێمەیان گوت پاسێک پیاوانی ڕژێمی هەڵگرتووە و هاتوونە بۆ دەستگیرکردنمان. ئێمەش پێمان وا بوو ئەو پاسەیە سەربازانی گاردی شۆڕشگێڕیی هەڵگرتووە." ئەی کاتێ کوردەکان موجاهیدین بەوە تۆمەتبار دەکەن کە ئەوان تەقەیان لە هاووڵاتییانی سڤیل کردووە کە دەیانویست بەو پاسە لە کفری ڕا بکەن؟ فورقانی دەڵێ بەڵێ ئەمەیان ڕاستە. بەڵام لە کۆتاییدا ئەو هاووڵاتییانە بەبۆچوونی موجاهیدین گاردی شۆڕشگێڕ بوون. "بەتایبەتی گەنجان و پیاوانی ڕیشدار جێی گومان بوون". موجاهیدین دەڵێن گوایە لەو شەڕانەدا نزیکەی ٥ هەزار سەربازی "گاردی

شۆڕشگێڕیان" کوشتووە، کە بێگومان ئەوانە هاوولاتییە کوردەکان بوونە. کوردەکان دەڵێن ژمارەی کوژراوەکان بە"سەدان"ن کەواتە تەنیا قوربانییە کوردەکانن. موجاهیدینیش قوربانییان داوە و دەڵێن نزیکەی ٤٠ ئەندامیان لەو ئۆپەراسیۆنەدا کوژراوە.

پاش ٤٠ ڕۆژ لەو شەڕە سوپای عێراق دێتە هانای موجاهیدین. چونکە دوای دامرکاندنی ڕاپەڕینی شیعەکان لە باشوور لە کۆتایی مانگی ئاداردا سوپای عێراق ئێستا بواری هەیە کۆنترۆڵی شەڕگەی باکور بکات و بەرپرسیارییەتییەکە لە موجاهیدین وەربگرێت. لە سەرەتای نیساندا ڕاپەڕینی باکوریش کۆتایی پێ دێت. ملیۆن و نیوێک کورد بەرەو چیاکانی سنوور هەڵدێن و دەچنە ناو خاکی ئێران و تورکیا. خێزانەکان ماوەی چەند هەفتەیەک خۆیان لە چیا بەرزەکانی پڕ بەفر دەمێننەوە. بەهەزاران کەس لە ئەنجامی سەرما و سۆڵە و برسییەتی گیان لە دەست دەدەن.

چیرۆکی هێرشی ئێران بۆ سەر عێراق کە موجاهیدین بەرپەرچیان داوەتەوە دەگاتە میدیاکانی جیهان. بەڵام ئەوەی مایەی سەرنجە ئەو ڕاستییەیە کە هەموو میدیاکانی جیهان ڕاپۆرتەکانی موجاهیدینی خەلق پشتگوێ دەخەن. لە ڕاپۆرتە هەواڵێکی کەناڵی CNNدا هاتووە کە ئێران لە ٢٨ی شوباتی ١٩٩١دا (ڕۆژی دەستپێکردنی ئەو ئاگربەستەی لە لایەن سوپای عێراق و جەنەراڵ نۆرمەن شوارزکۆڤەوە ئیمزا کرابوو) بەهێزێکی ٢٠ هەزار سەربازی هێرشی بۆ سەر عێراق دەست پێ کردووە. موجاهیدینیش دەڵێن گوایە بەرپەرچی هێرشەکەیان داوەتەوە و ١٥٠٠ سەربازی ئێرانییان کوشتووە.

من زۆر لەو ڕاپۆرتە هەواڵە بەگومانم. چۆن موجاهیدین دەتوانن، بەو تەنیا ٥ هەزار سەربازەی خۆیان کە هەیانە، نزیکەی ٢٥ هەزار سەربازی باش مەشقدراوی ئێرانی بشکێنن؟ بەکردارێکی بیرکاریی سادە بۆم دەرکەوت ئەو کاتە لە سەرانسەری عێراقدا تەنیا ٧ هەزار موجاهیدینی خەلق هەبوون، لەوانەش هەندێکیان هیچ مەشقێکی سەربازییان نەدیبوو.

ڕۆژنامەی دەیلی تیلیگراف باسی دوو ڕووداوی شەڕ و پێکدادانی سنووری دەکات

ەگەڵ گاردی شۆڕشگێڕی ئێران ڕوویان داوە، کە ویستبوویان دەست بەسەر ەنگەکانی موجاهیدین لە ناوچەکەدا بگرن. لەو شەڕانە موجاهیدین ٤٣ کەسیان لێ کوژرا و لایەنی ئێرانیش ٥ هەزار سەربازیان لێ کوژراوە، وەک لە هەواڵی ئەو ڕۆژنامە بەریتانییەدا هاتووە، بەبێ ئەوەی ڕۆژنامەکە پرسیار لە خۆیان بکەن چۆن ،ەبێ ئەو جیاوازییە بێ ئەندازەیە لە ژمارەی قوربانییەکانی هەردوولادا هەبێت.

میدیاکان چۆن قبووڵیان کرد ئەم شتە بەسەریاندا تێپەڕێت بەبێ ئەوەی هەواڵەکان ە سەرچاوەیەکی ترەوە پشتڕاست بکەنەوە؟ وەڵامی ئەوەش ئاسانە. ڕۆژنامەوانەکان ە سەردانێکی کەمپی ئەشرەف بوون و نمایشێکی سەربازییان بەچاوی خۆیان ینی. شایەتە چاودێدەکان باس لەو شانۆگەرییە دەکەن کە بۆ ڕۆژنامەوانان ساز کرابوو بۆ ئەوەی چەواشە بکرێن: نمایشەکە هێزێکی سنووردار بوو، بەڵام چەندین جار و بەچەندین شێوە بەبەردەم ڕۆژنامەوانەکاندا نمایش دەکران و هەموو جارێکیش چەند تانک و زرێپۆشێکیان دەخستە نێو نمایشەکەوە بۆ ئەوەی چەواشە بن و باوەڕ بکەن ژمارەی هێزەکانیان زۆرە.

دیارە ئەمەش کاری لە ڕۆژنامەوانەکان کردووە و لە ئەنجامدا باوەڕیان کردووە ەنگە موجاهیدین ٤٠ هەزار سەربازیان هەبێت کە لە ٣٠٪یان ئافرەتن. ئاژانسی ۆیتەریش ژمارەیانی لە نێوان ٤٠ تا ١٠٠ هەزار سەرباز مەزەندە کردووە. کۆنە ەندامانی موجاهیدینیش دەڵێن ئێمەش ئەو کات بڕوامان بەو ژمارانە هەبوو.

سەرەڕای ئەو هەموو چیرۆک و ڕاپۆرتانەی شایەتە چاودێدەکان و لایەنەکانی تر ە لە ڕەوشەکەدا بەشداربوون و ئەو کات لە عێراق بوون، موجاهیدینی خەلق ئەو اپۆرتانەی ڕەت کردووەتەوە کە دەیانگوت دەستیان لە دامرکاندنی ڕاپەڕینی کورددا ەیە و بە"درۆی شاخدار" ناویان دەبەن. بەڵام لە ڕاستیدا ئەندامانی یەکێتیی یشتیمانیی کوردستان و هاووڵاتییانی شار و شارۆچکە و گوندە کوردەکان تا ێستاش بیرەوەریی تاڵیان لە بارەی دڵڕەقیی موجاهیدینەوە هەیە. هەروەها ئەو اووڵاتییانە دەڵێن گوایە سەدام جارێک کە پەلاماری ناوچەی کورد دەدات لە ساڵی ١٩٩١دا دیسان موجاهیدین بەکار دەهێنێت، هەروەها لە ساڵی ١٩٩٦یشدا بەهۆی ودەتایەکی شکستخواردوو لە دژی، ناوچەی کورد سزا دەدات.

بەڵام هێشتا پارچەیەکی تری چیرۆکەکە ماوە تاوەکو وێنەکە تەواو ببێت. دەگەڕێینەوە سەر قسەکانی سوبحانی کە دەیگوت ڕەجەوی لە هاوینی ١٩٩٠دا داوای سەدامی بۆ یارمەتیدانی لە شەڕی کوێتدا ڕەت دەکاتەوە. ئاخر بۆ ئامادە نییە یارمەتیی دۆست و پارێزەری خۆی بدات؟ سەمەد نەزاری وەڵامی ئەو پرسیارە دەزانێ کە پاسەوانەکەی ڕەجەوی نایزانێت: موجاهیدین بەخۆیان پلانی تایبەتییان هەبووە بۆ هێرشکردنە سەر ئێران. هەر بۆیەش ڕەجەوی یارمەتیی سەدام نادات: چونکە سەربازەکانی خۆی بۆ کارێکی تر هەڵگرتووە.

ئەو کات نەزاری لە بەشی هەواڵگریی موجاهیدین کاری دەکرد، چەند ساڵێک بەر لە داگیرکردنی کوێت فەرمانی پێ دەدرێت بیر لە دانانی پلانێکی تر بۆ هێرشکردنە سەر ئێران دابڕێژێت. ئەو دەڵێت: "نەخشەی ئەو پەلامارە پێشکێشی سەدام کرابوو بەر لەوەی هێرش بکاتە سەر کوێت. ئەم نەخشەیەمان بەنهێنی ڕاگرتبوو، تۆش یەکەمین کەسی باسی ئەو پلانەت بۆ دەکەم."

کە فەرمانیشی پێ کرا نەزاری دەست بەداڕشتنی ڕەشنووسی نەخشەیەک دەکات لەسەر کاغەزی A4 کە تیایدا نەخشەی ناوچەی سنووری نێوان عێراق و ئێران کێشاوە، تا ڕادەیەک نەخشەکە هەمان ناوچە دەگرتەوە کە لە ساڵی ١٩٩١دا شەڕیان لەگەڵ کورد تیادا کرد لەگەڵ دیوی سنووری ئێرانیش لە ناوچەکە. بەچەند هێڵێکی سادە بۆمی دیار کرد دەبوایە پەلامارەکە چۆن ئەنجام بدرایە. ئەوەی لە نێوان هەرسێکمانە لەسەر ئەو مێزە لە تاران نەخشەی ئۆپەراسیۆنێکی سەربازییە کە دەبوایە لە ساڵی ١٩٩١دا ئەنجام بدرێت - نەخشەیەک هەواڵگریی ئێرانی زۆر حەزیان دەکرد بکەوێتە دەستیان.

نەخشەکە بریتییە لە ئۆپەراسیۆنێک کە زۆر باشتر لە نسکۆکەی ساڵی ١٩٨٨بیری لێ کراوەتەوە و پلانی بۆ داڕێژراوە. چونکە وەک نەزاری بۆمی ڕوون دەکاتەوە: "سەدام بەڕەجەویی گوتبوو: ئەو کاتە ڕێگەت پێ دەدەم هێرش بکەی کە خۆت بۆ داگیرکردن (فتح)ی تاران ساز کردبێت. چونکە کە ڕۆیشتی بۆ هێرش ئەوسا پێت ناکرێ بگەڕێیتەوە." مەبەستی ئەو پلانە ئەوە بوو لە چوار قۆڵەوە هێرش بکرێتە سەر ئێران و پاشان هەر چوار قۆڵی موجاهیدین خۆیان لە کرماشان ڕێک بخەن و بەرەو تاران بچنە پێش.

له ساڵی ١٩٨٨دا هەموو هێزەكانی موجاهیدین له یەک قۆڵەوە كه هێڵێكی باریكی هێـرشكردن بوو چوونه ناو ئێـران. ئەویش شكسـتـێكی تەواو بوو. بەڵام "لەو پلانه دەبوایه سەربازەكان له چوار شوێن كۆ بكرێنەوە. كه سەدامیش كوێتی داگیر كرد، حوسـێن ئەبریشـەمچی بەهەزار چەكدارەوە له قـۆڵی زرباتیـیه ساز و ئامـادە بوو. ڕادیۆی BBC تێبینیی ئەوەی كردبوو و ڕاپۆرتێكیشی لەو بارەیەوە بڵاو كردەوە."

له قۆڵەكانی تریشـەوە موجاهیدین دەستیان بەئامادە و كۆكردنەوەی هێزەكانیان كردبوو بۆ جێبەجێكردنی نەخشـەی هێرشـەكە. بەڵام كاتێک ئەمەریكاییەكان له سەرەتای ١٩٩١دا سـەدامیـان له كوێت ڕاو نا، وەک نەزاری دەڵێ "سـەدام داوای له ڕەجەوی كرد ناوچه سنوورییەكەی پارێزگەی دیاله – كه له كەمپی ئەشرەف دەست پێ دەكات تا سنووری ئێران له باكور بپارێزێ. هێزەكەی موجاهیدین كه له كەلار بوون له میانەی نەخشەكەیان كه ئەوان قۆڵی سێیەمی هێرشەكه بوون چی تر كاریان لەوێ نەمـا." بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جـێگه و ڕێگەیان بۆ شـەڕی كوردە ڕاپەڕیوەكان باش بوو.

بەگوتەی نەزاری نەخشـەی هێـرشـەكەی موجاهیـدین ئەو كـات ڕاگیـرا، لەبەر بارودۆخەكه و هەروەها بەڵێنی یارمەتیی هێزی ئاسمانیی عێراقییش كه موجاهیدین پێویسـتـیـان پێی بوو نەمـا. پاش مـۆركـردنی ئاگربەسـتـیش نـاوچەی دژەفـڕین له سەرتاسەری عێراق ڕاگەیەنرا.

سەرچاوە ئەمەریكاییەكان باس لەوە دەكەن كه له سـەرەتاكانی مـانگی ئاداردا له ناوچەی قەسری شیرینی سەر سنووری ئێران شەڕ و پێكدادان له نێوان موجاهیدین و گاردی شـۆڕشگێڕی ئێرانی دەسـتی پێ كـرد. له قـۆڵی دووەمی پلانەكەی نەزاری، ئەمەریكاییەكانیش وای بۆ دەچن كه سەدام مۆڵەتی بەموجاهیدین داوە هـۆشداری بدەنه ئێران دەست نەخاتە ناو كاروباری عێراقەوە. لەو كاتە ئەو له باشووری وڵات سـەرقاڵە. بەڵام ئەمەریكاییەكان لەوە ئاگەدار نین كه موجاهیدین بەپێی پلانێكی خۆیان بۆ هێرشكردنه سەر ئێران هێزەكانی خۆیان لەو ناوچانه كۆ كردووەتەوە.

ئەو كـات موجـاهیـدین دەسـتـبـەرداری گـرینگتـرین كـاری خـۆیـان دەبن بۆ ئەوەی یارمـەتـی و بەفـریای سـەدام حـوسـێن بكەون. ئەوان دەبێ یارمـەتیی بدەن، چونكه

نانخۆری ئەون. من پێش ئێستا نووسیبووم کە پێوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوان سەدام و ڕەجەویدا هەیە، بەڵام چەند توندوتۆڵ بوو؟ کۆنە موجاهیدینەکان بۆم دەگێڕنەوە ئەوان لەو شەڕەدا کاری پۆلیسیشیان بۆ سەدام دەکرد. ئەوان سەربازی عێراقیی هەڵاتوویان دەستگیر دەکرد و تەسلیم بەسوپای عێراقیان دەکردەوە. ئەوان پارێزگاری دیالەیان دەستگیر کرد کە بەجانتایەکی پڕ لە پارەوە بەرەو تورکیا دەڕۆیشت. هەروەها پارێزگاری ڕێگەی نێوان کەمپی ئەشرەف و بەغدایان دەکرد.

وەک حوسێن فورقانی دەگێڕێتەوە پێوەندییەکی توندوتۆڵی کار لە نێوان هەواڵگریی سەدام حوسێن و موجاهیدیندا هەبوو. فورقانی بەمنی گوت کە بەرپرسی پایە بەرزی عێراق لە بنکەیەکی هاوبەشی نێوان هەواڵگریی عێراقی و موجاهیدین لە باکوری عێراق بەجلوبەرگی سڤیلەوە کاریان دەکرد و "هەر ئەوان فەرمانیان دەدایە سەرکردەکانمان".

هەروەها مەسعود خودابەندەش بەمنی گوت کە موجاهیدین بۆ کارکردن بۆ بەرژەوەندی هەواڵگریی عێراقی ڕادەهێنران. خودابەندە خۆی ڕۆڵێکی گرینگی لە دەزگای هەواڵگریی موجاهیدین بینیوە و لەسەر دەستی هەواڵگریی عێراق مەشقی کردووە. عێراقییەکان لەسەر "ئاشکراکردن و دروستکردنی بەڵگەی ساختە و بەفێڵ دەربازبوون لە پشکنینی باڵەفڕگەکان و چۆنیەتیی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە" مەشقیان پێی کردووە. کۆنە ئەندامانی تر باسی ئەوەم بۆ دەکەن کە هەواڵگریی عێراق پاراستنی ئاسایشی سەربازگەکانی موجاهیدینیان لە ئەستۆ گرتبوو و هەر گەشتێکیان لە دەرەوەی بنکەکانیان پاش ڕاوێژکردن لەگەڵ ئەفسەرێکی هەواڵگریی عێراق ئەنجام دەدرا. ئەندامە نوێیەکانی موجاهیدین کە بڕیار دەدرا سەردانی نەجەف بکەن بۆ مزگەوتی ئیمام عەلی بەکاروانێک بەیاوەریی پاسەوانانی عێراقی لە پێش و لە پشت پاسەکانیان و لە ناو پاسەکانیان بۆ سەردانەکە دەچوون. کە دەگەیشتنە مەزارەکەش هەواڵگریی عێراق مزگەوتەکەی بۆیان چۆڵ دەکرد.

ڕەنگە ئەمەش وامان لێ بکات پرسیار بکەین ئەم هەموو ڕێوشوێنە توندانەی ئاسایش لە پای چی، تۆ بڵێی لە عێراقییەکان بیانپارێزن؟ بەڵی ڕاستە، چونکە نە کورد و نە شیعە حەز بەبینینی ئەو جاشانەی زۆردار ناکەن. لەوە زیاتر بڕوام وایە لە

پاش شەڕی کوێت سەدام وەک هێزێکی کاتی تەنگانە سەیری موجاهیدینی دەکرد. ئەوان بۆ سەدامیان سەلماند کە لە گاردە کۆمارییەکەی لە شەڕی کوێتدا پشتیان تێ کردن دڵسۆزترن. مەترسیی فێرارکردن لە ڕیزی موجاهیدیندا زۆر کەمە چونکە هەر لە بنەڕەتدا جگە لە ژیانی سەربازی چی تریان نییە بۆی فیرار بکەن. کۆنە موجاهیدین ناوی موجاهیدینیان کردووە بە"تابووری پێنجەمی عێراق."

بێگومان سەدام موجاهیدین وەک پەرژینێک لە بەرامبەر میلیشیای شیعەی عێراق کە لە ئێرانن دەژمێرێت. فەیلەقی بەدر لە پاش ۱۹۹۱وە دامەزراوە لە لایەن شیعە عێراقییەکانی ئاوارەی ئێران و چەک و تفاق و مەشقی سەربازییان لە لایەن سوپای ئێرانەوە بۆ دابین دەکرا، بەم شێوەش بەدر هاوتای موجاهیدینی عێراقە.

لەوەش گرینگتر ئەو ڕاستییەیە کە مەسعود ڕەجەوی لە سالانی تەنیاییی سەدامدا یەکێک بوو لە چەند کەسانێک کە بەقسە و کردار بەئاشکرا پشتگیریی سەدامی دەکرد. سەدام بێگومان بۆی دیار بووبوو ڕەجەوی لە هەموو شتێک لاسایی ئەو دەکاتەوە، جلوبەرگ و سمێڵ، تەنانەت لە شێوەی دەمانچە بەستن لە تەنکێش- بەلام لەبەرئەوەی بالای لە سەدام کورتترە، دەبوایە دەمانچەیەکی بچووکتر بۆ سەرکردەی موجاهیدین پەیدا بکرابایە.

سەدامیش ڕێزی لە موجاهیدین دەگرت. ژمارەی بنکە و سەربازگەکانی موجاهیدین دەکاتە ١٦ و هەموو پێداویستییەکانی بۆ دابین دەکردن. تەنانەت پاش ئابلووقەی UNیش لە پاش شەڕی کوێت لە ۱۹۹۰، کە عێراق بەدەست کەمیی پێداویستییەوە دەینالاند، کەمپی ئەشرەف بەشی خۆی لە خواردەمەنی هەبوو و بەگوتەی کۆنە ئەندامانی موجاهیدین هەر یەکێکیان بەئەندازەی دوو ئەوەندەی بەشی هەر ئەندامێکی پایە بەرزی حزبی بەعسی سەدام وەردەگرت. خواردن و گۆشت و میوە و هەموو ئەو شتانەی لە دەرەوە دەست نەدەکەوتن لە لای ئەوان مشە بوو.

مەسعود خودابەندە دەڵێت موجاهیدینیش لە بەرامبەردا هەموو ئەو کالایانەیان بۆ سەدام دەکڕی کە لەبەر ئابلوقە لێی قەدەغە کرابوو. چونکە خودابەندە دوو ڕۆڵی دەگێڕا وەک بەرپرسی هەواڵگری و بەرپرسی پێوەندییە بەتەل و بێتەلییەکان، بۆیە گەنجینەیەکی زانیاریی پێیە و لە دانیشتنە درێژەکانمان و بەنامەی ئیمێل بۆمی

ئاشکرا کرد. خودابەندە باس لە ئاودیوکردنی چەندان تۆن کلۆراید بۆ ناو عێراق دەکات کە زۆر لە پێداویستیی موجاهیدین بۆ پاککردنەوەی ئاوی خواردنەوە زیاتر بوو. کلۆراید یەکێکە لە مادە قەدەغەکراوەکان چونکە بۆ دروستکردنی چەکی کیمیاوی بەکار دێت. کەمیی کلۆراید دەبێتە هۆی دروستبوونی کێشەی تەندروستی بۆ هاووڵاتییانی عێراق و ئەو کێشانە تا ماوەیەک پاش ڕووخانی سەدام حوسێن دەمێنن، لە کاتێکدا سەدام ئەو مادەیەی دەست دەکەوت. بەڵام چی لێ دەکرد کەس نەیدەزانی، بەڵام ئەوەی دیارە بۆ پاککردنەوەی ئاوی بەکار نەدەهێنا.

موجاهیدینیش ئەو خزمەتانەیان باش پاداشت دەکرێن. لە ڕاستیدا هەموو خەرجییان لە سەدام حوسێنەوە دێت. بەقسەی مەسعود خودابەندە "سەدام پارەی هەموو شتێکی دابین دەکرد. ئێمە تەنیا پارەی ئەو شتانەمان دەدا کە لە دەرەوەی عێراقمان دەهاورد ئەویش بەدۆلارەکانی سەدام بوو. پارەی هیچ شتی ترمان نەدەدا وەک خواردەمەنی و شتەکانی تر."

هەمان باریش ئاواکردنی خانوو و تەلارەکانی نێو کەمپی موجاهیدینی گرتبووەوە. "بۆ نموونە لە کەمپی ئەشرەف خانوویەکمان بۆ ڕەجەوی ئاوا کرد، خانوو نەبوو قەڵایەک بوو، ٣٥ ژووری گەورە و پێنج ساڵۆنی تێدا بوو. هەروەها ژێرزەوینێکی دژی چەکی ئەتۆمی ٢٥ کەسی دەگرت بەتەواوی ئازووخە و گازی ئۆکسجین و ٣ ژووری خەوتن و هەموو شتێک کە مرۆڤ لە ژێرزەوین پێویستی پێ دەبێت. ژێرزەوینەکە لەسەر نەخشەیەکی سویدی کرابوو و بەرگەی بۆمبی هەزار تەنیی دەگرت. ئەمەیان نموونەیەکی نوێ بوو پاشان سەدامیش بۆ خۆی دروستی کرد".

ئیشوکاری بیناسازی لە ژێرزەوینەکە هێشتا تەواو نەبوون کاتێک ئەمەریکاییەکان لە ١٩٩١دا دەستیان بەبۆمبارانی عێراقی کرد. "من لەوێ کارم کردووە: هەر کاتێک باڵەفڕە جەنگییەکان بهاتنایە دەچووینە ژێرزەوینەکە. هەموو شتێک لەو ژێرزەوینە تەواو بووبوو. هیچ شوێنێک لەوێ ئارامتر نەبوو".

کە لە خودابەندە پرسیار دەکەم ئایا لیستێک هەبوو بەناوی ئەو کەسانەی بۆیان هەبوو لەو ژێرزەوینەدا بحەوێنەوە؟ خودابەندە بەزەردەخەنەوە وەڵامم دەداتەوە چونکە ئەو دەزانێ شێوە دیموکراسییەکەی بڕیار وەرگرتن لە نێو موجاهیدین نەماوە بۆ ئەوەی ئەو کەسانە دیاری بکرێن کە پێویستە لە ژێرزەوینەکەدا خۆیان بپارێزن و

دەڵێ: "ژێرزەوینەکە بۆ مەسعود ڕەجەوی و مریەم بوو و هەر کەسێکی تر کە بیانویستبا لەگەڵ خۆیان بێت".

لە ١٩٩١دا و پاش شەڕی کەنداو UN داوا لە عێراق دەکات چەکەکانی خۆی داماڵێ و ڕێگە بەپشکێنەرەکانی لیژنەی ئۆنسکۆم بدات بۆ پشکنین بێنە عێراق و هەر واش بوو. ئەمەش سەرەتای گەمەی پشیلە و مشک بوو بۆ چەندین ساڵ تیایدا سوپای عێراق بەردەوام چەکەکانی لەم شوێنەوە بۆ ئەو شوێنە دەگواستەوە و نەیدەهێشت پشکێنەرەکانی ئۆنسکۆم بچنە بنکەکان تا لە ساڵی ١٩٩٨دا عێراق دەرگای بۆیان خستە سەرپشت.

ئەو کات دەبوایە کەمپەکانی موجاهیدینیش سەیر بکرێن. بەڵام لە ڕاپۆرتەکانی ئۆنسکۆم و پاشان لیژنەی ئۆنمۆڤیکدا هاتووە کاتێک پشکێنەران دەچوونە کەمپەکانی موجاهیدین ئەوان کارئاسانییان بۆ نەدەکردن. جارێکیان موجاهیدین تەقەیان لە باڵەفڕە کۆپتەرەکەی پشکنەرەکان کرد و خەریک بوو بیخەنە خوارەوە. جارێکی تریش لە دوا چرکەدا پشکێنینەکە دوا دەخرێت چونکە موجاهیدین دەڵێن باڵەفڕەی ئێرانی بەتەمان هێرش بکەنە سەریان. ئەمەیان بەهانەیەک بوو چونکە هیچ هێرشێکی ئاسمانی ڕووی نەدا.

کاتێ پشکێنەرانی UN داوا لە عێراق دەکەن ڕێگەیان بدات کەمپەکانی موجاهیدین بپشکنن، عێراقییەکان داواکە ڕەت دەکەنەوە و دەڵێن "هیچ بناغەیەکی یاسایی" بۆ ئەم داوایە نییە. ئەم هەڵوێستەش بۆچوونێک دێنێتە کایەوە کە سەدام حوسێن هەموو چەکە کۆکوژەکانی لە کەمپی ئەشرەفدا شاردووەتەوە. ئەم بۆچوونە تا ٢٠٠٣ش کە ئەمەریکاییەکان هاتنە ناو عێراق و کەمپی ئەشرەفیان پشکنی هەر مابوو.

ئەو بۆچوونە بناغەی هەبوو چونکە کۆنە ئەندامانی موجاهیدین بۆمیان گێڕایەوە چۆن سەدام حوسێن لە ساڵی ١٩٩١دا بەر لە دەستپێکردنی هێرشی ئاسمانیی ئەمەریکا بۆ سەر عێراق چەکی کیمیاویی لە هەر ٥ سەربازگەکەی موجاهیدیندا شاردبووەوە. هەندێک ئەندامی تر باسیان لەوە دەکرد چەند ئەندامێکی موجاهیدین لە ساڵی ١٩٩٨دا دیبوو بەجلوبەرگی تایبەت بەخۆپاراستن لە چەکی کیمیاوییەوە

خەریکی گواستنەوەی مووشەک و بۆمبی قورس بوون. جگە لەوەش هەواڵی ئاواکردنی دامەزراوەیەکم لە چەند ئەندامێکی تر بیستبوو، کە سەرکردایەتیی موجاهیدین دەیگوت بنکەی پاککردنەوەی ئاوە. کەچی کاری بیناسازیی تەنیا بەشەو دەکرا و شوێنی دامەزراوەکە چەند مەترێک لە ژێر زەویدا بوو. بەڵام ئەو چیرۆکەم بۆ پشتڕاست نەکرایەوە.

هەروەها ڕاستییەکی تر هەیە مەسعود خودابەندە بۆم باس دەکات، ئەویش ئەوەیە عێراقییەکان لە کەمپی ئەشرەفدا دامەزراوە و کۆگەی تەقەمەنی و دەروازەی چوونە ژوورەوەی تایبەت بەخۆیان هەبوو، کە لە کاتی پێویستدا ئەمانەیان بەکار دەهێنا. هەروەها عێراقییەکان دەیانتوانی بچنە کەمپەکانی تری موجاهیدین وەک کەمپەکەی نزیک زیندانی ئەبوغرێب. "لە میانەی کارکردنم لە هەواڵگریدا دەمزانی شتێک لە ژێر زەمینی کەمپەکەدا و لە گۆشەی باشووریدا هەیە. دەمزانی عێراقییەکان شتێکیان لەوێ شاردووەتەوە و نەدەبوو ئێمە باسی بکەین. دەمتوانی سەری مووشەکەکان کە پێم وابوو بەتاڵن ببینم. عێراقییەکان ئەو مووشەکانەیان بەر لە شەڕ شاردبووەوە، بەهەمان شێوەی کە لەو شەڕەی دواییدا هەموو شتێکیان لە ژێر زیخ شاردبووەوە— تەنانەت باڵەفڕەکانیشیان."

موجاهیدین دەڵێن پشکنەرانی UN هیچ شتێکیان لە بنکەکانی ئەواندا نەدۆزییەوە. بەڵام لیژنەی ئۆنسکۆم بەنیگەرانییەوە لە ڕاپۆرتی کۆتاییی کارەکانی لە کانوونی یەکەمی ١٩٩٨دا ڕای دەگەیەنن کەمپەکانی موجاهیدین لە دەرەوەی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی عێراقییەکانە. هەڵوێستی ڕەسمیی موجاهیدینیش ئەمە ڕادەگەیەنێت: پێوەندیمان لەگەڵ عێراقدا پێوەندیی نێوان دوو وڵاتی خاوەن سەروەرییە، کەمپەکانی موجاهیدین سەربەخۆیی تەواوی لە حکوومەت و سوپای عێراق هەیە". بەڵام کاسێتەکانی ڤیدیۆ و بەڵگەنامەکانی پاش ڕووخانی ڕێژیم کەوتنە بەردەست و کۆنە ئەندامانی موجاهیدینیش چیرۆکێکی ڕێک پێچەوانەی ئەمە دەگێڕنەوە. کەچی وتەبێژەکانی موجاهیدین هەمیشە دووبارەی دەکەنەوە کە ئەو سەربەخۆییە بواری داراییشیان دەگرێتەوە. ئەوان دەڵێن تاقە سەرچاوەی پارەیان گەلی ئێرانە. ئەمەش ئەستەمە بچێتە مێشکی خەڵک سەبارەت بەو هەموو خەرجییە سەربازییەی ئەوان لەو ١٦ سەربازگەیەی هەیانە، ئەمە جگە لە بەڵگەنامەکان کە لە پاش ڕووخانی

سەدام لە ٢٠٠٣دا ئاشکرا بوون. موجاهیدینیش لە لیستی ئەو ١٣ کۆمپانیا و کەسایەتییانەن کە کۆبۆنی نەوتیان لە سەدام وەرگرتووە.

ئەوە چیرۆکێکی ئاڵۆزە میدیای جیهانی باسی لێوە دەکەن، چونکە بەڵگەکان کۆبۆنە نەوتییەکانیشی لەگەڵدا بوو و UNیشی ڕیسوا کرد. سەدام کۆبۆنە نەوتییەکانی بەکار دەهێنا بۆ ئەوەی فێڵ لە ڕێککەوتنی نەوت بەرامبەر بەخۆراک بکات، کە بواری پێ دەدا نەوت بفرۆشێت و بەداهاتەکەی تەنیا ئازووخە و کەلوپەلی مرۆیی بۆ گەلەکەی بکڕێت. سەدام کۆبۆنی دەدایە زۆر کەس و کۆمپانیا. بەقسەی چارلز دولفەری ئەندامی ئەمەریکایی لە لیژنەی پشکنینی چەکەکانی سەدامدا، لەو چوار ساڵەی بەر لە داگیرکردنی عێراق، موجاهیدین بایی ٣٨ ملیۆن بۆشکەی نەوت کۆبۆنیان لە سەدام وەرگرت. لەو کۆبۆنانە توانییان بایی ٢٧ ملیۆن بەرمیل بفرۆشن و لە ئەنجامدا ١١ ملیۆن دۆلار قازانجیان دەست کەوت.

لەبەرامبەر ئەوەشدا شاهین قوبادی وتەبێژی موجاهیدین لە لێدوانێکی بۆ کۆواری نیوز ویک لە ٢٠٠٤/١٠/٢٤ لە بارەی ئەو تۆمەتانە وەک چاوەڕوان دەکرا گوتی: "ئەمانە درۆی ئاشکران." ئەم لیستە هەڵبەستراوە دەستکردی هەواڵگریی حکوومەتی ئێرانە و بەشێکە لە هەڵمەتێکی ناوزڕاندن کە نۆکەرانی مەلاکان ئەنجامی دەدەن."

ساڵێک پاش شەڕی کەنداو لە نیسانی ١٩٩٢دا ئێران بەمووشەک پەلاماری کەمپی ئەشرەف دەدات. ڕەجەوی یەکسەر وەڵامی ئەو هێرشە دەداتەوە و ئەندامانی خۆی لە ئەوروپا دەنێرێتە سەر باڵیۆزخانەکانی ئێران و لە ١٣ شاری ئەوروپادا داخی دڵی خۆیان بەو هێمایانەی ڕێژیمی ئێران دەڕێژن. لەو هێرشانەی ئەوروپادا بیناکان دەسووتێنرێن و دیپلۆمات دەڕفێنرێن. ئەو کاردانەوە توندە تووشی سەرسوڕمانم دەکات چونکە لە ڕاستیدا بوونە مایەی زیادبوونی ڕەخنە گرتن لە ڕەجەوی لە ڕۆئاوادا. تۆ بڵێی ڕەجەوی لەم کارە لاسایی سەرکردە عەرەبەکانی دەوروبەری بکاتەوە و بەتایبەتی نموونەکەی خۆی سەدام: کێشە ببە دەرەوە بۆ ئەوەی کەس ئاگای لە کێشەی ناوخۆی تۆ نەبێت. ئایا ئەو پەلامارانەی ئەوروپا بۆ ئەوە بوون پشێویی ناو موجاهیدینی پێ دابپۆشرێت؟ چونکە لە وەتەی شەڕی کەنداوەوە ناڕازیبوون لە نێو ڕیزەکانی موجاهیدین زۆر فرەوان بووبوو و ئەندامان بەئاشکرا گلەییان دەکرد. ئایا ڕێکخراوەکە لە بەردەوامیی هاوکاریکردنی سەدام و

پەلاماردانی ئێران بەڕێگەیەکی بەستراو گەیشتووە؟ سوبحانی کە بەرپرسی ٥٠ پاسەوانەکەی ڕەجەوی بوو و لە ئەنجامیشدا ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو یەکێک لەو ئەندامانەی موجاهیدینە کە بەئاشکرا گلەیی دەکرد. سوبحانی باسی کۆبونەوەیەکی کۆمیتەی ناوەندیم بۆ دەکات لە ساڵی ١٩٩٢دا لە بنکەی باقرزادەی نزیک بەغدا کە بارەگای ڕەجەویی لێیە. "چەند پرسیارێکم لە بارەی ستراتیجی موجاهیدین کرد. ڕەجەوی جارێکی تر دەیویست پەلامارەکان و پاڵپەستۆکان زیاتر بکرێن بۆ زیاترکردنی گرژیی نێوان عێراق و ئێران بۆ ئەوەی بۆمان بلوێ هێرش بکەینە سەر ئێران. من هەستم دەکرد کاتی بەرگریی چەکداری بەسەر چووە و پێویستە ئێمە زیاتر ڕوو لە کاری سیاسیی بکەین. هەروەها بۆچوونەکانمان لە نێو هاوولاتییانی ئێران لە کارگەکان و لە نێو قوتابییاندا بڵاو بکەینەوە."

ڕەجەوی بڕیاری خۆی دابوو. هیچ گرینگیشی بەڕەخنەکانی سەرۆکی دەستەی هەوالگریی خۆی نەدا. لە ئەنجامدا سوبحانی دەکەوێتە ژێر پاڵەپستۆ. "ئەندامەکانی تر منیان دەناسی، بۆیە ئەگەر کەسێکی وەک من لەو پایەیە وای لێ بکرێت پرسیاری تر لە ناو موجاهیدیندا سەر هەڵدەدەن و ئەندامانی تریش وەک من بەرهەڵستکاریی سەرکردە دەکەن". ئەندامەکانی تری کۆمیتەی ناوەندی قسەی زۆر و دۆستانەیان لەگەڵ ڕەجەویدا کرد. "بەخۆم تکام لێ کرد و گوتم: بمکە بەئەندامێکی ئاسایی و لە کۆمیتەی ناوەندی دەرم بکە. ئەوسا دەتوانم موجاهیدین بەجێ بهێڵم، وا نییە؟"

هەر واشی لێ هات، بەڵام ئەوە تەنیا سەرەتای توندوتیژیی دژ بەسوبحانی بوو: لێی دەدرێت، دەیبەنە زیندان و لە کۆبوونەوە گشتییەکاندا نەفرەتی لێ دەکرێت لەبەرئەوەی ناپاکە و نۆکەری ئێرانە و کۆنە هاوڕێکانی تفی لێ دەکەن، چونکە لە پلە و پایە هێنرابووە خوارەوە بۆیە دەتوانرا وەک ئەندامێکی ئاسایی ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێت.

سوبحانی لە زیندانەوە ناگەڕێتەوە بۆ لای هاوڕێکانی، چونکە هیچ ئامادە نەبوو بۆچوون و هەڵوێستەکانی بگۆڕێت. بەڵام لەگەڵ کۆنە ئەندامی تری موجاهیدین قسەم کردووە تووشی هەمان گرفت بووبوون و ئەوان قایل بوون پەشیمان ببنەوە و دان بەوەدا بنێن کە هەڵە بوونە. ئەوانە دەگەڕانەوە ناو ڕێکخراوەکە، بێگومان بەپلەیەکی نزمترەوە. بەڵام ئەو کات موجاهیدین ڕێگەی نەدەدا ئەندامەکانی دەست لە کار

بکێشنەوە یاخۆ ڕێکخراوەکە جێ بهێڵن. لە ناو موجاهیدین تەنیا ڕێگە ئەوە بوو گوێڕایەڵی یاخۆ زیندان. ڕەنگە هەر لەو سەروبەندانەدا بێت حەسەنی باوکی یاسر کارە نوێیەکەی پێ سپێردرا بێت، ببێتە پاسەوانی زیندان.

باشە بۆچی ڕەجەوی بەم شێوەیە چووبووە کەلی شەیتان؟ من پێم وایە ئەگەر وای نەکردایە و دەرگەکانی بکردایەوە ئەوا کۆڕەو دەستی پێ دەکرد. ئەویش هیچ ڕێگەیەکی تری نەبوو جگە لە شەڕی پارتیزانی، تەنانەت ئەگەر ئەندامەکانیشی ڕێگەیەکی تریان پێ باشتر بووایە. بۆیە ئەو ڕێگە سیاسییەی سوبحانی لە کۆبونەوەکەدا باسی کرد نەمابوو: خۆ ڕەجەوی ئەو ڕێکخراوە سەربازییەی لە هیچ و خۆڕایی دانەمەزراندووە.

دەبوایەش شەڕیان شەڕێکی پارتیزانی بووایە، چونکە عێراق لە حاڵەتی ئاشتیدا بوو لەگەڵ ئێران و هاوپەیمانان پاش شەڕی کەنداو ناوچەی دژەفڕینیان بەسەر عێراقدا سەپاندبوو، بۆیە نەدەکرا ڕەجەوی شەڕێکی کراوە بەرپا بکات. ڕەجەویش لەو حاڵەدا نەبوو هەرچی بیەوێ بیکا، چونکە سەدام لەکاتی گرژیدا لەگەڵ ئێران چالاکییەکانی موجاهیدین بەکار دەهێنێت و لە شێنەییدا ڕێگەیان نادات شتێک دژی ئێران بکەن.

لە ساڵی ١٩٩٢ چەند تیمێکی تایبەتی موجاهیدین بەهاوکاریی هەواڵگریی عێراق چوونە ناو خاکی ئێرانەوە. لە تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا چەند تەقینەوەیەک لە دەرەوەی مەزاری ئایەتوڵڵا خومەینی لە نزیک تاران کە ڕۆژانە سەدان کەس سەردانی دەکەن ڕوو دەدەن. ئەوەی مایەی سەرنجە هیچ کەسێک لەو تەقینەوانە نابێتە قوربانی.

تیرۆر تەنیا لە عێراقەوە نابێت. لە تەممووزی ١٩٩٢دا تەقە لە ئۆتۆمبێلی وەزیری دەرەوەی ئێران ویلایەتی دەکرێت لە کاتی سەردانێکی بۆ شاری بۆتسدام. ئەم کارە توندوتیژانە – وەک هاوکارییە بێ قەید و شەرتەکەی بۆ سەدام حوسێن – کاری خراپ دەکەنە سەر وێنەی ڕەجەوی لە ڕۆژئاوادا. هەر بۆیە ڕەجەوی لە ١٩٩٣دا دووبارە مریەم دەنێرێتەوە پاریس، بۆ ئەوەی ئاڵۆزییەکان کەمتر بکاتەوە و وەک کاندیدێک بۆ هەڵبژاردنەکانی پۆستی سەرۆکی حکوومەتی کاتیی ئێرانی و سەرۆکی

ئەنجوومەنی نیشتیمانیی بەرەنگاری، کە ڕوخساری سیاسیی پاکی موجاهیدین بوو بەڵام لە کۆتاییدا هەموو ڕێکخراوەکانی تر بەجێیان هێشت.

پلانی ناردنی مریەم ئەوە بوو کە پاشان ڕەوانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای بکەن بۆ ئەوەی بارەگایەکی موجاهیدین لەوێ دابمەزرێنێت. بەڵام ئەمەریکاییەکان ڤیزەیان بەمریەم نەبەخشی چونکە تا دەهات ڕەخنەکان بۆ موجاهیدین زیاتر دەبوون. لە کۆتای ساڵی ١٩٩٤دا وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا ڕاپۆرتێک بڵاو دەکاتەوە تیایدا موجاهیدینی خەلق بە"ڕێکخراوێکی تیرۆریست" ناو دەبات. لە پاش ئەوەش وەزارەت هەموو پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ موجاهیدین دەپچڕێت. بەمەش گورزێکی گەورە لە ڕەجەوی دەدات.

لە کاتێکدا هەوڵ دەدەم بزانم هەڵوێستی ئەمەریکا تا چەند بەرامبەر موجاهیدین توند بووە، نووسینێکی مەسعود بەنیسەدر دەکەوێتە بەرچاوم لە بارەی ژیانی خۆی لە نێو موجاهیدینی خەلقدا نووسیبووی و لە کتێبێکدا (بیرەوەرییەکانی یاخیبوویەکی ئێرانی- لەندەن ٢٠٠٤). ئەم بەنیسەدرە برازای سەرۆکی پێشووی ئێران ئەبولحەسەن بەنیسەدرە کە لەگەڵ ڕەجەوی لە ئێران ڕایان کرد.

بەنیسەدر کە ئەو کات نوێنەری موجاهیدین و ئەنجوومەنی نیشتیمانیی بەرەنگاریی ئێرانی بوو لە واشنتن دەنووسێت: "چەندین ساڵ بوو ڕێکخراوەکەمان دەیویست وا پێشان بدات کە ئەمەریکا لە شەڕەکەی ئێمە لە دژی ڕێژیمی ئێران پشتگیریی تەواومان دەکات." بەڵام ئەو هەوڵە دیبلۆماسییانەی مریەم و سەدان ئیمزای ئەندامانی کۆنگریس و وێنەیەکی بیل کلنتۆن لەگەڵ وەزیری دەرەوەی موجاهیدین هەموویان بوونە بڵقی سەر ئاو".

لەوەش گرینگتر ڕاپۆرتەکەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا دەرەنجامی زۆری دەبێت لەسەر ئاواتەکانی موجاهیدین لە بارەی هێرشکردنە سەر ئێران بۆ ڕووخاندنی حکوومەتەکەی. بەنیسەدر لە بارەی ڕاپۆرتەکە نووسیویەتی: "ئەو ڕاپۆرتە ئاواتەکانی ئێمەی ژێر گڵ کرد، چونکە جارێکی تر عێراقییەکان ڕێگە نادەن بەهەموو چەک و تفاقمانەوە سنووری ئێران ببەزێنین. چونکە ئەگەر هێرشەکەمان سەری نەگرت بەدەستێوەردان و هێرشێکی (عێراقییەکان) دەژمێردرێت لە دژی ئێران و ڕەنگە ببێتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوان ئێرانێکی بەهێز و خاوەن پشتگیریی

نێودەوڵەتی و عێراقێکی لاواز و دابڕاو، بگرە عێراقیش تووشی تووڕەبوونی ئەمەریکا و بەریتانیا دەکات و لە ئەنجامدا ڕێگە خۆش دەبێت بۆ داگیرکردنی و گۆڕینی حکوومەتەکەی".

بەکورتی هۆی مانی موجاهیدینی خەلق، کە گرتنی دەسەڵات لە ئێران بەڕێگەی خەباتی چەکداری بوو، بەشاپێک لەسەر مێزەکە لابرا. ڕەجەویش ئەم ڕاستییەی بۆ پیاوانی خۆی ڕوون نەکردەوە: تەنیا چەند کەسێکی دەستنیشانکراوی وەک ئەوانەی لە ئاستی بەنیسەدر بوون لەم بارودۆخە ئاگەدار بوون.

کە ڕەجەوی لە ١٩٩٦دا مریەمی بانگهێشتی عێراق کردەوە بۆ هەموو لایەک ڕوون دەبێتەوە کە سێ ساڵ مانەوەکەی و ئەو هەموو خەرجییە زۆرە بەفیڕۆ چوون. کەواتە بەئاسانی دەتوانم هۆی ئەو شەپۆلی توندوتیژییەی ئەو کاتی ناو ڕێکخراوەکە دیاری بکەم. ڕەجەوی وەک شێری لە قەفەسکراو تۆڵەی شکستەکانی خۆی لە پیاوانی خۆی دەکاتەوە. هەموو ئەندامانی موجاهیدین لە ڕۆئاوا بانگهێشتن دەکات و سزای هەموو ئەوانە دەدات کە گومانی سیخوڕییان لێ دەکات. چالاکیی شەڕی پارتیزانیی تیمە تایبەتەکانیش کە لە ساڵی ١٩٩٣دا دەستیان پێ کرد زۆربەیان شکستیان هێنابوو. بۆیە ئەو بۆچوونە لای ڕەجەوی دروست دەبێت کە ڕێکخراوەکەی سیخوڕی تێدایە.

سەدان ئەندامی موجاهیدین لە زیندان دەنرێن و پاشان لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت و ئەشکەنجە دەدرێن، ئەندامی وەک حەسەن عیزەتیی باوکی یاسر. پاش ئەوەی ئەو زیندانییانە بەزەبری ئەشکەنجە دانپێدانان دەنووسن، ئینجا بەر بەزەیی دەکەون و دووبارە دەیانهێننەوە ناو ڕێکخراوەکە و ئەوانیش سوپاسگوزارن، چونکە لە ئەشکەنجە ڕزگاریان بوو و لەو ڕۆژە بەدواوە ئاگەداری خۆیان دەبن و چی تر ڕەخنەکانی خۆیان ئاشکرا ناکەن. ئەم توندوتیژییانەی دوو ساڵی ڕابردوو لە ساڵانی داهاتوودا دووبارە و دەبارە دەکرێنەوە. لە ساڵی ١٩٩٤یشدا یەکەمین کەس لە ژێر ئەشکەنجە گیان لە دەست دەدات.

لە ڕووی سیاسییەوە ئەو کات کاتێکی سەخت بوو بۆ موجاهیدین، چونکە لە ئێران سەرۆکی ڕیفۆرمخواز خاتەمی بەسەرۆکی وڵات بەزۆرینەی دەنگ و پشتگیرییەکی زۆرەوە هەڵدەبژێرێت. دەنگوباسی ئەو گۆڕانکارییانەی خاتەمی ئەنجامیان دەدات سەرەڕای سانسۆر دەگەنە ئەندامانی موجاهیدین. ئەوانیش لە ئەنجامدا داوا دەکەن

ڕەجەویش هەمان ئەو گۆڕانکارییانە ئەنجام بدات و دەرگەیان بۆ بکاتەوە. بەڵام ئەو داوایان لێ دەکات لەگەڵی بمێنن چونکە ڕێژیمی ئێران لە ساڵی ٢٠٠٠دا دەڕووخێت و پێویستە خۆیان لە بینینی ئەو ڕووداوە بێ بەش نەکەن.

بەڵام بۆ لە ساڵی ٢٠٠٠دا دەڕووخێت؟ ئەو پرسیارەم لە چەند ئەندامێکی موجاهیدین کرد و کەس وەڵامی پێ نەبوو. ئاخ، هەموو جارێک بەئێمەیان دەگوت شەش مانگی تر بەنمایشی سەربازی دەچینە ناو تاران و هەموو جارێک باوەڕمان پێیان دەکرد. ئەوان مەبەستێکیان بۆ ژیانی ئێمە دابین دەکرد. ڕەنگە ڕەجەوی لەبەرئەوە ساڵی ٢٠٠٠ی هەڵبژارد چونکە سەرەتای هەزارەی نوێیە. ڕەنگە پێوەندیی بەوادەی دووبارە هەڵبژاردنی سەرۆک خاتەمی لە ساڵی پاشترەوە هەبێت.

بەهەرحاڵ موجاهیدین جارێکی تر بڕیاریان دا بەزەقی ڕای گەیەنن ئەوان "تەنیا نوێنەری ڕاستەقینەی ئۆپۆزسیۆن"ن و هەوڵی لەناوبردنی حکوومەت دەدەن کە زەمانێکە چاوەڕوان دەکرێت. پاش ئەوە موجاهیدین بەگوللە هاوەن پەلاماری دامەزراوە سەربازی و حکوومییە ئێرانییەکان دەدەن و بەرپرسی ئێرانیی پایە بەرز تیرۆر دەکەن. تەنانەت کۆشکی کۆماریی خاتەمیش بۆمباران دەکرێت، ئەمەش ئێران تووڕە دەکات و لە وەڵامدا تۆڵە لە کەمپ و بنکەکانی موجاهیدین لە عێراق دەکاتەوە. سەرباری ئەو کارانە خاتەمی بەئاسانی لە ساڵی ٢٠٠١دا هەڵدەبژێرێتەوە.

لە عێراقیش بارودۆخەکە بەرەو باشتر ناچێت. وڵات لە ژێر باری ئابڵووقەی UNدا دەناڵێ و جارێکی تر لە کانوونی یەکەمی ١٩٩٨دا بۆمباران دەکرێت پاش ئەوەی سەدام دیسان ڕێگە ناداتە پشکێنەرە نێودەوڵەتییەکانی چەک، سەر لە چەند بنکەیەک بدەن. ڕەجەوی پاش ئەو هەموو ساڵانەی گفتوگۆ لەگەڵ سەدام، پشتگیری و دڵسۆزیی نەگۆڕی خۆی بۆ دووپات دەکاتەوە، بەڵام پاش هەڵبژاردنەوەی خاتەمی درک بەو ڕاستییە دەکات کە لەناوچوونی خۆی و سەدام حوسێن نزیک بووە. لە مانگی تشرینی دووەمی ٢٠٠١دا گەورە بەرپرسانی ڕێکخراوەکەی کە ٥٠٠ ئەندامن کۆ کردەوە، بۆ ئەوەی پلانەکەی خۆی بۆیان بخاتە ڕوو "قۆناغی ڕەش".

ڕەجەوی – بەپێچەوانەی سەدام – دەیزانی هێرشێکی فرەوانی ئەمەریکاییەکان بۆ سەر عێراق مسۆگەرە. ڕەجەوی لە سەدام حوسێن زیاتری دەزانی، چونکە سەدام

ئەوسا تەنیا ئەو زانیارییانەی ئەو حەزی لێ بوون لە ستافە تۆقیوەکەی وەردەگرت. هەر بۆیەش ڕەجەوی دەیزانی گەیاندنی ئەو زانیارییانە بۆ سەرووی خۆی بێ سوودە. ڕەجەوی لەو کۆبوونەوەیەدا سوێند دەخوات کە لە حاڵەتی ڕوودانی هێرشی ئەمەریکا موجاهیدین هیچیان لە بەردەست نامێنێ جگە لە ئەنجامدانی هێرشێکی فرەوان بۆ سەر ئێران.

ئەم قسانەی ڕەجەوی دوایین ڕێگە بوو بۆ کپکردنی ڕەخنەکان و جۆشدانی پێکەوە کارکردن. بەگوتەی کۆنە ئەندامانی موجاهیدین ئەو چەندین جار ئەو شێوازەی بەکار هێناوە. بەڵام ئەمجارەیان بۆ چاوبەستنە و زوو ئاشکرا دەبێت کاتێ ڕای دەگەیەنێت خۆی و مریەم و ٣٠٠ ئەندامی تر عێراق بەجێ دەهێڵن و دەچنە بارەگا نوێیەکەیان لە ڕۆئاوا بۆ ئەوەی بتوانن لەوێوە و دوور لە هەرا و هۆریای شەڕ کارەکان بەڕێوە ببەن.

هەر لە ٢٠٠٢ەوە دەیان موجاهید بەرەو ڕۆئاوا دەڕۆیشتن و لەوانە مریەم ڕەجەوی کە گەڕایەوە بۆ پاریس. بەڵام هەمووو ئەوانەی دەچنە ئەوێ پەناگە بۆ خۆیان نادۆزنەوە. کاتێکیش ئەمەریکاییەکان لە ٢٠٠٣ بەڕاستی عێراق داگیر دەکەن، دەیان ئەندامی موجاهیدین لەو ٣٠٠ی ڕەجەوی بۆ چوونە ڕۆئاوا هەڵی بژاردبوون، لەسەر سنوورەکانی عێراق لەگەڵ سووریا و ئوردن گیریان خواردبوو.

لە ساڵی ٢٠٠٣دا ئەندامانی موجاهیدین لە کەمپی ئەشرەف کە ژمارەیان ٦ هەزار ئەندام بوو بانگ کرانە هۆڵی کۆبوونەوەکان بۆ ئەوەی گوێیان لە چیرۆکێکی کەمێک جیاوازتر بێت. یاسریش لەوێ ئامادە بوو. ئەو وەبیری دێتەوە چۆن ڕەجەوی بەئامادەبووانی دەگوت ئێستا کاتی پەلاماردانی ئێرانە. "ئەوەی دەیەوێ بڕوات دەتوانێ بڕواتە ئێران. ئەگینا ئەوەی ماوە تەنیا مەسەلەی کاتە تاوەکو خاتەمی ڕاو دەنرێت".

ئەو پڕوپاگەندەیەی ڕەجەوی نەک تەنیا بەئەندامانی خۆی گەیشت. بەگوتەی ئەو کۆنە ئەندامانەی قسەم لەگەڵیان کرد، بۆم دەردەکەوێت کە سیخوڕی ئێران لە ناو ڕێکخراوەکەدا زۆر بوون. ئەو سیخوڕانەش بێ سێ و دوو هەواڵی ئەو بڕیارەی ڕەجەوییان بەمەلاکانی ئێران گەیاند. ئێرانیش لە لای خۆیەوە، پاش داگیرکردنی عێراق، بەتەواوی خۆی بۆ ئەگەری هێرشێکی موجاهیدین ساز دەکات. بەپێی

ڕاپۆرتەکانی میدیاکانی ڕۆئاوا ئێران نزیکەی ٥ هەزار چەکداری فەیلەقی بەدر دەنێرێتە باکوری عێراق. ئەم شیعە عێراقییانەی لە ئێران مەشقیان پێ کراوە سازدراون بۆ ئەوەی بەرپەرچی هێرشی چاوەڕوانکراوی موجاهیدین بدەنەوە.

ئەوە بوو لە سەرەتای ئاداری ٢٠٠٣دا ژمارەیەکی زۆر موجاهیدین بۆ ناوچەی شاخاویی نزیک جەلەولا دەکشێنەوە و لەوێ چاوەڕێی فەرمانی دەستپێکردنی هێرش بۆ سەر ئێران دەکەن. ماوەیەکی کەم پاش هێرشی ئەمەریکا بۆ سەر عێراق، شەڕی قورس لەگەڵ کوردەکان دەست پێ دەکات و بەپێی هەندێک سەرچاوە دژی فەیلەقی بەدریش، کوردەکان ڕقی خۆیان بەبنکەکانی موجاهیدین دەڕێژن و هەر کەسێکیان لەوێ بەردەست کەوتبا دەیانکوشت. دیسان پلانی هێرشکردن بۆ سەر ئێران یەکسان دەبێ بەهیچ، چونکە بەبێ پشتگیریی عێراق سوپا بچووکەکەی موجاهیدین لە بەرامبەر سوپا مەزن و باش مەشق پێکراوەکەی ئێران هیچ دەسەڵاتی نییە.

هەر ١٦ بنکەکەی موجاهیدین کە بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش وەبەر بۆمبارانکردنی ئەمەریکا نەکەوتبوون نە لە ساڵی ١٩٩١ و نە لە ١٩٩٨دا ئەمجارەیان بەقورسی بۆمباران کران. زۆربەی بنکەکان چۆڵ کرابوون چونکە زۆربەی موجاهیدین لە نزیک جەلەولا خۆیان قایم کردبوو. چەند یەکەیەکی موجاهیدین، کە لە نزیک ئاواییە گرینگەکانی حزبی بەعسی سەدام حوسێن بوون لە شوێنی خۆیان مانەوە. لە چەند پێگەیەکیش یەکەکانی موجاهیدین شان بەشانی سوپای عێراق شەڕیان دەکرد. بەگشتی قوربانییانی موجاهیدین لەو شەڕانەدا ٣٠ کوژراو بوون.

لە ٩ی نیسان کە بەغدا ڕووخا، هەروەها کەمپەکانی موجاهیدینیش دەکەونە دەستی ئەمەریکاییەکان. بەمەش کۆتایی بەڕۆڵی موجاهیدین وەک سوپای تایبەتیی سەدام حوسێن هات و پاش چەندین ساڵی پشتگیری، سەدام حوسێن و ڕەجەوی لەیەک دادەبڕێن.

سەدام ڕاو دەنرێت و پاشان دەستگیر و زیندان دەکرێت و بەهۆی تاوانەکانی دادگایی دەکرێت و لە کۆتاییدا لە سێدارە دەدرێت. ڕەجەوی باشتر خۆی دەپارێزێت. هێشتا ڕۆڵی ئەو کۆتاییی نەهاتووە.

# پشکی سێیەم

## رێبازی ڕەجەوی: پەرت کە و زاڵ بە

کۆنە موجاهیدین هەندێک بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە و بەدەمی داچەقیوەوە گوێیان لە چیرۆکەکانی چەرمەسەریی هەڤالانیان دەگرت. ئەمەشیان بەشێکی تری چیرۆکەکەیە، یەکێک لەوانە لە یەکێک لەو کۆبوونەوانەی کۆنە موجاهیدین سەیرم دەکات و ئاخێک دەکێشێت. ئەمەیە هۆی ئەوەی کۆنە ئەندامانی موجاهیدین حەزیان لێیە گوێ لەو چیرۆکانە بگرن کە هەڤالانیان بۆمیان دەگێڕایەوە و ئامادەبوون بەخۆشحاڵییەوە قسەکانم بۆ وەرگێڕن. ئەوان بەبیستنی ئەو چیرۆکانە تەنانەت ژیرتریش دەبوون و هەندێ وەڵامیشیان بۆ پرسیارەکانی خۆیان چنگ دەکەوت.

تەنیا یەک کەس لە ناو موجاهیدینی خەلق هەبوو کە هەموو ئەندامەکانی دەناسی، ئەویش مەسعود ڕەجەوی بوو. ئەندامی ئاسایی، تەنانەت ئەگەر لە ئاستی بەرزیش بووایە ئەو شتانەی دەزانی کە ڕێگەی پێ درابوو بیانزانێت. ئەندامی وەک مەسعود خودابەندە، کە ماوەیەکی درێژ پلەیەکی بەرزی هەبوو و کاری هەواڵگریی دەکرد، لە کەسانی تر زیاتری دەزانی، بەڵام تەنیا ڕەجەوی هەموو شتەکانی دەزانی. بۆیە یاسر عیزەتی کە نەخشەی کەمپی ئەشرەفی بۆم کێشا نەیتوانی زیاتر لە هێڵکارییەکی سادەم بۆ بکێشێت. دابەش بکە و زاڵ بە بەشێکی گرینگی ڕێبازی ڕەجەوی پێک دەهێنێت – بەتایبەتی لە بارەی زانیارییەکانەوە.

هەوڵم دا بزانم چ شتێک لە ناو ئەو ڕێبازەدا هەیە ببێتە بناغە بۆ ئەو تیرەیەی ڕەجەوی لە دەوروبەری خۆی دروستی کردبوو. چونکە پاش شیکردنەوەی ڕێبازەکە بۆمان دەردەکەوێ بۆچی ناکرێ موجاهیدین چی تر بەرێکخراو ناو ببەین.

ئەو ڕێبازەی باسی لێوە دەکەین، پاش هەڵاتنی ڕەجەوی لە ئێران لە ١٩٨١ هاتە کایەوە. ڕەجەوی کە لە ئێران دەرچوو ئیتر ئازادبوو چی بکات، هەرچەندە ئەندامگەلێ هەبوون بەڕوح و گیان خۆیان بۆ ئامانجە سیاسییەکە تەرخان کردووە و

ئامادەن لە پێناویدا خۆیان بەکوشت بدەن. ئەمانە هەستیان دەکرد کاریزما و وتارە ئاگرینەکان و ژیری و لێهاتوویی ڕەجەوی ڕایان دەکێشێت. بەڵام هەریەک لەو ئەندامانە ڕا و بۆچوونی تایبەتی خۆی لەمەڕ پرسەکانەوە هەیە، زۆر لە ئەندامانی موجاهیدین لە توێژی مامناوەندیی کۆمەڵگە و خاوەن بڕوانامەی زانکۆ بوون. ئەوانە دەبێ لەو بارودۆخە سەربازییە گوێ بۆ ڕەجەوی شل بکەن بەبێ ئەوەی هیچ گومانێک لە بڕیارەکانی بکەن.

پێم وا نییە نیازیان ئەوە بوو ئەندامەکانیان بکەن بەڕۆبۆت، کە زۆربەی کۆنە ئەندامەکان ئەو ناوەیان لە خۆ دەنا، بەڵام کۆتاییەکەی بەوە گەیشت. چۆن ڕەجەوی توانیی لەمەدا سەرکەوتن وەدەست بێنێت؟ ئەمە لە زانیارییە وردەکانی کۆنە ئەندامان بۆمیان باس کرد ڕوون دەبێتەوە. لە زۆر لە ئاخاوتنەکانمان کە پڕبوون لە نوکتە و گەپ ئەو کۆنە ئەندامانە سەری خۆیان بادەدا و پێدەکەنین بەوەی چۆن ئەوان بەو شتە هیچ و پووچانە تەواو بڕوایان کردبوو.

کە دەگوترێ مەسعود ڕەجەوی کاریزمای هەیە ئەوە بۆ من زۆر ڕوون و ئاشکرایە لەو فیلمە ڤیدیۆییانەدا بۆ دەیان کۆبوونەوەی جەماوەری گیراون کە هەزاران ئەندامی موجاهیدین تیایدا بەشدار دەبوون، هەرچەندە لە قسەکانیش تێ ناگەم. ئەو قسەکەرێکی بەسۆزە و زۆر دەست و مشتەکانی بەکار دەهێنێ بۆ ئەوەی وتەکانی بەهێزتر بکات. ئەو دەزانێ چۆن مەبەستی خۆی بەجەماوەر دەگەیەنێت وەک دەبینرێت ئامادەبووان بەچەپڵەڕێزان هەڵدەستنە سەرپێ و ستایشی دەکەن. تەنانەت یاسر عیزەتیش -کە زۆر ڕەخنەگرە- وتارەکانی ڕەجەوی زۆر کاری تێ دەکەن. بێگومان ڕەجەوی پیاوێکی زیرەکە: ئەگینا نەیدەتوانی تا سەر وەک تاکە سەرکردە بمێنێتەوە. ئەو لە سەرەتاکانی ژیانییەوە زۆر بایەخ بەدەسەڵات دەدا، کاتێ قوتابی بوو سەرکردەیەکی سیاسی بوو. ڕەجەوی کەسێکی ژیرە و زۆر دەخوێنێتەوە، هەرچەندە خوێندنی خۆی لە زانستی سیاسی تەواو نەکردووە. ئەو، وەک ئەوانەی لە نزیکەوە دەیناسن بۆمیان باس کرد، مرۆڤێکە بەردەوام زۆر دەخوێنێ و وەک مەسعود خودابەندە دەڵێ زۆریش بایەخ بەکتێبەکانی دەروونناسی دەدات.

خودابەندە چەند ساڵێک لە عێراق لە نزیک ڕەجەویدا کاری کردووە. پاش دەرچوونیشی لە ڕیزەکانی موجاهیدین یەکێکە لەو کەسانەی چوونەتە ژێر باری

چارەسەری دەروونییەوە بۆ ئەوەی بزانێت چۆن مەسعود ڕەجەوی توانیویەتی بۆ ماوەی ٢٥ ساڵی ڕەبەق لە خشتەی ببات. خودابەندە دەتوانێ ئێستا بەهۆی ئەو زانیارییانەوەی لە پزیشکی دەروونی بۆی ئاشکرا بوون خاڵ بەخاڵ خەسڵەتەکانی تیرەکەی ڕەجەوی دەستنیشان بکات.

خودابەندە ئێستا بۆی دەرکەوتووە کە ئەو کتێبانەی دەروونناسی کە ڕەجەوی بەپەرۆشەوە دەیخوێندنەوە بووبوونە بناغەی نامیلکەی ڕێساکانی ئەو تیرەیەی بەتەما بوو دروستی بکات. خودابەندە بەدڵنیاییەوە دەڵێ: "ئەو خۆی بیرۆکەی دروستکردنی تیرەکەی دانەناوە، ئەو تەنیا ئەوەی لە کتێبەکاندا هەبووە جێبەجێی کردوون." پاشان خودابەندە دانپێدانانێک لە زاری دەردەچێت و دەڵێ: "من زۆر لەو کتێبانەم لە زمانی ئینگلیزییەوە بۆی وەرگێڕاوە. نەمدەزانی دواتر بۆ چی بەکاریان دەهێنێت. ئەو کتێبانە تەنیا کتێب بوون کە کاتێ مریەمی فێر دەکرد پێی گوتبوو بیانخوێنێت. هیچ یەک لەو کارانەی ڕەجەوی هی هزری خۆی نین، بگرە ئەزموونی کەسانی ترە و تاقی کراونەتەوە و ئەنجامەکانیان ئاشکران."

بەڵام وەک ئەو پزیشکە دەروونییەی چارەسەری خودابەندەی کردووە دەڵێت، ئەو ئەزموونانە تەنیا ئەو کاتە سەردەکەون کە متمانەیەکی تەواوی بەسەرکردە هەبێت. ئەمەش ڕێک لەگەڵ بارودۆخی موجاهیدیندا دەگونجێت وەک خودابەندە دەڵێ. "ڕەنگە ئەمەش خەتای حکوومەتی ئێران بێت لە سەردەمی شۆڕشدا. بەڵام لەبەر ئەو شتە کرێت و هۆڤانەی لە ئێران ڕوویان دا، خەڵکی ناچار بوون باوەڕ و متمانەیەکی لە سەدا سەد بەڕەجەوی بکەن. ئەویش ئەو متمانەیەی قۆستەوە و تیرەیەکی بۆ خۆی دروست کرد."

ئەو متمانەیەش هەڵقوڵاوی پێگەی ڕەجەوییە. ئەو تاکە سەرکردەیەک بوو لە دەستەی سەرکردەکانی بزووتنەوەی سەرەتاکانی حەفتاکان. ئەو دەزانێ – وەک ئەندامەکان دەیانگوت، بارودۆخ لە زینداندا چۆنە و کە ئەشکەنجەت دەدەن چۆنە. ئەو زۆر باش ئەم شتانە دەزانێت: ئەمەیان هیچ گومانی تێدا نییە.

هەر لە سەرەتاوە موجاهیدین ڕقیان وەک ئامرازێکی بەهێز بۆ هێنانە دیی یەکگرتن بەکار هێنا. ئەویش ڕق لەو ڕێژیمەی ئێران کە باوک و دایک و برا و خوشک و مام و پلکەکانی ئەندامانی زیندان و ئەشکەنجە و گوللەباران کردبوو. ئاخر

نزیکەی هەموو ئەندامانی موجاهیدین ئەندامێکی خێزانەکەیان لەبەر پێوەندییان بەموجاهیدینەوە لە دەست دابوو. وەک خودابەندە دەڵێ: "هەموومان زیان لێکەوتوو بووین." هەر بۆیەش ئەو ڕقە لە ڕێژیم خاکێکی بەپیتی هەبوو بۆ ئەوەی لەسەری گەشە بکات. زیادبوونی ژمارەی گوللەبارانکراوەکان زیادبوونی ئەندامانی موجاهیدینی مسۆگەر دەکرد، ئەمەش لە پاڵ پەیامە دووبارەکراوەکە کە دەیگوت موجاهیدین تاکە هێزە توانای ڕزگارکردنی گەلی ئێرانی هەیە کە زۆریان لەسەر دەستی مەلا بێ بەزەییەکان چەشتووە.

ئەم باوەڕەش لای موجاهیدین وەک ئاینێکی لێ هات. وێنەی ئەو زیندانییە ئەشکەنجەدراو و لە سێدارەدراوانە، کە ڕێکخراوەکە لە شەقامەکانی ئەوروپادا بۆ کۆکردنەوەی پارە بەکاریان دەهێنێ، بەشێک بوو لە پرۆسەی مێشک ئاودان لە ناو موجاهیدیندا. دڵڕەقیی ئایەتوڵلا خومەینیش هۆکارێکی تر بوو بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتی ڕەجەوی لە نێو خەڵکی خۆی چونکە هەزاران ئەندامی موجاهیدینی لە ماوەی نێوان ١٩٨١ تا ١٩٨٨ کوشت، وەک ئاشکراشە شەهید دەبێتە بەهانەی خەباتکردن. هەروەها پێویستە ڕەجەوی سوپاسی شا بکات، چونکە بەهۆی زۆرداریی ئەوەوە موجاهیدین هەموو هۆشێکی پێوەست بەپێوەر و بەهای سیاسی لە دەست دەدەن. ئەوان هەرگیز دەرفەتیان نەبووە درک بەو ڕاستییە بکەن کە لە سیستمێکی دیموکراسیدا سەرکردەی هەڵبژێردراو بۆی نییە هەموو دەسەڵاتەکان بۆ خۆی پاوان بکات وەک ئەوەی لە "دیموکراسییەکەی" ڕەجەویدا هەبوو.

ئەوەی ڕاستی بێ موجاهیدین لە تاریکاییی نەفامیی سیاسیدا بوون. بۆیە بۆم دەردەکەوێ بۆچی ئەوان کاتێک درکیان بەبوونی هەڵە یا چەوتییەک دەکرد، بەئاسانی ڕێگەیان دەدا دەنگیان کپ بکرێت. من چەندین جار ئەوەم لێیان بیست کە ئەندامەکان خۆیان بەوە قایل دەکرد کە "کێشەکانی ئێمە گرینگ نین، ئەگەر هاتو لەگەڵ دەردەسەرییەکانی گەلی ئێرانمان بەراورد کرد. بۆیە دەبێ تانە لە خۆمان بدەین و خۆمان لاواز پیشان نەدەین." هەر بۆیەش ئەوەندە ئافرەتی موجاهیدین، وەک لە پێشەوە باسم کرد، پێوەندییان بەمن دەکرد کاتێک نووسیاری بەشی ڕۆهەڵاتی ناڤین لە کۆواری Trouwی هۆڵەندی بووم. ئەو ئافرەتانە لە پێوەندییەکانیاندا دەگریان کاتێک باسی بەسەرهاتی ئافرەتانی ئێرانیان بۆم دەکرد،

هەرچەندە ژیانی ئەوانیش خۆش نەبوو.

لە سەرەتاوە ڕەجەوی بەوە کۆنترۆڵی خەڵکەکەی خۆی کردبوو کە قایلیانی کردبوو بەوەی دەبێ هەمیشە ساز و ئامادە بن بۆ خەبات چونکە "ڕێژیم سبەی دەڕووخێت".

لە سەرەتای پێوەندیکردنیانەوە ئەندامان کاری قورس و بەردەوامیان پێ دەکرێت بۆ ئەوەی هیچ توانای بیرکردنەوەیان نەمێنێت. ئەوانەی لە ئەورووپا بوون فایل و کۆوار و بڵاوکراوەیان پێ دروست دەکردن بۆ ئەوەی بۆ ئێرانی بنێرن. لە کەمپی ئەشرەفیشدا بەئیشوکاری بێ سوود سەرقاڵ دەکران.

مەسعود خودابەندە گوتی وای لێ هات باسکردنی بەردەوامی کوژرانی کەسوکاری ئەندامەکان و ئەوەی کە مەسعود ڕەجەوی گەلی ئێران ڕزگار بکات بەس نەبوو. چونکە تیرە بەخێوکردنی بەردەوامی گەرەکە. "تۆ دەبێ ڕۆژانە مێشکی ئەندامان بۆمباران بکەیت: ئەگینا هەموو ماندووبوونت بەفیرۆ دەڕوات. دەبێتیش ئەو بۆمبارانکردنە ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر بکەیت چونکە بەپێچەوانە لێت هەڵدەگەڕێنەوە."

بۆمبارانکردنی ڕۆژانەش لە شێوەی "دانیشتنەکانی ڕاپۆرتدانی ڕۆژانە"دا بوو، کە تیایاندا دەبوایە هەر ئەندامێک هەموو کردەوەکانی ئەو ڕۆژەی خۆی بۆ بەرپرسەکەی بگێڕێتەوە و ڕەخنەی هاوڕێکانیشی وەرگرێت. هەروەها کۆبوونەوەی گشتیش لەگەڵ ڕەجەوی ئەنجام دەدران و تا دەهات زیاتر دەبوون تا دەگەیشتە هەفتەی یەک جار و ئەوسا ناوی ئەو کۆبوونەوە گشتییەیان دەنا "خۆشتنی پاککردنەوە". وای لێ دەهات کۆبوونەوەکان، بەگوتەی یاسر عیزەتی، ڕۆژانە ٩٠٪ی کاتی ئەندامانی دەگرت.

هەر بەرپرسێک (لە ناو موجاهیدین پێی دەگوترا مەسئوول) سەرپەرشتیی ٥ تا ٢٠ ئەندامی دەکرد، بەڵام کاری ئەو مەسئوولە لە چەند ساڵێکدا بەتەواوی گۆڕا. لە یەیکەری گرووپی بەرگریدا ڕۆڵی مەسئوول بریتی بوو لە پاراستنی ئەندامان: کەواتە کاتێک شانەیەکی موجاهیدین ئاشکرا دەبوو تەنیا ئەندامانی ئەو شانەیە دەستگیر دەکران و ئەو مەسئوولە ڕێگرێک بوون لە بەردەم ئاشکرا و دەستگیرکردنی شانەکانی تردا. بەڵام یەکسەر لە پاش دەرچوونی موجاهیدین لە ئێران مەسئوول دەبێتە ئەو کەسەی ڕاپۆرت لەسەر بارودۆخی ئەندامان دەدات و بەم شێوەیە بووە یەکەم پیادە (سەربازەکان لە گەمەی شەترەنج) لە پەیکەری تیرەکەدا.

ئەوەی بەلای منەوە مایەی سەرنج بوو لە کاتی دیمانەکانم لەگەڵ کۆنە ئەندامانی

موجاهیدیندا، ئاخافتنەکانمان چەند درێژەیان دەکێشا. سەرەتا چایان دەهێنا و پاشان میوە دەهات و لە پاش ئەوەش تاخمە چایەکی تر لەگەڵ پسکیت، ئەوان دەیانتوانی بەسات قسە بکەن. نەک هەمووشیان بەیەکەوە قسەیان دەکرد کە ڕەنگە خوێنەر وای بۆ بچێت زیاتر لە کەسێک لە شوێنێک دانیشتبن بەیەکەوە. ئەو ئەندامانە لەسەر ئەو شتە لە ناو موجاهیدین ڕاهاتبوون. هەر جارە و ئەندامانی موجاهیدین ٤ سات دادەنیشتن بۆ ئەوەی گوێ لە ڕێنوێنییەکان بگرن و تاوتوێی پلانێکی نوێ بکەن، هەروەها دان بەوەدا بنێن کە چییان کردووە و پاشان ڕەخنە لە هاوڕێکانیان بگرن. کۆبوونەوەکان (نەشاستەکان) لە سەرەتاوە ئامرازێکی بەهێزی دەستی ڕەجەوی بوون. ئەو لە دەستپێکدا لەگەڵ پێنج کەسی ڕازگری خۆی لە بارەی چەند پرسێکی "ئایدیۆلۆجیایی" قسەی دەکرد. بۆ ماوەی چەند ساتێ کۆبوونەوەکە ئەوانی دەخستە ژێر پاڵەپەستۆوە. ڕەجەوی خۆی لەسەر ئەوە ڕاهێنا بوو نێوەڕۆیان بخەوێت بۆ ئەوەی بتوانێ شەوانە کۆبوونەوەی درێژ ببەستێ و تیایاندا ئامادەبووانی بەگفتوگۆکردنی چەند ساتی ماندوو دەکرد کە خۆیان ماندووی کاری ڕۆژانە بوون، ئەمەش لە ئەنجامدا دەبووە نموونەی گوێڕایەڵی.

پاش ئامادەکارییەکان یا وەکو مەسعود خودابەندە دەڵێ "قاپەکە ئامادە دەکرێ"، ڕەجەوی بانگهێشتنی ١٠٠ فەرماندەی پێکەوە دەکرد. لە سەرەتای کۆبوونەوەکەدا فیلمە ڤیدیۆ هاندەرەکانی خۆی لە کۆبوونەوەکانی پێشتر پێشان دەدان. فەرماندەکان دەیانبینی چۆن خۆیان پلانەکەیان بەسەرگەرمییەوە پەسند کردووە، تۆ بڵێی چییان لە دەست بێت جگە لەوەی بەسەرگەرمی پەسندی بکەن؟ ڕەجەویش لەو (نەشاست)ـە تێبینی لە بارەی هەموو ڕووداوەکانی کۆبوونەوەکە لای خۆی تۆمار دەکات. دەبێ ئامادەبووانیش تێبینییەکانی خۆیان لە بارەی هەمان کۆبوونەوە بنووسن.

ئەم کۆبوونەوانە لەگەڵ هەموو فەرماندەکاندا دووبارە دەکرێنەوە تا کاتی بەستنی کۆبوونەوەی گشتیی هەموو ئەندامانی موجاهیدین دێت. لە باسی ئەو کۆبوونەوە گشتییەشدا خودابەندە دەڵێ: "ئامادەبووان نازانن مەسەلە چییە، بەڵام کە دەبینن یەکەمین ١٠٠ ئەندام بیرۆکەکەیان لە ڕووی ئایدیۆلۆجیاوە پەسند کردووە. بۆیە هەریەک لە لای خۆیەوە وای لێک دەداتەوە: خەتاکە هی منە دەبێ خۆم ماندووتر بکەم. دەبێ تێی بگەم، دەبێ باشتر گوێ بگرم، دەبێ کۆپیی بکەم،" خودابەندە خۆی

چەندین جار ئەوەی بەسەردا هاتووە. خودابەندە زیاتر ڕوونی دەکاتەوە و دەڵێ: "ماو ئەم شێوازەی لە چین بەکار هێنا".

من نامەوێ بڕوا بەمە بکەم. بەڵام ئایا هەموو ڕەخنەگر و هۆشمەندەکانیش دەکەوتنە ئەو داوەوە؟ کۆنە موجاهیدین بەمنیان دەگوت بەڵێ هەمووان، ئەگینا بەنامۆ لە قەڵەم دەدران. کەواتە زۆر لەوانە بەشێوەیەکی کردارییانە (پراگماتی) دەیانگوت تێ گەیشتین، کەچی لە ڕاستیدا هیچیان لە مەسەلەکە نەدەزانی. بەڵام سەرکەوتنی ئەو شێوازە وەک کۆنە ئەندامان دەڵێن لەوەدایە ئەگەر زۆر کەس شتێک بڵێن و ڕۆژانە بۆت دووبارە بکەنەوە تۆش لە کۆتاییدا بڕوات پێی دێت. ئەگەریش ئەندامێک یان زیاتر پاش ئەو هەموو دووبارەکردنەوەیە تێ نەگەیشتبن، ئەوا فیلمە ڤیدیۆییەکان هەن کە بەردەوام بۆیانی لێ دەدەن تاوەکو لە پرسەکە تێ دەگەن و پاشان داوایان لێ دەکرێت بۆچوونەکانیان بنووسن بۆ ئەوەی بیسەلمێنی کە بەڕاستی بەرەو "پێش" دەچێت.

وەک بۆم دەرکەوت ئەم پرۆسەیە لە ڕووی زانستییەوە تاقی کراوەتەوە، کە گەڕام بەدوایدا نموونەی لێکۆڵینەوەیەکی زانای دەروونناسی ئەمەریکایی سۆلۆمۆن ئاش کەوتە بەردەستم، کە لە پەنجاکاندا ئەنجامی دابوو. لەو تاقیکردنەوەیەدا ناوبراو ۷ کەسی هێنابوو و داوای لێیان کردبوو هێڵێکی ستاندارد لەگەڵ ۳ هێڵی کێشراوی تر بەراورد بکەن بزانن کامیان درێژترە. شەش کەس لەو بەشداربووانە لە لایەن زاناکەوە ڕێنوێنیی کرابوون و تەنیا حەوتەم کەس ئامانجی تاقیکردنەوەکە بوو. جاری یەکەم شەش کەسەکە وەڵامی ئاساییان دابووەوە. جاری دووەم وەڵامی هەر حەوتیان هەڵە بوو، بەڵام شەش کەسەکە هەمان وەڵامی هەڵەیان دابووەوە. هەرچەندە کەسی حەوتەم دەیزانی مەحاڵە چاوەکانی درۆ بکەن چونکە جیاوازیی بەرچاو لە نێوان هێڵەکاندا هەبوو، بەڵام دەستی کرد بەگومان کردن لە وەڵامەکانی خۆی و لە کۆتاییدا وەڵامی خۆی گۆڕی و هەمان وەڵامی شەش کەسەکەی تری پێشکێش کرد. ئەم تاقیکردنەوەیە چەندین جاری تر لەگەڵ گرووپی جیاوازدا دووبارە کرایەوە، بەڵام تەنیا چارێکی ئامانجەکانی تاقیکردنەوەکان سوور بوون لەسەر وەڵامەکانیان و سێ چارەکەکەی تر لە کۆتاییدا هەر وەڵامی "ڕاستی" شەش کەسەکەی تریان پەسند دەکرد.

ئەمەش زۆرەملێی بەگرووپە. لە نێو موجاهیدینیشدا وەک بۆ زۆر لە کۆنە ئەندامان دەردەکەوێت پاش بەجێهێشتنی ڕیزەکانی موجاهیدین، دیسان مەسئوولەکان ڕۆڵێکی گرینگ لەو گەمەیەدا دەبینن. ئەمەیان گەمەیەکە گرینگترین ئامانجەکانی بریتییە لە قایلکردنی ئەندامان بەبۆچوونێک -هەرچەند ئەوان کۆک نەبن لەگەڵ ئەو بۆچوونە- ئەمەش بێگومان مێشک شووشتنەوەیە.

لەم گەمەیەدا مەسئوول پێشەوایەتی دەکات، چونکە ئەوان یەکەمین کەسن دەتوانن هەر گۆڕانکارییەکی نوێ لە ناو ئەندامانیدا دەستنیشان بکەن: لەبەرئەمەشە ئەوان بۆ ئەو پۆستە دەستنیشان کراون. خودابەندە دەڵێ ڕەجەوی لەو بارەیەوە زۆر ڕاشکاوانە قسەی دەکرد. "ڕەجەوی دەیگوت: «ئەوەی لە تەنیشتم ڕاوەستاوە هیچ شتێکی تایبەت بەخۆی نییە زوو لە هەموو شتێک تێ دەگات». ئەمەش ڕاستە: ئەگەر بەخۆت بیر نەکەیتەوە تەنیا ئەلفێکت بەسە بۆ ئەوەی بزانی چیی گەرەکە."

کەواتە مەسئوولەکان ئەو مێشک بەتاڵانە بوون کە سەرپەرشتیی ئەندامانی تریان دەکرد! ئیدی وەک خودابەندە گوتی لە ئەنجامدا هەموو کێشەکان لەوێوە سەریان هەڵدا. مەسئوولەکان لەبەر ئەمەکداری و گوێڕایەڵییان دەکرانە مەسئوول. "ئەگەر سەیری هەموو ئەوانەی پلە و پایە بەرزەکانی نێو موجاهیدینیان پڕ کردووەتەوە بکەی، دەبینی کەسیان خاوەن بڕوانامەی بەرز نەبووە." ئەمەش بەرەنجامی خراپی بۆ سەرکردایەتی دەبێ. زۆربەی مەسئوولەکانیش ئافرەت بوون، نەخاسمە ڕەجەوی لە تیرەکەیدا پایەی ئافرەتی لە پیاو بالاتر کردبوو، ئەویش لەبەر هۆیەکی گرینگ. وەک خودابەندە دەڵێ: "بۆ پلەکانی مەسئوول ئافرەتانی بەتوانای هەڵنەدەبژارد، بگرە ئافرەتانێ کە دەیتوانی بەئاسانی سوودیان لێ وەربگرێت. ئافرەتانێک کە هەڕەشە لە پێگەکەی خۆی ناکەن."

بەڵام جگە لەوانە ئەو چارەکەی بەشداربووانی تاقیکردنەوەکانی سۆلۆمۆن ئاش کە لەسەر بۆچوونەکانیان سوور دەبوون لە نێو موجاهیدینیش هەبوون. فەرەح کەریمی کۆنە ئەندامی پەرلەمانی هۆڵەندی نموونەیەکە لەو بارەیەوە کە ئافرەتێکی چالاکیی بواری سیاسەتە. سەرەتا زۆر بەرهەڵستکاریی شا و پاشان خومەینیی دەکرد. ئەو مێشک ئاودانە کاردانەوەی پێچەوانەی لا دروست کرد. ئەو بۆ ماوەی ٤ ساڵ لە ناو موجاهیدینی خەلقدا ئەندامێکی چالاک بوو. کە موجاهیدین قەدەغە دەکرێت، لە

لایەن هاوسەرەکەی فاروق لە ساڵی ١٩٨٢ پەلکێشی نێو ڕێکخراوە قەدەغەکراوەکە دەکرێت و پاشان بۆ ئەڵمانیا ڕادەکات و لە کۆتاییدا بۆ ماوەی ساڵێک لە بارەگاکەی ڕەجەوی لە پاریس لەنگەر دەگرێت.

پاش ئەوەی چەند ساڵێکی وەک "هاوسەری.." بردە سەر و شانازیی بەوە دەکرد کە "بەشی خۆم خزمەتی بزووتنەوە مەزنەکەی بەرگریم کردووە" وەک بۆمی باس دەکرد لەو کاتەی کتێبەکەی لە بارەی بیرەوەرییەکانی لە ناو موجاهیدینی خەلق کە ئەوسا لە ژێر چاپکردندا بوو. "کە گەیشتمە پاریس ئەو هەڵوێستەی من بەخێرایی گۆڕا کاتێک مێشک ئاودانەکەم بەتەواوی لا ئاشکرا بوو و دەمدیت چۆن خەڵک لە ناسنامەی خۆیان ڕووت دەکرێنەوە. کۆبوونەوە و نمایشی ڤیدیۆییمان لەگەڵ ڕەجەوی هەبوو. بەڵام ئەو هەموو کۆبوونەوە درێژانە کارتێکردنی پێچەوانەیان لەسەر من هەبوو." لە ١٩٨٦دا ڕیزەکانی موجاهیدینی بەجێ هێشت.

بەپێی شیکردنەوەم بۆ ئەو تیرەیەی موجاهیدین دووبارە ئەوە دەبینم کە مەسعود ڕەجەوی چارەسەرگەلی کردارییانە بەزبلێکی ئایدیۆلۆجیایی دەپێچێتەوە و ئەو کارەش کە دەزانێت ئەو ئافرەتانی لە پیاوان باڵاتر کردووە. ئافرەتان، بەگوتەی ڕەجەوی، دواترین گیانلەبەری سەرکوتکراون، هەر بۆیەش شۆڕشی داهاتووی ئەوان لە دواترە و لە دژی ستەمکارەکەیان لە ئێران کە خومەینییە ڕادەپەڕن. پاش سالانی ساڵ چەوسانەوە زۆر ڕەوایە ئێستا بەرزتر لە پیاوان ڕابگیرێن.

موجاهیدین لەسەر ئەوە ڕادەهێنرێن کە باشترە بۆ پیاوان و ئافرەتان جێگۆڕکێ بەیەکتری وەک چەوسێنەر و چەوساوە بکەن. "ئیتر نابێ ئافرەتێک هەبێ لە لایەن پیاوێکەوە سەرکوت بکرێت و نابێ پیاوێک هەبێ هیچ ئافرەتێک لە سەرووی ئەودا نەبێ" وەک خودابەندە پاش چەند ساڵێک لە وازهێنان لە موجاهیدین بۆی دەردەکەوێت.

لە ئەنجامدا چەندین ئافرەت لە پێگەگەلێ دادەنرێن کە ناتوانن بەڕێوەی ببەن و لەبەرئەوە دەکەونە ژێر باری پاڵەپەستۆوە. زۆربەی جاریش لەبەرئەوە دەبێت کە ئەو پیاوە لێهاتووانەی پێگەکەیان بۆ چۆڵ کردوون دەکەونە ژێر دەستی ئەوانەوە و لە ئەنجامدا هەموو بڕیارەکان هەر لە لایەن ئەو پیاوانەوە وەردەگیرێن. کەواتە ئەو ٢٤

ئافرەتەی ئەندامی سەرکردایەتی بڕیارەکانیان بەدەست گرووپێکی بچووکی (پیاوان) لە ڕازگرەکانی ڕەجەوی دەبێت. بەڵام پاڵەپەستۆکە لەسەر ئافرەتەکان تا دێ زیاتر دەبێت، چونکە ئەوان زۆر جار دەخرێنە سەرووی هاوسەر یا برا یا مامەکانیان. بۆیە وایان لێ دێت لە پۆستەکانیان دڵنیا نەبن، چونکە ڕەجەوی لەسەر ئەوە ڕاهاتووە خەڵکی بەرز یا نزم بکاتەوە بەهەوەسی دڵی خۆی لە بەرامبەر ئەو خەڵکە و ڕەفتارەکانیان.

بۆ ئەوەی بتوانرێ لە کۆتاییدا ڕووخساری ڕێکخراو بەموجاهیدین ببەخشرێت، سیستمێکی ئاڵۆز دەخرێتە کار بۆ دەستنیشانکردنی پلەی هەموو ئەندامەکانی ڕێکخراوەکە. سیستمەکە بەلایەنگر دەست پێ دەکات و پاشان پاڵێوراو و ئەندامی ئاسایی و مەسئوول و ئەندامانی دەستە جیاجیاکان و ئەندامە یەدەگەکانیان کۆتایی پێ دێت. هەموو ئەوانەش پلەی جیایان هەیە و بەهۆی پیتەکان لە یەکتری جیا دەکرێنەوە. بۆ نموونە ئەوانەی هەردوو پیتەکانی (س، ف)یان هەیە ئەوانە لایەنگری بیانین، هەڵگری پیتی (و) ئەندامی ئاسایی و (و، س، ھ) ئەندامی کۆمیتەی ناوەندین: (م، س)یش مەسئوولەکانن و... تاد. ئەو سیستمە هەروەها هەستێکی بەرپرسیارەتی لای بەرپرس بۆ ئەوانەی ژێردەستی خۆی و بەرامبەر ڕێکخراوەکەشی دروست دەکات.

بێجگە لەوەش سیستمەکە لایەنێکی تریشی هەیە کە لە میانەی ئاخاوتنەکانم لەگەڵ کۆنە ئەندامان ئاشکرا بووە. زۆربەیان لە سەرەتاوە ویستیان هەر شتێک لە توانایاندا بێت بیکەن بۆ ئەوەی هەستێکی بەستران (انتماء) بەڕێکخراوەکە بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن. ئەوان خۆپێشاندانیان ساز دەدا و چوونە عێراق بۆ ئەوەی مەشق ببینن و بەشدارییان لە ناونووسکردنی ئەندامی نوێ دەکرد. بەڵام هەریەک لەوان هەر هەستی دەکرد هێشتا شتێک ماوە دروست نییە و بەتەواوی بەڕێکخراوەکەوە نەبەستراونەتەوە. هەرگیز ئەوەیان نەدەزانی خەتاکە لە خۆیان نییە و لە ڕێکخراوەکەیانە. بەرزکردنی پلەی لایەنگر بۆ ئەندامی پاڵێوراو لە پرۆسەکە گرینگییەکی زۆری هەبوو، چونکە ئەم پلە بەرزکردنە هەستێکی وابەستەبوونی لایان دروست دەکرد و وەک ئەندامانی تری موجاهیدین ئەو هەستەیان لا دروست دەبێت کە ئەوان لە هەموو خەڵک بالابەرزترن و لە هەموو خەڵکی تر باشترن. ئەم هەستە

موجاهیدەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە. ئیدی هیچ شتێکی تر لە ژیان گرینگ نییە: چونکە تەنیا ئەوان ڕاستییەکان دەزانن.

بەڵام پرسیارەکەم هەروەک خۆیەتی: چۆن دەتوانی خەڵک بەم شێوەیە لە خشتە بەریت تا وایان لێ دێت هەرچی شتی مایەپووچ بێ پەسندی بکەن. خودابەندە ئەو تەکنیکە دەروونناسییە فێر بووبوو کە تایبەت بوو بەلابردنی ئاسەواری مێشک ئاودانەکەی کۆنە ئەندامانی تیرەکە، ئەو تەکنیکانەش ڕەجەوی بۆ مێشک ئاودانی شوێنکەوتووانی خۆی بەکاریانی دەهێنا. خودابەندە نموونەیەکم بۆ باس دەکات لە بارەی یەکێک لەو کۆبوونەوە درێژانە، کە زۆربەی جار بەشەو دەبەستران کاتێک هەموو ئەندامان شەکەت بووبوون و تا درەنگانی شەو درێژەیان دەکێشا و دەرگەکان دادەخران و ڕێگە نەدەدرا کەس بچێتە دەرەوە. "لەو کۆبوونەوانەدا نەتدەتوانی بۆ سەر پێشاویش بچیت. ئینجا لەبەرئەوە جۆرە ژەهرێک لە ناو جەستەت دەگەڕا و کاری لە توانا هزرییەکانت دەکرد. ئەمە ئامرازێکە بەکارهێنانی لە نێو تیرەکاندا زۆر باوە. هەروەها وشەی قەبە ڕۆڵی خۆی لەو بارەیەوە هەیە. هەموو ئەو هۆکارانە پێکڕا کارت تێ دەکەن تا لە کۆتایی دەڵێی: بەڵێ ئەمەیە ئەو مەسیحەی جیهان لە زۆرداری ڕزگار دەکات."

خودابەندە ناوی لێ نا وشەی قەبە. منیش ناوی لێ دەنێم ئاخافتنە ئۆروێڵیانەکەی موجاهیدین «ئاماژەیەکە بۆ جۆرج ئۆروێل، نووسەری ڕۆمانی (١٩٨٤)». موجاهیدین ئەو کاتەی لە عێراق بوون ژمارەیان دەگەیشتە ٧ هەزار ئەندام، نەک تەنیا خاوەن پارت و یادەوەریی تایبەت بەخۆیان بوون، بگرە زمانێکی تایبەت بەخۆیانیش دروست کرد. لەو زمانە وشە فارسییەکان پاش تێکەڵکردنیان بەوشەی عەرەبی و ڕۆئاوایی مانایەکی نوێیان دەبەخشی.

کۆنە ئەندامەکان تا ئێستاش بەڵام بەگاڵتە بەوشەی أشلونک-ی عەرەبی (واتا چۆنی و مانا دەقاودەقەکەشی: ڕەنگت چییە؟) سڵاو لە یەکتری دەکەن، ئێرانییەکانی دەرەوەی ڕێکخراوی موجاهیدین لەو وشەیە تێ ناگەن، بەڵام موجاهیدەکان لە عێراق بەتەواوی وشەی (مەرحەبا) کە ئێرانییەکان بەکاری دەهێنن بەیەکجاری وەلایان ناوە.

زمانی تایبەتیی موجاهیدین چەند ساڵێک بەئەسپایی پەرەی پێ دەدرا بۆ بەهێزکردنی ئایدیۆلۆجیای "من لە دژی ئەوان". کۆنە ئەندامەکان بۆیان دەرکەوت

چەند وشەی زمانی تایبەتی موجاهیدینیان بەکار دەهێنا هاووڵاتییانی تری ئێران لێیان نەدەگەیشتن.

زۆر لە وشەی ئەو زمانە تایبەتییە ناکرێ بەوشە وەربگێڕین، ئەمەش مەبەستێکی هەبووە لە ناو ڕێکخراوێک کە تیایدا تێگەیشتن لە پاش گوێڕایەڵبوون دەهات. بۆ نموونە وشەی (ئەهلی) لە ناو ڕێکخراوەکەدا بەشێوەیەکی نەرێنی و بەمانای نەفرەت بەکار دەهات، ئەویش وەک وشەی (لیبراڵ) کە بێگومان مانای ئازادبوون دەگەیەنێت، لە ناو موجاهیدین مایەی تاوانبارکردن بوو. وشەی (بوریدە) بەئەندامێک دەگوترا کە دەیویست ڕێکخراوەکە بەجێ بهێڵێت، ئەویش کەسێکە دەیەوێ ببێتە مرۆڤێکی "ئاسایی" کە مانا ڕەسەنەکەی وشەکەیە. ئەو وشەیەش بەهێزترین وشەی نەفرەت بوو لە ناویاندا. بۆیە جێگەی سەرنج نییە کە یاسر عیزەتی ویستی جارێکی تر ژیانێکی ئاسایی بەسەر ببات باوکی ئۆقرەی لێ بڕابوو.

بیریان لە دانانی وشەی تریش کردبووەوە تا جۆرە تێگەیشتنێک بهێننە ئاراوە لە نێو "شۆڕشەکان"دا. بۆ نموونە وشەی خۆ تەڵاقدان کە فارسییەکەی "تەڵاق خود"ە. وشەیەکی بێتام، وەک کۆنە ئەندامان بەپێکەنینەوە دەڵێن، ئێ چۆن دەکرێ خۆت خۆت تەڵاق بدەیت؟ بەڵام لە ناو موجاهیدیندا دەکرێ و ئەگەر ئەو تێگەیشتنەشت لە ئامێز گرت ئەوە "ئینقلابکردن"ت کرد یاخۆ "شۆڕشی تایبەتی خۆت کرد".

قوڕ بەسەری ئەو ئەندامەی نەیانتوانیوە بۆ قۆناغەکەی تر دەرباز بێ چونکە ئەوان "ئینقلاب نەکەردەن" بوون یاخۆ "شۆڕشی تایبەتیی خۆیان نەکردبوو" ئەمەش شتێکی مەحاڵ بوو چونکە ئەو کات دەبوویتە "بوریدە" کە کەس نایەوێ ئەو ناوەی لێ بنرێت.

ئەو "شۆڕشانە" بەشێکی گرینگی ڕێبازی ڕەجەوییان پێک دەهێنا. یەکەمین "ئینقلاب"ی مەزن لە ناو موجاهیدیندا ساڵی ١٩٨٥دا لەگەڵ "شۆڕشی ئایدیۆلۆجیایی" ڕووی دا. پاش ئەوە ئینقلابەکان بەخێرایی بەدوای یەکتریدا دەهاتن.

هۆی "شۆڕشی" یەکەم کە ڕەجەوی دەیویست ئەنجامی بدات ئەوە بوو دەیویست هەمان پێگەی دوژمنەکەی، خومەینی، وەدەست بهێنێت. ئاوێتەکردنی ئیسلام و مارکسیزم هەر لە سەرەتاکانی دروستبوونی موجاهیدینەوە پەسند کرابوو و جێگیر بووبوو و ئێستا کاتی ئەوە هات ئایدیۆلۆجیایەکی نوێ بێتە ئاراوە، تیایدا ڕەجەوی (رهبر) واتە سەرکردەی ڕۆحییە. من ئەو قۆناغە بەخاڵی وەرچەخان دادەنێم کە

تیایدا موجاهیدین له بزووتنەوەیەكی بەرگریی سیاسییەوە بوو بە تیرەیەك. بەر لەو خاڵە ئەندامان دڵسۆزێكی لە ڕادەبەدەری ڕێكخراوەكەیان بوون، بەڵام دڵسۆزییەكەیان هەڵقوڵاوی لێكدانەوەیەكی سیاسییانەی قووڵ بوو. بەڵام پاش ئەو خاڵەی وەرچەرخان دڵسۆزیی ئەوان بۆ سەركردەیە و لەسەر بناغەی سۆزە كە بەخۆیان ناتوانن شیی بكەنەوە. ئەوسا ژیانی هەموویان (ئەندامەكان) بۆ وەدیهێنانی بەختیاریی سەركردەكەیان دەخولایەوە.

شێوازی گەمەكردنی ڕەجەوی بەو هۆكارانە زیرەكیی خۆی پێشان دەدات. چونكە چی ڕووی دەدا گەر بەر لە خاڵی وەرچەرخان بەئەندامانی خۆی بگوتبا كە دەبێ بۆ پێگەیەكی وەك پێگەی خومەینی بەرزی بكەنەوە و دەستبەرداری ئەو ئایدۆلۆژیایە بن كە ساڵانی ساڵ بوو پەسندیان كردبوو و پەرەیان پێ دەدا؟ ڕەنگە فشەیان پێ بكردایە یاخۆ پێی پێكەنیبان. هەر بۆیەش مریەمی تەرخان كرد ئەو كارەی بۆ بكات. وەك پاداشتیش لە تەنیشتی خۆی كردییە سەركردەی "ئاسایی"ی ڕێكخراوەكە و بەم شێوەیە مریەمیش دەتوانێ بیسەلمێنێت كە ئافرەتان لە نێو ڕێكخراوەكە لە كۆتاییدا بەمافی خۆیان گەیشتن. ئەم سەركردایەتییە هاوبەشەش بەسەركردایەتیی هاوبەشی ماو تسی تۆنگ و شو ێن لای دەچوێنرا و وەك سەركردایەتییەكەی ئایەتوڵڵا خومەینی و سەرۆك خامینەئیش بوو.

مریەم، ڕەجەویی وەك سەركردەی ڕۆحی بەلایەنگرانی موجاهیدین دەناساند، یاخۆ بەوەكیلی خوا لەسەر زەوی. ئینجا مریەم لەوساوە بووە "دەروازەی سەركردەی ڕۆحی" و تاقە كەس كە لە هزرە مەزنەكانی تێ دەگات.

هاوسەرایەتییان لە شوباتی ١٩٨٥دا پاش ساڵێك لە پێوەندیی سێكسیی نهێنی، وەك دیارییەك پێشكێشی ئەندامان و ڕێكخراوەكە دەكرێت. پێوەندی و كاركردنی ئەوان پاش بوون بەهاوسەركردە ئەوەندە بەیەكەوە و دوور لە چاوی ئەندامانی تر دەبێت كە نەدەكرا مەگەر بەڕێگەیەكی پاك بێت ئەویش كە هەردووكیان لە هاوسەریی خۆیان جودا بوون و هاوسەرایەتییان بەیەكەوە بەست. چەمكی "دیاری"یش كە بەو هاوسەرایەتییە بەخشرا بەتەواوی لە مێشكی ئەندامانی ئاساییدا چەقێنرا.

چەند مانگێكی دەوێ تاوەكو ڕەجەوی بتوانێ بەهۆی "نشاست" یا چالاكییەكان مێشكی هەموو ئەندامانی بەو هەموو گۆڕانكارییە بنەڕەتییانە ئاو بدات. بەڵام

بەرهەڵستكاری لە بەردەم ئەم چەمكە لە نێو ئەندامە ئاساییەكاندا سەرهەڵدەدات، چونكە ئەو گۆڕانكارییانە هزرڤان و ئایدیۆلۆجیستەكانی ئەوان مایە پووچ دەكات. ڕەجەویش بەئەندامانی خۆی دەگوت: "پێویستە ئێمە بەنێو ئەو تەندوورەدا دەرباز ببین بۆ ئەوەی بەهێزتر ببین".

فەرەح كەریمیی سەركێش لەو بارەیەوە دەڵێ: "زۆر تووڕە بووم كاتێک هەواڵی هاوسەرایەتییەكەم بیست، ئەوسا لە ئەڵمانیا بووم. ئەوە چییە؟ سەركردایەتیی ئافرەت مانای ئەوە ناگەیەنی كە شوو بەسەركردە بكات، وا نییە؟" بەڵام ئەم ڕەخنەیەی كەریمی تەنیا لە نێو بازنەیەكی تەسكی هاوسەران و هەڤاڵە نزیكەكاندا لە هامبۆرگ باس دەكرێت و كەریمی ئەم قسەیە بەئاشكرا لە (نشاست)ـەكانی بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ لە ماڵی ئەو دەبەسترێن ناكات. كەریمی زیاتر ڕوونی دەكاتەوە و دەڵێ: "زۆر بەوە دڵخۆش بووم كە من لەو بارودۆخە ڕزگار بوومە چونكە ئەو كات منداڵێكی نەخۆشی ئەندامێک لە ماڵمان بوو و منیش ڕۆژانە وەک وەرگێڕێک لەگەڵیان دەچووم بۆ نەخۆشخانە».

بەڵام بەبۆچوونی من ئەو كاتە ئەندامە ئاساییەكان ئەوەندە لە ڕەجەوی دەترسان مافیان بەخۆیان نەدەدا پرسیار یاخۆ گومان لە پلانەكانی بكەن. ئەندامانی تریش، واتە پلەدارەكان، تەنیا بۆ پاراستنی پلە و پایەی خۆیان ئەشهەدوبیلایان بۆ دەكرد بەو هیوایەی ڕۆژێک دادێت ئەوانیش لەو پلانەی ئەو تێ بگەن.

كاتێک لەو بارەیەوە پرسیار لە عەلی قەشقەوی دەكەم دەڵێ: "ئەوان لێی دەترسان". من بۆچوونی ئەوم زۆر لا گرینگە، قەشقەوی چەند ساڵێكی لە زیندانەكانی موجاهیدین بەسەر برد چونكە گومان و پرسیاری لە بارەی ئەو ترسەی ئەندامان دەكرد. "ڕەجەوی ئێمەی بەخێو كرد. ئەو مەسیح بوو، پێغەمبەرێكی خوا بوو. ئەو جۆرە قسانە لە هەموو كۆبوونەوەكاندا دووبارە دەكرانەوە. ئێمە چی تر مریەم و ڕەجەویمان وەک مرۆڤ دانەدەنا: ئەو دووانە هەموو شتێكیان بەئێمە دەبەخشی. ئەو كات نەدەكرا گومان لەو دووانە بكەیت".

سەرسام بووم بەوەی هەمان هەڵوێست لای مەسعود خودابەندەی ژیریش دروست بووبوو. ئەو گوتی كە نەیتوانی بزانێ چیی بەسەر هاتووە تا لە ناو موجاهیدین ڕای كرد، هەرچەندە ئەو لە كاتی دروستبوونی پێوەندییەكەی نێوان مریەم و ڕەجەوی لە

پاریس بوو. تەنانەت خودابەندە مریەمی بردە ئەو نەخۆشخانەیەی براکەی ڕەجەوی بۆ ئەوەی کۆرپەی بۆ لەبار ببەن. تەنانەت لەو ساتانەدا مێشک ئاودانەکەی موجاهیدین وەک هەر ئەندامێکی ئاسایی تر کاری لە خودابەندەش کردبوو.

تەنیا کاتێک لە ساڵی ١٩٩٦ کە خودابەندە بڕیار دەدات موجاهیدین بەجێ بهێڵێت توانیی کێشەکەی ناو موجاهیدین بزانێت و لەگەڵ نەسرینی یاریدەری مریەم لە پاریس باسی لێوە بکات. "لە نەسرینم پرسی: دەتەوێ ئێران ببێتە وڵاتێکی دیموکراسی و لەگەڵ ئەوەشدا پێت نەکرێت بگەڕێیتەوە ئەوێ- یان وڵاتێکی وەک گابۆن-ت پێ خۆشترە کە ڕەجەوی دەسەڵاتی بگرێتە دەست و ئێرانیش وەک خۆی بمێنێتەوە؟" نەسرین بەو پرسیارە حەپەسا، بەڵام دیسان پێم گوت: "تۆ وەڵامەکە دەزانیت. ئایدیۆلۆجیاکەی ئێمە لەسەر مەسعود ڕەجەوی بنیات نراوە: باکمان بەهەموو جیهان نییە. بەڵام من بۆ ڕەجەوی نەهاتوومەتە ئێرە. من هاتووم بۆ ئەوەی شتێک بۆ ئێران بکەم."

دیاربوو ئەندامانی موجاهیدینی خەلق کوێر بووبوون کە ئەو هەموو چەوتییانەی نێو ئایدیۆلۆجیاکەیان نەدەبینی. بۆ نموونە یەکێک لەو چەوتییانە دەڵێت پاش "شۆڕشی ئایدیۆلۆجیایی" و گەیشتنی ئافرەتان بەپێگەی سەرکردایەتی کەچی لە هەمان کاتدا هەموویان دەبنە موڵکی ڕەجەوی هەرچەندە مریەم ئەوسا ڕای گەیاند کە ڕەجەوی دەستبەرداری ئەو مافەی دەبێت. بەم شێوەیە ئافرەتان هان دران وەک "کەنیزە"ی مریەم ڕەجەوی خۆیان ببینن و لەسەر ئەو بناغەیە ڕەفتار بکەن. بەو ئاراستەیەش جۆش و خرۆشێکی زۆریان پێشان دا کە خەڵک تەنیا لە نێو گرووپ باخۆ تیرەیەکی ئاینی پێشانی دەدەن. مەسعود بەنیسەدر لە کتێبەکەیدا باس لە چەند ئافرەتێک دەکات کە "شۆڕشی خۆیان کردبوو" چۆن ستایشی مریەمیان دەکرد چونکە هاوسەرایەتییەکەی لەگەڵ ئەبریشەمچی کردە قوربانی هاوسەرایەتی لەگەڵ ڕەجەویدا بۆ ئەوەی ببێتە هاوسەرکردە. یەکێ لەو ئافرەتانەی باسیان دەکات نووسیبووی "من تەنیا یەک شت دەزانم، ئەوەیش ئەوەیە کە تۆ ئەی مریەم سومبولی ئایدیۆلۆجیای منی. با لە نێو ئاگرە پیرۆزەکەی تۆدا بسووتێم! با خۆم بکەمە قوربانیی تۆ و مەسعود ڕەجەوی! ئێوە سومبولی گەلێکی زیندانکراون."

ئافرەتێکی تریش لەو ئافرەتانەی بەنیسەدر باسیان دەکات نووسیبووی "هەست

دەکەم ڕێگەکەی تۆ ڕێگەی هەموو پێغەمبەرەکانی خوایە هەر لە ئیبراهیمەوە تا دەگاتە مووسا و عیسای ڕۆحی خوا. من دڵنیام نەک تەنیا ئێمە، نەوەکانی داهاتووش ستایشی ئەو ڕۆڵە پیرۆزەی ئێوە دەکەن".

مەسعود بەنیسەدر زەحمەتییەکی زۆری دیت تاوەکو تەواو لە ڕاستییەکان گەیشت. بەڵام کەس نەیدەتوانی خۆی لەو شۆڕشە ڕزگار بکات، چونکە وەک ئەو دروشمەیە لەسەر دیواری بارەگاکەیان لە لەندەن نووسرابوو: "دەبێ هەموومان شۆڕشی ئایدیۆلۆجیایی بکەین. ئەوەی نەیکات بۆی نییە ناوی خۆی بنێ موجاهید". نەمانی ئەو وابەستەبوونە (انتماء) بیرۆکەیەکی تۆقێنەرە و کەس نایەوێت بچێتە ژێر ئەو بارەوە.

لە کاتی ئەو شۆڕشەدا هەر دوو سێ ڕۆژ جارێک کۆبوونەوەیان دەکرد. وەک بەنیسەدر لە کتێبەکەیدا باس دەکات "هەموو شتێکی تر هەڵپەسێردرابوو. هیچ کارێکمان نەدەکرد، خواردنیشمان ئامادە نەدەکرد تەنانەت بۆ ماوەی ڕۆژێک و دوو ڕۆژ نووستنیشمان نەمابوو". ئەو ژوورەی دانرابوو بۆ کۆبوونەوە کە توانای ڕاگرتنی ٣٠ کەسی هەبوو، لەو کۆبوونەوانە دوو ئەوەندەی ئەو ژمارەیەی تێدا بوو. زۆربەی ئامادەبووانیش ناچار بوون لەسەر زەوی دانیشن و لەو خانووە تەنیا یەک ئاودەستی لێ بوو و پشووش بەئامادەبووان نەدەدرا". ئەو بارودۆخەی بەنیسەدر باسی دەکات بۆ پرۆسەی مێشک ئاودانی ئەندامان زۆر گونجاو بوو.

ئەوسا یەکێ لە سەرکردەکانی موجاهیدین سەردانی بارەگای لەندەن دەکات و هەوڵی قایلکردنی ئامادەبووان دەدات کە سەرکردە "ئایدیۆلۆجیاییەکەیان دیدێکی زۆر فرەوانتر و قووڵتر و جیهانیتری لەوان هەیە، ئەگەر ئەو دیدە ئێستا مایەپووچ بێتە بەرچاو ئەوا داهاتوو دەیسەلمێنێ کە ڕاستە. بۆیە دەبێ شوێنکەوتووان ملکەچی سەرکردە بن، ئەو ملکەچییەش نەک لەبەرئەوەی تێگەیشتن چیی گەرەکە بگرە دەبێ لەسەر بنەمای متمانەی ڕەها بێت".

ئانا، هاوسەری مەسعود بەنیسەدر، لەو جۆرە "نشاست"انەدا مێردەکەی تووشی حەپەسان کرد کاتێک نەفرەتی لە یەکێک لە پیاوەکانی نێو کۆبوونەوەکە کرد چونکە دانی بەوەدا نا کە چووبووە لای ئافرەتێکی سۆزانی لەبەرئەوەی ئەو پیاوە ئیهانەی هەموو "خوشکانی" ئامادەبووی کرد. بەنیسەدر قەت هاوسەرەکەی بەم شێوەیە

نەدیبوو: "ئەو گۆڕانە لە ڕادەبەدەرە بەڕاستی قایلی کردم کە هاوسەرەکەم شۆڕشە ئایدیۆلۆجیاییەکەی خۆی کردووە".

بەنیسەدریش دەیەوێ شۆڕشەکەی خۆی بکات و بەهەموو تواناکانی هەوڵی بۆ دەدات، بەڵام مەسئوولەکەی ڕازی نابێت. خێزانی بەنیسەدر پێی دەڵێت ڕەنگە نهێنییەکی زۆر مەزن هەبێت ڕێگر بێت لە بەردەم سەرکەوتنی لە شۆڕشەکەیدا. ئێستا بەنیسەدر بەوپەڕی شەرمەزارییەوە وەبیری دێتەوە چۆن لە کاتی منداڵیی خۆیدا دەستگەمەی سێکسیی لەگەڵ کراوە. ئەو هەست بەشەرمەزاری دەکات دان بەو شتەدا بنێت. بەڵام لەبەر ئەو قسەیەی خێزانەکەی لە کۆبوونەوەکاندا دانی پێدا دەنێ بۆ ئەوەی دەری نەکەن چونکە لە شۆڕشەکەیدا سەرکەوتوو نەبووە. بەنیسەدر دەنووسێت "خۆم هان دا و هێزم دایە بەر خۆم بۆ ئەوەی لە بارەی ئەو نهێنییە ڕەشەم بنووسم. لە ناکاو، لەجیاتی ئەوەی هەست بەقورسبوون بکەم و وەک چیایەکی نەبزێو بووەستم، بەپێچەوانە هەستم بەئازادبوون و ڕووح سووکییەکی وەک پەپوولەی نێو باغان کرد. هەستکردن بەسنوورەکان و ترس لە داهاتوو و ئاڵۆزییەکانی ڕابردوو و پرسیار و گرفتەکانم لا نەما. هەستێکم لا دروست بوو کە پێویستم بەهیچ شتێکی تر نییە. هەستم دەکرد دەوڵەمەند و بەهێز و دڵخۆشم."

هەروەها لە ناکاو تێ دەگات "مریەم ناچار کرا سەرپشک بێت لە نێوان باوەڕە ئایدیۆلۆجیاییەکەی و بەرپرسیارەتییەکانی لە بەرامبەر مێرد و کۆرپەکەیدا". ئیدی لە نامەیەکدا بۆ مریەم، بەنیسەدر خۆزگە دەخوازێت ببێتە پەروانە لە دەوری چراکەی ئەودا سەما بکات. "دەمویست لە بەردەم هەمووان خۆم بسووتێنم، وەک گەواهیدانێک و ستایشێک بۆ شۆڕشە ڕاستەقینەکەی ئەو لە دژی خراپ بەکارهێنانی ئافرەتان لە لایەن پیاوان لە هەموو جیهاندا." کەواتە بەنیسەدر لە مەترسیی دوورخستن لەو "بەهەشتە" ڕزگاری بوو.

"شۆڕشی ئایدیۆلۆجیایی" بەهۆی "شۆڕشی نێوخۆیی"یەوە قووڵتر کرا، تیایدا مریەم دەبێتە ئەمینداری گشتیی موجاهیدین و سەرکردەی مەزن، ڕەجەوی، پێگەیەکی بالاتر: سەرکردەی ئایدیۆلۆجیاییی تەواوی هێزەکانی بەرگریی ئێرانی. ئەو شۆڕشانە بەردەوام دەبن چونکە ڕەجەوی چی تر ناتوانێ ئەندامانی لەو کۆت و بەندانەدا بهێڵێتەوە.

ئینجا پاش ئەوە تەڵاقدانەکان دەستیان پێ کرد. کاتێک مریەم تەڵاقدانەکەی خۆی وەک قوربانی پێشان دا، دیاربوو هەندێ لە ئەندامەکان وەک بەنیسەدر لە کتێبەکەیدا نووسیویەتی، وا لێکیان دایەوە کە دەبێ ئەوانیش هەمان کار بکەن. هەر واش بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو "شۆڕشە" تازەیە بۆ ئەندامانی موجاهیدین تەواو کارێکی لە ناکاو بوو. بێگومان چونکە وەک بینیمان لە پاش شکستهێنانی ئۆپەراسیۆنی "رووناکیی هەتاهەتایی" لە ۱۹۸۸دا ڕەجەوی فەرمانی بەئەندامەکانی دا یەکتری مارە بکەن. بۆیە هاوسەرایەتییەکان بەردەوام بوون، بەڵام لەو شوێنانەی موجاهیدین قۆناغی داهاتووی خرابووە واری جێبەجێکردن هاوسەران خۆیان لە یەکتری دوور ڕادەگرت و هەموو پێوەندییەکیان بەیەکتری پچڕاند. ئەمەش هەوڵێک بوو بۆ زیاتر دابڕینی خۆیان بۆ ئەوەی لە ڕەجەوی نزیکتر ببنەوە، لەو سەروبەندانەدا بوو فەرمانیان پێ درا یەکتری تەڵاق بدەن. چونکە ئەگەر خۆیان تەواو بۆ ڕەجەوی تەرخان بکەن، ئەو کات دەبنە موجاهیدی ڕاستەقینە و لە ئەنجامدا توانای ڕزگارکردنی گەلی ئێرانیان دەبێت. پەیامەکە ئەو کات ئەوە بوو هاوسەرەکانیان بوونەتە کۆسپێک لە نێوان ئەوان و ڕابەردا. بۆیە دەبێ یەکتری تەڵاق بدەن هەروەک ئەوەی چەند ساڵێک بەر لەوە مریەم لەگەڵ مێردەکەی خۆی کرد بۆ ئەوەی بەتەواوی خۆی بۆ ڕەجەوی تەرخان بکات.

ترس لە نامۆبوون و دەرکردن لە خێزانەکەی موجاهیدین ئەو پاڵەپەستۆیەی دەخستە سەر ئەندامان. ئەم قۆناغە نەریتگەلی تایبەتی هەبوون تیایاندا هاوسەران ناچار دەکران بەڕاشکاوی ڕای گەیەنن کە بەنیازن لە یەکتری جیا ببنەوە، ئەڵقە زێڕینەکانیان لەسەر قاپێک دابنێن و تەنانەت ناچاریش دەکران بەیەکتری بڵێن "شەیتان" بۆ ئەوەی جیابوونەوەیان بسەلمێنن و پێشانی بدەن چەند ڕقیان لە یەکترە.

مەسعود بەنیسەدر باسی ئەو ئازارە دەکات کە خۆی بینیویەتی لە جێبەجێکردنی ئەم فەرمانەی موجاهیدین و چۆن ڕۆشنبیرەکانی تریش هەمان ئازاریان کێشا. ئەو هاوسەری خۆی خۆش دەویست سەرەڕای ئەوەی چەندین ساڵ بوو دوور لە یەکتر دەژیان و هاوسەرەکەشی لە داهاتوودا بەر لەو بڕیاری دەرچوون لە ڕیزەکانی موجاهیدین دەدات. بەنیسەدر لایەنی مریەمی ڕێبازەکەی پێ پەسند دەکرێ بەڵام ئەوەی بەلاوە قورس دەبێت ڕەجەوی ببێتە سەرکردەی ڕۆحیی ئەو. لەم بارەیەشەوە

نووسـیویەتی "مـانـای ئەوە بوو ڕەجـەوی بکەمە پلە یەک لە مێشک و ڕۆحـمـدا و لە پێشی پێشەوەی ویژدان و لۆجیک و باوەڕ و پرەنسیپەکانمی دابنێم".

فـەرەح کـەریمی لەو قـۆنـاغـەدا مـوجـاهـیـدینی بەجێ هێـشت. ئەو خـۆی بەرهەڵسـتکاریی ئەو یاسـایەی کـردبوو کـە حـەفـتـانە یەک ڕۆژ پشـووی دەدا بەهاوسـەران بۆ ئەوەی لە ژوورێکی خـێـزانیـدا کـۆ ببنەوە. فـەرەح لەو بارەیەوە دەنووسێت "پێوەندییەکەمان بووە کێشەیەک، بۆیە دەبوایە چارەیەکی بۆ بدۆزینەوە. وەک موجاهیدین بۆت نەبوو هیچ پێوەندییەکی مرۆیی ببەستی، تۆ ناچار کرابووی هەمـوو کـات و ژیانی خـۆت بۆ ڕێکخـراوەکـە تەرخـان بکەیت". پلەی مـێـردەکـەیان دابەزاند کـە قـبـووڵی نەکـرد دەسـتـبـەرداری هاوسـەرەکـەی بێت. "پاڵەپەسـتـۆکـەی موجاهیدین لەسـەر من کاردانەوەی پێچـەوانەی هەبوو. چونکە من شـتـێک بکەم لە خۆمەوە زۆر جیاوازە لەوەی کەسێک بەزۆر ئەو کارەم پێ بکات".

لەو قۆناغەدا شۆڕشەکان بەدوای یەکتریدا ڕوویان دەدا و هەر شەش مانگ جارێک شـۆڕشـێک دەهات و ئەندامـانی ڕادەچڵـەکاند. کۆنە ئەندامـەکان کە ئەو کـاتانەیان وەبیـر دێنەوە دەڵێن هەر جـارێک کە ڕەجـەوی کـارێکی سـەرشـێـتـانەی دەکرد، وەک هـاوسـەرایەتییـەکـەی لەگەڵ مریەم، بۆ سەرقـاڵکردنی ئەندامـەکانـی"فیلێکی دەفڕاند". بەڵام ئەو تەڵاقدانە زۆرەکییانە لایەنی کرداریشیان هەبوو. چونکە ئەمـەیان ڕێگەیەک بوو بۆ ئەوەی خـەتای شکسـتـهـێنانی ئۆپەراسـیـۆنی ڕووناکیـی هەتاهەتایی لەسـەر شـانی ڕەجەوی و هـاوسەرکردەکەی مریەم هەڵگرن و بیخـەنە ئەسـتۆی ئەندامەکان. لەوەش گـرینگتـر لەو سـەردەمەدا کـاتی ئەوە هاتبـوو بۆمـبـە کـاتییـەکـەی سـێکسکردن پووچەڵ بکرێتـەوە، چونکـە وەک بینیـمـان لـە ناو مـوجـاهـیـدینـدا ژمـارەی پیـاوان لە ئافـرەتان زۆرتر بوو. بۆیە ڕەجـەوی هەمـوو جـۆرە پێـوەندییـەکـانی نێوان هەردوو لای قەدەغە کرد.

بەڵام وەک هـادی شـەمس حـایری بۆم باس دەکـات شکـۆداریی بـاڵاترکردنـی ئـافـرەتـان بەسـەر پیـاواندا لە ڕێکخـراوەکە هیچ پێـوەندییـەکی بەئایدیۆلۆجیـاوە نەبوو. بۆیە ئەو چیـرۆکـەی کـە ئـافـرەتـان چەوسـاوەترین تـوێژن لەبەرئەوە دژی خـومـەینـی ڕادەپەڕن قـسـەی پووچە. هـادی دەڵێ: "ڕەجـەوی قـەت بڕوای بەڕزگـارکـردن نییـە. ئەو تەنیـا ویسـتـی ئەو چەمکە دژی خـومـەینـی، کە ئـافـرەتـانی دەچەوسـاندەوە، بەکـار بهـێنی.

پیاوێک سێ جار ژنی بەبێ خۆشەویستی هێنابێ چۆن بایەخ بەهیچ مافێکی ئافرەتان دەدات؟ ئەمە هەمووی گەمەیەک بوو. هەموو ئەندامانی مەجاهیدینیش دەیانزانی ئەو دەسەڵاتەی بەئافرەت دراوە نەک لەبەر شیاویی ئافرەتە بگرە لەبەرئەوەیە کە ئەم کارە بەقازانجی ڕەجەوی تەواو دەبێت. ئەوەی هەیە ئەوەیە کە ڕەجەوی بەم کارەی سنووری بۆ پیاوان دانا و وای کرد کە زۆر ئەستەم بێ بتوانن لای بەرن."

هەروەها لایەنێکی تری ئەرێنی لە کاری جیاکردنەوەی منداڵان لە دایک و باوکاندا هەیە، هەرچەندە ئەم جیاکردنەوەیە نیگەرانییەکی زۆری لە نێو موجاهیدیندا نایەوە و ئەوە بوو چەندین ئەندام پاش ئەو بڕیارە موجاهیدینیان بەجێ هێشت و هەندێک پێیان وابوو ڕەجەوی خەریکی ئەنجامدانی پاکسازییەکە لە نێو ڕێکخراوەکەدا، ئەویش بۆ ئەوەی تەنیا ئەو ئەندامانە بهێڵێتەوە کە ئامادەن بۆ ڕەجەوی خۆیان لە ئاگر و بەرد بدەن. بەڵام بەبۆچوونی من ڕەجەوی ویستی خۆی لە منداڵان ڕزگار بکات چونکە بوونیان لەوێ بۆ سوپای موجاهیدین کارێکی زەحمەت بوو، هەروەها لەبەرئەوە بوو کە ئەو هەموو وزە و خۆشەویستی و بایەخەی کە بۆ منداڵان تەرخان دەکرێت، پێویستە بۆ سەرکردە تەرخان بکرێت.

زۆر لە موجاهیدین خۆیان لەو سەرئێشەیە هەر ڕزگار کردبوو و خۆشەویستییان بۆ منداڵ یا هاوسەر بەئاستەم مابوو. مەسعود خودابەندە لەسەر فەرمانی موجاهیدین هاوسەری گرتبوو بەڵام هیچ منداڵیان نەبوو. "وەک هاوسەر پێکەوە نەدەژیاین. چەند حەفتەیەک جارێک یەکترمان دەبینی ئەویش ئەگەر تەنیا ژوورێکی خێزانیی چۆڵ بووایە. بەو حاڵە تەنیا تێرکردنی حەزە سێکسییەکانمان پێ دەکرا، پێوەندی و هەست لە نێوانماندا بوونیان نەبوو". بەڵام بۆ کەسانی تر سەردانی هەفتانە بۆ کەمپی ئەشرەف بووبووە بارگرانییەک. حەبیب خورەمی، کە زۆر هاوسەرەکەی خۆی خۆش دەویست زۆر بەرهەڵستکاریی بڕیاری تەڵاقدانی کرد تا لە ئەنجامدا موجاهیدینی بەجێ هێشت. ئەو بەشەرمەزارییەوە پێم دەڵێ سەردانی خێزانەکەی وای لێ هاتبوو وەک "سەردانی سۆزانییەک" بکات. چونکە بەشێک لەو "شۆڕشە" لەوە پێک هاتبوو کە ناوی سێکسکردنیان نابوو "شتە پیسەکە"، ئەو بارەش بەدوورودرێژی لە شۆڕشە داهاتووەکاندا بەشێوەیەکی وردتر باس دەکرێت.

حەبیب خورەمی بۆمی گێڕایەوە: "ئەوەی موجاهیدین لە بارەی سێکسەوە کردیان زۆر زیاتر بوو لەوەی مەلاکانی ئێران کردیان، مەلاکان تەنیا زیناکردنیان حەرام کردبوو. بەلاّم موجاهیدین هەموو جۆرە پێوەندیی سێکسییان پێ پیس بوو." ئەم کارەی موجاهیدین هیچ پێوەندییەکی بەئیسلامەوە کە سەرچاوەی دابونەریتەکانی کۆمەڵگەی ئێرانە نەبوو.

بەلاّم لە نێو تیرەکاندا، سێکس زۆر جار بەکار دێت، بەلاّم وەک پاڵەپەستۆ یاخۆ وەک پاداشت. لە ئەنجامی ئەو بڕیارانە سێکس ئەوەندە تابوو کرابوو لە ناو موجاهیدین تا وای لێ هات بۆ کەس نەبوو بیری لێ بکاتەوە. مەسعود خودابەندە لەو بارەیەوە دەڵێ ئەو کارە ئەستەمە سەربگرێ چونکە: "سێکس وەک خۆراک وایە. تۆ دەتوانی بەکەسێک بڵێی نان مەخۆ و مان لە خواردن بگرە. بەلاّم پێمان بڵێن: بیر لە خۆراک نەکەیتەوە لەو کاتەدا کە خەریکە لە برسا بمری، ئەمەیان مەحاڵە. ئەگەریش پێمان وابوو ئێمە دەتوانین بیر لە خواردن نەکەینەوە ئەو کات ئێمە شێت دەبین. لە ناو موجاهیدیندا هەندێ کەس وایان لێ هات."

نائۆمیدییەکان لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانە زۆر فرەوان بوون: چونکە ئافرەتان و پیاوان ڕۆژانە لە کاتی کارکردن پێکەوەدا یەکتریان دەدیت، بەلاّم بۆیان نەبوو دەست لە یەکتری بدەن و تەنانەت بیریش لەو کارە بکەنەوە. بۆیە، وەک مەسعود خودابەندە بۆی دەچێت، ئەوانەی دەنگی ڕەخنەیان بەرز دەکردەوە زۆر بەتوندی ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکرا و ئەندامان هاوڕێکانی خۆیان ئەشکەنجە دەدا. "چ سیستمێک وا لە خەڵک دەکات ئەو سنوورانە ببەزێنن؟ مەگەر کار لە هەستی گشتیی مرۆڤ بکەن بەشێوەیەک کە تەواو ئەو مرۆڤە بگۆڕێ."

هەموو ئەندامانی موجاهیدین دەیانزانی کە پێوەندیی سێکسی بەنهێنی هەر ماوە، بەتایبەتی کاری نێربازی کە لە کولتووری ئێراندا زۆر تابووی لەسەرە. بۆیە پاش ئەوەی چیرۆکی یاسر عیزەتیمان بیست چۆن پیاوان دەستگەمەیان لەگەڵدا دەکرد، بۆمان دەرکەوت سەربازە هەرزەکارە نوێیەکان لە ناو موجاهیدیندا بەنرخ بوون. یاسر ئەوەش دەڵێ کە فەرماندەکان بەم شتەیان دەزانی بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان گێل کردبوو. کۆنە ئەندامی تری موجاهیدین وای بۆ دەچن کە فەرماندەکان بۆیە خۆیان گێل دەکرد تا بەڵگە لەسەر تێوەگلاوەکان بگرن و لە داهاتوودا ئەگەر

بەرهەڵستکاریی فەرمانێکیان کرد بەڵگەکانیان لە دژ بەکار بهێنن تا ناچاریان بکەن فەرمانەکە جێبەجێ بکەن.

دیارە حەزە سێکسییەکان لە ناو ناچن تەنیا بەوەی تۆ ڕەتیان بکەیتەوە، ئەمەش بەڕوونی لە بەسەرهاتی موجاهیدێکی گەنج کە لە کەمپی ئەشرەف دەکەوێتە داوی ئەوینیی کچە گەنجێکی موجاهیدین و هەوڵی پێوەندیکردنی بەکچەکەوە شکست دێنێ. کاتێک کچە نەخۆش دەکەوێ و لە شوێنی حەوانەوەی ئافرەتاندا دەمێنێتەوە و هەموو ئافرەتەکانی تر دەچن بۆ کۆبوونەوە، کوڕە گەنجەکە بڕیار دەدات بچێتە لای قسەی لەگەڵدا بکات. بەڵام کچەکە پیاوێک لە شوێنی حەوانەوەی ئافرەتاندا دەبینێ دەست بەهاوار دەکات و کوڕەی داماویش هیچی بۆ ناکرێ و هەوڵی کپکردنی هاواری کچەکە دەدا و بەهەردوو دەست دەمی دەگرێت و لە ئەنجامدا وەک کۆنە ئەندامێک بۆمی گێڕایەوە کچە دەخنکێت و دەمرێت.

بێگومان یاسای قەدەغەکردنی سێکس ڕەجەوی ناگرێتەوە چونکە ئەو لە سەرووی یاساکانی خۆیەتی. بۆیە وەک چەندین کۆنە موجاهید دەڵێن ئەو ئافرەتانەی ئەو بۆ سەرکردایەتییە هاوبەشەکەی هەڵیاندەبژێرێ شۆخ و شەنگ دەبن. هەر ئەو کۆنە ئەندامانە باس لە دەنگۆی ڕابواردنە سێکسییەکانی ڕەجەوی دەکەن. ئازادییەک کە بۆ موجاهیدەکان نەبوو. چونکە قەدەغەکردنی سێکس هەمیشە لە بیری هەموو ئەندامانی تر بوو. هەروەها سیستمی کۆنترۆڵکردنی ئەندامان بەهۆی "کۆبوونەوەی ڕۆژانەی ڕاپۆرتدان" وای لە هەمووان دەکرد هەست بەتاوانباری بکەن. بەئەندامان دەگوترا زۆر باشە خۆیان "پاک" ڕابگرن و باسی هەموو هزر و بیر و خەونەکانیان بکەن و ڕاپۆرتنووسین لە بارەی ئەو شتانەوە یارمەتییان دەدات.

ئەندامان هان دەدران بەخەونە سێکسییەکانیاندا بنێن کە ئەمەش دەلیڤەیەکی کۆنترۆڵکراو بوو بۆ هەردوو لایەنی قسەکەر و گوێگری ئەو دانپێدانانە. ئاشکراش بوو بۆ زۆر لە ئەندامەکانی موجاهیدین کە مەسئوولەکان و فەرماندەکانی تر ئارەزووی خۆیان بەبیستنی وردەکاریی زیاتری خەونەکان تێر دەکرد و پاشان نەفرەتیان لە ئەندامەکە دەکرد کە دانپێدانانەکەی دەکرد. زۆر پیاو هەبوون وێنەی مریەم ڕەجەوییان بەدەرگەی دۆلابەکانیانەوە هەڵواسیبوو. خەونەکانی بەویانەوە دەبینی ئەژمار نەدەکران.

بەلام بۆچی پیاوان نهێنیترین بیرەکانی خۆیان لە "کۆبوونەوەکانی ڕاپۆرتدان"ی ڕۆژانەدا بۆ گرووپێک خەڵک ئاشکرا دەکەن کە ڕۆژانە دەیانبینن؟ بەتایبەتی کاتێک پرسەکە پێوەندیی بەشتێکی تایبەت و نهێنیی وەک خەون و خەیاڵە سێکسییەکانەوە هەبێت. من باوەڕ ناکەم ئەوانە تەنیا بۆ چێژی نهێنی بێت کە لە ئەنجامی باسکردنی ئەم جۆرە خەیاڵانەیە. چونکە ئەوانەی بەڕاستی باسی بیرەکانیان ناکەن دەخرێنە ژێر پاڵەپەستۆ تا وای لێ دێت ئەو پیاوە یان ئافرەتە شتێکی هەڵبەستراو باس دەکات بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکات. ئەمەش دیسان وا لە ئەندامان دەکات هەست بەتاوانباری بکەن. زۆر ئەندام بەحەپەسانەوە بۆمیان باس کردووە چۆن هەستیان بەتاوانباری دەکرد کاتێک بیرە نهێنییەکانی خۆیان ئاشکرا نەدەکرد و بەنهێنی ڕایان دەگرتن.

بەئەندامانی موجاهیدین دەگوترا ئەو دانپێدانانەی ئەوان زۆر پێویستن، چونکە ڕابەر ڕەجەوی خەتای هەموو کردەوەکانی ئەندامان لە ئەستۆی خۆی دەگرێت و پێیان دەگوتن پێویست ناکات خەم لە کردەوەکانیان بخۆن، چونکە ڕەجەوی ئەو خەمە لەجیاتی ئەوان دەخوات. ئەم قسەیەش دەرەنجامێکی یەکجار گەورە لەسەر ئەوانە هەبوو کە زۆر باوەڕیان بەو قسەیە هەبوو، چونکە بەو شێوەیە بەهیچ شێوەیەک بیر لە کردەوەکانیان ناکەنەوە و لە ئەنجامدا نابنە خاوەنی هیچ دەستپێشخەرییەکی خۆیان.

لە مەسعود خودابەندە دەپرسم ئەو قسەیە بۆ مرۆڤ واتای چییە؟ لە وەڵامدا دەڵێ: "نەمدەتوانی کراسێک بکڕم. نەمدەتوانی هیچ شتێک لە ژیانمدا بەدڵی خۆم هەڵبژێرم. هەمیشە منیان بەوە قایل دەکرد کە دەبێ حەز لەو شتە بکەم کە سەرکردەکەم حەزی لێیەتی. ئەمەش تووشی تەوەزەلییەکی خۆشت دەکات. کە تۆ لە کردەوەکانی خۆت بەرپرس نەبی تەنانەت لە دەستنیشانکردنی کراسێکیش، کەواتە لە کوشتنی خەڵکیش بەرپرس نیت. چونکە ڕابەر بەرپرسە. ڕۆحی تۆ بەشدار نییە. ئەمەش لایەنێکی تری ترسناکی هەیە. تۆ هەست بەتاوانباری ناکەیت بەلام هەست بەدڵخۆشیش ناکەیت."

ئەنجامی ئەم پرۆسەیەش ئەوەیە: ڕەجەوی هەر شتێک بەئەندامانی خۆی بڵێت دەیکەن. هەر شتێک، وەک خودابەندە دەڵێ، ڕەجەوی بیڵێت باشە. تێگەیشتن لە

بارەی باش و خراپ بەهەوەسی سەرکردەوە بەندە، هەرچی حەزی لێ بێت باشە و حەزی لێ نەبێت خراپە. کۆنە ئەندامێکی تر لەو بارەیەوە دەست بۆ شەکردانێکی سپی لەسەر مێزەکەمان دەبات و دەڵێ: "لەوەش گرینگتر ئەوەیە، ئەگەر ڕەجەوی پێتی بگوتبا ئەو شەکردانە ڕەشە ئەوسا بەڕاستی ڕەش دەهاتە پێش چاوت."

دیسان "شۆڕشێکی" تر هات. ئەمجارەیان مەبەستەکەی شکاندنی ناسنامەی کەسێتیی ئەندامان بوو. قۆناغی کەرایەتی، کۆنە ئەندامەکان بەتەوسەوە ئەو ناوەیان لێ نابوو، کەواتە قۆناغی خۆ تەلاقدان "تەلاق خود". مەسعود خودابەندە فێرم دەکات چۆن پێویستە بەخەیاڵی خۆم لەو بارەدا بژیم. لێرەشدا دووبارەکردنەوە ڕۆڵێکی مەزن دەبینێ. لە میانەی "نشاست"ـەکاندا کە زیاتر لە ١٠٠ کەسی تێدا ئامادە دەبوون، یەک کەس دووبارە و سێبارە قسەی ناشیرینی پێ دەگوترێت. "دەبوایە کە نۆرەی تۆ دەهات هەر گوێت بگرتبایە لەو قسە دووبارە کراوانە تاوەکو قایل دەبووی کە تۆ هەڵە و ئەوان ڕاستن، ئینجا ئەوان ڕاست بن یا هەڵە گرینگ نییە..کەواتە دەبوایە بەقسە و کردار پێشانت دابا تۆ وەک کەرێک ئیش دەکەی و بیر دەکەیتەوە. نەدەبوو بیر بکەیتەوە."

ناسنامەی کەسایەتیی خۆت لەو قۆناغەدا هیچ ڕۆڵێکی نەدەما: پرسەکە پرسی یەکبوونی ئەندامان و سەرکردە بوو. خودابەندە لێرەدا قسەیەکی موجاهیدین دەگێڕێتەوە: "ڕەجەوی گوتوویەتی: دەبێ هەموو ئەندامێک وەک شووشە دیوەدەر بێت، نابێت هیچ شتێکی خۆت هەبێت، چونکە بەپێچەوانەوە ئەو شتە تایبەتییەی خۆت دەبێتە کۆسپ لە نێوان تۆ و خەڵکی من". خودابەندەش ئەم گوتنەم بەم شێوەیە بۆ ڕاڤە دەکات: "مانای ئەوەیە تۆ پێویستیت بەهیچ جۆرە خوێندنێک نییە و نابێ بیرۆکەی تایبەت بەخۆت هەبێ. لە ڕاستیدا مەبەستی ئەوەیە تۆ چەند کەمتر بزانی ئەوەندە باشترە". چونکە ڕەجەوی دەزانێ زانین دەسەڵاتە، وەک سەرکردەیەکی ڕەهاش ئەوێک ئەو دەسەڵاتە تەنیا لە دەستی خۆی ڕادەگرێت.

کە ئەندامەکانی موجاهیدینی لە زانیاری و لە ڕابردووی خۆیان دابڕاند، ئەوسا بەڕاستی لە کۆتاییدا ناسنامەی خۆیان لە دەست دا. ئەوە بوو زۆربەی موجاهیدین لە ناو ڕێکخراوەکەیان چی تر ناوە ڕەسەنەکانی خۆیانیان بەکار نەدەهێنا. ئەم کارە پێشتر بۆ پاراستنی گیانی ئەندامان و دوورخستنەوەیان لە دەستگیرکردن بەکار

دەهێنرا بەڵام لەو قۆناغە بووە بەشێکی گرینگی پرۆسەی نامۆکردن.

ئەم کارەش پەشیمانیی تێدا نەبوو. نزیکەی هەموو ئەندامانی موجاهیدین بۆیان ساغ بووبووەوە کە ئیدی تەواو ناگەڕێنەوە نێو باوەشی خێزانەکانیان. چونکە ئەوان تا ئەو کاتە ئەم خێزانانەیان خستبووە مەترسی و داوای پارەیان لێیان کردبوو بۆ ڕێکخراوەکەی خۆیان، پاش ئەوەش چەندین ساڵ بوو پێوەندییان بەخێزانەکانیانەوە نەکردبوو.

کەواتە بەهزری ئەندامانی خۆیان کەس ئەوانی خۆش نەدەویست جگە لە ڕەجەوی. ئیدی هیچیان نەماوە لە دەرەوەی موجاهیدین بایەخی پێ بدەن: ئەوان خوێندنی خۆیان تەواو نەکردبوو، زانستیان کاتی بەسەر چووە و ڕێگەشیان لێ گیراوە و ناتوانن بچنە نێو هێزی کاری وڵاتەکەیان. کەواتە ئەوسا ڕێکخراوەکەیان بووبووە تاکە پشت و پەنایان. هەر ئەم چەمکەشیان بەردەوام بەگوێی ئەندامانـدا دەچرپاند وەک خودابەندە دەڵێ: "ڕەجەوی بەخۆی گوتوویەتی: نە خاوەن هیچ شتێکن و نە هیچ شوێنێکتان هەیە بۆی بچن، بۆیە خەم لە هیچ مەخۆن، تا دوایی لەگەڵمان وەرن".

بەڵام کە دەمپرسی ئەی بۆ لەگەڵیان مانەوە؟ تۆ بڵێی خەڵکی ناو ڕێکخراوەکە باش بوون و لە ڕاستیدا لە خێزانەکانیشتان باشتر بوون بۆتان؟ هەموو کۆنە ئەندامان لە وەڵامدا دەیانگوت خۆزگە وەڵامی ئەم پرسیارە بەئاسانی لامان دەست بکەوێ.

لەو قۆناغەدا نەبوونی متمانە باڵی بەسەر هەمووانـدا کێشابوو. لەو ژینگەیەشدا دروستکردنی پێوەندیی دۆستانە ئەستەم بوو. ئەگەریش بیاندیبا دوو کەس چپەچپ لەگەڵ یەکتریدا دەکەن ئەوسا پێیان دەگوترا "محفل" دەکەن یاخۆ قسە لە دژی ڕێکخراوەکە دەکەن. دۆستایەتی لە ناو تیمەکانی موجاهیدین کە بەیەکەوە کاریان دەکرد هەبوو، بەڵام دۆستایەتیی ڕاستەقینە بوونی نەبوو.

مەسعود خودابەندە لەو بارەیەوە دەڵێت "تۆ نەتدەویست ئەم جۆرە دۆستایەتییە نزیکە هەبێ، چونکە دەتزانی کە بوونی قەدەغە کراوە. چونکە دۆستایەتی وزە پڕووکێن بوو کە دەبوایە وزەکە تەنیا بۆ سەرکردە تەرخان بکرێت. ئێمەش ئەندامانی بەشی هەواڵگریی ڕێکخراوەکە لە هەموو کەسێک چاکتر دەمانزانی ئێمەش چاودێریی توندمان خراوەتە سەر، چونکە ئێمەش چاودێریی خەڵکی ترمان دەکرد. ئەمە ئاشکرا بوو."

ئەندامان لە هەموو ئاستەکانی ڕێکخراوەکە ڕاپۆرتیان لەسەر یەکتری دەنووسی و لەو باوەڕەدا بوون شتی باش دەکەن بۆ ڕێکخراوەکە، چونکە ئەگەر ئەندامێک هەڵەی کرد ئەوا دەکرێ هەڵەکەی ڕاست بکرێتەوە و ئەگەر ئەندامێک سیخوڕی بۆ ئێران بکات ئەوا پێویستە ئاشکرا بکرێت. ئینجا ئەندامان زۆر بەوریاییەوە ئەو کەسانەیان دەستنیشان دەکرد کە متمانەیان پێ بکەن و ئەوانەی متمانەیان پێ نەکەن. هەمان ئەو چەمکەش ڕۆڵێکی گرینگی هەبوو لە کۆبوونەوەکاندا کاتێک هەڤاڵان نەفرەتیان لە یەکتری دەکرد و جاری وا هەبوو دەگەیشتە ڕادەی لێکدان.

پێم وایە خووگرتنی ئەندامان بەڕەجەوییەوە تاکە هۆ بوو کە نەیدەهێشت ئەندامان لە دەست موجاهیدین ڕابکەن و ڕوو لە بیابان بکەن، کە دەکرێ لەگەڵ خووگرتن بەتلیاک کێشانەوە بەراورد بکرێ. تۆ ڕقت لە تلیاک یا مادەی سڕکەرە، بەڵام ناتوانی بەبێ کارتێکردنی بژی. تۆ تەواو پشتی پێ دەبەستی و ئەویش ژیانت کۆنترۆڵ دەکات، چونکە تاکە شتێکە بۆت ماوە. نە ماڵێکت هەیە بۆی بگەڕێیتەوە، نە خێزانێک کە هێشتا تۆیان بوێ و نە دۆستێک جگە لە خووگرتووەکانی تری داماوی وەکو تۆ نەبن.

ئەی پێگەی ئیسلام کە ڕۆژێک لە ڕۆژان زۆر گرینگ بوو لە ناو موجاهیدین لەو کاتەی ئیسلام و مارکسیزمیان تێکەڵ بەیەکتری کردبوو، چی لێ هات؟ ئەویش وەک کۆنە ئەندامان دەڵێن سووا بوو. ئەندامان لەسەر ئەوە ڕادەهێنرێن کە: تەنیا کە باوەڕت بەڕەجەوی هێنا ئینجا باوەڕت بەخوا دەبێ. ئەو "پەردەدارەکەیە = الشراع" و تۆ دەبێ خۆتی پێ ببەستی. ڕۆژێک دێ مرۆڤایەتی داوای لێ دەکات ڕزگاری بکات، ئەوانەی باوەڕیش بەم قسەیە ناکەن بێگومان بڕوایان بەخوا نییە، ئەگینا ئەم ڕاستییەیان دەزانی. بۆ موجاهیدین ڕەجەوی مەسیحی پێغەمبەر بوو.

بەڵام ئەمە هەموو شتێک نییە. چونکە لە ئێران خومەینی فەرمانڕەوایەتیی "ولایە الفقیە"ی دامەزراندبوو، یاخۆ سەرکردایەتیی ڕۆحی، موجاهیدینیش هەمان ڕۆڵیان دابووە ڕەجەوی و هەموو مشتومڕێکی سالانی ساڵ بوو لە ئێران بەردەوام بوو لە بارەی ڕاستبوونی ئەم جۆرە سەرکردایەتییەی پشتگوێ خست. ڕەجەوی سەرکردەی ڕۆحی بوو، جاری یەکەم هەر بۆ ئەوان و پاشان بۆ هەموو ئێرانییەکان.

پاشان دەمەوێ بزانم ئەندامانی موجاهیدین تا چ ڕادەیەک ئازادیی ئاینییان

هەبوو. مەسعود خودابەندە لە وەڵامدا دەڵێ: "هیچ." ڕەجەوی بەلێکدانەوەی خۆی وەک سەرکردەی ڕۆحی خۆی خستبووە نێوان ئەندامان و خوا. هەر خۆیشی ئامرازی پێوەندیکردن بوو بەئیمامی عەلی (ر). کەواتە پێوەندیی ڕاستەوخۆ لەگەڵ خوا نەک هەر ئەستەم بوو بگرە قەدەغەش کرابوو.

پێوەندیکردنیش بەڕەجەوی واتە پێوەندیکردن بەخوا، ئەوەی ڕەجەوی لە ڕێگەی مریەمەوە فەرمانی دا، دەبێ. مەگەر ئەو دەروازەی ڕابەر نییە. "ئەگەر قورئانت بخوێندبا یاخۆ نوێژی زیاتر لە پێویستت بکردایە بەوە ڕاڤە دەکرا کە ئاماژەیەکە بۆ دابڕانت لە ڕەجەوی و کە تۆ کەوتوویتە کێشە و پێویستیت بەڕێنیشاندەری هەیە."

چەند ساڵێک بەر لەو قۆناغە و لە میانەی "گەردەلوولی کتێب"دا هەموو کتێبەکان لە ناو ڕێکخراوەکە لابران، لەوانە قورئانی پیرۆزیش کە موڵکی تایبەتی ئەندامان بوون. تاکە سەرچاوە کە بۆت هەبوو لێی بخوێنی و خواستنی بکەیت ڕەجەوی بوو.

ڕەجەوی بانگەشەی ئەوە دەکات گوایە تەنیا ئەو لە بەرامبەر خوادا بەرپرسیارە، کەواتە لە بەرامبەر ئەندامانی بەرپرسیار نییە. ئەوان لە بەردەم ئەودا بەرپرسیارن کە جێگری خوایە و بۆیە دەتوانی سزا و پاداشتیان بکات. نوێژکردن و پێوەندیکردن بەخوا، کە نەریتی موسڵمانی چاکە، موجاهیدین وازیان لەم کارە هێنا. لەوەش گرینگتر: لە هەموو شتێک تەنانەت لە یاسا و ڕێسا ئاینییەکانیش قسەی ڕەجەوی دەیخوات. دەکرێ بگوترێ کە خۆی لە سەرووی خواشەوە دانابوو. خودابەندەش ڕوونی دەکاتەوە و دەڵێ: "چونکە ئێرانییەکان مرۆڤی موسڵمانن، ڕەجەوی ئیسلامی وەک ئامرازێک بەکار دەهێنا. ئەگەر ئەوان مەسیحی بوونایە ئەوسا تیرەکەی خۆی لەسەر بنەمای مەسیحییەت دادەمەزراند."

ئەی چی بەسەر مارکسیزمدا هات کە بەشە کۆمەڵایەتییەکەی موجاهیدینی پێک دەهێنا؟ ئەوە بوو تێکەڵەی مارکسیزم و ئیسلام لەمێژ بوو فڕێ درابوو. تاکە مەبەستی ئایدیۆلۆجیای نوێش "بەختیاری"ی مەسعود ڕەجەوییە.

بۆ ئەوەی کارەکان بەڕێکوپێکی ئەنجام بدرێن، لە کاتی پێشکێشکردنی "شۆڕشی ئایدیۆلۆجیایی" جۆرێکی نوێی ئایدیۆلۆجیا پێشکێش دەکرێت ئەویش دیسان کاردانەوەیەک بوو بۆ ئەو کارەی خومەینی لە ئێران دەیکات. مەسعود بەنیسەدر دەگێڕێتەوە چۆن مریەم ڕەجەوی لە دانیشتنێکدا لە کەمپی ئەشرەف، کە هەفتەیەک

دەخايەنێت، بەراوردێک لە نێوان خومەینی و موجاهیدین دەکات و لەو کارەیدا، وەک لە "شۆڕشەکاندا" باو بوو، هێرشێکی توند دەکاتە سەر ڕاستییەکان. ئەو باوەڕی ئەوە بوو کە خومەینی سێکس بەهەموو شتێک تاوانبار دەکات، کەچی گەورەترین تاوان لە نێو موجاهیدین نەبوونی باوەڕ بوو بەبەزەییی خوا. کاتێکیش ئەو ئەم قسانەی دەکرد سێکس لەمێژ بوو لە نێو موجاهیدیندا بەگەورەترین تاوان دادەنرا.

بەنیسەدر لە کتێبەکەیدا قسەی مریەم لەو بارەیەوە دەگوێزێتەوە: "ئەو خوایەی خومەینی باسی دەکات خوای ڕق و جەهەننەمە، خواکەی ئێمە خوای بەزەیی و لێبووردنە. ئەوان ڕق و کینە دەیانجوولێنێ، ئێمەش خۆشەویستی. سۆزەکانی ئەوان تەنیا بۆ کەسوکارە نزیکەکانیانە و سۆزەکەی ئێمەی بۆ هەموو مرۆڤایەتییە."

ئەگەر ئایدیۆلۆجیاکەی ئەوان ئەوەندە لە مێشکیان چەقی بێت و ئافرەتان ئەوەندە بالاتر کرابن، بۆچی ئافرەتی موجاهیدی داماو تا ئەو کات لەچکیان لەسەر دەکرد؟ ڕەنگە بۆ ئەوەی پێشانی حکوومەت و گەلی ئێرانی بدەن موجاهیدین چەند موسڵمانن. هەمان شتیش دەربارەی تەوقەنەکردنی ئافرەتان لەگەڵ پیاوان دەگوترێ. ئەو ڕەفتارەی موجاهیدین دەیانکرد لە ئێرانیش باوی نەمابوو، چونکە تا دەهات ئافرەتان لە ئێران قژی خۆیان زیاتر لە ژێر لەچکەوە دەردەهێنا و تەنیا بۆ کارمەندی حکوومەت و پیاوانی ئاین نەبێ دەستگرتنی ئافرەت کارێکی ئاسایی بوو و تەنانەت لە پشت دەرگە داخراوەکاندا کوڕ و کچی گەنج بەوپەڕی دڵخۆشییەوە سەمایان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد.

کۆنە ئەندامان ڕێکخراوی موجاهیدینیان بەزیندان ناو نابوو. ڕەجەوی نەک تەنیا ئەوانی لە پشت دیوارە بەرزەکانی کەمپەکاندا زیندان کردبوو، بگرە لە ڕووی سۆزیشەوە خستبوویانییە زیندان و بەهۆی ئەو هەموو ترس و یاسایەوە ناچاریانی کردبوو باوەڕی پێ بێنن. چونکە هەموو ئەو خەڵکەی لە دەرەوەی ڕێکخراوی موجاهیدین وەک "ئاژەڵ" یاخۆ بەراز دەژین، ئەمە باوەڕی ئەندامانی موجاهیدین بوو ئەوانەی لە کەمپەکانی عێراق دەژیان. باوەڕی ڕاستەقینەی ئەوان ئەوە بوو-ئەگەر تاکە شێوازی ژیان هەبێ لەگەڵ ئیسلامدا بگونجێ ئەوە لە ناو موجاهیدیندا هەیە. لای ئەوان دابەشکردنێکی ئاسان بۆ جیهان کرابوو: ناوەوە باشە و دەرەوە خراپە.

ئەم بارە بۆ زیادکردنی گۆشەگیری باشە کە ئەویشیان توخمێکی گرینگی

تیـرەکەیە. تاوەکو ئەمـەریکاییـیـەکـانیش هاتنە عێـراق بارودۆخ لەســەر ئەو ڕێرەوە دەڕۆیشت. هەموو ئەندامان تەنیا گوێیان لەو شتـانە دەبوو کە سـەرکردەکان پێیان باش بوو. تەنیا کەناڵی تەلەفزیۆنی خۆیان دەبینرا و تەنیا کۆواری خۆیان "موجاهید" دەخوێندرایەوە. هیچ موجاهیدێک نەیدەزانی پێوەندیی نێوان ڕەجەوی و سەدام چەند نزیکە، هەرچەندە ئەوانە لە عـێـراق بوون و ئەو پێـوەندییـە لە بەردەمـیـان بوو. دەنگوباسی ئەو گۆڕانکارییانەی جیهان نەدەگەیشتـە موجاهیدین و ئەگەر بگەیشتبا تەنیـا بەچاوی سـەرکردایەتی دەیانبینی. کـەسیـان نەیدەزانی سـەرۆک خـاتەمی لە ئێران چ جۆرە چاکسازییەکی ئەنجام داوە.

ئەندامـانی مـوجاهـیدین هیچ پێوەندییەکیان لەگەڵ جـیـهانی دەرەوەدا نەبوو. ئەو نامـانەی لە خێزانەکانیانەوە بۆیان دەهات پێیان نەدەدرا. پێیـانیش دەگوترا بۆتان نییە تەلەفۆن بەکار بهێنن، هەرچەندە کاتێ مەسعود خودابەندە لە ناو مـوجاهیدین بوو سـوور بوو لەســەر ئەوەی مـوجـاهـیـدین ببنە یەکـەم لایەن ئامـێـری فـاکس لە ڕۆهەڵاتـی ناڤین بەکـار بهـێنن و یەکـەمین کـەس بن تەلەفـۆنی مـۆبایل کـە لەســەر شەپۆلەکـان ڕادیۆ کاری دەکرد بەکـار بهێنن. بەڵام ئەو ئامێرانە تەنیا بۆ ڕەجـەوی و سەرکردەکانی تر بوو.

هەروەها ئەنـدامـانی مـوجـاهـیدین پێـوەندیان بەعێراقـیـیەکـانیشـەوە نەبوو، کە ئەمەشیان شـتێکی سەیرە چونکە موجاهیدین لەسەر خاکی عێراق بوون و ئەفسەری عـێـراقی مـەشـقـیـان پێ دەکـردن. لەگـەڵ ئەوەشـدا کـۆنە ئەندامـان بەمنیـان گـوت پێوەندیکردن بەعێراقییەکانەوە قەدەغە کرابوو: نەدەبوو بیر لە قسەکردن لەگەڵیـان بکـەینەوە. تـەنانەت ســەربازەکـانی مــوجـاهـیـدین کــە پێـوەندییـان بەئەفـســەرە عـێـراقـیـیـەکـانەوە دەکـرد پێـوەندی و ئاخـاوتنەکـانیـان تەنیـا لـە بواری کـاروباری مـەشقـەکاندا بوو. مـوجاهیدین نەیاندەزانی چۆن دراوی عێراقی بەکار بهێنن. تەنیا چەند کەسێک لە ئاستی سەرکردایەتـی کە کاروباری کڕینیان دەکرد دەیانزانی چۆن بەکاریان بهێنن.

لە ئەورووپا دابڕان و گۆشەگیرییەکە کـەمتر بوو، چونکە لەوێ نەدەتوانرا دیوارێکی بەرز لە نێوان ماڵەکەت و جیهانـی دەرەوەدا قیت بکەیتەوە. لەگـەڵ ئەوەشدا ئەندامانی مـوجاهـیدین کـە لەوێ چالاک بوون وا کـاریان دەکـرد دەتگوت بارگـیری کـاکـوتانن

چاویان نیمچە بەستراوەتەوە. بەڵام جیهانی ڕاستەقینەیان دەدیت وا نییە؟ لە ئەورووپاش ئەندامان پێوەندییان بەجیهانی دەرەوەی ڕێکخراوەکەیانەوە نەبوو، بێجگە لە "دیبلۆماتەکان" نەبێ وەک مەسعود بەنیسەدر. ئەوانەش ماوە ماوە بۆ دووبارە مێشک ئاودان بانگهێشتنی عێراق دەکرانەوە و بۆ ئەوەی لە ژێر چاودێریی توندی مەسئوولێکدا کار بکەن.

چەند ئەندامێکیش پێمیان گوت لەبەرئەوەی ئەوان زۆر پرۆگرام کرابوون لە ئەورووپاش بەهەمان شێوەی عێراق ڕەفتاریان دەکرد. یەکێ لەوانە گوتی: "کە لە عێراق بووین وەک ئەوەی لە نێو بوتڵێکدا دانیشتبین وا بووین. لە ئەڵمانیاش لە ناو هەمان بوتڵ دادەنیشتین. نەماندەتوانی لەو بوتڵە بچینە دەرەوە." بەڵام ئەو زیندانە شووشەییە بنیاتنراوی خەیاڵی خۆتە، وەک ئەو ئەندامانە بەمنیان گوت، لە کۆنترۆڵە کۆمەڵایەتییەکەی نێو گرووپەکەدا "سەرشووشتن و سەر پێشاوی لێ بچێتە دەر هەموو کاتەکانی تر کەسێکی ترت لەگەڵدا هەبوو."

ئەو جۆرە کۆنترۆڵە لە ڕادەبەدەر بوو و بووبووە لایەنێکی ژیانی ڕۆژانەی ئەندامان. مەسعود خودابەندە دەڵێ ئەو هەستی بەتاوانباری دەکرد کە شتێکی دەبینی موجاهیدین لێی قەدەغە کردبوو ببینێ. "من بەخۆمم دەگوت لەبەر کارەکەم دەبێ ئەم جۆرە شتانە ببینم. بەم شێوەیە گومانەکانم دەڕەواندەوە. من زۆر بەوە دڵخۆش دەبووم کاتێک کەسێکی تر لەگەڵمدا دەبوو بۆ ئەوەی چاودێریم بکات نەوەک کارێکی هەڵە بکەم."

لە ئەورووپا کە موجاهیدێک دەچووە هۆڵی پێشوازیی ئوتێلێک و تەلەفزیۆنێکی لێ بایە یان ڕووی خۆی وەردەگێڕا یاخۆ لە کاتی دانیشتن پشتی تێ دەکرد. ئەو موجاهیدە ئینتەرنێت تەنیا لە ژووری کارکردن بەکار دەهێنی و تەنیا ئەگەر موجاهیدێکی تری لەگەڵدا بێ بۆ ئەوەی چاودێریی بکات. ئەمەش لە ڕووی ڕەسمییەوە بۆ ئەوەیە نەوەک نابەدەست سایتە سێکسییەکان بکاتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ڕەجەوی لەوە دەترسا نەوەک موجاهیدەکان پێوەندی بەجیهانی دەرەوەی موجاهیدینەوە بکەن. خودابەندە لەو بارەیەوە دەڵێ: "تۆ هەمیشە لە ململانێ بوویت لەگەڵ خۆتدا، ئەمەش شێتت دەکات." ئەم شێوازی ژیانەی بۆمی دەگێڕنەوە چەندین ئەندامی موجاهیدی لە کەمپی ئەشرەف ناچاری خۆکوشتن کرد. بەقسەی ئەوانەش

٢٤ کەس لەو کەمپە خۆیان کوشتووە. بەڵام ڕەنگە ژمارەکە لەوە زیاتر بێت چونکە هەمیشە ڕووداوەکانی خۆکوشتن بەنهێنی ڕادەگیرێن و هەرگیز ڕانەدەگەیەنرا فلانە ئەندام خۆی کوشتووە. چونکە پیاوان و ئافرەتان لەوێ لە بەهەشتدا دەژیان و شوێنی ئەم جۆرە ڕووداوانە لەوێ نابێتەوە.

ناشیرینترین وشەی نێو موجاهیدین چ بەپیاو یان ئافرەت بگوترێت "بوریدە" بوو. چونکە پرۆسەی پەڕاوێزکردن بەو وشەیە دەستی پێ دەکرد. بۆیە تەنیا بیرکردنەوە لە پێوەندیکردن بەوانەی ڕیزەکانی موجاهیدینیان بەجێ هێشتبوو لە موجاهیدین نەدەغە بوو. چونکە ئەوانە وەک خائین و سیخوڕی ئێران تەماشا دەکران و تۆش نەتدەویست هیچ تێکەڵییەکت لەگەڵیاندا هەبێ. مەسعود خودابەندە لە بیریەتی لە پاش وازهێنانی لە موجاهیدیان چۆن جارێکیان لە ماڵی دایکی چاوی بەئیبراهیمی برای کەوت کە هێشتا لە ناو موجاهیدین مابوو. ئیبراهیم لە نەفرەت زیاتر هیچی پێ نەگوت. خودابەندە گوتی بەهیچ جۆرێک بواری ئاخاوتنی ئاساییی لەگەڵیدا نەبوو، لە تۆنی دەنگیشی دیار بوو ئەو ڕووداوە تا ئێستاش ئازاری دەدات. ماوەیەکی کورت پاش ئەو قسانە لە زیندانی ئەڤین لە تاران چاوم بەئیبراهیم کەوت. کە باسی ئەو ڕۆژەی لەگەڵ مەسعودم بۆ گێڕایەوە زۆر بەپەشیمانییەوە گوتی: "هیچی ترم لە دەستدا نەبوو، چونکە پێچەوانەی ئەوە ناپاکیکردن بوو لە ڕێکخراوەکەم."

مەسعود بەنیسەدر لە بارەی ئەو ڕقەی ڕێکخراوەکە لەوانەی وازی لێ دێنن نووسیویەتی "من لەسەر ئەوە ڕاهاتبووم وەک شۆڕشگێڕێک چەند خۆشەویستیت هەبێ دەبێ ئەوەندەش ڕقت هەبێ. دەبوایە ڕقمان لە دوژمنگەلی سەرکردەکانمان ببووایە و بەدوژمنی گەل و بگرە مرۆڤایەتیش دایانبنێین." بەڵام وەک نووسیویەتی ڕق لە کۆنە هەڤاڵان هەچەندە هۆیەکانی زۆر بوون، بەلای ئەوەوە کارێک زۆر قورس بوو. ئاشکراکردنەکانی ئەوانەی وازیان لە تیرەکەی ڕەجەوی دەهێنا زەرەرێکی زۆریان بەڕێکخراوەکە گەیاند. وەک لە کتێبەکەی بەنیسەدر هاتووە "لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا ئەو زیانەی ئەوان بەموجاهیدینیان گەیاند زۆر گەورەتر بوو لە زیانەکانی هەموو دژە شۆڕشگێڕەکان، هەر لە ساڵی ١٩٧٩وە تا ئێستا."

یەکێک لە گرینگترین ئەو هۆیانەی وای کردووە تەمەنی ئەم تیرەیە لە "ڕێژەی تەمەنی چاوەڕوانکراوی" ئەم جۆرە تیرانە، کە ١٠ ساڵە، زیاتر بێت ئەوە بوو مەسعود

ڕەجەوی وای لە خەڵکەکەی خۆی کردبوو هەمیشە چاودێریی یەکتر بکەن. ئەوان وەک هاووڵاتییانی نێو ڕۆمانی ١٩٨٤ی نووسەری بەریتانی جۆرج ئۆروێل بوون و هەمووشیان ئەو ڕاستییەیان دەزانی.

سیستمی کۆنترۆڵی نێوخۆ تا دەهات قایمتر دەکرا. فاتیمە ئەمیری کە ساڵانێک لە بەشی کارگێڕیی موجاهیدین لە کەمپی ئەشرەفدا کاری دەکرد دەڵێ هەموو ئەندامێک چ لە ناو یاخۆ دەرەوەی عێراق بێت، فایلێکی قەڵەوی هەبوو کە لە ڕاستیدا لە چەند فایلۆکەیەک پێک هاتبوو. بەشێکی ئەو ئەرشیڤە مەزنە خرابووە سەر کۆمپیوتەرەکان، بەڵام نەدەکرا هەموو شتەکان بخرێنە سەر کۆمپیوتەر، چونکە جگە لە ڕاپۆرتی مەسئوولەکان لەسەر هەر ئەندامێک و زانیارییە کارگێڕییەکان لە بواری کارکردنی لەگەڵ موجاهیدین، بڕێکی زۆری زانیاریی کەسیش هەبوون.

فاتیمە ئەمیری، کە ئەمەش ناوێکی خوازراوە، دەڵێ: "ئەو فایلانە ئەڵقەی هاوسەرایەتییان تێدا بوو و ئەو بەڵگانەی تایبەت بەتەڵاقدانەکان و هەروەها وێنە و پاسپۆرتی هەر ئەندامێک کە کاتی گەیشتنی بۆ لای موجاهیدین پێی بووە و ئەو نامانەی ئەندامانی خێزانەکانیان بۆیانیان ناردووە." ئەو بەشەی فاتیمەی لێ بوو هەموو نامە هاتووەکانی لێ دەخوێندرایەوە. زۆربەی ئەو نامانە نەدەدرانە ئەندامان. "ئەگەر لە نامەیەکدا منداڵێک بۆ دایک و باوکی نووسیبا کە بیریان دەکات ئەو نامەیە لە ناو دەبرا. بەدوای ئەو منداڵەدا دەگەڕاین. ئەگەر لە یەکێک لە خانەکانی ئێمە بووایە ئەوا پێوەندیمان بەسەرپەرشتیارەکانەوە دەکرد و فەرمانمان پێیان دەکرد نامەیەکی تر بەناوی منداڵەکەوە بنووسن و بڵێن وەزعی زۆر باشە و هیچ بیری دایکی ناکات. نامە ساختەکەشمان دەگەیاندە دەستی دایکی منداڵەکە."

زۆربەی نامەکانی ئەندامانی خێزانەکان لە نێو ئەو فایلانەدا نوقم دەبوون و قەت نەدەگەیشتنە دەستی ئەندامانی موجاهیدین. چونکە ئەو نامانە مەترسییان تێدا بوو: ئەمانە نەک تەنیا سەرگەردانیان دەکات بگرە پێشانی موجاهیدینی دەدات کە ئێستاش لە دەرەوە جیهانێک هەیە و خەڵکێکی تێدایە ئەوانیان خۆش دەوێ. کۆنە ئەندامانیش ئەوەیان پشتڕاست کردەوە و گوتیان ئەگەر نامەیەکی لەم جۆرەیان بەدەست گەیشتبا ئەوا لە ناخەوە دەیانیهەژاند و دڵی خۆیان پێ گەرم دەکرد و دەیانویست بۆ خۆیانی هەڵگرن، بەڵام دیسان دەبوایە لە کۆبوونەوەکانی "ڕاپۆرتدانی

ڕۆژانە"دا ئاشکرایان بکردایە.

ڕێکخراوەکە بۆ سوودی خۆی نامەی بۆ ئەندامانی خۆی دەنارد. فاتیمەی ئەمیری لەم بارەیەوە بەمنی گوت ئەگەر دوو هاوسەر ڕازی نەبان یەکتری تەڵاق بدەن ئەوا ڕێکخراوەکە دوو نامەی ساختەی بەناوی ئەوانەوە بۆ هەردووکیان دەنارد تیایدا داوای تەڵاقدانی لە هاوسەرەکەی دەکرد. بەڵام کە نۆرە گەیشتە فاتیمەش، چونکە خۆی بەو ساختەکارییەی دەزانی مێردەکەی خۆی ئاگەدار کردبوو کە ئەو نامە ناشیرینەی نەنووسیوە. هەروەها فاتیمە دەڵێ: "ڕێسایەکی گرینگیش هەبوو لە ڕێکخراوەکە کە تۆ قەت بۆت نەبوو سەیری ناو فایلەکەی خۆت بکەی. ئەندامان نەیاندەزانی چ وێنە و نامەگەلێک لە نێو فایلەکانیاندا هەبوو." فاتیمە لەوە دڵنیایە کە لە نێو فایلەکەی خۆیدا وێنەی منداڵەکانی هەبوون، ئەو منداڵانەش بۆ ئەورووپا ڕەوانە کرابوون و فاتیمە نەیدەتوانی بگاتە ئەوێ.

بەشێکی گرینگی بەڵگەکانی نێو ئەو فایلە کەسییانەش بریێتی بوون لەو ڕاپۆرتانەی ئەندامان لەسەر خۆیانیان دەنووسی و هەروەها ڕاپۆرتی مەسئوولەکان لەسەر خەون و کردەوەکانی هەر ئەندامێک. فاتیمە هەفتەی دووجار دەچووە بەشی ئەرشیف لە نێو موجاهیدین و لەگەڵ ١٥ کەسی تردا کە هەریەکە و نزیکەی ٤٠ فایلی لە بەردەستدا بوو کاری دەکرد. هەریەک لەوان یەکە یەکە بەفایلەکاندا دەچووەوە بۆ ئەوەی بزانێت چ کێشەیەک هەیە، ئایا فڵانە ئەندام کاری چاک دەکات یاخۆ پێویستی بەچ جۆرە کردارێک هەیە؟ هەروەها کاتێک بەدوای ئەندامێکدا دەگەڕان بۆ ئەوەی پۆستێکی پێ پڕ بکەنەوە یان ئەگەر بەدوای زانیاری بۆ دەستگیرکردن و ئەشکەنجەدانی ئەندامێک بگەڕایەن بەفایلەکاندا دەچوونەوە.

فاتیمەی ئەمیری ئەوەش دەڵێت کە لە فایلەکاندا ئەو بەڵێننامانەی ئەندامانی تێدا بوو کە هەر ئەندامێک خۆی دەینووسی و ئیمزای دەکرد و تیایدا هاتبوو "بەڵێن دەدەم ئەگەر ڕێکخراوکەم بەجێ هێشت ئەوا ڕێکخراو چی بەپێویست بزانێ لە دژی من بیکات و ئەگەر پێویستیشی کرد بمکوژێت." بۆ ماوەیەکی درێژ وازهێنان لە ڕێکخراو هیچ مومکین نەبوو. تۆ وەک ڕێکخراوێک ئەندامانی خۆت ناچار بکەی خۆیان فەرمانی کوشتنی خۆیان ئیمزا بکەن بۆ ئەو ڕۆژەی کە چی تر بەرگەی ئازار نەگرن و لێت بێزار بن. ئەم جۆرە بەڵێننامەیە چ سوودێکی هەیە ئەگەر تۆ وەک

ئەندام پێت نەکرێ ئیمزای نەکەیت.

ئەو بەڵێننامەیە نموونەیەک بۆ ئەو تۆقاندنە بەردەوامە و پاڵەپەستۆ لە ڕادەبەری لە دژی ئەندامان بەکار دەهات. ئەمە ئەڵقەیەکە لەو زنجیرەی دەست و پێی ئەندامانی موجاهیدینی بەستبووەوە. چەند زنجیرێکی تریش لە ناو ئەو فایلە کەسییانەدا هەبوون. بۆ نموونە دانپێدانانەکانی هەر ئەندامێک لە دانیشتنەکانی ڕاپۆرتدانی ڕۆژانەدا، یاخۆ ئەوانەی لە ئەنجامی ئەشکەنجەدا لە زیندان لە ئەندامان وەرگیرابوون. ئەو ئەندامانە دەیانەوێ واز بێنن لەگەڵ ئەو دانپێدانانانە بەرەو ڕوو دەکرێن. ئەمیری بەمنی گوت: "ئەندامان بەهەمان نامە و بەڵگەکانی خۆیان دەتۆقێنران." ڕێکخراوەکە بەم شێوەیە دەیتوانی ئەندامانی خۆی ڕابگرێت.

ئەوەی وازیشی بهێنایە دەیزانی فایلەکەی هەر لەوێ دەمێنێ. مەسعود تەیبی بەمنی گوت کە پاش وازهێنانی ئەندامانیش فایلەکانیان دەما. تاوەکو ساڵی ٢٠٠٢ تەیبی لە پۆستێکی بەرز لە ناو موجاهیدین کاری دەکرد و بەحوکمی پلەکەی دەیدیت موجاهیدینی خەلق چ جۆرە زانیاریگەلێکی لەسەر ئەندامانی خۆی کۆ کردبووەوە. بۆیە ئەو فایلانە پاش وازهێنانی ئەندامانیش تا دەهات ئەستوورتر دەبوون چونکە وەک ئەو دەڵێ هەرچی شتێک ئەو ئەندامەی وازی هێناوە دەیکات یا نایکات لەو فایلەدا تۆمار دەکرا. چونکە پاش ماوەیەک موجاهیدین دووبارە پێوەندیی بەو ئەندامانە دەکردەوە تا بزانێ ئاخۆ دەگەڕێنەوە. هەروەها سوود لەو فایلانە وەردەگیرا کاتێک موجاهیدین بیانویستایە شتێک لەسەر کۆنە ئەندامێک بڵاو بکەنەوە.

جگە لەوەش ئەگەر هاتو وەک تەیبی بەپێکەنینەوە دەیگوت: "موجاهیدین دەسەڵاتیان گرتە دەست لە ئێران ئەو فایلانە هەموو قسە و کردەوەکانی کۆنە ئەندامانی تیایە کە لە دژی موجاهیدین کردوویانە، بۆ نموونە وەک ئەو قسانەی من و تۆ ئێستا دەیانکەین..."

دەکرێ ئەو قسە نەستەقە بەمەسعود ڕەجەوی بڵێین کە زانین دەسەڵاتە و ڕێک لەگەڵ ڕێبازەکەی دابەش کە و زاڵ بە یەک دەگرێتەوە. من ئەوەم لە یەکێک لە باسەکانی مەسعود تەیبی بۆ ئاشکرا بوو لە بارەی پەندێک لە ڕەجەوی فێری بوو و بۆی باسکردبوو کە بۆ ئەو (واتە ڕەجەوی) چەند گرینگە زانیارییەکان دابەش بکرێن.

تەیبی چەند ساڵێک بوو ئەرکی سازکردنی فیلمە ڤیدیۆییەکانی لە ئەستۆ گرتبوو

که له "شۆڕش" و نشاستەکانی ڕەجەویدا بەکار دەهێنران. جارێکیان ڕەجەوی بەڕاشکاوی پێی دەڵێ هەموو ڕاستییەکان بەیەک جار پێشانی ئەندامان نەدات. تەیبی قسەکانی ڕەجەویی لە بیرە کە پێی گوت "ئەگەر وامان کرد خەڵکی واز دێنن". شێوازی هەر جارە و کەمێک زانیاری دان بەئەندامان کۆنترۆڵ و دەسەڵاتی ڕەجەویی دەپاراست.

فەرەح کەریمی لە کتێبەکەیدا پراکتیزەکردنی ئەم شێوازەمان بۆ دەگێڕێتەوە. کە فەرەح لە ئێران بوو نەیدەزانی فاروقی مێردی لە ناو موجاهیدین چی دەکات. "لە ناو موجاهیدین هەموو شتێک بەپێی پلەکان دامەزرا بوو: چەند پلەت بەرزتر بووایە زیاتر زانیاریت چنگ دەکەوت." کە فەرەح لە هامبۆرگ جێگیر بوو ئەمەی نووسی "ڕەنگە فاروق سەرکردایەتی تیمی (...) بکات بەڵام کەس ئەمەی بەمن نەگوتووە." کە فەرەح لە پاریس دامەزرا بەدڵنیاییەوە نووسیی "لێرەش هەمان پرەنسیپ زاڵ بوو ئەویش لە کاتی ئیشکردندا دەبێ تا بکرێ کەمترین زانیاری لەگەڵ یەکتری ئاڵوگۆڕ بکەین، بۆیە نەمدەزانی چ شارێک لە شارەکانی تر لە نێو تۆڕی ڕێکخراوەکەدایە."

سیاسەتێکی گشتی بوو کە هەر جارەی کەمێک زانیاری بەئاستێکی دەستنیشانکراوی نێو ڕێکخراوەکە بدرێت. هەر بۆیەش ساڵێکی پێ چوو تا ئەندامی ئاسایی لەگەڵ تەڵاقدانی بەزۆر ڕووبەڕوو کرانەوە کە لە ساڵی ١٩٨٩وە ئەم بڕیارە بەسەر ئەندامانی سەرکردایەتیدا سەپێنرا بوو. ئەو بڕیارە لە ڕاستیدا لە ساڵی ١٩٨٥وە بەهاوسەرایەتییەکەی ڕەجەوی و مریەم دەستی پێ کرد.

لە شەڕی کۆنترۆڵکردنی زانیارییەکاندا پڕوپاگەندە ڕۆڵێکی سەرەکیی هەیە. بۆیە کاتێک ئەو زانیارییانەی لە دەرەوە دەگەیشت لە بێژنگ دەدران و ڕەنگ و بۆیان دەگۆڕا، کەچی ڕەجەوی و مریەم لە پڕوپاگەندەکانی موجاهیدین بۆ جیهانی دەرەوە زۆر مەزن دەکران، مەسعود تەیبی کاسێتی ڤیدیۆیی تایبەت بەکار و کردەوەکانی ئەو دووانەی دروست دەکرد و بۆ کەناڵە تایبەتییەکەی موجاهیدینی دەنارد، هەروەها بۆ کەناڵە ڕۆژئاواییەکانیش، وەک نەریتی سەرکردە عەرەبەکان، بەڵام کەم لەو کەناڵانە پەخشی دەکردن.

بۆ بەکارهێنانی ڕۆژانەش کاسێتەکانی پەیامەکانی ڕەجەوی بەکار دەهێنران، کە چەندین جار نمایش دەکران، هەروەها وێنە و دەنگوباسی ئەو کەسانەی بۆ

پاداشتکردن لەسەر کارێکی تایبەت سەردانی ڕەجەوییان دەکرد. ئەو سەردانانە لووتکەی ئاواتەکان بوون. ڕەجەوی لە پێشوازیی ئەم جۆرە گرووپانەدا ستایشی تایبەتیی ئەو کەسەی دەکرد کارەکەی کردووە و چەند نموونەیەکی لە قورئانی پیرۆز بۆ باس دەکرد، کە ئەو ئەندامە دەچووە دەرەوە بەڕاستی لە خۆشییان خەریک دەبوو باڵ بگرێ. جاری وا هەبوو پەشتەماڵێک لەو پەشتەماڵانەی ڕەجەوی خۆی پێ وشک کردبوو وەک دیاری دەدرا بەئەندامێک، ئەندامەکەش ئەو پەشتەماڵەی لە لای خۆی وەک شتێکی پیرۆز بۆ تەبەروک هەڵدەگرت. بەم شێوەیە وەک مەسعود خودابەندە بۆی باس کردم بەردەوام مێشکی ئەندامان بۆمباران دەکرا.

بۆمبارانکردنی بەردەوام لەگەڵ کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵایەتی و خۆکۆنترۆڵکردنی بەردەوام وای لە موجاهیدەکان دەکرد باوەڕ نەکەن ڕێکخراوەکە هیچ هەڵەیەکی تیابێ و هەر هەستێکی نارازیبوون وەلاوە بنێن. هادی شەمس حایری ڕوونی دەکاتەوە و دەڵێ: "ئێمە وەک خێزانێکی گەورەی بەختەوەر بووین کە چەندین ئەندامی مردبوون. زۆر شت هەن تۆ ناتەوێ بیانبینی، چونکە ئەگەر وا نەکەی پێت دەگوتری ئەی خوێنی ئەو شەهیدانە لە پای چی ڕژاوە؟ هەمیشە وەبیرتیان دەهێنایەوە کە دەبێ بۆ خوێنی ئەو شەهیدانە وەفادار بین."

لەوانەش ترسناکتر و قەدەغەتر لە ناو ڕێکخراوەکەدا پرسیارکردن بوو، چونکە دەبوایە کوێرانە ملکەچی سەرکردە بیت. "کە دەتبینی ئەو هەموو خەڵکە بەبێ گرفت ملکەچ دەبوون، تۆش قایل دەبووی کە ئەوان ڕاستن و تۆ هەڵەی." دەبوایە لە گەڕان بەدوای هەڵەکاندا لە خۆتەوە دەستت پێ بکردایە، ئەمەش سەلامەتترین ڕێگە بوو. لەبەرئەوەی هەموو شتەکان زۆر ڕوون بوون: یان دەبێ ملکەچی سەرکردە بیت، یان بچیتە لایەنی بەرامبەر و لە ئەنجامدا دەبوویتە ناپاک. ئەوەی لەگەڵمان نەبێ دژمانە.

مەسعود ڕەجەوی زۆر سەرکەوتوو بوو لەوەی پێگەیشتووان، کە زۆربەیان خوێندەوار و ڕۆشنبیر بوون، بگۆڕێت و بیانکاتە زۆمبی (مردووی زیندوو کراو لە باوەڕی جادووگەرانی ڤودو- وەرگێڕەکان) کە کوێرانە شوێنی دەکەوتن و نەیاندەتوانی بەبێ ئەو هیچ کارێک ئەنجام بدەن. ئەو دەیزانی چۆن وا لە خەڵک بکات بەبێ مەرج ملکەچی بن، ئەوسا دەبوونە تەنێک کە نەدەتوانرا پێشبینیی هیچ کاردانەوەیەکیان لێ بکرێ چونکە فێر کرابوون خۆیان هیچ بڕیارێک وەرنەگرن.

ئەگەر لەمێژەوە لە ڕێکخراوەکەدا ئەندام بوونایە، ئەوا هەر پێیان نەدەکرا هیچ بڕیارێکی خۆیان هەبێ چونکە هەموو بڕیارەکان لەجیاتی ئەوان وەرگیرابوون. ئەوان دەبێ ئەو کارە بکەن کە سەرکردە پێیانی گوتووە، باشتریشە ئەگەر بەبێ دوودڵی بێت، وەک بۆ نموونە خۆبەختکردن لە پێناو دۆزەکەدا. نەدا حەسەنی ئەو کچەی لە بەردەم باڵیۆزخانەی فەرەنسا لە لەندن گڕی لە خۆی بەردا نەماوە بۆ ئەوەی بۆم باس بکات ئاخۆ ئەو ئاگای لەو هەموو شتانە هەبووە یان نا. بەڵام عەلی قەشقەوی کە چەندین ساڵ بوو کاری تیرۆریستیی بۆ موجاهیدین لە ئێران ئەنجام دەدا ماوە و دەتوانێ بۆم باس بکات.

"من ئێستا دەزانم ئەگەر بمایەم دەبوومە بکوژ. من ئامادە بووم گیانی خۆم لە پێناو ڕێکخراوەکەدا بکەمە قوربانی. تەنیا دوو ئەگەر لە پێشمدا هەبوون: یا وازیان لێ بێنم یان ببمە "خۆکوژێکی بەبۆمب." قەشقەوی بڕیارێکی ژیرانەی دا کە وازیان لێ بهێنێت هەرچەندە بەو بڕیارەی ڕێڕەوێکی پڕ توندوتیژی و زیندانی هەڵبژارد.

ئەو ئێستاش کە لە ئارامگەی ئەوروپادا ژیان بەسەر دەبات پێم دەڵێ: "ئێستاش ئازادییەکی زیاترم بۆ وڵاتەکەم گەرەکە." ئامانج و هۆیەکانی پێوەندیکردنی ئەو بەموجاهیدینەوە هێشتا هەر وەک خۆیان ماون. "بەڵام قەت جارێکی تر نابمە ئەندامێکی چالاک لە هیچ ڕێکخراوێک. ڕقم لە ئایدیۆلۆجیایە. پێم وایە کۆمۆنیستەکان و هەموو پارتەکانی تریش وەک موجاهیدین بەدن. هەر ئایدیۆلۆجیایە خەڵک دەشێوێنێ."

بەڵام ڕێکخراوی موجاهیدین ئایدیۆلۆجیای لە دەست داوە و بەپراگماتیزمی سەرکردەی وێڵ بەدوای دەسەڵاتی ڕەهادا گۆڕییەوە. سەرکردەیەک ئایدیۆلۆجیای لەو ڕێکخراوە سیاسییە سەند کە بەخۆی لە دامەزراندنی هاوبەش بوو، ئەو ئایدیۆلۆجیایەی لەناوبرد و ڕێبازەکەی خۆی لە شوێنی دانا. ڕێبازێک کە خەڵک ناچار دەکات وەک پێغەمبەر شوێنی ئەو بکەون، ئینجا هەرچییەکی مەبەست بێ. لە ڕێبازی ڕەجەویدا ڕزگارکردنی گەلی ئێران شتێکە بەپلە دوو دێت.

# پشکی چوارەم

## شەهیدبوون لە پێناوی ڕەجەویدا

"زۆر شیرین و زۆر ژیر بوو و هەمیشە لە فێربوونی وشەکانی زمانی ئینگلیزیدا یارمەتیی دەدام. بەڵام زۆر توندڕۆ بوو." یاسر عیزەتی بەم شێوەیە باسی نەدا حەسەنی دەکات، کە بۆ ئەو وەک تروسکاییەکی ڕووناکی بوو کاتێ لە ماڵی ئەوان لە کەنەدا دەژیا. ئەم "کچە شیرینە" دەبێتە یەکێک لە شەهیدەکانی موجاهیدین.

نەدا لە حوزەیرانی ۲۰۰۳دا خۆی دەسووتێنێ وەک نارەزاییەک لە بەرامبەر بڕیاری دەستگیرکردنی مریەم ڕەجەوی، هەروەها ۱۰ ئەندامی تری موجاهیدینیش لەبەر هەمان هۆ لە شارەکانی پاریس و لەندەن و بێرن خۆیان دەسووتێنن. موجاهیدینی خەڵق ڕای دەگەیەنێ کە ۳ لەوانە شەهید بوون.

نەدا حەسەنی کار لەو ڕۆژنامەوانە بیانییانە دەکات کە لە ۱۹۹۹دا سەردانی کەمپی ئەشرەف دەکەن و قسەی لەگەڵدا دەکەن. ماڵپەڕی CBSی ڕادیۆی کەنەدا وێنە و چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو کچە بڵاو دەکاتەوە. لە یەکێک لە وێنەکاندا نەدا سواری تانکێک بووە لە نمایشێک بەنێو کەمپی ئەشرەفدا، لە وێنەیەکی تردا لەگەڵ چەند ئافرەتێکی تری موجاهیدین بەجلوبەرگی سەربازی و لەچکی سوورەوە ڕاوەستاوە. نەدا لە کەنەدا پێ گەیشتووە، ئەو لە تەمەنی حەفت ساڵاندا لەگەڵ دایکی کە ناوی فرووغە و باوکی کە ناوی ئەحمەد حەسەنییە هاتوونەتە کەنەدا، پاش چەند ساڵێک یاسر دێتە لایان و بۆ ماوەیەکی کورت لەگەڵیاندا دەمێنێ. نەدا زانستی کۆمپیوتەر لە زانکۆی ئۆتاوا دەخوێنێ، بەڵام لە تەمەنی ۱۹ ساڵی و بەر لە تەواوکردنی خوێندن دەچێتە عێراق و پێوەندی بەسوپای ڕزگاریخوازی نیشتیمانیی سەر بەموجاهیدینی خەلقەوە دەکات.

"دەمزانی چی لە ئێراندا ڕوو دەدات. ئافرەتانی لە تەمەنی من زۆر کۆت و بەندیان

لەسەرە. بڕیارم داوە چی تر ئەمەم پێ قبووڵ نەکرێ و تەنیا ڕێگە وەک دەیبینم بۆ ڕزگارکردنیان ئەوەیە خەبات لە پێناویاندا بکەم." نەدا بەم شێوەیە لەگەڵ ڕۆژنامەوانە بیانییەکان لە کەمپی ئەشرەف قسە دەکات. نەدا لەو دیمانەیەدا ئەوەش دەڵێ کە دایک و باوکی ڕێز لەو بڕیارەی ئەو دەگرن و عەلیی براشی بیر لە هاتن بۆ ناو ڕێکخراوەکە دەکاتەوە.

ئەمەیە ئەو "توندڕۆییی"یەی" یاسر ئاماژەی پێ دا. موجاهیدین ئەو هەلەیان قۆستەوە. یاسر لە بیریەتی کە موجاهیدین لە ساڵی ١٩٩٤دا کەمێک زەحمەتی دەبینێ لە قایلکردنی نەدا بۆ ئەوەی بچێتە عێراق بۆ ناو ڕیزەکانی سوپاکەی موجاهیدین. جگە لەوەش باوکی نەدا پێی وا بوو کە کۆمەڵگەی کەنەدا زۆر کراوەیە بۆیە هانی کچەکەی دەدات بچێتە عێراق.

باوکی نەدا لە دیمانەیەکی لەگەڵ ڕۆژنامەی گاردیانی بەریتانیادا گوتبووی نەدا هەستی دەکرد دڵی بۆ لای موجاهیدین دەچێ لەبەر بەسەرهاتی مەحموودی مامی، کە زیندانییەکی سیاسی بوو لە ئێران. دیارە ئەو مامەیان بووەتە سەرەتای پێوەندیکردنی خێزانەکە بەموجاهیدینەوە، چونکە لەبەر لایەنگریی ئەو بۆ ڕێکخراوەکە لە ئێران لە لایەن حکوومەتەوە ڕاونراوە.

لە ماڵی نەدا یاسر عیزەتی هەستی نەدەکرد لە ماڵی خۆی دەژی. ئەو بە"خێزانێکی گەندە" ناویان دەبات چونکە زۆر جار لێیان دەدا. هەرچەندە ئەویش مرۆڤێکی ئەوەندە باش نەبوو. دایک و باوکی نەدا دڵسۆز و وەفادارن بۆ موجاهیدین بۆیە حەفتانە منداڵەکانی خۆیان لەگەڵ خۆیاندا بۆ کۆبوونەوەی ڕێکخراوەکە دەبرد. ئەحمەد حەسەنیی باوکی نەدا لە ساڵی ١٩٩٨دا دەچێتە عێراق و سەردانی کچەکەی دەکات لە کەمپی ئەشرەف، هەروەها بۆ ماوەی ٣ مانگ بەخۆشی مەشقی سەربازی دەبینێ. لەو ٣ مانگەدا زۆر چاوی بەکچەکەی ناکەوێت. بەڵام ئەوەی مایەی سەرنجە پاش ئەو ٣ مانگە باوکە دیسان دەگەڕێتەوە کەنەدا هەرچەندە زۆربەی ئەو لایەنگرانەی قایل دەکرێن بێنە عێراق هەر لەوێ دەمانەوە. من پێم وایە باوکی نەدا لەوەی لە کەمپەکەدا دیویەتی تووشی نائومێدی بووە، بۆیە نەدا لە دیمانەکانی لە ساڵی ١٩٩٩دا لەگەڵ ڕۆژنامەوانەکان بەئەندامی "پێشوو"ی موجاهیدین ناوی دەبات.

کاردانەوەی باوکەش پاش مردنی نەدا هەمان ئەو بۆچوونەم لا دروست دەکات، چونکە زۆر حەپەسا بوو لەو کردارەی کچەکەی. بەڵام بەپێچەوانەوە دایکی کچە زۆر شانازیی بەکردەوەی کچەکەیەوە دەکات و بەوەی کە شەهید بووە. چونکە دایکی نەدا موجاهیدێکی باش بوو بۆی نەبوو سۆزی خۆی زۆر پێشان بدات، ڕای دەگەیەنێ کە کچە گەورەکەی زۆر مریەم ڕەجەویی خۆش دەویست و "وەک سومبولی ئامانجەکانی خۆی بۆ ئازادی و مافەکانی ئافرەتانی ئێران دەیبینی." یاسر پاشان بۆمی باسکرد کە پاش ئەوە دایکی نەدای لە کەمپی ئەشرەف بینیوە کە بۆ ماوەیەکی کورت بەمەبەستی مەشقکردن لەوێ مابوو. یاسر نەدا بەکچێکی ئاسایی ناو دەبات و دەڵێ تەنانەت بەیەکەوە چوونە بۆ مەلەکردنیش لە کەنەدا، هەرچەندە لەبەر شەرمکردن نەدا لەجیاتی بەرگی مەلەکردن تیشێرتێک و پانتۆڵێکی لەبەردا بووە. کچە حەزی لە میوزیکی کلاسیک و شیعر بوو و لە کاری کۆمپیوتەریش شارەزا بوو. کە لە یاسرم پرسی جلوبەرگی ئاساییی نەدا چی بوو، گوتی جلوبەرگی ئاسایی و جاری واش هەبوو پانتۆڵێکی کاوبۆی تەسکی لە پێ دەکرد. نەدا ئەو کاتە لەچکی کردە سەر کە موجاهیدین فەرمانیان پێ کرد بچێتە ئەڵمانیا، ئەو کات یاسریش تازە گەیشتبووە ئەڵمانیا. پاش مانەوە لەوێ چەند مانگێک نەدایان ئامادەکردبوو بچێتە عێراق.

یاسر دەڵێ کە نەدا گەیشتە کەمپی ئەشرەف بردیان بۆ بەشی سیاسی، لەبەر زمانە ئینگلیزییەکەی و توندوتۆڵیی باوەڕەکانی. ئەو بەشە "دیپلۆماتەکانی" ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی هزری موجاهیدین "بفرۆشنە" جیهانی نۆرماڵ. هەر بۆیەش ئەو کچە زۆر بەزەقی لە میدیاکانی جیهان پێشان درا، چونکە موجاهیدین بۆ ئەو مەبەستە هەڵی بژاردبوو.

لە ١٧ی حوزەیرانی ٢٠٠٣ کە مریەم ڕەجەوی و نزیکەی ١٦٠ ئەندامی سەرکردایەتیی موجاهیدین لە لایەن پۆلیسی فەرەنساوە دەستگیر کران، نەدا حەسەنی لە لەندەن بوو. پاشان موجاهیدین ڕای دەگەیەنێت کە نەدا بەمەبەستی پشوودان لەوێ بوو. ڕەنگە نەدا بەهۆی پاسپۆرتە کەنەدایییەکەیەوە بەر لە هاتنی هێزەکانی ئەمەریکا بۆ ناو عێراق لە مانگی ئاداری ٢٠٠٣دا کەمپی ئەشرەفی بەجێ هێشتبێ. وەک دەگوترێ ئەو بۆ لقی ڕێکخراوی موجاهیدین لە بەریتانیا

گواستـرابووەوە. لە ڕۆژی دەستگیـرکردنی مریەم نەدا خـۆپێشـاندانـی لە بەردەم باڵیۆزخانەی فەرەنسا کردبوو لە لەندن لە بەرامبەر گۆڕەپانی نایتس سکوێر و ڕۆژی پاشتریش دیسان لە خۆپێشاندانەدا بەشدار بوو.

لە ڕۆژی دووەم لە سات ٧ی ئێوارە کە زۆربەی خۆپێشاندەرەکان دەچنەوە ماڵ نەدا بەنزین بەخـۆیدا دەکات و ئاگر بەردەداتە گیانی خۆی. دایکی نەدا کە پاش ٥ ڕۆژ لە کـەنەداوە بەباڵەفـڕ دێتـە لەندەن و لە تەنیـشت دارەمـەیتی کـچـەکـەی دادەنیـشێت بەڕۆژنامـەوانان ڕادەگەیەنێت کە زۆر هەست بە"شانازی" دەکات و تەنیا خـوا دەزانـێ چەند شانازی بەکچەکەیەوە دەکات، هەرچەندە ڕاشـی دەگەیەنێت کە ئەو بەنیاز نییە هەمان کردەوەی کچـەکـەی دووبارە بکاتەوە. "ئەو دەیزانی چیی دەکرد. ئەو ویستی پەیامێک بگەیەنێتـە خەڵکانی ئێمە لە زیندانەکانی ئێراندا، کە ئێمە ئەوانمان لە بیر نەکردووە و ئەوەی لە تواناماندا هەبێت دەیکەین بۆ ئازادکردنیان."

لە شـاری ئۆتاوا گـوتەبێـژی ئەنجـوومـەنی نیـشـتیـمـانیی بەرەنگاریی ئێـران کـە بڵندگۆی موجاهیدینە ڕای دەگەیەنێ نەدا حەسەنـی بۆیە خۆی سووتاندووە بۆ ئەوەی "خـۆشـەویسـتی خـۆی بۆ ئێران و سـەربەخـۆیی ئێـران پێشـان بدات." هـەمـان ئەو ئەنجـوومـەنە ڕای دەگـەیـەنێت کـە نەدا بووە شـەهیـدی ڕۆژی ١٨ی حـوزەیران، لە کاتێکدا نەدا هێشـتـا دڵی لە لێدان نەوەسـتـابوو و پزیشـکەکان لە نەخـۆشـخـانەی لەندەن لە هەوڵـی ڕزگـارکـردنی ژیانیدا بوون. لە ڕێوڕەسـمی بەخـاکـسـپـاردنیـشی لە ئۆتاوا لە کـۆتاییی مـانگی حوزەیران ٥٠٠ ئەنـدامی مـوجـاهیـدین بەدەم گوێگرتن لە میوزیکی نەتەوەیی گوڵیان لەسەر گۆڕەکەی دانا.

مەرزیە باباک خانیش دەبێتە شـەهیدی مـوجاهیـدین، ئەو ژنێکی تەمـەن ٤٥ سـاڵان بوو، ٢٥ ساڵ بوو ئەندامی ڕێکخراوی موجاهیدین بوو و لە بەردەم وەزارەتی ناوخۆی فەرەنسا خۆی سـووتاند. بەهـەمان شێوە سدغیە موجـاوەریش بووە شەهید کە ژنێکی تەمـەن ٤٤ سـاڵان بوو و دایکی کـوڕێکی ١٢ سـاڵان بوو. ئەویش چەند سـاتێک بەر لە مـەرزیە خـۆی لە هـەمـان شـوێن سـووتـاندبوو. مـیـدیاکـانی جیـهـانی هەواڵـی مـردنی سدغیە پشـتڕاست دەکەنەوە و پاش چەند ڕۆژێکیش هەواڵی مردنی نەدا ڕادەگەیەنن. بەڵام هیچ هەواڵێک لە بارەی مـردنی مـەرزیە باباک خـان بڵاو نەکـرایەوە و هیـچ

هەواڵێک لە بارەی بەخاکسپاردنیشی پاش چەند ڕۆژێک بڵاو ناکرێتەوە.

بۆیە هەندێک لە کۆنە ئەندامانی موجاهیدین پێیان وایە مەرزیە هێشتا زیندووە، بەڵام بزر کراوە چونکە بەهەڵە بەشەهید ناوی ڕاگەیەنرا بوو، نەوەک کەسێک پرسیاری لێ بکات چۆن گەیشتە ئەو ئاستە کە ئەم کردارەی خۆسووتاندن ئەنجام بدات، چونکە لە ڕاستیدا موجاهیدین ئەم جۆرە ڕووداوانە بەدەرفەتێکی باش دادەنێ بۆ ئەوەی گەمە بەهەست و نەستی خەڵک بکات. وتەبێژێکی موجاهیدین لە دیمانەیەکیدا لەگەڵ ڕۆژنامەی ئەلشەرق ئەلئەوسەت کە بەزمانی عەرەبی دەردەچێت بەوپەڕی ڕووقایمییەوە دان بەو ڕاستییەدا دەنێ و دەڵێ: "خۆسووتاندن لەسەر شەقام زۆر کاریگەرترە لە خۆفڕێدان لەسەر تاوەری ئیڤل."

ئایا ڕاستە ئافرەتێکی گەنج کە دایکی منداڵێکی هەرزەکارە خۆی کردە قوربانی بۆ ئەوەی مریەم ڕەجەوی ئازاد بکرێت؟ بێگومان کچە ژیرێکی وەک نەدا دەیزانی پۆلیسی فەرەنسایی هەرگیز مریەم ئازاد ناکات لەبەرئەوەی کەسێک لەو پێناوەدا خۆی سووتاندووە. کۆنە ئەندامانی موجاهیدین پێم دەڵێن ئەو ئافرەتانە لە لایەن سەرکردەکانی موجاهیدینەوە هاندرابوون بۆ ئەوەی خۆیان بسووتێنن و کە پێیان گوترابوو زوو جلوبەرگە گڕگرتووەکانیان دەکوژێندرێنەوە بۆ ئەوەی زیانیان پێ نەگات. هەروەها دەڵێن کە ئافرەتەکان بەو هاوینە جلوبەرگێکی زۆریان لەبەردا بوو بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن.

ڕۆژنامەی لو پاریزیانی فەرەنسایی بڵاوی کردبووەوە کە هەواڵنێرە فەرەنساییەکان پێش ئەو ڕووداوانە پێوەندییان پێوە کرابوو لە لایەن ئێرانییەکەوە کە وەک وتەبێژی ئەنجوومەنی بەرگریی نیشتیمانیی ئێران دەیناسن و ئاگەداریانی کردبوو کە چەند کەسێک خۆیان دەسووتێنن. پۆلیسی فەرەنسا پاش ئەوەی سدغیە خۆی سووتاند دوو پیاوی دەستگیر کردبوو چونکە کەلوپەلی تایبەت بەسدغیەیان پێ بووە. یەکێک لەو دووانە بەر لە خۆسووتاندنەکە بۆشکە بەنزینێکی لە بەنزینخانەیەک کڕیبوو و بەمەش وای کرد ئەستەم بێت کارمەندانی فریاکەوتن ئافرەتەکە ڕزگار بکەن.

هاووڵاتیی ئێرانی ئاراش سەمعەتی پوور چاوی بەنەدا دەکەوێ لەو کاتەی چاوەڕێ

دەکات بچێتە ئەڵمانیا و پاشان لە بارەگای موجاهیدین لە ئەمەریکا لە کڵێسای فۆڵز کە ئەوسا لەوێ کاری دەکرد جارێکی تر بەر لەوەی بچێتە عێراق دەیبینێ. کە پرسیار لەو کابرایە دەکەم لە بارەی ئەو ڕووداوانە ئەو دەیگوت ئەو قسانەی دەڵێن ئەمانە "خۆبەختانە" خۆیان سووتاندووە قسەی قۆڕن.

ئەو بەدڵنیاییەوە دەڵێ کە دەزانێ نەدا بەفەرمانی موجاهیدینی خەلق خۆی سووتاندووە. "لە ناو موجاهیدین کەس بۆی نییە لە خۆیەوە بیر بکاتەوە. بۆت نییە هیچ شتێک بکەیت تاوەکو فەرمانت پێ نەکرێ بیکەی. نەدا خۆی سووتاند، ئەوە تەنیا بەفەرمانێکی ڕاستەوخۆی موجاهیدین دەبێ. ئەگەریش بڵێن ئەو لە خۆیەوە ئەو کارەی کردووە. من باوەڕ بەو قسەیە ناکەم. ئەمە ڕاست نییە."

لە یەکەم سات کە مەسعود ڕەجەوی بڕیاری دابوو خەباتی چەکداری لە دژی خومەینی دەست پێ بکات توانیی شوێنکەوتووانی خۆی قایل بکات کە مردن لە پێناو موجاهیدیندا شەرەف و مەزنییە. لە ١٩٨١دا، کە هێشتا موجاهیدین لە ڕێکخراوێکی سیاسییەوە نەبووبوو بەتیرە، یەکەمین تەقینەوەی خۆکوژیی موجاهیدین ئەنجام درا. تا ئەمڕۆش ئەوانەی ئەو کارەیان کردووە وەک شەهیدی دۆزی پیرۆز ڕێزیان لێ دەگیرێت.

لە ساڵی ١٩٨١دا دوو گەنجی کوڕ و کچ تەقینەوەیەکی خۆکوژییان لە نێو چەند سەرکردەیەکی ئاینی لە مەزارێکی شاری مەشهەد و شیراز ئەنجام دا. لە ١٩٨٢ش سێ پەلاماری تر بەتەقینەوەی خۆکوژی لە تاران و یەزد ئەنجام دران و تیایدا بەرێوەبەری زیندانە بەدناوەکەی ئەڤین و دوو گەورە بەرپرسی ئاینی کوژران. بەم کردەوانە ڕەجەوی کاری لەسەر دواڕۆژی وڵاتەکەشی کرد. چونکە لە نێو کوژراوەکاندا ژمارەیەک ئایەتوڵڵا هەبوون کە دەکرا پاش مردنی خومەینی جێگەی بگرنەوە. ئەوانەش بێگومان ڕێچکەیەکی میانڕۆتریان دەگرتە بەر لەوەی جێگرەوەی خومەینی، خامینەئی گرتیە بەر.

لیستی شەهیدانی موجاهیدین دوورودرێژە. خۆکوژەکانی تەقینەوەکان تەنیا ژمارەیەکی کەم لەو لیستە پێک دەهێنن. زۆربەی ئەو موجاهیدانەی ڕێکخراوەکە بەشەهیدی داناون یان لە شەڕ کوژراون یاخۆ لە زیندانەکانی شا و خومەینی لە

سـێـداره دراون. بەرگـری له دژی شـا له سـاڵانی ۱۹۷۲ - ۱۹۷۹ نزیکەی ۱۳۰ قوربانیی موجاهیدینی لێ کەوتەوە. له کاتی شۆڕش و له پاش شۆڕشیش (له ۱۹۷۹ تا ناوەڕاستی ۱۹۸۱) بەپێی ئامارەکانی موجاهیدین خۆیان نزیکەی ۷۱ کەسیان لێ کوژراوە. بەڵام زۆربەی کوژراوەکان له پاش ڕاکردنی ڕەجەوی له ئێران کوژراون کە ئەو ئەندامانەی له پاش ئەو بەجێ مان لە خەباتی چەکداریی دژی ڕێژیمی خومەینی بەردەوام بوون. ئەو خـەباتە نزیکەی ۱۰ تا ۲۰ هەزار کـوژراوی لێ دەکـەوێتـەوە، زۆربەیان یان گوللەباران کراون یان تا مردن ئەشکەنجە دراون.

ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانی ڕەجەوی له عێراقەوە دژی ئێران ئەنجامی دەدان ئەوەندە مەترسیدار بوون دەبوایە ئەوانەی بەشدارییان تێدا بکردایە ئامادە بن گیانی خۆیان له پێناو موجاهیدینی خەلق بەخت بکەن. کە بەدوای کەسێکدا دەگەڕام باسی ئەو مـەسـەلەیەم بۆ بکات بەڕێکەوت ئەندامێکی موجاهیدین دەبینم کە ئافرەتێکی بەتەمـەنە و لە یەکێ لە کـۆبوونەوەکـانی مـوجـاهـیـدین چاوم پێی دەکەوێ. ڕوبیـبە شـارۆخـی کە قسـەی لەگەڵ دەکـردم چاوە قاوەییـیەکـانی لە ژێر لەچکە ڕەشـەکەی سـەریدا دەدرەوشـانەوە. ڕوبیـبـە دەڵێ: "من پردێک بووم لە نێـوان مـوجـاهـیـدین و ئێراندا." ئەو ئافرەتە گچکۆکە ڕەشپۆشە ئەم چیرۆکەم بۆ باس دەکات: ئەو ٥ جار لە کەمپی مـوجـاهـیدین لە عـێراقەوە لە سنوور پەڕیوەتەوە و چووەتە ئێران و خـەڵک یا کەلوپەلی هێناوە. لەو ٥ جـارە ۳ جـار بەڕێگەی کوردسـتـانی عـێـراق دەرباز بووە و ۲ جاریش بەڕێگەی پاکستـان چووەتە ناو ئێران. ئەم کـاری ئاودیوکردنانە زۆر گـرینگن چونکە بوار دەدەن کۆمەکی دارایی بەهۆی ئەو پارانەی کۆکراونەتەوە لە ئێران لەگەڵ چەک و هەروەها ئەندامی نوێ بۆ عێراق ئاودیو بکرێن.

ئەو گـەشـتـانەی ڕوبیـبـە پڕبوون لە مـەترسـی، چونکە هەمـوو جـار لەسـەر خـاڵی سنووری ئێرانی تـووشـی پرسیار و پشکنین دەبوو و هەمـوو جار دووچاری مـەترسیی ئاشکرابوونی وەک چالاکێکی موجاهـیدین دەبووەوە. ئەگەریش ئاشکرا بوویووایە کە سەر بەموجاهیدینە زیندان سووکترین سزا بوو کە دەبوایە خەمی لێ بخواردایە. ئەو دەڵێ: "وەک ئافرەتێک حکوومـەت گـومـانی لە من نەدەکرد." هەر بۆیەش مـوجـاهـیدین بۆ ئەنجـامدانی ئەم کـارانە ئافرەتیـان پێ باشـتـر بوو لە پیـاوان. چونکە پۆلیسـەکـانی

سنووری ئێران بەگومانێکی کەمترەوە تەماشای ئافرەتانیان دەکرد.

روبیبە خۆی بەسەربازێکی سوپای رزگاریخوازی نیشتیمانی دەژمێرێت. ئەو شانازە بەوەی کە یەکێکە لە موجاهیدین، سەربازێکی خوایە. هەروەک ئەندامەکانی تری ئەم میلیشیایە بەتێروتەسەلی لە لایەن سوپای عێراقەوە مەشقی پێ کراوە. ئەو تا ئێستا لە چەکی کلاشینکۆڤ تەواو شارەزا نەبوو، بەلام بەشانازییەوە پێم دەڵێت چەند باشتر لەو چەکە شارەزا بووبوو. "من بەتوانا بووم" ئەم قسەیە بەزەردەخەنەوە دەڵێ چونکە باش دەزانێت رووخساری شتێکی تر پێشان دەدات.

لەبەر ئەو کارەی ئەو لەجیاتی پۆشاکی سەربازیی موجاهیدین بەرەنگەکانی سەوز بۆ جلوبەرگ و سوور بۆ لەچک بەرەنگی رەش گۆری کە پۆشاکی زۆربەی ژنانی ئێرانە. لەسەر ئەو کراسە رەشەش سەرپۆشی درێژ و عەبای رەش کە لە تەوقی سەریەوە تا پاژنەی پێی دادەپۆشێ. لە هاموشۆکانی نێوان عێراق و ئێران هێستریک بەکار دێنی و کەلوپەلە قاچاخەکان لە ژێر باری هەنار و کەلوپەلی تردا دەشاردەوە. مەبەستیش ئەوە بوو خۆی وەک هەموو جووتیارانی ناوچە سنوورییەکان پێشان بدات کە بەرهەمەکانیان لەو سنوورانە دەفرۆشت. بەلام کەلوپەلە قاچاخەکان شتێکی تر بوون. لەم بارەیەوەش ئەو ئافرەتە بچکۆلەیە دەڵێ: "جارێکیان دوو ملیۆن دۆلارم لە ئێران هێنابوو. پاشان ئەو پارەیەم لەسەر سنوور دا بەبرادەرێکی عێراقی."

ئێران لە پێش چاوی ئەو ژنە ولاتێکی پڕ مەترسی و خاوەن حکوومەتێکی دلڕەق بوو. بۆیە ئەو رۆژێک بیری لەوە نەکردووەتەوە لە ئێران بمێنێتەوە و واز لە موجاهیدین بهێنێ. پڕوپاگەندەی موجاهیدین چاک کاری لێ کردبوو. روبیبە شارۆخی هەموو هەستێکی زانینخوازیی لە دەست داوە بۆیە هەر هەوڵیش نادات لە راستیی ئەو قسانەی پێی دەگوترا لە بارەی ئێرانەوە بکۆڵێتەوە. ئەمە جگە لەو راستییەی کە موجاهیدین بەو کارانە ژیانیان خستە مەترسی ئەگەر بێتو حکوومەتی ئێران پێی زانیبا. "موجاهیدین لە پاش یەکەمین چالاکیی سەربازیم وێنەی منیان بەجلوبەرگی سەربازی و بەچەکەوە بلاو کردبووەوە بۆیە ئێرانییەکان دەیانزانی من کێم. منیش دەمزانی کە نامەوێ بکەومە دەستیانەوە. پاش بلاوکردنەوەی وێنەکە، براکەم کە لە ئێران بوو لە لایەن هەواڵگریی ئێرانەوە بانگ کرابوو." ئینجا لەو رۆژە

بەدواوە ئەو بەیەک شێوە دەیتوانی لە سنووری ئێران بپەڕێتەوە - سەرپۆشێک کە تەواو دەموچاوی دادەپۆشی لەگەڵ مکیاجێکی زۆری دەموچاوی. کە لێم پرسی ئەم کارەت زەحمەت بوو؟ شانی خۆی هەڵتەکاند. ئەمە بەشێکە لە کاری تەتەری بۆ موجاهیدینی خەلق.

ڕوبیبە پاش کوژرانی کوڕەکەی لە لایەن ڕێژیمی ئایەتوڵڵا خومەینی لە ئێران لە ساڵی ١٩٨٢دا بڕیاری دابوو ژیانی خۆی بۆ ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلق تەرخان بکات. ماوەیەکی کورت پاش گوللەبارانکردنی کوڕەکەی لە زیندانە بەدناوەکەی ئەڤین لە تاران، موجاهیدین خۆیان لە ڕوبیبە نزیک دەکەنەوە و دەبینن گوێیان بۆ شل دەکات، هەروەها هەرسێ کوڕەکەشی بەهەمان شێوە. "ئەو هەستەی لە لام دروست بووبوو لە پاش لە سێدارەدانی کوڕەکەم موجاهیدین بەهێزتریان کرد. بەمنیان دەگوت دەبێ بیر لە هەرسێ کوڕەکەم بکەمەوە و ببمە ڕزگاریخوازێک بۆ گەلی ئێران."

بەڵام وەک بەئازارەوە دەیگێڕێتەوە ئەو ڕێبازە هەرسێ کوڕەکەی تریشی فەوتاند و لەناوبرد. ئەوە بوو کوڕێکی تری لە ڕێڕەوی بەرگریی چەکداری لە ئێران کوژرا بەماوەیەکی کورت بەر لە چوونی موجاهیدین بۆ عێراق. هەروەها بووکێکی ڕوبیبەش لە ئۆپەراسیۆنە شکستخواردووەکەی "ڕووناکیی هەتاهەتایی" لە ١٩٨٨ دەکوژرێت. ئەو ژنە ئێستاش لەگەڵ ئەو ڕاستییەدا دەژی کە دوو کوڕی بوونە شەهیدی ئەو دۆزەی ئەوی هەر خەباتی لە پێناو دەکرد. بەڵام کاتێک کوڕی سێیەمی لە ئەنجامی ململانێیەک لەگەڵ سەرکردایەتیی موجاهیدین لە یەکێک لە زیندانەکانی ئەو ڕێکخراوە لە سێدارە دەدرێت بەماوەیەکی کورت بەر لە هێرشەکەی ئەمەریکا بۆ سەر عێراق لە ٢٠٠٣دا، ئیدی ڕوبیبە بڕیار دەدات ئیتر بەسە ئەو نایەوێ کوڕی چوارەمیشی لە دەست بدات.

ڕوبیبە بەتووڕەییەوە قسەی بۆم دەکرد و گوتی: "موجاهیدین سێ نەوەی خێزانی منی لەناوبرد. منداڵەکانم، نەوەکانم و منیش لەگەڵیاندا. کاتێک زانیم خەڵک لە زیندانەکانی موجاهیدین ئەشکەنجە دەدرێن و دەکوژرێن ئەوسا چاوم کرایەوە. موجاهیدین وەک ڕێژیمی ئێران بەدن."

ڕوبیبە لە هەموو کەسێک باشتر دەزانی کە مانای چییە کاتێک ڕێکخراوێک داوات لێ دەکات هەموو شتێک لە پێناویدا بکەیتە قوربانی. بەهۆی ئەزموونی خۆی، لەناوچوونی منداڵەکانی و پاشان وازهێنان لە ڕێکخراوەکە، ڕوبیبە بووە سومبولی کۆنە ئەندامانی تری موجاهیدین. ڕێزیشیان لێ ناوە بەوەی ناویان ناوە دایکی ڕەزوان، ئەو دایکە ئەفسوناوییە لە مێژووی ئێران کە بۆ ڕزگارکردنی منداڵەکانی جەنگاوە، بەڵام لە کۆتاییدا هەموویان لە ناو دەچن.

ژیانی دایکی یاسر عیزەتی و ژیانی مامەکەی بەم شێوەیە ئەفسووناوی نەبوون. ئەوان هەروەک بووکی ڕوبیبە دووانن لەو سەدان شەهیدەی موجاهیدین کە ناویان خراوەتە لیستی ئەو ڕێکخراوە لە پاش ئۆپەراسیۆنەکەی ڕووناکیی هەتاهەتایی لە ساڵی ١٩٨٨دا. ئۆپەراسیۆنێک بوو کە دوایین و ناچارترین پەلاماری بێ سوودی ڕەجەوی بوو دژ بەئێران. مەسعود خودابەندە کە لە زۆر کۆبوونەوەکانی ڕەجەوی لەو سەردەمە ئامادە دەبوو بۆمی گێڕایەوە کە ڕابەری موجاهیدین زۆر تووڕە دەبێ کاتێک دەزانێ سەدام حوسێنی دۆستی ڕازی بووە ئاگربەست لەگەڵ خومەینیدا ئیمزا بکات. بۆمیش ڕوون دەکاتەوە چۆن ڕەجەوی ئەو ئۆپەراسیۆنەی وەک کارێکی ناچاری کردووە.

مەسعود ڕەجەوی دەزانێ ڕێککەوتنی ئاشتیی نێوان عێراق و ئێران کۆتایی بەهەوڵەکانی دێنێ کە لە ساڵی ١٩٨١ەوە خەریکی پلاندانان بووە بۆ ئەنجامدانی کودەتایەک دژی خومەینی. چونکە پێویستی بەیارمەتیی سەدام بوو بۆ سەرکەوتنی ئەو پلانانەی. هەندێ لە کۆنە ئەندامەکان پێیان وایە ڕەجەوی دەیەوێت لە ناو خاکی عێراقەوە هێرش بکاتە سەر ئێران بۆ تێکدانی ڕێککەوتنی ئاگربەست لە نێوان هەردوو وڵات چونکە دووبارە هەڵگیرسانی شەڕ لە بەرژەوەندی ئەودا بوو. ئەو ئۆپەراسیۆنە ئەوەندە بەشری پلانڕێژیی بۆ کرابوو و جێبەجێکردنەکەشی ئەوەندە شڕ بوو بەشێوەیەک کە بەڕاستی گومان دەخاتە سەر نیازەکانی ئەو کابرایە لەمەڕ سەرکەوتنی ئۆپەراسیۆنەکەوە.

مەسعود خودابەندە دەڵێ ڕەجەوی دەچێتە لای سەدام بۆ ئەوەی پرۆتیستۆی ڕێککەوتنی ئاگربەست بکات، سەدام دەینێرێتە لای دوو لە گەورە ئەفسەرانی خۆی.

لە لای ئەو دووانە دەبوایە ڕەجەوی پلانی دواترین پەلاماری مەزنی موجاهیدین بۆ سەر ئێران بخاتە ڕوو. "ئەفسەرەکان پێی دەڵێن ئەم جۆرە پلانە سەرناکەوێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یارمەتیی دەدەن." سەدام بەڕەجەوی دەڵێت هەفتەیەکی لە پێشە بەر لەوەی بەڕەسمی ڕازیبوونی خۆی لەمەڕ ڕێککەوتننامەکە لەگەڵ ئێراندا ڕابگەیەنێت.

بۆ ئۆپەراسیۆنی ڕووناکیی هەتاهەتایی ڕەجەوی هەموو ئەندامانی موجاهیدین ڕاپێچ دەکات گەنج و پیر و ساخ و نەساخ، مەشقدراو و مەشق نەدراو تەنانەت ئەندامان لە ئەوروپا و لە ئەمەریکاش بانگهێشتن دەکات. پلانی ئۆپەراسیۆنەکە ئەوە بوو هێزەکانی موجاهیدین بەهەموو چەک و تفاقی سەربازییانەوە لە سنووری ئێران بپەڕنەوە لە ژێر چەتر و پشتگیریی هێزی ئاسمانیی عێراقیدا. پلانەکە ئاسان دێتە بەرچاو: لیوای یەکەمی هێزەکە پەلاماری ناوچەی کەرەند دەدات و لیوای دووەمیش لە قووڵاییی ئێران پەلاماری ئیسلام ئاباد و لیوای سێیەمیش کرماشان و پاشان لە کۆتاییدا پەلاماری تاران بدەن.

ڕەجەوی لە وتارێکی لە کەمپی ئەشرەفدا بەڵێن بەئەندامەکانی دەدا و دەڵێ: "ئێمە بەتەنیا شەڕ ناکەین گەلی ئێرانیش لەگەڵمانە"، هەروەها پێیان دەڵێ ئەو شوێنانەی بۆی دەچن "هاووڵاتییانی سڤیل ڕەو ڕەو بەگەڵمان دەکەون و ئەو زیندانییانەی ئازادیان دەکەین دەبنە پشت و پەنامان تا وەدەستهێنانی سەرکەوتن. پەلامارەکەمان وەک تۆپە بەفرێکی گلۆربووی سەری چیا دەبێ تا دێتە خوارەوە گەورەتر دەبێ و لە کۆتاییدا تۆڕەکەی خومەینی هەپروون بەهەپروون دەکات."

ڕەجەوی دان بەوەشدا دەنێ کە ڕەنگە پەلامارەکە سەرنەگرێ و پێیان دەڵێ: "ئێمەمانان هەموومان شوێنکەوتەی ئیمامی حوسێنین و دووریش نییە عاشورایەکی ترمان بەسەردا بێت و هەموومان تێیدا بکوژرێین".

هاوکاریی سنوورداری عێراق زۆر لەوە کەمتر بوو کە بتوانێ سوپای لاوازی هەڵخەڵەتاوەکان ڕزگار بکات. لەبەرئەوەی ئەو سوپایە، سەرباری هەموو شتێک، کەسانێک ڕابەرایەتییان دەکرد بەپێی پاوەندییان بەڕەجەوییەوە پلەی فەرماندەیان پێ درابوو نەک بەپێی توانا و لێهاتووییەوە. سەربازەکانیش بەدەگمەن تێیاندا هەبوو بزانێ چۆن تفەنگ بەدەستەوە دەگرێ یا تانک بەکار دەهێنێ، جگە لەمەش

هیچ زانیاری یاخۆ شارەزاییان لە شەڕدا نەبوو. کاتێ باڵەفڕە ئێرانییەکان سەربازەکانیان بۆمباران دەکرد دەچوون لە ژێر ئۆتۆمبێل و تانکەکاندا خۆیان حەشار دەدا بۆیە هەر بەزیندوویی دەسووتان. لەگەڵ ئەم دۆخەدا پاڵپشتیی ئاسمانیی عێراق و هاوێشتنی ڕۆکێتی عێراقی کاریگەرییەکی وای نەبوو کە لە توانایدا بێت بارەکە بگۆڕێ.

فەرەح کەریمی بەم شێوەیە باسی هاوڕێیەکی قوتابخانەی دەکات: "ئەو بەڕاستی بڕوای وا بوو دەرگەی تاران بۆ ئەوان والایە. بەردەوامیش مکیاجی لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرت بۆ ئەوەی لە ئاهەنگی چوونە ناوەوەی تاراندا خۆی پێ بڕازێنێتەوە. ئەو لەگەڵ سەدانی تر چووە ناو شەڕەکەوە. لە شەڕەکەشدا ئەوانەی دەوری یەک یەک وەک گەڵای دار هەڵوەرینە سەر زەوی. ئەو یەکێک بوو لەو ژمارە کەمەی توانییان ڕابکەن". خوشکە بچکۆلەکەی، فەرزانە، نەیتوانی گیانی خۆی لەو شەڕە نابەرامبەرەدا ڕزگار بکات. بەڵام ئەو چۆن کوژرا ئەوە شتێکە کەس بەتەواوی نایزانێ.

چیرۆکی ئافرەتگەلی سکپڕم بیست کە زۆر ئازایانە لە لاپاڵی چیاکاندا بێ ئەوەی خۆیان بدەنە پەنای هیچ شتێکەوە شەڕیان کردووە و گوللە گیانیانی بڕیوە. هەروەها چیرۆکی چەندین گرووپ کە بێ ترس چوونەتە ناو خاکی ئێرانەوە وەک ئەوەی بۆ سەیران چووبن و پزیشکگەلێک کلاشینکۆفیان کردووەتە شان و چوونەتە ناو شەڕگەوە بۆ کوشتنی ئێرانییەکان لەجیاتی ئەوەی لە خەمی چارەسەرکردنی بریندارەکاندا بن. یاسر نازانێ دایکی چۆن مرد، بەڵام تەنیا لە شتێک دڵنیایە ئەویش ئەوەیە دایکی تەنیا هەلێکی زۆر کەمی بەدەستەوە بوو بۆ ڕزگاربوون لە بەرامبەر باڵادەستیی بێ سنووری ئێرانییەکاندا. حوسێنی مامیشی تەنیا لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا بوو کاتێ ئۆپەراسیۆنی ڕووناکیی هەتاهەتایی لووشی کرد.

سوپای ئێران لە ڕێی میهرسادەوە تا نزیکەی سەد کیلۆمەتر موجاهیدینی بەکێش کردە ناو خاکی ئێرانەوە بۆ ئەوەی لەوێدا بکەونە ناو بۆسەوە. من دوای نزیکەی ١٦ ساڵ سەردانی شوێنی ڕووداوەکەم کرد، کە بەچیا دەورەی دراوە، ئەو چیایانەش سووپەری نایاب بوون بۆ سەربازە ئێرانییەکان و لەوێدا تابلۆیەکم بەدی کرد بۆ

زیندووکـردنـەوەی یادی ئـەو ڕووداوە لەوێدا دامــەزرێنرابوو. لە بـەرامــبــەر تانکە تێکشکاوەکانیشدا کـە لەسـەریاندا دروشـمگەلی دژ بـەموجـاهـیـدین نووسـرابوون، دیواربەندێک کراوە بەوێنەی ژمارەیەک لەو سـەربازە لاوە ئێرانییانەی لەوێدا کوژران داپۆشـراوە. ژمــارەیەکـی کـەم شـەهـیـدی ئێـرانی بەرامـبـەر هـەزاران لە سـوپای موجاهیدین کە لەم شوێنەدا عاشوورایان لێ دووبارە کرایەوە.

مـەسعود خودابەندە دەڵێ: "ئەو تاکوتەرایەی ڕزگاریان بوو یان ئەو کەسانە بوون کە باکگراوندی لۆجستی یان سەربازییان هەبوو یاخۆ ئەو کەسانە بوون گوندییەکان هاوکارییان کردن". لەو شـوێنەی ئەڵمـانیا و لەگەڵ زەنگی کڵێسـاکان کە بێدەنگیی بەیانیی یەکشەممەیان شکاند ئەو دەستی بەئاشکراکردنی ژمارەکان کرد: "نزیکەی پێنـج هـەزار کــەس سنوورییان بڕی و نـزیکەی سێ هـەزاریان مــردن و هەزاریـان گەڕانەوە، ئەو هـەزارەی تریش دوای چەند هـەفتـەیەک گەیشتنەوە، ئەمـان بەنـهێنی و بەهاوکاریی کەسوکاریان بەناو ئێراندا یاخۆ گوند بەگوند یا لە ڕێی پاکستـانەوە ئێرانیان جێ هێشت و هاتنەوە".

من نەمـتوانی ژمـارەی تەواوی ئەو "شەهیدانە" بزانم کە لە هـاوینی ۱۹۸۸دا لـەسەر خاکی ئێران گیانیان بەخشی. بەڵام بەپێی ئەو ژمارە فەرمییانەی موجاهیدین دوای نزیکەی دە سـاڵ ئاشکرایان کرد ۱۳۰۸ لە مـوجـاهـیـدین لە ئۆپەراسیۆنی ڕووناکیی هـەتاهـەتاییدا مردن و ۱۱۰۰ بریندار بوون و ئەوانیش دوایی ۱۱یان لێ مـرد. ژمارەی سەربازە ئێرانییە کوژراوەکانیش نادیارە، مـوجاهیدین لە سەرەتادا باسـی کـوژرانی "هـەزارانیـان" دەکـرد، بەڵام ڕێی تـێ دەچێ سـەدان کـوژراویان بـووبێ و ئەم ژمـارەیە پشتڕاستکردنەوەی ئەستەمە.

دەبێ ئەو ژمـارە "فـەرمـییانەی" مـوجاهـیدین تا چەند ڕاست بن؟ لە سـاڵی ۱۹۹۹دا دەزگـای ڕۆژنامـەوانیـی ڕێکخـراوی مـوجـاهـیـدینی خـەلقی ئێـران PMOI لە دەنـهـاگ ئەوەی بەدرۆ خسـتـەوە کـە ڕێکخراوەکـەیان نزیکەی دە سـاڵ بێدەنگ بوو پێش ئەوەی ژمـارەکـان ڕاگـەیەنێ. کـەچی کـۆنە ئەنداممـانی ئەو ڕێکخـراوە بەجـیـا بەمنیـان گـوتووە ئەوان چـەنـدین سـاڵ بێ ئـاگـا بوون لە ژمــارە ڕاسـتـەکـان. دەزگـای ڕۆژنامــەوانیی ڕێکخـراوەکە دەڵێ "یەکسـەر دوا بەدوای ئۆپەراسیۆنی ڕووناکیی هـەتاهـەتایی، لە ئابی

١٩٨٨دا، موجاهیدین ئاشکرای کرد کە لە هەڵمەتێکی گرینگدا توانییان نزیکەی ١٧٠ کیلۆمەتر بچنە ناو خاکی وڵاتی خۆیان و لە ڕیزەکانی سوپای دوژمن ٥٥ هەزار قوربانی هەبووە و ١٤٠٠ لە موجاهیدین و چەکدارانی سوپای ڕزگاریی نیشتمانی کوژران. ئەم ئۆپەراسیۆنە گورزێکی کوشندە بوو بۆ ڕێژیم و وای کرد مەلاکان هەموو ساڵێک یادی کوژراوەکانیان بکەنەوە. موجاهیدین شانازی بەوەوە دەکەن کە ١٢٠ هەزار لە ئەندام و لایەنگرانیان ئامادەییی خۆیان پێشان دا بۆ بەشداربوون لە ڕزگارکردنی خەڵک و خاکی وڵاتە ستەم لێکراوەکەیان".

دەبێ من کاتێ بەراوردی پەنجا هەزار سەربازی کوژراوی ئێرانی لەگەڵ تەنیا ١٤٠٠ کوژراوی موجاهیدین بکەم، چاوەڕوانی چیم لێ بکرێ؟ بەرامبەر بەمەش ژمارەی ١٢٠ هەزار هەیە، کە کۆی گشتیی "شەهیدان"ی موجاهیدینە کە ئیعدام کراون یا تا مردن ئەشکەنجە دراون یاخۆ بەهەر شێوەیەکی تر لە لایەن ڕێژیمەوە کوژراون. ئەم ژمارەیە بەهیچ شێوەیەک یەک ناگرێتەوە لەگەڵ ئەو بیست هەزار قوربانییەی لە ساڵانی ڕابردوودا دەگوترا قوربانیی دەستی مەلاکانن. لە ڕاستیدا، هەندێ لەوانەی بڕوایان پێم هەبوو پێیان ڕاگەیاندم کەوا لایەنگرانی موجاهیدین لە تەممووزی ١٩٨٨دا لەو دیوی سنوور ئامادە بوون ئالای شۆڕش هەڵکەن. بەڵام ڕێگر چی بوو؟ کاتێ کە کارەکە بوو بەڕاستی کەسیان نەیویست خۆی ئاشکرا بکات و تەنیا شتێک کە هەندێکیان کردیان حەواندنەوە و پێشکێشکردنی چارەسەری سەرەتایی بوو بۆ بریندارەکانی موجاهیدین، شەهیدە هەڵخەڵەتاوەکانی موجاهیدینیشیان لە چەند گۆڕێکی بەکۆمەڵدا ناشت.

مەسعود خودابەندە دەڵێ ئەو لە ١٩٨٨دا بڕوای تەواوی هەبوو بەوەی خەڵکی ئێران، وەک ئەوەی ڕەجەوی بەڵێنی دابوو، هەڵدەستن و دوا هەنگاو ئەنجام دەدەن: "من دەمزانی کارەسات ڕوو دەدات، ڕەنگە زیاتر لە نیوەی خەڵکی خۆمان لە ناو بچن، بەڵام من پێم وابوو ژمارەی ئەو خەڵکەی سەر بەخۆمانن دە ئەوەندەی ئەو ژمارەیە کە هەبوو چونکە پێمان گوترابوو ئێرانییەکان دێنە پاڵ هێزەکانمانەوە. ئەمە ڕووی نەدا، بگرە تەواو بەپێچەوانەوە بوو: ئێرانییەکان لە دژی ئێمە کەوتنە شەڕ".

خودابەندە بەحوکمی کارەکەی وەک بەرپرسی هەواڵگری لەگەڵ مەسعود ڕەجەوی لە بارەگاکەیدا بوو و ئاگەداری ئەوە بوو کە بەلای کەمەوە سێ جار بەهیلیکۆپتەر چووەتە بەغدا بۆ داواکردنی هاوکاریی زیاتر لە سەدام. "جەنەراڵەکانی سەدام پێیان گوت: ئێمە پێمان گوتوون ئەوە هەرگیز نابێ. ئێستاش زۆر درەنگە، ئێمە ناتوانین هاوکاریی زیاترتان پێشکێش بکەین. ئێمە خۆمان بۆ شتی وا ئامادە نەکردووە".

محەمەد حوسێن سوبحانی ئێستا ناوی ئەو ئۆپەراسیۆنەی ناوە "درۆی هەتاهەتایی". ئەو لە ساڵی ٢٠٠٢دا وەک پەنابەر هاتە ئەڵمانیا، بەمنی گوت ئەو لە ١٩٨٨دا "پرسیاری زۆری نەبوو" لە بارەی ئۆپەراسیۆنەکەوە. ئەو بەتەواوی بڕوای بەموجاهیدین بوو. سوبحانی پێی وایە ئەو ئۆپەراسیۆنە تەنیا لەبەر هەڵخەڵەتاندنی قوربانییەکان نییە درۆیەکی گەورەیە بگرە لەبەر هاندانی زۆری ڕەجەویشە.

"کاتێ خومەینی بەئاگربەست قایل بوو ڕەجەوی کەوتە کێشە و دڵەڕاوکێوە. ئەو پێی وابوو شەڕ تا ئەو کاتە بەردەوام دەبێ یەکێک لە دوو لایەنی شەڕەکە دەیباتەوە. ڕەجەوی هیچی بەدەستەوە نەما. دەبوایە شتێک بۆ درێژەدان بەشەڕەکە بکات و ئەگەر وای نەکردایە هەموو ئەندامانی ڕێکخراوەکە لێیان دەپرسی: تۆ گوتت شەڕ بەردەوام دەبێ، ئەمە چۆن دەبێ؟". سوبحانی دەڵێ ئەمە بۆ ڕەجەوی پێویست بوو، بۆ ئەوەی ئابڕووی خۆی بپارێزێ و متمانە بۆ لایەنگرانی پەیدا بکات. بەڵام ئاخۆ هیچ ڕێگەیەکی لەمە باشتر نەبوو بۆ بەدیهێنانی ئەو مەبەستە؟

سوبحانی بۆ هەوڵی من لە بەدەستهێنانی هەندێ بەرچاوڕوونی لە بارەی ئەو شەڕە و ژمارەی قوربانییان کەمێ ئاسانکاریی کرد لەبەرئەوەی ئەگەر لە دووریشەوە بێ ئەو بەجۆرێک لە جۆرەکان بەشدار بووە. سوبحانی لەو کاتەدا بەڕێوەبەری (مدينة الطب) بوو کە نەخۆشخانەی موجاهیدین بوو لە بەغدا. ئەو نەخۆشخانە گەورەیە هەرچەندە پزیشکی عێراقیش کاریان تێدا دەکرد بەڵام لە ژێر دەسەڵاتی موجاهیدیندا بوو.

سوبحانی گوتی: "بریندارەکان بەهیلیکۆپتەر دەهێنران و ئێمە نەشتەرگەریمان بۆیان دەکرد". بەڵام پێش ئەوە دەبوایە بەڕێگەی ئەرزیدا لە خاکی ئێران دەرکرێن ئینجا هیلیکۆپتەر دەیگواستنەوە بۆ لامان چونکە دەترسان لە ئاسمانی ئێران

بپێکرێن. بۆیە ماوەیەکی زۆر هەبوو لە نێوان برینداربوونی ئەو کەسانە و گەیشتنیان بۆ نەخۆشخانەکەمان. من پێم وایە زۆر لە موجاهیدین لە مردن ڕزگاریان دەبوو ئەگەر زووتر چارەسەری پزیشکییان بۆ بکرایە.

سوبحانی دەڵێ زۆر زیاتر لە هەزار کەس لە بریندارانی موجاهیدین هەبوون و نیوەیان دوای چەند هەفتەیەک لە چارەسەرکردن دەگەڕانەوە بنکەکانیان. بەڵام نەخۆشخانەکەی ئەو تەنیا نەخۆشخانەیەک نەبوو کە بریندارانی موجاهیدینی بۆ دەبرا. یەکێکی تر لە کەمپی ئەشرەف هەبوو، ئەوانەی برینەکانیان سووکتر بوو و پێویستیان بەنەشتەرگەری نەبوو دەبرانە ئەوێ. زانیاری لای موجاهیدین زۆر بەنرخە. کەسیش تەواوی ڕاستییەکە نازانێ. سوبحانیش ئەگەر خۆی لە ۱۹۸۸دا لەوێ نەبوایە نەیدەزانی بریندارەکان چییان بەسەر هاتووە.

"چوار سەد تا پێنج سەد کەس برینەکانیان سەخت بوو"، ئەمە ئەوەیە کە سوبحانی لە نەخۆشخانەکەی بەغدا دیویەتی. "زۆربەیان تا ماوەیەک لە ژێر چاودێریی پزیشکی عێراقیدا دەمێننەوە". ئەو نەیتوانیبوو لاشەی مردووەکان ببینێ. بۆیە ئەو نەیتوانی ڕاستیی ئەو بانگەشەیە دیار بکات کە بۆ چەند ساڵێک لە ئێران بڵاو دەبووەوە گوایە ئێرانییە تووڕەکان سەری موجاهیدینیان دەبڕی.

کەمێک لەو شەهیدانەی موجاهیدین کە لە ئێران نەنێژران لە گۆڕی بزردا لاشەکانیان لە گۆڕستانێکی تایبەت بەشەهیدان لە کەمپی ئەشرەفدا نێژران.

فەرەح کەریمیی کۆنە پەرلەمانتاری هۆڵەندا شینی بۆ ئەو خوشکەی دەگێڕا کە نازانێ لە کوێ نێژراوە و دەیگوت: "وەک کەسوکاری قوربانییانی تر حەزم دەکرد مردووەکان ناسرابان و بەشێوەیەکی شیاو نێژرابان. بەڵام ڕێژیمی ئێران نایەوێ گۆڕەکانیان ببێتە مەزارگە و هەموو لێکۆڵینەوەیەکی لەو پرسە قەدەغە کردووە".

سوبحانی دەڵێ کاتێ ڕزگاربووەکان دوای چەند ڕۆژێکی بێدەنگیی سەرکردەکان بۆیان دەرکەوت ئۆپەراسیۆنەکە شکستێکی گەورەی هێناوە وەک بۆمبێک ڕەخنەکان تەقینەوە. دوای چەند ڕۆژێکی بێدەنگیی دۆڕاوەکان و سەرسامییان، توانای خۆ کۆنترۆڵکردنیان نەما، "ڕەجەویش ڕخنەگرەکانی بەناپاک ناوبرد و گوتی ئەوانە لایەنگری ڕێژیمی خومەینین، پرسیاری لێمان کرد: بۆ ئێمە ناتوانین کرماشان بگرین

و بەرەو تاران بچین؟ لەبەرئەوەی ئێمە هێشتا لە ڕووی ئایدیۆلۆجییەوە تەواو بەهێز نین. ئەمە هەڵەی سەربازەکان بوو، ئەوان بڕوای تەواویان نەبوو و زۆر بیریان لە ژن و منداڵەکانیان دەکردەوە".

سوبحانی پرسیارەکانی بۆ خۆی هەڵدەگرێ و لەم کارەشدا تەنیا نییە. موجاهیدین بڕوایان بەوە هێنا کە هەوڵە بێهوودەکەیان بۆ ڕزگارکردنی ئێران شکستی خوارد. ئەوان بۆ هاوڕێکانیان، کە شەهیدە نوێیەکانن، دەگرین. بەڵام پرسی ئەوەی سەرکردە بەڕێزەکەیان ڕووبەڕووی مەترسییانی کردەوە شتێک نییە بیری لێ بکەنەوە. لە هەر بزووتنەوەیەکی سیاسیدا، ئەگەر دیموکراتیش نەبێ، هەڵەیەکی لەم جۆرە و ئەو ئەنجامە کارەساتاوییە دەبێتە هۆی لاچوونی ئەو سەرکردایەتییە. بەڵام کاتێ ڕەجەوی دوای ماوەیەکی کورت لە شکستی ئۆپەراسیۆنی ڕووناکیی هەتاهەتایی فەرمانی بەشوێنکەوتووانی دا ئاهەنگ بگێڕن بۆ ئەوەی پێشانی مەلاکانی بدەن کە ئەمان ناڕووخێن، گوێڕایەڵی بوون.

بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئایەتوڵڵا خومەینی بەشدار بوو لە بڵاوکردنەوەی بیرۆکەی نەبوونی شۆڕشێک لە دژی ئەو. بۆیە چەند مانگێک دوای ئەو ئۆپەراسیۆنە ژمارەیەکی گەورەی تری لە شەهیدان بەڕەجەوی بەخشی، ئەو ژمارانەش لە لایەن سەرکردەی موجاهیدینەوە بەکار دەهات بۆ ئەوەی بۆ لایەنگرانی خۆی بسەلمێنێ کە سیاسەتەکانی چەند ڕاست و دروستن. دوو شت هەن من ناتوانم جیا لەیەک بیانبینم: بڕیاری خومەینی بۆ لە سێدارەدانی هەموو گیراوەکانی موجاهیدین لە لایەک و نەبوونی هیچ بەرهەڵستییەک لە ناو موجاهیدین بەرامبەر بەڕەجەوی لە لایەکەی ترەوە. هەروەک دەزانن شەهیدی نوێ تۆڵەی نوێ دەخوازن...

ئەو هۆیەی وای لە خومەینی کرد لەو کاتەدا بڕیاری لە سێدارەدانی هەموو ئەو موجاهیدانە بدا کە چەندین ساڵ بوو لە زیندانە تاریکەکانی ئەودا بوون، بەتەواوی ڕوون نییە. تەنانەت ئەو گیراوانەی زۆربەی یان هەموو ماوەی زیندانیی خۆیان تەواو کردبوو و ئەوەندەی نەمابوو ئازاد بکرێن نەکەوتنە بەر بەزەیی. ڕەنگە پرسەکە ئەوە بێت کە پێشەوای ئێران نەیویست ڕێ بۆ هیچ هەلێک بهێڵێتەوە بۆ ئەوەی ئۆپەراسیۆنی ڕووناکیی هەتاهەتایی ببێتە هۆی زیندووبوونەوەی شتێکی گەورەتر.

ڕەنگە پرسەکەش تەنیا تۆڵەسەندنەوە بێت بۆ ئەو هێرشە لە ناکاوە. ڕاستییەکە هەر چییەک بێت ئەوا یەک شت ڕوونە: موجاهیدین لە چەند مانگێکی کەمدا چەندین هەزار شەهیدی نوێیان دا.

شەهیدی نوێش ستراتیجی نوێ دەخوازن. دوای ئۆپەراسیۆنەکە موجاهیدین بڕیار دەدەن دەست بەشەڕی پارتیزانی بکەن. ئەو هێرشانەی لە ناو ئێراندا تیمگەلێک ئەنجامیان دەدەن کە مەشقی تایبەتیان پێ کراوە مەبەستیان ئەوە نییە شەهیدی نوێ بدەن، هەرچەندە وای لێ دێت. بەگوتەی میرازگەری خۆ ئامادەکردن کورت دێنێ و، پلانی هێرشەکان بەپێی پێویست نین، تیمەکان کاتی کەمیان دەدرێتێ بۆ پشوودان لە نێوان ئۆپەراسیۆنەکاندا. ئەم کەسە دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٨٨دا گەیشتە کەمپی ئەشرەف لە چەندین کردەدا وەک سەرباز و دواتر وەک ڕاهێنەر بەشداریی کردووە. من لە ئەڵمانیا ئەم باسەم لەگەڵیدا ورووژاند، ئەو مانگێک پێش هێرشی ئەمەریکا بۆ سەر عێراق لە ٢٠٠٣ هەڵهات و لەو کاتەوە لە ئەڵمانیایە.

کاتێ میرازگەری گەیشتە کەمپی ئەشرەف، موجاهیدین هێشتا بەبرینەکانی ئۆپەراسیۆنە شکستخواردووەکەوە دەتلانەوە. ئەو بەمنی گوت کەشوهەواکە زۆر سەیر بوو. مەسعود ڕەجەوی دەیویست بەزووترین کات بەگەڕیان بخاتەوە و ئامانج و مەبەستێکی نوێیان بخاتەوە بەر. بۆیە زۆر بەخێرایی تیمی نوێ لە پیاو و ژنانی گەنج پێک هێنران و مەشقی چڕوپڕیان پێ کرا بۆ ئەوەی بۆ شەڕی پارتیزانی ئامادە بن. میرازگەری یەکێک بوو لەوانەی هەڵبژێردران و لە لایەن سوپای عێراقەوە لەسەر هاوەن و ئار بی جی مەشقیان پێ کرا.

ئەی کەی ٤٧ کە ڕەشاشێکی بچووکە و تایبەتە بەهێرشی تیرۆریستی دەدرایە موجاهیدین تا بتوانن لە ژێر جلوبەرگدا بیشارنەوە و لەو پشتێنە ڕەشە تایبەتەی لە ژێر جلوبەرگەوە دەیانبەست دەمانچەیەکی ٩ ملم لە جۆری باریتە هەبوو لەگەڵ ناسنامەیەکی ساختە و حەبێکی سیانید و نارنجۆکێکی دەستی. ئەم دووەی دواییش بۆ ئەوە بوون لە کاتی دەستگیرکردنی ئەو کەسە لە لایەن دوژمنەوە بۆ خۆکوشتن بەکاریان بهێنێ.

عەلی ڕەزا میرازگەری دەڵێ سەرەتا بۆ کاری هەواڵگری مەشقی پێ کرا. تا ساڵی

١٩٩٣ هەشت ئەركی هەواڵگریی سێ ڕۆژەی لە ناو خاكی ئێراندا جێبەجێ كردووە. ئەركەكانی سەرەتاشی بریتی بوون لە دیاریكردنی كێڵگەكانی مین ئەوانەی لە شەڕی هەشت ساڵەی نێوان ئێران و عێراقدا بەجێ مابوون و دەبوونە ڕێگر لە هەر ئەركێك كە دوارۆژ ئەنجام بدرێ.

هەر لە سەرەتاوە ئاشكرا بوو كە موجاهیدین و عێراقییەكان بەیەكەوە كار دەكەن. هاوكاریی نێوانیان زۆر لە مەشق پێكردن تێپەڕی دەكرد. "ئێمە وێنەكانی سەتەلایتی عێراقمان بەكار دەهێنا و لە دەرەوەی بنكە عێراقییەكان كارمان دەكرد. بەڵام هەموو شتێك لە ژێر كۆنترۆڵی عێراقییەكاندا بوو". پلانەكان پێشوەخت لەگەڵ عێراقییەكاندا تاوتوێ دەكران. سوپای عێراقی تا سەر سنوور كاری لەگەڵیاندا دەكرد. "ئەوان لە توانایان نەبوو بچنە ئەودیوی سنوورەوە بەڵام ئێمە دەچووین. هەموو زانیارییەكانیش بۆ عێراقییەكان دەچوون".

من لێم پرسی: باشە ئەمە پرسیاری لە بارەی لایەندارییەوە دروست نەدەكرد؟ ئەو بەسەر لەقاندن وەڵامی دایەوە. ئەو گوتی پرسیاری ئاخۆ ئەوان كار بۆ عێراقییەكان دەكەن لەسەری هەڵی دا. "ئێمە خرابووینە ژێر پاڵەپەستۆوە تا ئەو جۆرە پرسیارانە لە بیر بكەین. هەرچەندە گرینگ نەبوو بەلامانەوە كە موجاهیدین و سوپای عێراق یەك شت بن".

لە ساڵی ١٩٩٣دا ئەوەی هەڵبژارد كەوا لە كردە تیرۆرییە نهێنییەكان لە ناو خاكی ئێراندا بەشدار بێت، ئەو كارانە ڕەجەوی نەیدەویست لە ناو ڕێكخراوەكەدا ئاشكرا بن. تیمەكان دەبوو هێرش بكەنە سەر پاسدارانی كۆمار و دواتر ئامانجی ئابووریی وەك پاڵاوگەكانی نەوت. ئەو كردانە جێی گومان بوون و عەلی ڕەزا میرازگەری دوای چەندین ساڵ بێدەنگی ئێستا ئامادەیە باسیان بكات. بەخەندەوە دەڵێ "كە دەتوانم باسیان بكەم".

میرازگەری بۆی دەركەوتووە پرسەكە تەواو ڕوون نییە لەبەرئەوەی لە شەڕی پارتیزانیدا زۆر شت هەیە بەهەڵە دەكرێ. بۆ نموونە، لە پێناوی ئەنجامدانی هێرشێكی لەو جۆرە ژمارەیەكی زۆری موجاهیدین كوژران كاتێ گوللە هاوەنیان لە كەڵەكێك لە شەتوعەرەبدا بار كردبوو. هەندێكی تر كوشندەیی مینیان تاقی كردەوە.

یان یەکێ لەو تیمانە لە کاتی گەڕانەوەدا شەو لە ئێران مانەوە و شوانێکی ئێرانی ناپاکیی لێ کردن، حەوت ئەندامی تیمەکە کەوتنە بۆسەوە و ناچار بەنارنجۆکەکانیان خۆیان کوشت. "ئۆپەراسیۆنەکە پلانی باشی بۆ دانەنرا بوو. ئەوەندە چەکمان پێ نەبوو بتوانین بەرگری لە خۆمان بکەین" میرازگەری لەگەڵ ئاوڕدانەوە لە ڕابردوو ئەمەی گوت، "بەڵام لای موجاهیدین ئەمە شکست نەبوو و ئەو پیاوانە شەهید بوون. لاشەکانیان لە تەلەفزیۆنی ئێران پێشان درا. ئەوەش ئەو شتە بوو کە هەموومان مەبەستمان بوو".

ئینجا باسی ئەوە دەکات چۆن سەربازەکان دوای هەر ئۆپەراسیۆنێک وێنەیان لەگەڵ مەسعود و مریەم ڕەجەویدا دەگرت و ئەم "پاداشتە" دوای لە دەستدانی هەموو تیمەکەش هەر دەمایەوە. ئەو گوتی "هەر بەم بۆنەیەوە ڕەجەوی بڕیارێکی نابەجێ دەدا. هەموو ئەو شوانانەی لە ناوچە سنوورییەکانن لەگەڵ دەزگا سیخوڕییەکانی ئێران کار دەکەن. بۆیە پێویستە بیانکوژن. دەبێ ڕووبارەکان بەخوێنی ئەو شوانانە سوور بن".

لێرەدا میرازگەری هاوبەشی سەرسوڕمانی منە لەوەی ئاخۆ ڕەجەوی فەرمان بەپیاوەکانی خۆی دەدا خەڵکی بێ تاوان لەجیاتی سەربازەکان بکوژن؟ ئەو تەنانەت ئەو کاتە و لە کەمپی ئەشرەفدا نەیدەتوانی بەمە قایل بێت و پرسیارەکە لە یەکێ لە بەرپرسەکانی دووبارە دەکاتەوە: باشە ئەی ئەگەر ئەو شوانە بێ تاوان بوو؟" وەڵامی بەرپرسەکە بێ هیچ بەڵگەیەک ئەمە بوو "نەخێر، ئەوان هەموویان بەفەرمانی دەزگا سیخوڕییەکان لەوێ دانراون".

لەگەڵ ئەمەش ئەم فەرمانە گومان دروست دەکات. دوای ماوەیەک میرازگەری چاوی بەو هاوڕێیانەی خۆی کەوت کە ئەم بڕیارە کێشەی ویژدانیی بۆ دروست کردبوون کاتێ لە یەکێ لە کردەکان، لەسەر سنوور تووشی جووتیارێکی ئێرانی هاتن. بەپێی فەرمانەکە دەبێ بیکوژن، بەڵام ئەو هاووڵاتییەکی ئاساییی ئێرانییە کە موجاهیدین بۆ ڕزگارکردنی لە چنگی ڕێژیم تێ دەکۆشن.

لەو سەروبەندەدا و لە یەکێ لە ئۆپەراسیۆنەکاندا میرازگەری بریندار دەبێ و لە کاتی گواستنەوەی بۆ شوێنێکی ئارام لە لایەن هاوڕێکانیەوە خوێنێکی زۆری لەبەر

دەچێ. کاتێ دوای سێ مانگ چاک دەبێتەوە، دەبینێ ئەو جۆرە ئۆپەراسیۆنانە بەهۆی ڕەخنەی ڕۆئاوا و هێرشی سیحراویی مریەمەوە لە پاریس ڕاگیراون. بەڵام ڕووداوێکی سەیر چاوەڕوانی میرازگەرییە: ئەو کارێکی باڵای پێ دەسپێررێ تاکو ببێ بەیەکێ لە پارێزەرانی تایبەتی بنەماڵەی ڕەجەوی. دوای ئەوەش دەبێ بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. هەروەها دوای دەستپێکردنەوەی ئۆپەراسیۆنەکانی پارتیزانی دەبێتە فەرماندە و لە ئاداری ١٩٨٤دا سەرکردایەتیی زنجیرە هێرشێکی سەرکەوتوو بۆ سەر چەند بیرە نەوتێک لە ناو ئێراندا دەکات. لێرەش دووبارە گومانی لا دروست دەبێتەوە: باشە ئەم بیرە نەوتانە هی گەلی ئێران نین؟

ئەو سێ مانگەی میرازگەری تێیاندا ناچار بوو پشوو بدات بوونە هۆی ئەوەی بکەوێتە گومانەوە. لەگەڵ سەرکردەکانی تردا گفتوگۆی دەکرد. ئەوە شتێک باشتر وابوو نەیکات، چونکە بەرزبوونەوەی ئەو بەهۆی ئەو کارانەوە بوو کە کردبوونی و لەو پێگەیەدا گومان جێی نابێتەوە. ئەو باش دەزانێ هاوەڵەکانی ڕاپۆرتیان لەسەر ئەو بۆ سەرەوەتر بەرز کردووەتەوە، لەبەرئەوەی دوای ماوەیەکی زۆر کورت پلەکەی هێنرایە خوارەوە و دەستگیر کرا و دوای ئازادکردنی لە چالاکی خرا.

دەستگیرکردنەکەی بڕوای لا دروست کرد کە دەبێ موجاهیدین جێ بهێڵێ، بەڵام لەبەرئەوەی هیچ دەرفەتێکی نەبوو بۆ ئەوەی ئەو کارە بکات بڕیاری دا دەستکاریی هیچ شتێک نەکات. پێش ساڵی ١٩٩٦ دووبارە پلەی بەرز کرایەوە، لە سەرەتادا کرا بەلێکۆڵەرەوە لەو بەشەی کە بەرپرس بوو لە ئاشکراکردنی ئەوەی تازە هاتووەکان بۆ چوونە ناو هێزەکانی موجاهیدین سەر بەحکوومەتی ئێرانن یان نا. ئەو بەمنی گوت "ئێمە ئامادەمان دەکردن بۆ ئەنجامدانی کردەی تیرۆر لە ئێراندا، بەڵام زۆربەیان تاوانکار و تریاکخۆر بوون. لەو کاتەشدا لەوانە باشترمان چنگ نەدەکەوت".

ئەو مەشق پێکردنی سێ تیمی پێ دەسپێررێ کە هەر یەکێکیان لە سێ کەس پێک دێت. لێرەدا پرسی بیر کێشەیەک نییە. ئەوانەی تازە هاتوون تێکەڵی ئەندامە ئاساییەکان نابن. ئەوان جۆرێکی جیاوازن: ئەنجامدەری گەمژەی هێرشن. بەڵام ئەو گەمژەیەش نین، وەک زوو بۆ عەلی ڕەزا میرازگەی ئاشکرا بوو.

ئەوان بۆ ئەنجامدانی یەک هێرش بڕی سەد هەزار دۆلار وەک خەرجی وەردەگرن.

ئەم بەبەرپرسەکەی دەڵێ "ئەمە بڕە پارەیەکی زۆرە و کاتی زۆری پێ ناچێ تا بۆمان ئاشکرا ببێ ئەوان چوونیان هەیە و گەڕانەوەیان نییە"، بەڵام بەرپرسەکان هیچ ناکەن. هەندێ لە تازە هاتووەکان هەر لەو دیوی سنوور خۆیان دەدایە دەست پۆلیسی ئێران و هەندێکی تریان خۆیان بزر دەکرد. "تا ئەو کاتەی من لەم دۆخە ئاگەداریانم کردەوە ڕەخنەی ئەوەم لێ گیرا بۆ زوو ئاگەدار نەبوومەوە".

لە نێوان سالانی ١٩٩٨ و ٢٠٠١دا زۆر لەو تیمانە ڕەوانەی ئێران کران. لە سەرەتادا لە هەر پێنج تیمێک ئێرانییەکان لەسەر سنوور چواریان دەستگیر دەکرد، ڕەنگە هۆکارەکە بەبۆچوونی عەلی ڕەزا میرازگەری ئەوە بێت ئەوان خۆیان بەدەستی پۆلیسەوە دەدا، بەڵام لەوانەشە هۆیەکە خزانە ناوەوە و ناپاکیی نێو موجاهیدین بێت. زۆر ئەندام ئەم کردانەیان دەقۆستەوە وەک هەلێک بۆ ڕاکردن لە ڕێکخراوەکە. میرازگەری بەمنی گوت ئەویش بۆ ماوەیەک بیری لەو کارە دەکردەوە. بەڵام لەو کاتەدا هەڵمەتێکی پاکسازیی ناوخۆیی دەبێ. لە شوباتی ٢٠٠٠دا زنجیرەیەکی نوێی ئەو هێرشانە دەست پێ دەکاتەوە کە بەبۆچوونی موجاهیدین سەرکەوتوو بوون.

لە سالانی ٢٠٠١ و ٢٠٠٢دا عەلی ڕەزا میرازگەری سەرکردایەتیی چەند تیمێکی کرد ئەرکەکەیان ئەنجامدانی هێرشی مووشەکی بوو لەو دیوی سنوورەوە. ئەو دەڵێ "لەم ئۆپەراسیۆنانەدا دووبارە ڕێژیمی سەدام دەستی بەهاوئاهەنگی لەگەڵ ئێمەدا کردەوە"، هەرچەندە لە ساڵی ١٩٨٨ەوە ئاگربەستی فەرمی لە نێوان هەردوو وڵاتی عێراق و ئێراندا هەبوو. ئەم زۆر ئاگەدار بوو کەوا ئەو ڕەتکردنەوەی ئەم دۆخەی لە ناخیدا هەبوو بۆ ئەندامانی تری ڕێکخراوەکە ئاشکرا نەکات. "ئێمە بەئۆتۆمبێلی عێراقی چووینە ئەودیوی سنوور و لەوێ بەکاتیۆشا چەند هێرشێکمان ئەنجام دا و قوربانیی زۆری لە ناو هاووڵاتییانی سڤیل لێ کەوتەوە".

هەندێ تیمی تر کە هەر یەکێکیان لە دوو کەس پێک دەهات، فەرمانیان پێ درا بەرپرسانی ئێرانی بکوژن. ئەوان قوربانییانی خۆیان تەنیا بەو وێنانە دەناسی کە بەرپرسەکان پێشانیان دەدان. ئەم تیمانە بەهاوکاریی پیاوانی ئەمنی عێراق لە سنوور دەرباز دەکران.

دەبێ میرازگەری لەو کاتەدا زانیبێتی قوربانییانی ئەو ئۆپەراسیۆنانە تەنیا خەڵکی

بێ تاوانی سڤیلن؟ ڕەنگە لە ناخی خۆیدا هەستی بەو ڕاستییە کردبێت، بەڵام مەسعود ڕەجەوی بەردەوام بەشوێنکەوتووانی خۆی دەگوت کەوا ئامانجی ئەو کردانە خەڵکی سڤیل نین. بەڵام لە ڕاستیدا تەنیا ئەوان دەبوونە قوربانی، بۆ نموونە لە شوباتی ۲۰۰۰دا کاتێ یەکێ لە قەڵەباڵغترین شەقامەکانی تاران، شەقامی وەلیی عەسر، بۆمباران کرا کەسێک کوژرا و هەشت کەسی تر بریندار بوون کە هەموویان پیاو و ئافرەتی ئاسایی ئێرانی بوون. بۆمبارانکردنی دادگەیەک لە تاران لە ۱۹۹۸دا سێ کوژراو و ۱٤ بریندراری لێ کەوتەوە ئەمانەش بەتێکڕایی سڤیل بوون. لە ۲۰۰۰یشدا کاتێ دوو تیم لە ناو کوردستانی ئێراندا دوای دوو هێرشی مووشەکیی سەرنەکەوتوو هەستیان بەمەترسی کرد و کوێرانە دەسڕێژیان لە دەوروبەریان کرد و سێ سڤیلیان کوشت و چواری تریشیان بریندار کرد. لە لای خۆشیانەوە موجاهیدین دەڵێن ئەو هێرشانە هەموویان لە دژی سوپا و میلیشیای سەربازی و پۆلیسی ئێرانن و بەسەرکەوتوویی ئەنجام دراون.

پسپۆڕانی سەربازی دەڵێن ئەو جۆرە تۆپی هاوەنەی بەکارهێنراون ناوبانگیان بەخراپی دەرکردووە لەبەرئەوەی زۆربەی کات نیشانەی خۆیان ناپێکن. زۆریش لە کۆنە ئەندامانی موجاهیدین پێیان گوتم کەوا ئەو کاتە ئاگەداری مەسعود ڕەجەوییان کردووە لەوەی هەلی بەرکەوتنی خەڵکی سڤیل لە کردەکانی ئەواندا زۆرە. وەڵامی ئەویش ئەمە بوو "گوێی مەدەنێ هیوادارم ئەو سڤیلانە نەمرن" یان وەڵامەکە بەم شێوەیە دەبوو "نەتەوەی مەزن و گەلی مەزن پێویستە قوربانی بدەن".

دەبێ مەبەست لە هێرشگەلێک کە تەنیا خەڵکی سڤیل بپێکن و هیچ خزمەتی ناوبانگی موجاهیدین نەکەن چی بێت؟ کۆنە ئەندامانی ڕێکخراوەکە بۆمیان ڕوون کردەوە تەنیا مەبەستێک گەیاندنی پەیامی ڕەجەوی بوو بۆ ئەودیو تا پێیان بڵێ موجاهیدین کە بیانەوێ دەستیان دەگاتە گشت جێیەک لە ئێراندا و لەو پێناوەشدا چەند کەس بمرێت گرینگ نییە. بۆیە گومانی تێدا نییە بەرهەمی ئەو کردانە تەواو پێچەوانەی ئامانجی خۆیان بوو و لە زیادکردنی ڕق و تووڕەیی دژ بەسەربازانی ڕەجەوی بەولاوە هیچیان بەدەست نەهێنا. بەڵام لە ناو ڕێکخراوەکەدا ئەم کردانە گرینگ بوون لەبەرئەوەی هەستی بەردەوامی لە ئەندامیەتیی ڕێکخراوێکی

بەرهەڵستی بەئەندامان دەبەخشی و نیشانی دەدان کەوا لە بەردەوامبوون بەولاوە هیچی تریان لە پێشدا نییە.

وا لە گشت سەربازەکان گەیەنرابوو کە هاووڵاتییانی ئێران بەشادی و بەختەوەرییەوە پێشوازییان لێ دەکەن و چاوەڕێیانن. سەیریش لەوەدا بوو چۆن وا زوو شکستی ئۆپەراسیۆنی ڕووناکیی هەتاهەتایی، کە هاووڵاتییان شکستیان پێی هێنا، لە یادگەی بەکۆمەڵیاندا سڕایەوە.

ئەوانەی ئەم کردانەشیان جێبەجێ دەکرد دەنکەی سیانیدیان پێ دەدرا بۆ ڕێگرتن لە بەزیندوویی دەستگیرکردنیان لە لایەن ڕێژیمی ئێرانەوە و ئەشکەنجەدانیان لە زیندانەکانی ئێراندا. بەهیچ شێوەیەک ئەمانە ئامادە نەدەکران بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی لێکۆڵینەوە یاخۆ زیندانیکردنی درێژخایەن، یاخۆ بۆ خۆحەشاردان بۆ ماوەیەکی درێژ ئەگەرهاتو پێوەندییان لەگەڵ ڕێکخراوەکەدا پێ نەکرا.

مەرجان مالیک لە بارەی ئەو کارە تیرۆریستییانەی لە ئێران لە کۆتاییی ساڵی ۲۰۰۰دا ئەنجامیانی داوە دەڵێ "هەموو شتێک جیاواز بوو و ئێمە زۆر گرژ بووین". ئەو بۆ ماوەی سێ ساڵ مەشقی چڕوپڕی پێ کرابوو لە کەمپی ئەشرەف، لەو ماوەیەدا ئەو و ١٤ ئافرەتی تر لە جیهانی دەرەوە دابڕابوون. ئەوە مەشقێکی سەخت بوو لە ڕووی جەستەیی و دەروونییەوە و ئەوانەی مەشقیان پێ دەکردن ئەوانیش هەموویان ئافرەت بوون. کە لێم پرسی ئەو و عەلی ڕەزا میرازگەری یەکتریان دەناسی، چونکە لەو سەردەمەدا میرازگەری ڕاهێنەری تیمەکان بوو، هەردووکیان بەتەواوی ناسینی یەکتریان ڕەت کردەوە. لە ناو موجاهیدیندا پیاوان و ئافرەتان جیا لە یەکتر مەشقیان دەکرد.

دوای تەواوکردنی مەشق مالیکی تەمەن ۲۸ ساڵ لەگەڵ بەرپرسەکەی، حورییە شالچیم، کە ئەویش ۲۸ سالان بوو و پێش ئەو بەساڵێک واتە لە ١٩٩٦دا گەیشتبووە کەمپی ئەشرەف تیمێکیان پێک هێنا. ئەو خاوەن "ئەزموون" بوو و کردەیەکی سەرکەوتووی ئەنجام دابوو بۆیە کرایە ڕێنیشاندەری مەجانی بێ ئەزموون. هەروەها ئەو سەلماندبووی کە جێی باوەڕ و متمانەیە. لە بەهاری ۲۰۰۰دا شالچی هێرشێکی کردبووە سەر بنکەیەکی پاسداران و بەساخی گەڕابووەوە کەمپی ئەشرەف.

لەم هێرشەی خۆی و مەرجان مالیک ئەنجامی دەدەن بنکەیەکی سەربازی لە تاران امانجیانە. بەڵام ئەمجارە بنکەی یەکەیەکی سوپایە کە دەکەوێتە تەنیشت تیژە ێگەیەک. مالیک پێی گوتم: "لە دووریی ۸۰۰ مەترەوە مووشەکێکمان ئاراستەی نکەکە کرد، بەڵام دامەزراوەکە جیاواز بوو لەوەی مەشقمان لەسەری کردبوو. ووشەکەکە کەوتە گۆڕەپانێکەوە. ئێمە ئەو کاتە بەوەمان نەزانی، تەنیا ئەوەمان ەزانی کە لە شتێکمان داوە". دەشێ بڵێم بەرنەکەوتنی کەس لەو گۆڕەپانە نەڵەبالغەدا جۆرە پەرجوویەک بوو.

مەرجان مالیک و حورییە شالچی ماوەی دوو هەفتە لە تاران مانەوە. لەوێ لە ناو کەسوکاریاندا بوون. مالیک دەڵێ "زۆر دڵخۆش بووم کە ئەو ئەرکەم پێ سپێردرا. یەکەمین شتێک بیرم بۆی چوو ئەوە بوو خێزانەکەم دەبینمەوە. چونکە دەبوایە لە ماڵی خۆمانەوە کارمان بکردایە لەبەرئەوەی لە تاران ئافرەت بەتەنیا ڕێگەی پێ نادرێ لە ئوتێل بمێنێتەوە".

من سەرم لەم کارە سوڕ دەمێنێ. چونکە پێوەندی لەگەڵ کەسوکاردا سەرەڕای هەموو شتێک پڕە لە مەترسی لەبەرئەوەی ئەو ئەندامە هەست دەکات کە ڕێیەک هەیە بۆ دەرچوون لە ڕیزەکانی موجاهیدین. لەگەڵ ئەمەشدا پاڵنەرێکی تر هەیە، فەرمانی ڕێکخراوەکەیان. هەروەها دەبێ ئەو ئافرەتانە لە کاتی مانەوەیان گشت ڕێگەیەک بگرنە بەر بۆ قایلکردنی کەسوکاریان تا هاوکارییان بکەن و تەنانەت هێرشی داهاتوو ئەوان ئەنجامی بدەن.

شالچی توانیی لە یەکەمین هەوڵ لەم کارەدا سەرکەوێ. ئەوەتا باوکی وەک شۆفێرێک کاریان لەگەڵدا دەکات. بەڵام برا و خوشک و دایک و باوکی مالیک زۆر بەسادەیی پێیان گوت نا سوپاس. تا لە دواییدا بۆ ورمێیان برد، لەوێ دەبوو پێوەندی بەو قاچاخچییەوە بکەن کە لە سنوور دەربازیان دەکات. "کە ڕۆیشتم دایکم پێی وتم تکایە هەرگیز نەگەڕێیتەوە".

ئەو دوو هەفتەیە بەیەکەوە، هەموو شتێک بوون بەڵام ئاسان نەبوون. خێزانی مەرجان سێ ساڵ بوو نەیاندیبوو دڵیان داخورپا کە دیتیان ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە و چەند گۆڕاوە. ئەو تەنانەت نەیویست کاسێتی ڤیدیۆی ئاهەنگی زەماوەندی براکەی

ببینێت کە ئەمە لە خێزانێکی یەکگرتووی ئێرانیدا ئاسایی نییە.

مالیک بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵسوکەوتەکانی پێی وتم: "من جۆرە ڕۆبۆتێک بووم. تەنیا بیرم لەوە دەکردەوە فەرمانێکم پێ دراوە و پێویستە جێبەجێی بکەم. من و حورییە دانیشتنی ڕۆژانەمان هەبوو. لەو دانیشتنەدا وەک چۆن فەرمانمان پێ درابوو هەموو شتێکمان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە". بەهۆی ئەم جۆرە کۆنترۆڵەوە بوار بۆ ئەو هەڵسوکەوتانە نەدەما بەلای موجاهیدینەوە نابەجێ بوون و بەلای خێزانە ئێرانییەکانەوە ئاسایی بوون. هەروەها بوار بۆ ئارەزووی پاراستنی خێزان یان ژیانی ئاسایی لە ئێراندا نەبوو کە شتگەلی پووچن.

لەبەرئەوەی ئێران بەو شێوە ناشیرینە نەمابوو کە لە یادگارییەکانی مالیکدا هەبوون و چیرۆکەکانی موجاهیدین ئاویان دابوو، مالیک دەڵێ "کاتێ دیم چەند شتەکان جیاوازن خۆزگەی ئەوەم دەخواست هەرگیز نەچووبامە عێراق" بەڵام ئەمە شتێک بوو ئەو نەیدەتوانی بۆ حورییە شالچیی بدرکێنێ. "بەڵێ من ویستم کۆتایی بەو کارە بهێنم. بەڵام وتم ئێستا ئەو کارە بەناپاکی لە موجاهیدین و لە گەلی ئێرانیش دەژمێررێت".

بۆیە گومانەکانی لە ناخی خۆیدا لە گۆڕ دەنێ و، خۆی دوورەپەرێز دەگرێ و هیچ شتێک لە بارەی ئەرکەکەی کە بۆی هاتووە بەخێزانەکەی نالێت. تەنیا ئەوەندەیان پێ دەڵێ کە هاتووە نامەیەک بەجێیەک بگەیەنێت. ئەوان چەکەکانیان لای کەسوکاری شالچی شاردەوە. خێزانی مالیکیش دوای ئەوەی هەوڵە ئاشکراکانی بۆ بەکێشکردنیان بۆ کارکردن لەگەڵ موجاهیدین بۆیان ئاشکرا بوو ئەو موجاهیدە، لە ترسی بەردەوامدا دەژیان لەوەی پۆلیس بیدۆزێتەوە و تەواوی خێزانەکە ڕەوانەی زیندان بکرێن.

لەگەڵ دڵنیانەبوونیان لە ئاکامی هێرشەکەیان، ئەو دوو ئافرەتە لە هەوڵی ئەوەدا بوون بەزووترین کات خۆیان بگەیەننەوە کەمپی ئەشرەف. بۆیە پێوەندییان لەگەڵ قاچاخچییەکە کرد کە بڕیار بوو لە سنوور ئاودیویان بکات. "ئێمە مۆبایلێکمان پێ بوو پێوەندیمان بەژمارەیەکی دیاریکراوەوە کرد و نهێنییەکمان لە نێواندا هەبوو. دوای ئەوە لە شوێنێکی دیاریکراو لە ورمێ بەپیاوەکە گەیشتین".

بەڵام دوایی بۆیان دەردەکەوێ زۆر شتی تر هەن زۆر جیاوازن لەوەی پێیان گوترابوو. "لە ورمێ دەستگیر کراین. قاچاخچییەکە ئێمەی دایە دەست حکوومەتی ئێرانەوە". باوکی حورییە شالچیش گیرا. لەجیاتی هاوکاری ئەوان تەنیا ناپاکی و ڕقیان لە هاووڵاتییانی ئێرانی بەدی کرد. ئەم دوو ئافرەتە دەسخەڕۆ کرابوون.

ئەو هەستە ئەو کاتە بەهێز بوو کە حکوومەتی ئێران بۆ هاندانی موجاهیدین بۆ ئەوەی کاردانەوەیان هەبێ ڕای گەیاند کە مالیک لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکەکەیدا کوژراوە. هەر یەکسەر دوای ئەوە ڕێکخراوەکە ئەوی بەشەهید دانا لەبەرئەوەی ئەرکێکی خۆکوژیی سەرکەوتووانەی بەئەنجام گەیاند. مالیک زۆر بەنەرمی دەڵێ "ڕێکخراوەکە ڕای گەیاند بەتەواوی ئاگەداری گشت ڕووداوەکانی کردەکەیە لە ئێراندا، لە ڕاستیدا هیچی لە بارەی ئەو دوو ئافرەتە تەنیایە لە کاتی ئەنجامدانی کردەکەدا نەدەزانی".

لە ژمارەی ئەمجارەی کۆواری ڕێکخراوەکەدا (موجاهید) ڕەجەوی ئەوی بەپاڵەوان و شێرەژن و دوڕ و سەرباز ناوبرد. هەروەها کۆوارەکە دوو لاپەڕەی خۆی بۆ ئەو و کردەکەی تەرخان کرد بەوێنەگەلی هەڵبەستراو و جوانی مەرجان مالیکەوە کە دەمی بەپێکەنینە و تەنانەت وێنەی دوو منداڵەکەشیان بڵاو کردبووەوە.

کەچی لەو کاتەدا مالیک و شالچی هەردووکیان لە کونجی زیندانی ئێرانییەکاندا بوون. ئەوەی جێی سەرسوڕمانیان بوو لەوێ بەباشی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرا و بەپێچەوانەی ئەوەی چاوەڕوانیان دەکرد ئەشکەنجەش نەدران. مالیک دەڵێ "تەنانەت ڕێم پێ درا بەتەلەفۆن پێوەندی لەگەڵ کچەکانمدا بکەم و پێیان ڕاگەیەنم من باشم، لە کاتێکدا موجاهیدین وتبوویان من مردووم". من پرسیاری وردەکاریی ئەو هەڵسوکەوتەم کرد کە لەگەڵیاندا کرابوو. بێگومان لێکۆڵینەوە هەبوو؟ بەڵێ، زۆر بەچڕیش، بەڵام نەخرانە ژێر پاڵەپەستۆوە، هەردوو ئافرەتەکە چەندین جار ئەمەیان گوت. بەڵام دواتر مالیک بەپارێزەرێکی هۆڵەندیی گوتبوو کە خراوەتە ژێر پاڵەپەستۆوە بۆ ئەوەی ناوی ئەندامانی موجاهیدین ئاشکرا بکات کەچی ئەو تەنیا نازناوی فەرماندەکانی کەمپی ئەشرەفی پێ گوتوون.

لێرەدا بۆ هەردووکیان ڕوون بووەوە کە ئەو وێنەیەی موجاهیدین بۆ ئێرانی ژێر

دەسـەڵاتی مـەلاکـان کێـشـابووی ڕەنگدانـەوەی ڕاسـتـیی سـەر زەوی نییـە. مـالیک بەجدییەتێکی تەواوەوە دەڵێ "ئەگەر ئێستا بەراوردی بارودۆخی ناو موجاهیدین لەگەڵ ئەوەی ناو زیندانەکـەی ئێـراندا بکەم پێم وایە زیندانی ڕاسـتی لەوێیـە، لە کەمپی ئەشرەف".

حـوریـیـە شـالچـیش هەر هـەمـان بۆچوونی هـەیە. ئـەو دوای ئەوەی باوکی بەهۆی لایەنداریی موجاهیدینەوە لە لایەن ڕێژیمی خومەینییەوە دەستگیر کرا هاتە ناو ڕێکخراوەکەوە. هەر ئـەو پێمی وت ژمارەیەک لە کەسوکاریان بەهۆی ئەندامیەتیی ڕێکخراوەکەی ڕەجەوییەوە لە سێدارە دران. ئەو تا ئێستا سێ خوشکی کە شوێنی ئەو کـەوتن لە کـەمپی ئەشرەفدان و وەکو خۆی دەڵێ زۆر نیگەرانە چونکە هەست دەکات بەرپرسە لە دوارۆژی ئەو خوشکانەی. ئەمیش وەکو مالیک کۆنە مێردەکەی ئێستاش لەگەڵ موجاهیدین لە عێراقدایە، بەڵام ئەم هەر لەو کاتەوە لە زیندانی ئێراندا بوو بڕیاری دا چی تر پێوەندیی بەو ڕێکخراوەوە نەمێنێ.

هەموو موجاهیدین لەم قۆناغەدا ئەوەی گرینگ بوو بەلایانەوە ئەوە بوو کە هەڵوێستی نەرمی دەسەڵاتدارانی ئێران بەرامبەریان دەگۆڕێ ئەگەر دڵسۆزییان بۆ ڕەجەوی وەکو خۆی بمێنێتەوە. بەڵام موجاهیدین ئەوەندەیان پێ گوتراوە نەتوانن بەئاسانی بەهۆی هەڵوێستێکی سەرپێییەوە ڕای خۆیان بگۆڕن. ئەو کاتەش دەرکەوت کە زۆریان هەڵوێستی نەگۆڕیوە، کاتێ ڕێکخراوی لێبووردەییی نێودەوڵەتی لە کۆتاییی ۲۰۰۲دا هەڵمەتێکی ساز کرد بۆ پشتگیریی یەکێک لە موجاهیدین کە لە ئێران زیندانی بوو، دەنگۆی ئەوە هەبوو ئەشکەنجە دراوە و لە سێدارە دراوە و ئەم ڕووداوە جێی بایەخی زۆری موجاهیدین بوو. ئەو پیاوە گیراوە هەرگیز ئامادە نەبوو بۆ ڕاگەیاندنەکان دژ بەڕەجەوی قسە بکات.

مالیک و شالچی بۆ دەربڕینی نیازپاکی ئەمەیان کرد. لە ۱۲ی نیسانی ۲۰۰۱دا لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی لەگەڵ شەش ئەندامی نێرینەی موجاهیدین، بەئاشکرا و بەشێوەیەکی ڕوون موجاهیدینی خەلقیان تاوانبار کرد. باسی ئەو هێرشانەیان کرد کە بەنیاز بوون ئەنجامیان بدەن، لەگەڵ باشیی ئەو مەشقەی سوپای عێراق پێی دەکردن و ئەو چەکەی لە عێراق وەریان دەگرت. هەروەها باسی تەڵاقدانی بەزۆر و

بەگوێدا خوێندن و مێشک شووشتنەوەشیان کرد. باشە بۆ وایان کرد؟ من لە قسەکانیان بۆم دەرکەوت ئەوە لە تۆڵەی ئەو ناپاکی و درۆیانە بوو کە ڕێکخراوەکە دەرهەقیان کردبووی.

موجاهیدین هەر زوو کاردانەوەیان هەبوو. هەر یەکسەر وێنەکانی مەرجان مالیک و ئەو بابەتانەی باسی شەهیدبوونی قارەمانانەی ئەویان دەکرد لە سایتی ئەلیکترۆنیی کۆواری موجاهد ڕەش کرانەوە. ئەو شوێنانەی کۆوارەکە کە پێشتر گوتەکانی ڕەجەوییان بڵاو کردبووەوە لە بارەی ئازایەتیی ئەو بەسپییەتی مانەوە. بەڵام هەرگیز ڕێکخراوەکە ئامادە نەبوو دان بەوەدا بنێ ئەو نەمردووە و لە ئێرانە و پەشیمانە لە پێوەندیی بەموجاهیدینەوە. مالیک دەڵێ "تەنانەت کۆڕێکی ماتەمینیشیان لە فەرەنسا بۆم ساز کرد".

ئێستا چۆن ئەو هەڵوێستە دەبینێ؟ ئەو بەمنی گوت ڕەجەوی زیرەکانە بەکاری هێنا "ڕەجەوی ڕووداوەکانی بۆ پڕوپاگەندە بەکار هێنا. پێم وایە منی وەک سیمبولێک وێناند، وەک شەهیدێک. ئێمە تەنیا ئامرازگەلێکین بەدەست ئەوەوە". حورییە شالچیش ئەمە دووپات دەکاتەوە "مالیک لە ئەوروپاوە هاتبوو زۆربەی سەربازەکان دەیانناسی. ڕەجەوی بۆ پڕوپاگەندە و پاڵنانی ئەوانی تر بۆ تۆڵەسەندنەوە بەکاری هێنا. ئەو بۆ بەکێشکردنی ئەندامی نوێ بەکاری هێنا، بەتایبەتی لەو خێزانانەوە کە کوڕان و کچانیان لە لایەن ئێرانەوە کوژرابوو. ئەو زۆری حەز دەکرد ئافرەت بۆ ئەم مەبەستە بەکار بهێنێ، چونکە دەیزانی مەرگی دایکێک یان ژنێک زۆر کاریگەرترە لە مەرگی پیاوێک".

ئاراش سامیتی پوور دەڵێ "ڕێکخراوەکە گوێ بەتاکەکان نادات" ئەم لەگەڵ مالیک و شالچیدا لە کۆنفرانسە ڕۆژنامەوانییەکەدا بەشدار بوو، چونکە لە کردەیەکی سەرنەکەوتوودا لە ئێران لە ساڵی ٢٠٠٠دا بەشدار بوو. ئەو کردەیە دەبوایە پلەی شەهیدی پێ ببەخشێ. ئەو توانیی لەو کردە شکست خواردووە لە مردن ڕزگاری بێت بەڵام دوای لە دەستدانی دەستێکی. کاتێ دوای زیاتر لە چوار ساڵ چاوم پێی کەوت هێشتا سەرقاڵی کار بوو بەدەستێکی دەسکردەوە.

سامیتی پوور کاتی خۆی دەستی لە خوێندنی ئەندازیاریی کۆمپیوتەر لە کەنەدا

هەڵگرتبوو و پێوەندیی بەموجاهیدینەوە کردبوو لە عێراق و مەشقی پێ کرا بۆ ئەوە لە ئێران هێرش ئەنجام بدات. لە شەوێکی تەمموزی ۲۰۰۰دا لە ڕێی یەکاوی عەرەبەوە لەگەڵ چەند ئەندامێکی دەزگای ئەمنی عێراقدا سنوور دەبڕێ و دواتر بەساخی دەگاتە تاران و چەند مانگێک لەوێ دەمێنێتەوە و خانوویەک و ئۆتۆمبێلێک بەکرێ دەگرێ. ئەو قسەی میرازگەری دووپات دەکاتەوە "بەهیچ شێوەیەک پارەمان لێ نەدەبڕا".

ئەو پێی وتم کە ئەو مانگەی بەسەردا تێ پەڕی نەک بۆ ئەوەی پارەکە بۆ ڕاکردن خەرج بکات. بگرە ئەو بیرۆکەیە بەبیریدا نەهات. بەڵام ئەو گەڕابووەوە نیشتمانی خۆی و حەزی دەکرد ئەو شوێنە کۆنانە ببینێ کە منداڵیی تێدا بەسەر بردبوو، سەردانیان بکات و پێوەندی بەبرادەر و دۆستە کۆنەکانیەوە بکات، مەهدی بایمانی کە فەرماندەی ئەو بوو و بڕیار بوو لەو کردەیە بەشداریی بکات چاودێریی دەکرد. هەروەک مالیک و شالچی ئەمانیش "دانیشتنی پێشکێشکردنی ڕاپۆرتی ڕۆژانەیان" هەبوو. ئێستاش سامیتی پوور لەوە تێ ناگات ئەوان بۆ ئەو کارەیان دەکرد لە کاتێکدا کەس نەبوو بەدیاریانەوە چاودێرییان بکات. ئیتر ئەمە ئەو کارە بوو دەبوو بکرێ و ئەوانیش دەیانکرد، ئەمیش وەکو شالچی و مالیک هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە وازی لێ بهێنێ. یادگارییەکانی دەگێڕێتەوە و دەڵێ "تەنانەت ئەگەر کچێکم بدیتایە خۆشم دەویست دەبوایە بەبایمانی بڵێم". پێوەندی لەگەڵ ئافرەتدا قەدەغەیە، بۆیە بایمانی توورە دەبێ. لەبەرئەوە وەک خۆی دەڵێ جارەکانی تر کە قسەی لەگەڵ کچاندا دەکرد باسی نەدەکرد، سامیتی پوور ئەمە بەپێکەنینەوە دەگێڕێتەوە، بەڵام هێشتاش ئامادە نەبوو واز لە ڕێکخراوەکە بهێنێ.

هاوڕێیان دوور لە جیهانی گەورە و بەد کاتێکی زۆریان پێکەوە بەسەر دەبرد. سامیتی پوور دەڵێ "ئێمە گوێمان لە ڕادیۆی موجاهیدین دەگرت، کاتێکیش بەیەکەوە دادەنیشتین سروودەکانی موجاهیدینمان دەچڕی" و لەبەرئەوەی ئەم ئارەزووی موزیکی هەبوو مارشێکی دەگوتەوە و "سروودی سەربازیی" دەگوتن. ئەم لەمەیاندا زۆر پابەند نەبوو و بەدزییەوە گوێی لە پەخشی فارسیی دەنگی ئەمەریکا و بی بی سی دەگرت.

لە بارەی کۆنە سەرکردەکانیشیەوە دەڵێ "ئەوان ژیر بوون، دەیانزانی بۆ ئەم جۆرە کردانە کێ هەڵبژێرن. دەیانزانی من ئەوەندە بەهێزم بێ ئەوەی چاو بترووکێنم ئەرکەکانی موجاهیدین جێبەجێ دەکەم. بەئێمەیان دەگوت جیهانی دەرەوە پیسە ئەگەر جوانیش بێتە بەر چاوان. ئەوان ناچاریان دەکردی وا تێ بگەی ئەمە باشترین ژیانە دەستی مرۆڤ بکەوێ و خەڵکانی تر وەکو ئاژەڵ ژیان بەسەر دەبەن".

سامیتی پوور بەو چاوانە سەیری گۆڕانکارییەکانی تارانی دەکرد، کە لەوێدا هەموو شتێک لەوانەی بەغدا جوانتر و نوێتر بوو: ڕێگەوبان، ئۆتۆمبێلی جوان کە بوونیان لە عێراقی سزادراودا نەبوو، "من وا بیرم دەکردەوە هەموو ئەوانە پێچەیەکن شتە ناشیرینەکانی لە ژێردا حەشار دراون، وەک ئەشکەنجەدانەکان، تەنیا شتێک دەمویست بیکەم ئەنجامدانی هێرشەکە بوو، تاوەکو دوای ئەوە بگەڕێمەوە عێراق. لەبەر ترسی زۆریشم لەوەی ڕەنگە لە کاتی گرتنمدا ڕوو بدات، بەردەوام باریتاکەم سوار و ئامادە بوو و لە کاتی نووستندا لە ژێر سەرینەکەمدا بوو، دەنکەی سیانیدەکەشم لە ناو پاکەتێکی شقارتە لە تەنیشت پێخەفەکەم بوو".

پێم وایە ئەو تەنیا دەیتوانی کردەکە ئەنجام بدات لەبەرئەوەی بڕوای وا بوو خێزانەکەی نایانەوێ بیبینن و ئەمەش دووری خستبووەوە. بۆ هەر ئەندامێکی تری موجاهیدین ئەوەندە بەس بوو دایکە پیرەکەی ببینێ بۆ ئەوەی ناپاکی بکات و ئەو کارەی بۆی هاتووە بەدەسەڵاتدارانی ئێرانی ڕاگەیەنێ. بەڵام ئاراش سامیتی پوور هەستی بەتاوان دەکرد چونکە ساڵانێک بوو هیچ پێوەندییەکی بەکەسوکاریەوە نەکردبوو و لەو ماوەیەدا باوکی مردبوو، ئەو بەهیچ شێوەیەک پێوەندیی پێیانەوە نەکردبوو. جاروبار پێوەندیی بەپوورێکییەوە دەکرد بەڵام هەرکە گوێی لە دەنگی دەبوو تەلەفۆنەکەی بەڕوودا دادەخست و "تەنیا بۆ ئەوەی گوێی لە دەنگی بێت... ئەوە زۆر سەخت بوو".

زۆرجار هاوڕێکەی دەبرد بۆ دوکانێک بەرامبەر ماڵی باپیری، "دەمویست یەکێ لە ئەندامانی خێزانەکەم ببینم، بەڵام کەسیانم نەدی. ئەو خانووەی لە تاران بەکرێمان گرتبوو زۆر لەو شوێنەوە نزیک بوو ماڵی باوکمی لێ بوو، بەڵام ئەمەم بەهاوڕێکەم نەگوت". کە لێم پرسی ئەگەر پێوەندیت بەیەکێک لە خێزانەکەتەوە بکردایە

دەستبەرداری کردەکە دەبووی؟ لە وەڵامدا گوتی بەڵێ.

بەڵام ئەوە ڕووی نەدا، لەگەڵ ئەوەی گومان دەیخواردەوە، هەر بەدڵسۆزی مایەوە بۆ ئەو ڕێکخراوەی فەرمانی پێ دابوو مرۆڤ بکوژێ.

ڕۆژی ئەنجامدانی کردەکە هات. سامیتی پوور و هاوڕێکەی ئەنجامەکەی خۆیان دۆزییەوە. پیاوەکە لە ناو ئۆتۆمبێلێکدا بوو لە ترافیکلایت وەستابوو، ئەمە ئەو پیاوەیە وێنەکەیمان لایە. سامیتی پوور دەیەوێ تەقەی لێ بکات بەڵام دەمانچەکەی ڕادەوەستێ، هاوڕێکەشی کە چاوی بەپۆلیس کەوتبوو لە ترسان ڕا دەکا و ئەم بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی چارەنووسی خۆی جێ دێڵێ. پۆلیس بەسەر سامیتی پووردا زاڵ دەبن بەڵام ئەم فریای قووتدانی حەبی سیانیدەکە دەکەوێ.

سامیتی پوور کە وا خۆی دەنوێنی پیاوێکی ئاینپەروەر نەبێ بەڵام تا ڕادەیەک بڕوای بەقەزا و قەدەر هەیە، دەڵێ "لەو کاتەدا سێ شتی باش ڕوویان دا: یەکەم، دەمانچەکە نەتەقی. دووەم، دەنکەی سیانیدەکە کاری نەکرد، ڕەنگە لەبەرئەوەی زۆر کۆن بوو. دوای ئەمانەش هەوڵم دا خۆم بەنارنجۆکێکی دەستی بکوژم، پۆلیس منیان نەپشکنی و دەستم نەبەسترابوو، دەرزیی نارنجۆکەکەم ڕاکێشا و بیرم کردەوە باشترین شێوە بۆ تەقاندنەوەی چییە، بیخەمە سەر سنگمەوە باشە؟ لە ناکاو تەماشام کرد دایکم لە بەردەممدایە و ئاگام لە خۆم نەما و نارنجۆکەکە لە ناو دەستمدا تەقییەوە. دەستم لە دەست دا و لاقم بەسەختی برینداڕ بوو، بەڵام نەمردم".

سامیتی پوور برایە نەخۆشخانە و نەشتەرگەریی بۆ کرا و زۆر بەجوانی چاودێری کرا تا چاک بووەوە و دوای ئەمە خرایە زیندانەوە. ئەمیش نەیتوانی بڕوا بەو هەڵسوکەوتە باشە بکات کە لەگەڵیدا کرا، "پێم وا بوو بەدڕندانەترین شێوە ئەشکەنجەم دەدەن. بۆیە ویستم خۆم بکوژم. بەڕاستی زۆر دەترسام".

باشە بۆ ئەوەندەی لە ئەشکەنجەدان دەترسا لەو جۆرە مردنە بەئازارانە نەدەترسا؟ سامیتی پوور لە وەڵامدا دەڵێ لە کەمپی ئەشرەفدا ئەو ترسەیان لە دڵماندا چاند. "تەلەفزیۆنی موجاهیدین بەردەوام باسی ئەو ئەشکەنجەدانەی دەکرد کە لە زیندانەکانی ئێراندا هەیە. من هەرکە پێوەندیم بەموجاهیدینەوە کرد فەرماندەکەم باسی بیروباوەڕی موجاهیدینی بۆم کرد و هاوکات باسی ئەشکەنجەدانی ئێرانی

بۆم کرد. بۆیە من دڵنیا بووم هەرکە بکەومە دەستی ئێرانییەکانەوە لە سێدارە دەدرێم، بەڵام دوای ئەشکەنجەدانێکی زۆر و چڕ".

ئەم جۆرە چیرۆکانە وایان دەکرد موجاهیدین پێیان خۆش بێت شەهید بن نەک زیندانی بن لە یەکێ لە زیندانەکانی ئێراندا کە لەوێدا مردن لە ژیان باشترە. لەبەرئەوەی مەسعوود ڕەجەوی قازانجی زیاتر لە شەهیدێکی ئازا و سەربەرز دەکرد نەک لە ئەندامێکی زیندانیکراو لە ئێران کە هۆشی بۆ بگەڕێتەوە و کتێبی موجاهیدین بکاتەوە.

سامیتی پوور ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە مەرگی ئەو دەشیا لە لایەن ڕێکخراوەکەوە بەکار بێت بۆ سەلماندنی ئەوەی ئێران موجاهیدین دەکوژێ و مەسعود ڕەجەوی لەم بارەیەوە ڕاست دەڵێ. هەر بۆیەش چی تر موجاهیدین لە ئێران ئەشکەنجە نەدەدران و لە سێدارە نەدەدران و نەدەگەڕانەوە نێو موجاهیدین لە عێراق.

ئێران پڕە لە شتی دژ بەیەک، لە کاتێکدا ڕۆژنامەوان بەپێی یاسا دەسگیر دەکرێن و ئەشکەنجەی جەستەیی و دەروونی دەدرێن، کۆنە ئەندامانی موجاهیدینیش بەشێوەیەکی باش مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ. ئەمان لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەکرێ بەڵام بەهیچ جۆرێک ئازار نادرێن و هەڕەشەیان لێ ناکرێ و ڕێیان پێ دەدرێ تەماشای تەلەفزیۆن بکەن و ڕۆژنامە و کتێب بخوێنن، هەروەها ڕێگە بەکەسوکاریان و خاچی سووری نێودەوڵەتی دەدرێ سەردانیان بکەن. ئەمە هەمووی بەپێی بڕیاری سەرۆک خاتەمییە کە بڕیاری داوە بەهیچ شێوەیەک ڕێ خۆش نەکرێ بۆ ئەوەی مەسعود ڕەجەوی ئەشکەنجە و مردن بۆ پڕوپاگەندەی خۆی بەکار بهێنێ. خاتەمی سیاسەتێکی داڕشت بۆ تێکشکاندنی ئەو ڕێکخراوە لە ناوەوە. واش دەردەکەوێ ئەم سیاسەتە لە سەردەمی مەحموود ئەحمەدی نەژادیش، کە لە ئابی ٢٠٠٥دا جێی خاتەمیی گرتەوە، بەردەوام بێت.

ئەم نموونانە ڕوونی دەکەنەوە تا چەند شەهید بۆ موجاهیدین گرینگن. ئەوان ڕێزیان لێ دەگیری و دوای خۆیان بینا و کەمپ بەناوی ئەوانەوە ناویان لێ دەنرێ و لە کەمپی ئەشرەفدا گۆڕستانی تایبەتیان هەیە.

سامیتی پوور دەڵێ ئەوانەی موجاهیدین بەجێ دەهێڵن بەناپاک بەرامبەر

به"خوێنی شەهیدان" ناو دەبرێن. ئەمەش گەورەترین تاوانە بدرێتە پاڵ کەسێکەوە. بەڵام مەبەست لەوە چییە؟ کەس نازانێ!

هەروەک ئەوانەی تر کە دوای کردەیەکی سەرنەکەوتوو پشتیان لە موجاهیدین کرد. ئاراش سامیتی پوور بەتەواوی پشتگوێ خرا. "تەنیا ئەوەندەیان گوت کە هێرشێک بۆ سەر بنکەیەکی پۆلیس لە تاران لە لایەن کەسێکی نەناسراوەوە بەنارنجۆکی دەستی بووە هۆی برینداربوونی دەیان کەس. کەسە نەناسراوەکە منم"، بەپێی قسەی ئەو بێت ڕاستییەکەی ئەوەیە لەو هێرشە خۆکوژییەدا تەنیا چوار پۆلیس زۆر بەسووکی بریندار بوون.

دەبێ شەهید لای ئەندامێکی ئاسایی موجاهیدین چەند گرینگ بێت؟ ئەوان تەنیا سیمبولن و ڕۆژێک لە ڕۆژان لە کتێبەکانی مێژوودا دەرناکەون. سامیتی پوور ئەمە دووپات دەکاتەوە. هەموو شەهیدان بۆ زۆربەی موجاهیدین لە کەمپەکانی عێراقدا تەنیا سیمبولی بەرخودان و سروودەکانیانن، ئەو وا دەڵێ.

"هەندێ جار دەچووینە پێشانگەی وێنەکانیان لە کەمپی ئەشرەف. من کەسم لەوان نەدەناسی. بەلای وێنەکانیاندا دەڕۆیشتم و شتێکم دەگوت لە بابەتی"چەند مەزنە" و "خودا پاداشتیان بداتەوە" بەڵام ساتێک دوای ئەوە هەموو شتێکم لە بارەیانەوە لە بیر نەدەما".

بەبزەیەکەوە دەڵێ: "ئەگەر منیش بکوژرایەم هەر وەکو ئەوانم لێ دەهات".

# پشکی پێنجەم

## منداڵ دزینە گەورەکە

"ئێمە نەدەترساین. ئێمە خەمبار بووین، دەمانویست لەگەڵ باوانمان بمێنینەوە"، یاسر عیزەتی دەڵێ.

سەرەتای ساڵی ۱۹۹۱ە، ئەو ڕۆژەی ئەو و دەیان منداڵی تر سواری پاس دەکرێن و بەرەو دەرەوەی کەمپی ئەشرەف دەبرێن. ئەمە ئەو گەشتە بوو کە بۆ ساڵانێک باڵ بەسەر ژیانی سەدان منداڵ و دایک و باوکی موجاهیدیندا دەکێشێت. هەروەها بەسەر ژیانی یاسریشدا.

تەمەنی یاسر عیزەتی دە ساڵ بوو کە بووە قوربانیی منداڵ دزینە گەورەکە، کاتێ لە ساڵی ۱۹۹۱دا مەسعود ڕەجەوی ویستی منداڵەکانی شوێنکەوتووانی لە کۆڵ بکاتەوە. ئەم منداڵانە بارێکی گران بوون بەسەر شانی ڕێکخراوەکەوە. ئێستاش کە ژن و مێردەکان ڕازی بوون بۆ سەلماندنی دڵسۆزی بۆ سەرکردەکەیان یەکتری تەڵاق بدەن، پێویستە لە منداڵەکانیشیان جیا ببنەوە.

شەڕی کەنداو چارەسەرێک دەداتە دەستی ڕەجەوییەوە. لە کانوونی دووەمی ۱۹۹۱دا هێزەکانی هاوپەیمانان دەستیان بەبۆردومانێکی سەخت و چڕی عێراق کرد. بەڵام کاتێ بەدایک و باوکان دەڵێ پێویستە منداڵەکانتان بۆ جێیەکی ئارام بگوێزرێنەوە، ڕووبەڕووی پرۆتیستۆ دەبێتەوە. کەمپەکانی موجاهیدین لە عێراق دوورن لە مەترسیی بۆردومان و هەموو شوێنێکی تر لە دەرەوەی کەمپەکان مەترسیدارترە.

ڕەجەوی دەیەوێ منداڵەکانی لە کۆڵی خۆی بکاتەوە و ئەگەر بیانباتە بەغدا کە بەشەو و بەڕۆژ لە ژێر بۆردومانی ئەمەریکاییەکاندایە. ئەو کات باوانیان بڕوا دێنن کە دەرەوەی عێراق بۆ جگەرگۆشەکانیان ئارامترە و ڕێ بەگواستنەوەیان دەدەن.

"سنوورەکـان بەڕووی پەنابەرێکی زۆردا داخـرابوون، جـاروبار خـۆراکـیـان لە ئاسمانەوە دەگرتە خـەڵکەکە و زۆر کەسیش دەمرد. کەس بەکەس نەبوو"، مەسعود خـودابەندە بەم شـێـوەیە باسی ئەو کـاتە دەکـات. خـودابەندە ئەو کـات لە ناو موجاهیدین بوو و بەرپرسی پاراستن بوو و هاوڕێیەتیی یەکەمین دوو پاسی دەکرد کە هەر یەکێکیان پەنجا منداڵی بار کردبوو. یاسر تەنیا یەکێک بوو لەو منداڵانەی ژمارەیان بێگومان لە ٤٠٠ کەمتر نەبوو و ڕەنگە گەیشتبێتە ٨٠٠، کە بەناو خاکی وڵاتێکی پڕ شەڕوشۆڕدا گوێزرانەوە ئەو دیوی سنوور و برانە عەممانی پایەتەختی ئوردن. بچووکترینی ئەو منداڵانە تەمەنی دوو مانگ بوو و گەورەترینیان تەمەنی ١٥ ساڵان بوو. خودابەندە بەهۆی پلەی لە ناو موجاهیدیندا بەپسوولەیەکی تایبەتی ڕێ پێدان ئەمبەر و ئەوبەری سنووری دەکرد و پێوەندیشی هەبوو. "یەکەمین پاسم بردە کۆشکەکە، بۆ شا حوسێن" خودابەندە وای بەمن گوت وەک ئەوەی زۆر ئاسایی بێت لە جـیـهـاندا شـای ئوردن چاودێریی ٥٠ منداڵی مـوجـاهـیـدین بکات، ئینجـا بەگاڵتەجاڕییەوە گوتی "پێمان گوت بێگومان هێنانی ئەم منداڵانە لەبەر بارودۆخی شەڕە نەکە لەبەر تەڵاقدانی باوانیان".

لەسـەر سنوورەوە خـودابەندە بەتەلەفـۆن پێـوەندیی بەشـا حـوسـێنەوە کـرد. "شـا گـوتی: ئەم منداڵانـە دێنە لای من، ڕێیـان پێ بدەن بێنە ناوەوە". پاسـەوانانی دەزگـە ئەمنییـەکـانی ئوردن هاوڕێیـەتیی دەکـەن تا دەگـاتە کـۆشکی شـا. "بۆ بـەیانی شـا سـەردانـی منداڵەکـانـی کـرد و دوو ڕۆژ لە کـۆشکەکـەی مـانەوە". شـا گـوتـی با ئەم منداڵانە تا شـەڕ کـۆتاییی دێت لە ئوردن بمێننەوە، بەڵام ڕەجەوی ئەمەی نەدەویست، لەبەرئەوەی وەک خـودابەندە دەڵێ ئوردن "زۆر نزیکە و ڕەنگە دایک و باوکەکـان هەر چەند هەفتەی جارێک داوای سەردان و بینینی منداڵەکانیان بکەن".

بۆیە ئەم بەشـا دەڵێ کە فـەرمانی پێ دراوە منداڵەکان ببـاتە ئەورووپا، ئەویش بەڵێن بەخـودابەنـدە دەدات بەتەواوی هـاوکـاریی بکات. "بۆ ناردنی مـنداڵەکـان بۆ ئەورووپا ئوردنییـەکـان خـۆیان کـەڕ کـرد. منداڵەکان پاسـپـۆرتیـان نەبوو. بەپەنـابەرگـەلێک ژمێردران کە توانای گەڕانەوەیان نییە. ئەم کارەمان بەبێ هاوکاریی ئوردنییەکان پێ نەدەکرا".

لە نێو کۆنە ئەندامانی موجاهیدین ڕای جیاواز لە بارەی پاسپۆرتەکانەوە هەیە: ۆربەیان بەمنیان گوت پاسپۆرتی ساختە دروست کرابوون بۆ ئەوەی منداڵەکان سەفەری پێوە بکەن. بۆ نموونە، یاسر عیزەتی دەڵێ خۆی و نزیکەی سێ سەد تا چوار سەد منداڵ ماوەیەک لە چاوەڕوانیی پاسپۆرتدا لە ئوتێلێکی پێنج ئەستێرەدا وون. ئەو سوێندی بۆم خوارد کە "پاسپۆرتەکان ساختە بوون". بەڵام پرسیار ئەوەیە ەگەر دەسەڵاتداریی ئوردن ئەو پاسپۆرتانەی بەخشیبێت، وەک چۆن خودابەندە ەڵێ، دەشێ ناسنامە و بەڵگەکان ساختە بن. ئەم بابەتە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر ییە. موجاهیدینیش دوای بەکارهێنانیان پاسپۆرتەکانیان کۆ کردەوە.

لە عەممانەوە منداڵەکان بەرەو ئەورووپا و کەنەدا و ئەمەریکا فڕین. تەنیا لە ئەڵمانیا زیکەی دوو سەد لەو منداڵانە گیرسانەوە و زۆربەیان لەو خانەی منداڵانەی سەر ەموجاهیدینن. ئەوانەشی وەک یاسر عیزەتی مێردمنداڵ بوون و دەشیا باسی ئەوە کەن کە ڕووی دا، ئەنجامیان شوێنگەلێکی دوور لە خۆشەویستی بوو کە تیایدا ێش چوونە قوتابخانە و دوای هاتنەوەیان هەموو کارەکانی ناوماڵیان پێ دەکرا و ەزۆر تا درەنگی شەو تەماشای ڤیدیۆگەلێکیان دەکرد تەنیا مەسعود و مریەمیان یشان دەدان. ئەمانە تووشی لێدان و سزا دەبوون ئەگەر هەڵسوکەوتی یاخییانە یان ەنانەت منداڵانەشیان بکردایە. هەندێکیان دەگێڕنەوە کە ڕۆژانە پەنجەرەکانیان اوێن دەکردەوە.

یاسر عیزەتی دوای سێ ساڵ دەرچوونی لە عێراق گەیشتە ئەوێ و پێشتر برایە ێ دایەنگە و هەرگیز هەستی نەدەکرد کە خۆشحاڵە چونکە دوور بوو لە ماڵی ۆی. هەمان هەستیشی لە خانە ئەڵمانییەکانی منداڵانیشدا هەبوو. سەبارەت بەو ێ خانەی منداڵانەی کۆلۆن کە تەمەنی ۱۳ تا ۱۷ ساڵی تیایاندا بەسەر برد، دەڵێ هەموو شتێک قەدەغە بوو، زۆر جاریش سزا دەدراین".

ئەو بەتایبەتی گازاندە لە سنووردارکردنی ئازادییەکانی دەکات، بەڵام منداڵانی تر ەدرێژاییی ساڵ ئاسەواری لێدان و کوتانیان پێوە بوو کە ئاکامی ڕەفتاری خراپ وو لەگەڵیان لەو خانەی منداڵانەدا. کچێکی گەنجی یەکێ لە کۆنە موجاهیدینم لە ۆڵەندا دی و پێی وتم تا ئێستا بەبەردەوامی خەوی ناخۆش لە بارەی ئەو خانەیەوە

دەبینێ. باوکی دوای گەڕانێکی زۆر بەدوایدا لە هامبۆرگ دۆزییەوە. خێزانەکەیان لەو کاتەوە بەبەردەوامی لە لایەن ڕێکخراوەکەوە هەڕەشەی لێ دەکرێت و ئەو ئەوکات ئامادە بوو قسەم بۆ بکات کە قایل بووم بەناوێکی خوازراوەوە ئاماژەی بۆ بکەم.

ئەو لە هامبۆرگ لەگەڵ نزیکەی ٥٠ منداڵی تر لە خانەیەکدا بوون. کچان و کوڕان لەو خانەیەدا ئاگایان لە دایکان و باوکانیان نەبوو. بەقسەی خۆی هیچیان لەو بارەیەوە پێ نەدەگوترا و ڕێشیان پێ نەدەدرا پرسیاری وا بکەن. تا بکرایە خوشک و براکان لەیەک جیا دەکرانەوە. کچان و کوڕان جیا لە یەکتر دەنووستن هەر گرووپێکی دە کەسی لە ژوورێکدا لەسەر زەوی دەنووستن. تەنانەت ڕێگەیان پێ نەدەدرا بەیەکەوە گەمە بکەن. بەهیچ شێوەیەک بۆیان نەبوو لە دەرەوە یاری بکەن و گەشت و سەیرانیش هەر نەبوون. ڕۆژ لای ئەوان لە چواری بەیانییەوە دەستی پێ دەکرد و تا شەوێکی درەنگ و دوای تەماشاکردنی کاسێتە ڤیدیۆییە ڕۆژانەکان و دانتان بەکردەوەکانی ئەو ڕۆژە تەواو دەبوو. هەر وەکو گەورەکان منداڵەکانیش لە "دانیشتنی ڕاپۆرتی ڕۆژانە"دا دەبوایە هەرچییەکیان کردووە باسی بکەن و قایل بن بەسەرزەنشتی چاودێران و منداڵەکانی تر.

هەر گرووپێکی ١٥ منداڵی دایەنێکی هەبوو. بەڵام هەموو دایەنەکان دڵڕەق بوون؟ منداڵانی ئەو سەردەمە پێیان وتم نا. بەڵام دایەنی لادەر نەرم و نیان بوو و گرووپی خۆی دەبردە دەرەوە، بۆ نموونە بۆ باخچەی ئاژەڵانی دەبردن. یەکێ لەو دایەنانە باسی ئەوەی بۆم کرد چەند ڕووبەڕووی سەرکۆنەی بەتەمەنەکانی تر دەبووەوە کە پێیان دەگوت: دەبێ منداڵەکان نەچنە دەرەوە و بەردەوام خەریکی خۆ ڕۆشنبیرکردن بن.

کچە هۆڵەندییە گەنجەکە دەڵێ "بەردەوام برسی بووم، تەنیا بڕێکی کەم خواردنمان دەدرایە و ئەگەر داوای زیاترت بکردایە لێدان بەشت دەبوو". ئەو لە بیریەتی کە تەمەنی دوو سێ ساڵ دەبوو تایەکی گەرمی هەبوو، بەتەنیا لە ژوورێکدا فڕێ درابوو، "بۆ خوشکەکەم دەگریام کە لەمێژ بوو نەمدیبوو. لەبەرئەوەی نەخۆش بووم نانیشیان نەدامێ. خوشکەکەم ناچار نانەکەی خۆی دایە من. کە گریام و داوای باوکم کرد کەوتمە بەر لێدان".

من پێم سەیر بوو ئەو ئەوەندە بچووک نییە ئەو هەموو ڕووداوەی بەڕوونی لە بیر بێت و وام دەزانی باوکی و خوشکەکەی کە دوای ئەوە بەماوەیەکی کورت دۆزییانەوە بۆیان باس کردبێت. بەڵام خۆی گوتی ئەو یادگارییانە زۆر تیژ و ڕوونن لە بیریدا و تا ئێستە خەونی ناخۆش بەو بەسەرهاتانەی خۆیەوە دەبینێ.

منداڵەکان لە خانەی منداڵانەوە چوونە قوتابخانەی ئەڵمانی، لەوێ نەک تەنیا بەجلوبەرگە سەیرەکەیان و لەچکی سەری کچەکان سەرنجیان بۆ خۆیان بەکێش دەکرد، بگرە بەوەش کە بەردەوام لە ناو وانەکاندا خەو دەیبردنەوە. مامۆستاکانیان سەرنجی ئەوەشیان دابوو کە ئەو منداڵانە ئاسەواری زۆری لێدانیان پێوە بوو. هەروەها هەندێک باسی شوێنی سووتاندن بەجگەرە بەلەشی منداڵەکانەوە کراوە.

بۆ چەند ساڵێک کەس گوێی بەو ڕاپۆرتانە نەدا کە مامۆستاکان لە بارەی گومانی مامەڵەی خراپ لەگەڵ ئەو منداڵانە لە ماڵەوە بەرزیان کردبووەوە. تەنیا شتێ کە پۆلیسی ئەڵمانیا دەیکرد گوێگرتن بوو لە قسەی بەرپرسەکانیان و ئەمانیش وەک یاسایەک بەردەوام نکۆڵییان لە هەموو شتێک دەکرد. کار گەیشتە ئەوەی یەکێ لە مامۆستایانی منداڵە ئێرانییەکان هەڕەشەی کوشتنی لێ بکرێت دوای ئەوەی لەسەر ڕاپۆرتێکی ئەو پۆلیس لێکۆڵینەوەیەکی کردبوو.

لە چیرۆکەکەی یاسر عیزەتی ئەوەم بۆ دەرکەوت کە ئەو خانەی منداڵانەی لە ساڵی ۱۹۹۵ەوە ئەوی تێدا بوو خرابووە ژێر چاودێریی حکوومەتی ئەڵمانیا و لە پاڵ موجاهیدینەوە کارمەندی ئەڵمانی لەوێ کاریان دەکرد. بارودۆخ لەو خانەیەی موجاهیدین ئازادانەتر بوو لەو خانانەی پێشتر تیایاندا بوو.

موجاهیدین لە ڕێی دامەزراوەیەکەوە توانیبوویان خۆیان لە دەستوەردانی حکوومەتی ئەڵمانیا دوور بخەنەوە، ئەو دامەزراوەیە لە ساڵی ۱۹۹۳دا لە کۆڵۆن بەناوی دامەزراوەی هاوکاریی منداڵانی ئاوارەی ئێرانییەوە دامەزرا. لایەنی کەم چوار خانەی منداڵانیان هەبوو سێ لە کۆڵۆن و یەکێک لە هامبۆرگ. بەڵام لە ساڵی ۱۹۹۵ حکوومەتی ئەڵمانیا کاردانەوەی هەبوو بەرامبەر بەو ڕاپۆرتانەی باسی باری خراپی منداڵەکانی نێو ئەو خانانەیان دەکرد.

بەڕاستی موجاهیدینی خەلق نەیاندەزانی چی لەو منداڵانە بکەن کە ڕەجەوی بۆ

کێشـه دروستکردن و بێ ئەوەی پێویست بێت ناردیانیە دەرەوەی عێراق. وەک هـەموو شـوێنێکی تری ڕێکخـراوەکـەش کـەسـانی ناشـایان بەچاودێریکردنی ئەو منداڵانە سپێـردران، ئەو کەسانە بەپێی دڵسۆزییان بۆ ڕێکخـراوەکە هەڵبـژێران نەک لەبەر پسپۆڕی و شارەزاییان. بیرۆکەکە ئاشکرا بوو: ئەو منداڵانە بەشێوازێکی سەربازی پەروەردە دەکـران بۆ ئەوەی لـە دوارۆژدا ببنە سـەربازی نوێ بـۆ موجـاهـیدین. جگە لەمـەش ئەرکی پارە پەیداکـردنیـان بەجێ دەهێنا لـە ڕێی سـواڵکردن بۆ دابینـکردنی ژیانێکی باش بۆیان.

خانەکانی منداڵان سەرچاوەی پارە پەیداکردنی ئاسان بوون بۆ موجاهـیدین. بۆیە دوای دە سـاڵ حکوومـەتی ئەڵمـانیا کـۆتـاییی بەم بارە هێنا. ڕێکخـراوەکە بـەهـەموو شێوەیەک داوای هاوکاریی لە ئەڵمانەکان دەکرد و گشت ڕێیەکی بۆ بەدەستهێنانی پارە گرتە بەر. هەموو جارێکیش ئەو ڕێیانە یاسایی و دروست نەبوون. ڕێکخـراوەکە چەندین سـاڵ ڕۆژانە بۆ هـەر منداڵێک بڕی ١٣٠ تا ٢٦٠ مـارکی ئەڵمـانیی وەردەگرت لەبەرئەوەی هـەموو منداڵەکانیـان بەساختـە بـەهەتیو تۆمـار کـردبوو. تەنیا شـاری کـۆلۆن سـاڵانە نزیکـەی سێ ملیـۆن مـارکی بەشـێـوەی هـاوکـاری بە٥٠ لەو منداڵانە دەبەخشی. دەسەڵاتی ئەڵمانیا لە ڕاستیدا بێ ئاگا بوو لەوەی ئەو منداڵانە لە دایک و باوکانیان جیا کراونەتەوە چونکە موجاهیدین ئەوانیـان هەڵخەڵەتاندبوو بەوەی گوایە دەسەڵاتدارانی ئێران دایک و باوکی منداڵەکانیان کوشتووە.

دوای دوو سـاڵ لێکۆڵینـەوە دادگەی باڵای ئەڵمـانیـا لە کـانوونی یەکـەمی ٢٠٠١دا بڕیاری داخستنی هەمـوو ئەو ٢٥ خانەی منداڵان و بنکەیەی موجاهـیدین بەئەڵمانیا دا بەهۆی خـراپ بەکـارهێنانی هاوکـاریی کـۆمـەڵایەتی و فـێـڵبـازییەوە. دەسـەڵاتی ئەڵمـانیـا ئەو پارەیەی مـوجـاهـیدین توانیبوویان کـۆی بکەنەوە بەدە تا دوازدە ملیۆن مارک خەمڵاند و گەیشتە ئەو ئاکامەی کە ئەو پارەیە بۆ کڕینی چەک بەکار هێنراوە.

هەمـوو منداڵە "دزراوەکـان" لە خـانەی منداڵاندا نەبـوون لە ئەڵمـانیـا. هەندێکیان لە مـاڵی دۆست و لایەنگرانی ڕێکخـراوەکـە جـێـیـان کـرایەوە، ئەمـە لە شـوێـنانی تری ئەوروپا و لە کـەنەدا و ئەمـەریکاش کـرا. هـەندێ جـار ئاکـامـەکـە دڵخۆشکەر بوو بۆ دایک و باوکـە نوێیـەکـە و منداڵەکـەش. هەرچەندە ئەوەی یاسـر عـیزەتی لە بارەی

سزادان و لێدانیەوە لە لایەن دایک و باوکە نوێیەکەیەوە حاڵەتێکی باو بوو. جگە ەمەش باس لە دەسدرێژیی سێکسیش بۆ سەر ئەو منداڵانە هەیە.

ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلقی ئێران لە نیسانی ١٩٩٩دا بەو ڕۆژنامە ۆڵەندییانەی ڕاگەیاند کە لەسەر دزینی منداڵانیان دەنووسی و دەیانگوت ئەو نداڵانە بەزەبری هێز لە دایک و باوکانیان جیا کراونەتەوە، "لە زستانی ١٩٩١دا ێراق کەوتە بەر سەختترین بۆردومان لە مێژوودا و سەلامەتیی ئەم منداڵانە لە هیچ ـوێنێکی ئەو وڵاتەدا مسۆگەر نەدەکرا"، ئەمە لە نامەیەکدا هاتبوو کە ەئینگلیزییەکی ڕێک بەڵام پڕ لە زیادەڕەوی نووسرابوو. ئەوان مەبەستیان بوو ئەوە ڵێن ئەم منداڵانە برانە ئەوروپا و باکوری ئەمەریکا بەپێی داوای باوک و دایکانیان و کارێکی سەخت بوو و ملیۆنان دۆلاری تێدا خەرج کرا". هەروەها نووسینگەی ڕاگەیاندنی موجاهیدین لە دەنهاگ ئەوەشی دووبارە کردەوە کە "ئەمە یەکێک بوو لە ەسپێشخەرییە هەرە مرۆڤانەکانی موجاهیدین".

دوای ئەمە ئاماژەی بەو "هەواڵە دڵتەزێنانە" دا کە ئەو کاتە لە بارەی "مەرگ و ازاری منداڵانی عێراق"ەوە بڵاو دەکرانەوە. وا دەردەکەوت ئەوان دەیانەوێ بڵێن ئەم ـارە ئەنجامی ئەو ئابلووقەیەیە کە نەتەوە یەکگرتووەکان بەسەر عێراقدا ـەپاندبووی، بەپێی ڕاگەیاندنەکەیان "بارەکە لە ١٩٩١دا زۆر سەختتر و تراجیدیتر ـوو".

هەندێ لە منداڵەکان چەندین جار جێگۆڕکێیان پێ کرا و لە کۆتاییدا کە تەمەنیان ـو بە١٦ ساڵان برانەوە کەمپی ئەشرەف. لە چیرۆکەکەی یاسر عیزەتی وا ـردەکەوێ موجاهیدین لە ناوەڕاستی نەوەتەکاندا هەڵمەتێکی ساز کردووە بۆ ـێڕانەوەی ئەو منداڵانەی ئەو کات هەرزە بوون بۆ عێراق. سوپای ڕزگاریی ـشتمانی بەرەو پیری دەچێ، ڕێژەی تەمەنی ئەندامانی ڕووی لە پەنجا ساڵە. بۆیە ـو منداڵانەی زۆر دڕندانە دەربەدەر کران ئامانجێکی گرینگن بۆ هەڵمەتی ـاندنەوەی ئەو سوپایەی پێویستی بەخوێنی نوێ هەیە.

یاسر عیزەتی دەڵێ سێ چارەکی ئەو دوو سەد منداڵەی لە ئەڵمانیا گەورە بوون ـبوایە بگەڕێنەوە عێراق و مەشقی سەربازییان پێ بکرێ و لە ڕاستیدا دوو سەد

منداڵیان هێنایەوە عێراق و هێزێکی تایبەتی گەنجیان لێ پێک هێنان.

ئەمە چارەنووسی خوشک و برایەک بوو بەناوی نوسرەت و ئەمیر شەمس حایری، کە دوای چەند ساڵێک لە خانەکانی ئەڵمانیا برانەوە عێراق. هادی شەمس حایریی باوکیان کە بەهۆی ئەو دوو کتێبەی لە بارەی ڕێکخراوەکەوە بڵاوی کردوونەتەوە (کتێبەکان بەناوی "پارێزگاریی سەرکەوتووان و ژێرکەوتووان" و "ئاوی مەند"ن) ناوبانگی لە نێو کۆنە موجاهیدین و شوێنانی تریشدا هەیە، باسی هەوڵی بێ سوودی خۆی بۆم کرد بۆ شادبوونەوە بەمنداڵەکانی. ئەو لە ساڵی ١٩٩١ موجاهیدینی جێ هێشت و دوای ماوەیەک مانەوە لە کەمپی ڕەمادیی پڕ نەهامەتی و برسییەتی کە کەمپێکی پەنابەرانی کوردی ئێرانە لە نزیک ڕەمادی و موجاهیدین وەک وێستگەیەکی نیوەی ڕێ بۆ ئەو ئەندامانەی دەیانەوێ ڕێکخراوەکە جێ بهێڵن بەکاری دەهێنێ. بەتەنیا بەبێ ژنەکەی و منداڵەکانی دەچێتە هۆڵەندا و لەوێ وەک پەنابەر وەردەگیرێ. بۆ چەند ساڵێک نەیزانی لە کوێ بەدوای منداڵەکانیدا بگەڕێ. دوایی بەهاوکاریی مایا فان فلوتن کە فەرمانبەر بوو لە ئەنجوومەنی پەنابەران لە گرۆنینگن توانیی لە ساڵی ١٩٩٣ نوسرەت و ئەمیر لە دوو "هەتیوخانە"ی موجاهیدینی خەلق لە کۆلۆن بدۆزێتەوە.

"زانیم ئەمیر دەچێتە چ قوتابخانەیەک و پێوەندیم بەبەڕێوەبەرەکەیەوە کرد. جارێکیش ئەمیرم لەوێ دی" ئەو دەیگێڕێتەوە. بەڵام پێوەندی بەمنداڵەکانەوە کارێکی گران بوو. "وایان لێ کرابوو نەوێرن بەلای مندا بێن. بەمنیان گوت تۆ بوویتە بەکرێگیراوی ڕێژیمی ئێران".

کاتێ کە شەمس حایری بەکوڕەکەی گوت ئەو پانتۆڵە کۆنە چییە لەبەرت کردووە کوڕە لە وەڵامدا گوتی ئەمە کارێکە بۆ هاوکاریی موجاهیدین لە تێکۆشاندا دەیکات. "بۆم دەرکەوت منداڵەکان شەو و ڕۆژ پروپاگاندەباران دەکرێن".

موجاهیدین بەهیچ جۆرێک بەم پێوەندییە دڵخۆش نین. چونکە هەر چۆنێک بێت شەمس حایری پشتی لە ڕێکخراوەکە کردووە و ئێستا هەڕەشەی ڕزگارکردنی منداڵەکانی لە چنگی ئەوان دەکات. بۆیە منداڵەکان گواسترانەوە قوتابخانەیەکی تر، کە ئەمجارەش شەمس حایری توانیی بیاندۆزێتەوە دووبارە گواسترانەوە.

ئەو هەوڵی دا لە ڕێی یاساییەوە بیانباتە گرۆنینگن. پەنای بردە بەر (یوگندامت) دەزگای خۆشگوزەرانیی منداڵی ئەڵمان، ئەوانیش زۆر خۆشحاڵ بوون کە زانییان ئەو منداڵانە هەتیو نین. بەڵام موجاهیدین توانییان هەوڵەکەی پووچەڵ بکەنەوە. ژنەکەی شەمس حایری لە عێراقەوە هات و توانیی لە دادگەی ئەڵمانیا بڕیارێک دەربکات و ببێتە سەرپەرشتیاری منداڵەکان. ئەم شەڕە هەر لە سەرەتاوە دۆڕاو بوو. "موجاهیدین پارەی زۆر و پارێزەری باشیان هەبوو. منیش لەو کاتەدا تەنیا دۆستێکی کەمم هەبوو" ئەمەی بەهەناسە ساردییەوە گوت.

دوای دادگاییەکە جارێکی تر چاوی بەمنداڵەکانی نەکەوتەوە. هەوڵی دا نامەیان بۆ بنێرێ بەڵام پێی گوترا کوڕەکەی ئامادە نییە نامەکان وەرگرێ. دوای ئەمە منداڵەکانی دیار نەمان و شەمس حایری پێی وایە کوڕەکەی، کە لە کاتی دادگاییەکەدا ١٥ ساڵان بوو، بەخێرایی ڕەوانەی عێراق کراوەتەوە.

ڕاستیی ئەم بۆچوونەش دوایی دەرکەوت. کاتێ لە کۆتاییی ٢٠٠٥دا وەک ڕەتدانەوەی ڕاپۆرتێکی تاوانبارکردنی ڕێکخراوەکە لە لایەن ڕێکخراوی چاودێریی مافی مرۆڤەوە، دۆستانی ئێرانی ئازاد کە هەوادارانی موجاهیدینن لە پەرلەمانی ئەورووپا "ڕاپۆرتێکی مەیدانی"یان بڵاو کردەوە تیایدا وەفدێک سەردانی کەمپی ئەشرەف دەکات و قسە لەگەڵ ئەوانەی ئەوێ دەکات و منداڵەکانی شەمس حایریش لەوێ قسەیان لەگەڵدا دەکرێ، بەڵام ئێستا تەمەنیان ٢١ و ٢٥ ساڵە. نوسرەتی کچی بووەتە گۆرانیبێژ لە ئۆرکێسترای کەمپەکە، بەڵام نەزانراوە ئەمیری کوڕی چی دەکات. بەگوێدا خوێندنی بەردەوام کاری خۆی کرد و ئێستا منداڵەکان تەواوی بڕوایان هەیە کە باوکیان بۆ وەزارەتی هەواڵگری و ئاسایشی ئێران کار دەکات، هەر بۆیەش کتێبی لە دژی موجاهیدین نووسیوە. ئەمیر دەڵێ "ئێمە ئەوەمان هەڵبژارد لەگەڵ دایکمان بمێنینەوە و بەداخەوە ڕێکخراوەکە باجی ئەمەی دا". لە بارەی باوکیشیەوە دەڵێ "ئەو لە سایتێکی سەر بەوەزارەتی هەواڵگری و ئاسایشی ئێراندا دەڵێ منداڵەکانم لای ڕەجەوی دیلن و دەمەوێ ڕزگاریان بکەم. ئێمە بەنامەیەک وەڵاممان دایەوە و گوتمان ئێمە بەئارەزووی خۆمان ئەمەمان هەڵبژاردووە. (......) ئەو بەبیانووی منداڵەکانی ماوەی ١٤ ساڵ دژایەتیی ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلقی ئێرانی کرد".

کوڕ و کچەکە تەواو بڕوایان وایە باوکیان گوێ بەوان نادات و هەرگیز نەیویستووە لەگەڵ ئەواندا عێراق جێ بهێڵێ و هەموو ئەوەی دەیکا بەفەرمانی حکوومەتی ئێرانە. ئەوان دەڵێن لەو چەند مانگەی بەیەکەوە لە کەمپی ڕەمادی بوون هیچ گوێی پێ نەدەدان. نوسرەت دەڵێ ئەو کاتەی لەو کەمپەدا بوون تەمەنی حەوت ساڵ بوو "جلوبەرگی خاوێنم نەبوو و پێم پەتی بوو. ڕۆژگارم لە ماڵی خەڵک و لای دراوسێکان ڕادەبوارد... ئەگەر ئەو مەبەستی بووایە پێوەندییەکی خۆشەویستیمان لەگەڵدا بنیات بنێ کاتی ئەوەی هەبوو. ئەو زۆر بەئاشکرا ڕێنوێنییەکانی وەزارەتی هەواڵگری و ئاسایشی ئێرانی جێبەجێ دەکرد و مەبەستی نەبوو ئێمە بباتەوە لای خۆی... ئێمە بوارمان پێی دا و ئەویش سوودی لێ وەرگرت..."

زۆر لە دایک و باوکان بەهۆی دابڕینی منداڵەکانیان لە موجاهیدین دوور کەوتن تا بتوانن لەگەڵ منداڵەکانیان یەک بگرنەوە. هادی شەمس حایری لە هەوڵەکانی سەرکەوتوو نەبوو. هەروەها حەبیب خورەمیی دۆستی لە شاری گرۆنینگنی باکوری هۆڵەندا زۆر لەو باشتر نەبوو. بەهادوری کوڕی وەکو یاسر کەوتە کەنەداوە و بەهادور زۆر لەو منداڵترە. ئەم لە حوزەیرانی ١٩٩١دا کە گەیشتە باڵەفڕگەی کیبیک تەمەنی تەنیا سێ ساڵ بوو و لەوێ لە لایەن شیمین شافی و حامد پیرە هەڵگیرایەوە و ئەم دووە بوونە دایک و باوکی بەخودانکەری بەهادور.

بەهادور خورەمی کە ئێستە تەمەنی ١٦ ساڵانە دەڵێ "من ئەو دایک و باوکەی کەمپەکەی عێراقم لە بیر نییە. دایک و باوکی بەخودانکەرم لە کەنەدا وەکو دایک و باوکی ڕاستەقینە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردم و من بڕوام بەدایک و باوکێتیی ئەوان کرد".

بەهادور بەدوای وشەی ئینگلیزیدا دەگەڕا، ئەو زمانەی چەند ساڵێک بوو زۆر بەدەگمەن بەکاری هێنابوو. ئەو زۆر بەداخە بۆ ئەو وشانەی لە بیری کردوون. بەچوارمشقی لەسەر کومبارێکی ئێرانی، لە ماڵی باپیری، لە شاری ئیلامی ئێران بەرامبەرم دانیشتبوو. ئێستا لە ناو خێزانێکی گەورە و لەگەڵ مامەکانی و پوورەکانی و ئامۆزاکانی بەفارسی قسە دەکات و کەمێک کوردیش دەزانێ. بەڵام هێشتا یادگارییەکانی ئەو ساڵانەی لە تۆرنتۆی بەسەر بردن لە یادگەیدا زیندووە

هەرچەندە شەشساڵیان بەسەردا تێ پەڕیوە. ئەو ماوەیەی لەوێ بوو زۆر کاریگەریی بەسەریەوە هەبووە، ڕەنگە هۆکارەکەش ئەوە بێت کە بەهیچ شێوەیەک لەو ماوەیەدا شاد نەبووە.

ئەو دەڵێ سەرەتا زۆر باش بوو تا ساڵێک، ئەو کاتەی سێیەمین کوڕێکی بوو و ناوی نا ئاڤێستا. ئینجا ئەوان ڕوویان لە منداڵەکەی خۆیان کرد، ئەویان لە باوەش دەگرت نەک من، لە منیان دەدا نەک ئەو. لەو کاتەوە هەستم کرد ئەوان دایک و باوکی من نین. بەهادور ئێرەیی دەبات، بەڵام بەتوندی خێزانی دووەمی دەستیان پێوە گرتووە. بەڵام لە یاسر کەمتر، دایک و باوکی بەخودانکەری بەهادوریش نەیاندەزانی چی لێ بکەن. ئەو باسی مشتومڕێکی خێزانیی بۆ کردم کاتێ دایکە بەخودانکەرەکەی، کە ئەو بەفەرەح ناوی دەبا، لەسەر ئەوەی ئەم شیری ڕشتبووە سەر کومبارەکە لێی دابوو.

ڕووداوێکی ناخۆشی بەبیر هاتەوە، کاتێ تەمەنی هەشت ساڵ بوو و پانتۆڵەکەی بزر کردبوو. "لە قوتابخانە وانەی وەرزشمان هەبوو. کە تەواو بوو پانتۆڵەکەم نەدۆزییەوە. بۆیە بەشۆرتی وەرزشەوە گەڕامەوە ماڵەوە. فەرەح پێی وتم ئەگەر پانتۆڵەکە نەدۆزیتەوە تێهەڵدان بەشت دەبێ. دووبارە گەڕامەوە قوتابخانە بەڵام پانتۆڵەکەم پێ نەدۆزرایەوە. زۆر دەترسام و چەندم دەکرد نەمدەوێرا بگەڕێمەوە ماڵەوە". لەبەرئەوەی زۆر برسی دەبێ هەندێ پارە لە حەوزێک دەردێنێ و بابۆڵەیەکی پێ دەکڕێ و دوای چەند ساتێک خولانەوە بەدەوری بازاڕگەیەکدا بۆی ڕوون دەبێتەوە هیچ چارەی نییە و دەبێ بچێتەوە ماڵەوە، بەڵام تا ئەو کاتە دایکە بەخودانکەرەکەی تەلەفۆنی بۆ پۆلیس کردبوو تا بەدوایدا بگەڕێن. "فەرەح پێی وتم بۆم نییە بەپۆلیس بڵێم ئەو هەڕەشەی لێدانی لێ کردووم".

ئەوان لە سەرەتاوە بۆ کۆبوونەوەکانی موجاهیدینیان دەبرد. ئەو گەشتێکی بۆ نیویۆرک لە بیرە کە بۆ پرۆتستۆی سەردانی سەرۆکی ئێران، خاتەمی، بۆ ئەو شارە بوو. "جلوبەرگی نوێمان لەبەردا بوو و وێنەی ڕەجەویمان هەڵگرتبوو. هەموو یەکشەممەیەکیش دەچووینە بارەگاکەی موجاهیدین لە تۆرنتۆ و لەوێ فیلمی خۆی و سەربازەکانیمان پێشان دەدرا. لەوێ پێیان دەگوتین ئەگەر گەورە بووین ئێمەش دەبینە سەرباز و شەڕ لە پێناوی ئازادیدا دەکەین، ئێمە کوڕی ڕەجەوین". ئەم زۆر

حەزی لەو شوێنە بوو چونکە لەوێ دەیتوانی لەگەڵ منداڵانی تردا یاری بکات و هەندێ جار سەیران و ئاهەنگیش هەبوو.

ئەو منداڵانەی نەدەناسی کە گەمەی لەگەڵدا دەکردن، دەبێ ئەوانیش لە عێراق ڕفێن رابن. برای دایکە بەخودانکەرەکەی بەرپرسی بەشی موجاهیدین بوو لە تۆرنتۆ و فەرمانی پێ درابوو سەرپەرشتیی ئەو بەشەش بکات کە تایبەتە بەو منداڵانەی لە کەمپی ئەشرەفەوە بۆ کەنەدا هاتوون. خۆی و ژنەکەی بێ منداڵن و دوو منداڵیان لای خۆیان گل داوەتەوە و بەهادور تەنیا ئەوەندەی دەزانی کە نادیرە و هۆما کچی خاڵین و زۆر جار سەردانی دەکردن.

لە کۆتاییدا باوکی بۆ یەکەمین جار لە هۆڵەنداوە تەلەفۆن دەکا. بەهادوریش کە پێی گوترابوو ئەوە مامەکەیە تەلەفۆن دەکا زۆر گوێی پێ نەدا. مامەیەک لە موجاهیدین مەرج نییە خزم بێت، ڕەنگە تەنیا ئەندامێکی ڕێکخراوەکە بێت و بەهادور لەو جۆرە مامە زۆری هەیە.

کاتێ حەبیب خوڕەمی تەلەفۆنی بۆ کوڕەکەی لە تۆرنتۆ کرد، ئەمە ئەنجامی گەڕانێکی زۆر بوو. بۆ ئەو ڕفاندن و دوورخستنەوەی بەهادور لە لایەن موجاهیدینەوە دوا وێستگە بوو. حەبیب خوڕەمی لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەدا نییە ڕەجەوی لە ڕێکخراوەکەدا دەیانکات. ئەو ناچار کرا لەیلای ژنی تەڵاق بدات و زۆر هەوڵی دا ئەو فەرمانە جێبەجێ نەکات. هەر لە دەوروبەری ئەو کاتەشدا بوو کوڕەکەی شوێنبزر کرا، ئەو دواجار لە سەروبەندی بۆمبارانەکەی ١٩٩١دا کە بەهۆی داگیرکردنی کوێت لە لایەن سەدامەوە بوو، کوڕەکەی خۆی دیبوو. "پێیان وتم شەرمە تۆ لەم کاتە سەختەدا داوا لە ڕێکخراوەکە بکەی کێشەی منداڵەکانت بۆ چارەسەر بکات" ئەمەی بەبیر دێتەوە. ئەو زوو زانی بەهادور کەوتووەتە کەنەدا و وێنەیەکی ئەویشی بەدەست گەیشتبوو بەڵام بەبێ ناوونیشان. "هەر جارێکیش دەمگوت ئەرێ دەتوانم نامەیەک بنووسم پێیان دەگوتم وەڕس مەبە".

خوڕەمی بەردەوام دەبێ لەبەرئەوەی دەیەوێ ڕێکخراوەکە بەجێ بهێڵێ و بەکوڕەکەی شاد بێتەوە. بەڵام لەسەر ئەم کەللەڕەقییە سزا دەدرێت. بۆ ماوەی شەش مانگ لە زیندانە جۆراوجۆرەکانی موجاهیدیندا زیندانی دەبێت. دوای ئەوە دوور

دەخرێتەوە بۆ کەمپی پەنابەران لە ڕەمادی کە لەوێ هەموو شتێک کەمە. ئەو دەڵێ "لەوێ تەنانەت سەگیشیان دەخوارد" و دوای ئەم هەموو ساڵەش هەر بێزی لەوە دەبێتەوە. لەوێ موجاهیدینی خەلق وەک حزبە ئێرانییەکانی تر نووسینگەیان هەیە و زۆر بەنابەدڵییەوە هاوکاریی دەکەن بۆ دەرچوون لە عێراق. ئەویش بەبێ لەیلای کۆنە ژنی کە لە کەمپی ئەشرەف مایەوە.

لەسەر مێزی نانخواردنەکەی لە گرۆنینگن، کە ژنە نوێیەکەی مەرزییە یەک لە دوای یەک خواردنی ئێرانیی لەسەر ڕیز دەکرد ئەو سەرقاڵی هەڵدانەوەی ئەو فایلە ئەستوورانە بوو کە لەسەر خۆی و کوڕەکەی دروستی کردبوون. ئەوەی دوای دەرچوونی لە عێراق بەسەریدا هات زۆر ئاڵۆزە بەشێوەیەک تەنانەت دادوەرەکانیش نەیاندەتوانی بابەتەکان تێ بگەن.

حەبیب خورەمی دوای ئەوەی بەڵێنی لە موجاهیدین وەرگرت کوڕەکەی لەوێ دەبینێ، ساڵی ١٩٩٢ گەیشتە هۆڵەندا. بەهۆی چیرۆکێکی درۆینەی موجاهیدینەوە گوایە ئەم ڕای کردووە وەک پەنابەر وەرگیرا. بەڵام موجاهیدین بەڵێنەکەی خۆیان نەگەیاندە جێ و دوای داواکردن و پاڵەپەستۆیەکی زۆریش ئینجا تەنیا ژمارەی تەلەفۆنی باوک و دایکی شیریی بەهادوریان لە کەنەدا دایێ.

کاتێ تەلەفۆنیان بۆ دەکات باوک و دایکە بەخودانکەرەکە داوای لێ دەکەن بڵێ ئەو مامەی بەهادورە بۆ ئەوەی منداڵەکە زۆر نەشڵەژێ، خورەمیش بەداواکەیان قایل دەبێ. "من پێم وتن دەمەوێ منداڵەکە بگێڕمەوە لای خۆم، کەچی پێم وترا ئەوە لە ڕووی یاساییەوە مەحاڵە. من زۆر تووڕە و بێ ورە بووم بەم قسەیە".

چۆن دەبێ باوکێک داوای گێڕانەوەی کوڕی خۆی بکات و لە وەڵامدا پێی بگوترێ ئەمە لە ڕووی یاساییەوە مەحاڵە؟ ئەمە لە کاتێکدا دایک و باوکە شیرییەکە بەو منداڵە دڵخۆش نەبن؟ خورەمی وا تێ گەیشت کە ڕێکخراوەکە کوڕەکەی وەک پاڵەپەستۆیەک بەکار دێنن بۆ ڕێ گرتن لەوەی پرسی قاچاخچێتییان بەو منداڵانەوە بۆ میدیاکان ئاشکرا نەکات. یان بۆ ڕێ گرتن لەوەی دووبارە پێوەندی بەلەیلای کۆنە ژنیەوە لە عێراقدا بکات و بیهێنێتە لای خۆی لە هۆڵەندا. "من ئەو کاتە بارمتە بووم لای ئەوان".

ڕێکخراوەکە و دایک و باوکە بەخودانکەرەکە هاوکار نین. بۆیە خورەمی تەنیا ڕێی دوورودرێژی فەرمیی لە پێشدا بوو. بەهۆی مۆڵەتی نیشتەجێبوونەکەیەوە داوای ناسنامەی هۆڵەندای کرد. پرسی بەهادوری بەدەسەڵاتی هۆڵەندیی تایبەت بەیەکخستنەوەی خێزان گەیاند، هەرچەندە ئەمە وای دەخواست دان بەوەدا بنێ ئەو چیرۆکەی مافی پەنابەرییەتیی پێ وەرگرتووە درۆ و ساختە بووە. ئەم جۆرە درۆیەش لە کاتی ئاشکرابوونیدا دەبێتە هۆیەک بۆ وەرگرتنەوەی مافی پەنابەری لەو کەسەی درۆکەی کردووە، بەڵام خورەمی ئامادە بوو هەموو کارێک بکات لە پێناو گەڕانەوەی کورەکەی بۆ باوەشی خۆی. بەڵام ئەم بەختیار بوو، چیرۆکەکەی خۆی زۆر لەو چیرۆکە درۆیینە بەهێزتر بوو.

هەر لە سەرەتاوە ئاگەداری تۆرنتۆی کردەوە نیازی چییە. "ئەوان هیچ بەمە شاد نەبوون. هەڕەشەیان لێم کرد کەوا جارێکی تر چاوم بەبەهادور ناکەوێتەوە. بۆ چەند ساڵێکی کەم ترسی ئەوەم هەبوو موجاهیدین جێی بگۆڕن و جارێکی تر نەیبینم". لە ساڵی ١٩٩٧دا پاسپۆرتی هۆڵەندای وەرگرت لە پاڵ مۆڵەتی نیشتەجێبوونی کاتی بۆ بەهادور لە هۆڵەندا. لە هاوینی ١٩٩٧دا توانیی بەرەو تۆرنتۆ بچێت و لەوێ دوای حەوت ساڵ دابڕان دووبارە بەهادور لە ئامێز بگرێتەوە، بەڵام کورەکە هێشتا وای دەزانی مامەیەتی و هیچی تر.

بەڵام بەهادوریش گومانی خۆی هەبوو. بۆ دەبێ ئەم مامەیە لە وڵاتی دووری هۆڵەنداوە ئەو هەموو تەلەفۆنەی بۆ بکات و تەنانەت بێتە سەردانیشی؟ "من خۆشحاڵ بووم کە پێی وتم دێمە لاتان. هەستیشم کرد باوک و دایکە بەخودانکەرەکەم خۆشحاڵ نەبوون". باشە بۆ ئەوان ئامادە نەبوون منداڵەکە بدەنەوە؟ "من پێم وایە موجاهیدین لەبری چاودێریکردنی من پارەیان پێ دابوون. ئەوان هیچ کارێکیان نەدەکرد".

لەگەڵ ئەمەشدا گشت خێزانەکە لە باڵەفڕگەی تۆرنتۆ چاوەڕوانی خورەمییان کرد. ئەویش دوای چەند ڕۆژێک بەکورەکەی خۆی گوت کە ئەو مامی نییە. "ئەو چیرۆکی کوڕێکی بۆم گێڕایەوە - چیرۆکی خۆم بوو". بەهادور لەگەڵ تێکردنی پیاڵە چایەکی تر بۆ خۆی پێدەکەنێ. لەو خانووە کپەی ئیلامدا باپیر و داپیری لە خەوی ئاساییی

دوای نیوەڕۆدا بوون. "لێم پرسی: بۆ ئەم شتانەم بۆ دەگێڕیتەوە؟ ئینجا پێی وتم ئەو باوکمە".

بەهادور تووشی سەرسوڕمانێکی زۆر هات، بەڵام ئەوەی بەباشی لە بیریەتی تووڕەیی دایکە بەخودانکەرەکەیەتی کە زانیی خوڕەمی ڕاستییەکەی بۆ کوڕەکەی درکاندووە. "ئەو پۆلیسی ئاگەدار کردەوە و هاتن بردیان و چەند ڕۆژێک نەمتوانی بیبینم".

لە کۆتاییدا خوڕەمی هاوکاریی تەواوی دایک و باوکە بەخودانکەرەکەی بەدەست هێنا. لەگەڵ ئەواندا کاری دەکرد بۆ بەدەستهێنانی بەڵگەی سەفەر بۆ بەهادور تا بیباتەوە هۆڵەندا. بەڵام فەرمانگەی کۆچی کەنەدا بۆ ئەم جۆرە کارە ماوەی سێ مانگی دەوێ، ئەمەش دەبێتە هۆی شکستهێنانی پلانەکەی خوڕەمی. ئەویش لەگەڵ دایک و باوکە شیرییەکەدا ڕێک دەکەوێ هەر کاتێ بەهادور پاسپۆرتی وەرگرت یەکسەر سواری باڵەفڕەی بکەن و بۆ هۆڵەندا ڕەوانەی بکەن.

بەهادور لە بارەی ئەو چەند مانگەی دوای سەردانی باوکی دەڵێ "دوای ئەوە لەگەڵمدا باشتر بوون وابزانم دەیانویست لای خۆیان بمهێڵنەوە". دوایی بەپێی ئەو شارەزاییەی لە بارەی خۆشەویستیی خێزانەوە لە ماڵی باپیری لە ئیلام پەیدای کردبوو دەڵێ "ئێستا دەزانم دایک و باوکی ڕاستەقینە چۆنن و چیت بۆ دەکەن. ئەوان دایک و باوکی باش نەبوون".

لە کۆتاییدا لە کانوونی یەکەمی ١٩٩٨دا بەهادور بۆ سەردانی باوکی دەچێتە گرۆنینگن. بەڵام ئەو شادییە ناهێنێت کە حەبیب کەریمی چاوەڕوانی دەکرد. بەهادور دەڵێ "ئەو بەمنی گوت ئیتر ناڕۆیتەوە. ئەمە زۆر قورس بوو بۆ من، من بیری فەرەح و حامدم دەکرد. سەرەتا هیچ باوکم خۆش نەدەویست".

حەبیب خوڕەمی باسی ئەوەم بۆ دەکات کە گرێدانەوەی بەکوڕەکەیەوە چەند سەخت بوو. وەک هەر منداڵێکی تر بەهادوری شەش ساڵە بەچاودێرانیەوە گرێ درابوو، بێ ئەوەی گوێ بەوە بدات بەباشی چاودێرییان کردبوو یان نا. بەهادور دەڵێ ساڵێکی پێ چوو تا خۆشەویستیی باوکی لە دڵی چەسپی، سەرەڕای ئەوەی باوکی هەوڵی بێ وچانی دەدا وای لێ بکات هەست بکات لە گرۆنینگن لە ماڵی خۆیدایە و

بەردەوام دەیبردە دەرەوە بۆ باخچەی ئاژەڵان و پارکی دڵڕفێن و لە ماکدۆناڵد بەیەکەوە هەمبەرگەریان دەخوارد.

خورەمی دەڵێ "دوایی بۆم دەرکەوت ئەوان کارێکی وایان کردبوو لە من بترسێ و چەند ژمارە تەلەفۆنێکی موجاهیدین و پۆلیسیان دابوو پێی. ئەو بەدەگمەن شتێکی دەخوارد".

بەهادور تینووی فێربوون بوو و بەدڵخۆشییەوە بەرەو قوتابخانە دەچوو. زۆر بەخێرایی فێری زمانی هۆڵەندی دەبوو و هەلیشی دەقۆستەوە بۆ ئەوەی بەدزیی باوکییەوە تەلەفۆن بۆ دایک و باوکە بەخودانکەرەکەی بکات. هەروەک فەرەحی دایکی شیریی فێری کردبوو لە ڕێی باڵیۆزخانەی کەنەداوە و لە ڕێی مامۆستایەکی قوتابخانەکەشیەوە هەفتانە تەلەفۆنی بۆ فەرەح دەکرد. ئەمە ڕێیەکی پێچاوپێچ بوو لەبەرئەوە دەترسا داوای ڕێ پێدان لە باوکی بکات بۆ ئەوەی تەلەفۆن بۆ دایک و باوکە بەخودانکەرەکەی بکات، ئەو دەڵێ "من باوەڕم بەو نەبوو. ئەو دەیگوت ئێستا تۆ لەگەڵ منی، منیش حەزم دەکرد بگەڕێمەوە کەنەدا".

بەهادور کەوتە دووڕیانێکی سەختەوە. لە هۆڵەندا گوزەرانی باشە. لە قوتابخانە بە(جۆن) بانگی دەکەن، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە پرسیارم لێی کرد و وتی "ئەوانی ئێرانییان خۆش ناوێ، منیش نەمویست بزانن ئێرانیم. جگە لەمەش ناوەکەم لەسەر زمانیان قورس بوو و هەندی منداڵ پێکەنینیان پێی دەهات". باوکی پێی وایە ئەو دەیویست منداڵێکی ئاسایی بێت و ئەوەی دەیەوێ دەستی بکەوێ و بۆ ماوەیەک هەردوو ناوەکەی بەکار بهێنێ.

لەو سەروبەندە لە کەنەدا هەڵمەتێک دەستی پێ کرد بۆ ئەوەی بەهادور بۆ موجاهیدین بمێنێتەوە و بگەڕێتەوە کەنەدا. بەبێ ئەوەی حەبیب خورەمی دەستبەرداری پرسەکەی بێت یاخۆ خۆی لە دەسەڵاتی باوکانە بەدوور بگرێ یان ئەم دەسەڵاتە لە لایەن دادگەوە لێ بسێنرێتەوە، سیمین شافی و حامد پیرە توانییان لە ناوەڕاستی کانوونی دووەمی ١٩٩٩دا مافی سەرپەرشتیاریی بەهادور بەدەست بهێنن. ئەوان بەدرۆ گوتبوویان بەهادور برازایانە و دایک و باوکی لە ئێرانن و داوایان لەمان کردووە چاودێریی بکەن.

له سەرەتای مانگی کانوونی دووەمدا ئەوان ئاگەدارییان دا کە بەهادور ڕفێنراوە و ئەوەی زۆر خورەمیی تووڕە کرد و بووە مایەی قێز و سەرسوڕمانیش ئەوە بوو کە دادوەرە کەنەدییەکەش لای ئەوانی گرت. خورەمی تا ئێستا و دوای تێپەڕینی چەند ساڵێک هەر تووڕەیە دەڵێ "من خۆم دەسەڵاتی باوکێتیم هەبوو. ئەوانیش لە سەرەتاوە دەیانزانی من بۆ ئەوە هاتووم بەهادور ببەمەوە. تەنانەت هاوکاریشیان کردم. لە سەرووی هەموو ئەوەشەوە من هەرگیز ڕێم بەموجاهیدین نەداوە کوڕەکەم ببەنە کەنەدا".

لە تشرینی دووەمی ۱۹۹۹ دادوەرێکی هۆڵەندی لەگەڵ ئەو بڕیارەدا کۆک بوو. بەهادوریش پێش چەند ساتێکی کەم لە دادگەکە پێوەندیی تەلەفۆنیی لەگەڵ دایکە بەخودانکەرەکەیدا کردبوو، لە بەردەم دادوەرەکە ڕای گەیاند ئەو دەیەوێ بگەڕێتەوە لای ئەو ژنە. خورەمی بەڕفاندنی کوڕی خۆی تاوانبار کرا و بڕیار درا بەبڕێک پارە قەرەبووی ئەو دایک و باوکە شیرییەکە بداتەوە کە توانییان بەزانیاریی ساختە سەرپەرشتیاریی کوڕەکەی بەدەست بهێنن. لەو کاتەوە مانگانە بڕی ۱۵۰ تا ۲۰۰ یۆرۆ لە مووچەکەی (کرێکاری بواری کۆمەڵایەتییە) دەبڕێ و گومانی ئەوەی هەیە ئەو پارەیە بەموجاهیدین دەدرێ.

خورەمی بەدڵساردییەوە دەڵێ "زۆر زانیاریی هەڵە هەن کە ئەو دادوەرە گەمژەیە نەیدیون"، دوای ئەمە کۆمەڵێ زانیاریی زۆر لەو فایلە گەورەیەی دەستی پێشکێش دەکات. جاربەجارێکیش دەست بۆ کتێبی یاسای تاوان دەبات و پێم دەڵێ ئەو مادەیە بخوێنەوە کە بۆ پرسەکەی ئەو گرینگە. مێژوو و شوێنی لە دایکبوونەکەی بەهادور ئەوەی لە بەڵگەنامە کەندییەکاندا و دواتر لە هۆڵەندا بەکار هاتووە هەڵەیە. ئەو لە ئیستانبووڵ لە دایک بووە نەک لە تاران، ئەو برازای شافی نییە، لە ئێرانەوە نەهاتبوو بگرە لە عێراقەوە هاتبووە کەنەدا، دایک و باوکی لە ئێران ناژین بگرە لە عێراقدا دەژین. ئەم ڕاستییەش زۆر ڕوون دەبێتەوە بەوەی لەیلای دایکی بەهادور لە کانوونی دووەمی ۲۰۰۰دا – خورەمی پێی وایە موجاهیدین ئەم کارەیان بەزۆر پێی کردووە – لە عێراقەوە نامەیەکی پشتگیریی ئاراستەی دایک و باوکە بەخودانکەرەکە کردووە و نامەکە پوول و مۆری عێراقی بەسەرەوەیە. ئەمەش لە کاتێکدایە کە تەنیا

چەند مانگێک پێش ئەوە گوتبووی ئەوان نازانن دایکی بەهادور لە کوێیە.

لە کاتی ئەنجامدانی پرۆسە یاساییەکەدا هەڵەی زۆر رووی دا. یەکەمیان ئەوە بوو خورەمی درەنگ زانی دادوەرە کەنەدییەکە مافی رەتکردنەوەی بڕیارەکەی لە کۆتایی ١٩٩٩دا پێی دابوو. دوای ئەوە دەرکەوت کەوا بۆ ماوەی دوو هەفتە بۆی هەبوو داوایەک لە دژی بڕیارە هۆڵەندییەکە پێشکێش بکات کە دەیگوت پێویستە منداڵەکە بگەڕێتەوە کەنەدا، بەڵام پارێزەرەکە بەهەڵە تێ دەگا و وا دەزانێ ماوەکە دوو مانگە. ئێستاش بڕیارەکە هەڵناوەشێتەوە. لە سەرەوەی هەموو ئەمەشەوە راپۆرتێکی سایکۆلۆجی (کە دەڵێ بۆ رێ گرتن لە هیچ کێشەیەکی سایکۆلۆجی پێویستە بەهادور لەگەڵ باوکی خۆیدا ژیان بەسەر ببات) لەگەڵ بەڵگەیەکی ئێرانی کە دەڵێ بەپێی یاسای ئێران خورەمی سەرپەرشتیاری بەهادورە، هەردووکیان درەنگ گەیشتن و فریای داوای هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکە نەکەوتن.

دوای داوایەکی تریش کە پارێزەری شافی لە ئەیلوولی ٢٠٠٢دا پێشکێشی کرد ١٨ مانگ زیندانی و راگرتنی شەش مانگی حوکمەکە بەسەر خورەمیدا سەپێنرا.

لەبەرئەوەی دادوەر بڕیاری دابوو بەهادور بگەڕێتەوە کەنەدا، خورەمی لە پایزی ١٩٩٩دا بڕیاری دا خۆی و کوڕەکەی خۆیان بشارنەوە. لە شوێنێکی نهێنییەوە لە هۆڵەندا بەهادور لەو قسانەی لە بەردەم دادوەر کردبوونی پەشیمانیی دەربڕی و گوتی خورەمی باشە و بەباشی ئاگاداریی دەکات و ئەمیش زۆری خۆش گەرەکە، ئەم راستییانەی لە کاتێکی درەنگدا بۆ ئاشکرا بووە. "پێم گوت: "من نامەوێ بچمە کەنەدا و دەمەوێ لەگەڵ تۆ بمێنمەوە". بەڵام ئەو گوتی: "ئێستا زۆر درەنگە و دادوەر بڕیاری خۆی داوە"".

حەبیب خورەمی بۆی دەرکەوت کە ناتوانێ لە حەشارگەدا بمێنێتەوە تا ئەو کاتەی بڕیارەکە پووچەڵ دەبێتەوە. بۆیە لە تشرینی دووەمی ١٩٩٩ کوڕەکەی رەوانەی لای کەسوکاری لە ناوچە کوردنشینەکانی ئێران دەکات. ئەمە کارێکی سەرسوڕهێنەرە بۆ کۆنە ئەندامێکی موجاهیدینی خەلق کە ئێران بەخراپترین بەشی ئەم جیهانە دەزانێ. بەڵام لە کاتێکدا دەسەڵات دەستی بەناقرگەیەوە گرتبێت خورەمی ناتوانێ بیر لە شوێنێک بکاتەوە لە ئێران باشتر بێت و بەرای ئەو هەر چۆنێک بێت ئێرانی

ئەمرۆ بۆ کورەکەی زۆر باشتر و ئارامترە لەوەی بکەوێتە دەستی موجاهیدینەوە.

بۆ بەهادور کارێکی ئاسان نابێت جارێکی تر بگوازرێتەوە ولاتێکی تر. لەوێ دەبێ فێری خوێندن و نووسینی فارسی بێت و زمانە هۆلەندییەکە لە بیر بکات. هەروەها دەبێ لەگەڵ ژیانی ناو خێزانی گەورەدا ڕابێت کە ئێوارە دوورودرێژەکان بەیەکەوە لەسەر مافوور لە یەکێ لە خانووەکانیان بەسەر دەبەن و بەیەکەوە گەمە دەکەن و پێدەکەنن، قسە دەکەن، گفتوگۆ دەکەن و گوێ بەو تەلەفزیۆنە نادەن کە لە سووچێکی ژوورەکە دانراوە. دوای ماوەیەکی کورتیش لەگەڵ باپیر و داپیرەی بەتەمەن و نیوە کوێر دەچێتە لای مامی گەورەی کە ئەویش وەک کوڕی گەورەی خۆی مامەڵە لەگەڵ بەهادوردا دەکات. هیچ گومانی تێدا نییە کە ئێستە هەست دەکات لە ماڵی خۆیدایە. "ئەمە بەلای منەوە نوێ بوو، ئەم هەموو خەڵکە و خێزانێکی ڕاستەقینە. چۆن هەموو ئەمانە بەیەکەوە دەژین!".

لە قوتابخانەش باش بەڕێوە دەچێ، بەلام بەهادور زۆر حەز دەکا بگاتەوە بەباوکی و بەردەوام داوای دەکات. ئەو دەڵی "من لە نزیک باوکم شادتر دەبم. ئەوە بۆ دوارۆژم باشترە. لە هۆلەندا دەتوانی خوێندنی باشتر دەستەبەر بکەیت". بەهادور حەز دەکا لە هۆلەندا بخوێنێ و حەزیش دەکا ببێ بەدادوەر. "بۆ هاوکاریکردنی خەڵک. دەزانی یاسا چەند ژیانی خەڵک ڕێک دەخات".

دایکی بەهادور، لەیلا قەنبەری ڕای زۆر جیاوازی هەیە، ئەو ئەمەی بەشاندی دۆستانی ئێرانی ئازادی گوت، کە لە پایزی ٢٠٠٥دا لە کەمپی ئەشرف قسەیان لەگەڵدا کرد. من قسەکانی ئەو و حەبیب و بەهادورم بەراورد کرد بۆم دەرکەوت بەگوێدا خوێندن چەند کاریگەرە. لەیلا زۆر بەساردییەوە گوتی حەبیب بەهادوری لە چنگی دایک و باوکی لە کەنەدا ڕفاند. ئەو پێی وایە کۆنە مێردەکەی مافی خۆیەتی ئەو کارە بکات، بەلام جووتە کەنەدییەکە مافی سەرپەرشتیارییان هەیە. بۆ ئەویش کێشە نییە هەرچییەک لە بارەی مێردەکەیەوە دەگوترێ. "ئەو ئەوەندە تاوانبارە تا ئەو ڕادەیەی هەڕەشەی لە دایک و باوکە شیرییەکە کردبوو، پێی وتبوون ئەگەر واز لە کەیسەکەی خۆیان نەهێنن ناچار دەبێ بیانکوژێ...".

ئەمیش وەکو منداڵەکانی هادی شەمس حایری پێی خۆشە لە کەمپی ئەشرەفدا

بمێنێتەوە. ئەو نکۆڵی لەوە دەکات کە لە ساڵی ١٩٩١دا موجاهیدین ڕێگر بوون لەوەی لەگەڵ حەبیب و خوشکەکەیدا بڕوات. هەرچەندە لەگەڵی چووە کەمپی ڕەمادی. بەلام بۆ دوایی لەگەڵیاندا نەڕۆیشت؟ لەبەرئەوەی پیاوانی حکوومەتی ئێران لەو کەمپەدا چالاک بوون بۆیە پێی وابوو کە ناتوانێ لەوێ بمێنێتەوە و گەڕایەوە کەمپی ئەشرەف. هۆیەکی سەیرە. پێم وایە کەس ناتوانێ دەسبەرداری مێرد و منداڵەکەی بێ مەگەر موجاهیدینی خەلقی پێ گرینگتر بێ.

بەهادور هیچ گومانی نییە کێ شایانی سوپاسە بۆ ئەو بارەی ئێستای. ئەو بەبێ دڵەڕاوکێ دەڵێ "ئەمە بەهۆی موجاهیدینەوە بوو. ئەوان منیان لە باوکم جیا کردەوە. ئەگەر ئەوان نەدەبوون، ئێستا من و باوکم بەیەکەوە لە ئێران بووین". هەرچەندە ئەو زۆر لە بارەی حکوومەتی ئێرانەوە نازانێ بەلام لە بارەی موجاهیدین زۆر لەوە کەمتر دەزانێ.

ئەم بۆچوونە دەنگدانەوەی زۆری لە خێزانە گەورەکەیدا هەیە، ئەو خێزانەی پێشتر خۆیان بەلایەنگری موجاهیدین دەزانی. ئەمە بۆ زۆربەی ئیلامیش ڕاستە. زۆر لە دانیشتووان لە سێدارە دران بەگومانی پشتگیریی ئەندامانی خێزانەکانیان لە ناو موجاهیدیندا، ئەمەش دەبووە هۆی زیادکردنی لایەنگرانی موجاهیدین. یەکێ لە خوشکانی حەبیب خورەمی شوێنی کەوت بۆ عێراق و دواتر ڕێکخراوەکەی بەجێ هێشت و ئێستا ئەویش لە هۆڵەندایە. هەندێکی تریان لە ئێران مانەوە و بۆ ماوەیەکی درێژ مەیلی کەمیان بۆ ڕێکخراوەکە هەبوو.

حکوومەتی ئێران هەموو خێزانەکەی بەهۆی بڕیاری حەبیب و خوشکەکەیەوە سزا دا، ئەویش بەبێبەشکردنی برا و خوشکەکانیان لە خوێندن و کارکردن بەپێی بڕوانامەکانیان. ئەوانیش ئێستا هەستێکی زۆر تاڵیان بەرامبەر موجاهیدین هەیە. هەروەک باپیرەکەیان دەڵێ "ئەوان خێزانەکەمیان ڕووخاند".

بەهادور وەک دەنگدانەوەیەکی هەستەکانی خێزانەکەی دەڵێ "من ژیانی خۆم بەقسەی قۆڕی دژ بەسوپا و ئەو شتانەوە بەفیڕۆ دا" و ئەو هەموو کۆبوونەوانەی موجاهیدینی لە تۆرنتۆ بەبیر دێتەوە کە لە کۆتاییی هەر یەکێکیاندا دەبوو تەماشای کاسێتە ڤیدیۆییەکانی ڕەجەوی بکەن. "ئەوە هەمووی کات بەفیڕۆدان بوو". هەروەها

لەو باوەڕەدایە کە دایک و باوکە بەخودانکەرەکەی هەرگیز منداڵی خۆیان نانێرنە عێراق بۆ ئەوەی شەڕ بۆ موجاهیدین بکەن - بەپێچەوانەی ئەوەی بۆ ئەو دانرابوو. "ئەوان ئەوە بەکوڕی خۆیان ناکەن، ئەوان ڕێ نادەن کوڕەکانیان لەوێ بکوژرێن".

لەگەڵ هەموو ئەمەشدا هەندێ جار حەز دەکا دووبارە دایک و باوکە بەخودانکەرەکەی ببینێتەوە. ئەو پێی ناخۆشە باوکی مانگانە بڕە پارەیەک بەوان بدات، لەگەڵ ئەوەشدا پێی وایە لە کۆتاییدا پارەکەی بۆ دەگێڕنەوە. "ئەوە پارەی باوکمە و لە کۆتاییدا بۆ من دەبێ".

فەرەح چەند جارێک بۆ ئێران تەلەفۆنی بۆی کردووە. لە قسەکانی بەهادورەوە بۆم دەرکەوت کە پێوەندییەکان قورس بوون. ئەم پێی وتووە نایەوێ بگەڕێتەوە. "ئەو دەڵێ: من دایکتم. منیش دەڵێم خێزانی ڕاستەقینەی من لێرەیە و تەنیا وەک برادەر دەتوانین من و تۆ یەکتری ببینین. من دەبێ ئەم کتێبە دابخەم. نابێ ئەو هەست بکا کە خۆشم دەوێ. ئێستاکە ئاشکرایە من کێم هەڵبژاردووە".

وەک بڵێی وانەیەکی لەبەرکراوە، ئەم پرسە دەبێ بەدرێژی لە لایەن خێزانی خوڕەمییەوە گفتوگۆی لەسەر بکرێ. ئەگەر لە کەنەدا بمایەتەوە ئەوا بێگومان ئێستا دەنێردرایەوە عێراق و دەبووە سەربازێکی موجاهیدین، ئەمە ڕوونە لای. "من لە لایەن باوکمەوە ڕزگار کرام".

موجاهیدین ئێستا لە ڕێی دایکییەوە کە لە عێراقە هەوڵ دەدەن بەکێشی بکەنەوە. "من بەچات قسەی لەگەڵ دەکەم" بێ مەبەست دانی بەمەدا نا. بەکارهێنانی ئینتەرنێت لە ناو موجاهیدین قەدەغەیە و تەنیا ئەگەر دووانیان بەیەکەوە بن ڕێی پێ دەدرێ. بۆیە پێ دەچێ دایکی لە خۆیەوە ئەو کارە ناکات بگرە وەک دایک و باوکانی تری ناو کەمپی ئەشرەف فەرمانی پێ دراوە بۆ ئەوەی پێوەندی لەگەڵ کوڕەکەیدا نوێ بکاتەوە و بەکێشی بکاتەوە ناو ڕێکخراوەکە. دەبێ وای لەگەڵدا بکات؟ بەهادور وەک ئەوەی بەرگری لە خۆی بکات دەڵێ "ئەو تەنیا پێم دەڵێ دەبێ کوڕێکی باش بیت".

ئەو هەست دەکا موجاهیدین پێویستی بەگەنجی وەکو ئەو هەیە، بۆیە دەڵێ "ئەگەر ئەوان دەست بەشەڕ بکەن من لە پێناوی ئێراندا شەڕ دەکەم".

دوای ماوەیەک لەیلا بێ ئەوەی هەست بکا ئەوە دەسەلمێنێ کە چاتکردنی لەگەڵ

کوڕەکەیدا نیازپاک نەبوو. ئەو بەدۆستانی ئێرانی ئازاد دەڵێ کوڕەکەی ئێستا لە ئێران لەگەڵ کەسوکاری کۆنە مێردەکەی دەژی، بەنەسرینی پووری بەهادور دەڵێ "یەکێکە لە کرێگرتە داپلۆسێنەرەکانی حکوومەت" و گلەیی دەکات و دەڵێ "وەزارەتی هەواڵگری و ئاسایشی ئێران ڕێ نادات کوڕەکەم بێتەوە ئێرە. من دەزانم ئەو حەز دەکا بێت... تەنانەت ئەوان ناهێڵن پێوەندیم پێوە بکات".

بەهادور بەمنی گوت ئەو تەنیا لە ئێران و لە ئیلام بۆ یەکەمین جار وێنەی دایکی دی بەبەرگی موجاهیدینەوە. من شانازی بەوەوە دەکەم کە ئەو ئافرەتێکە و لە ناو سوپایەکدا شەڕ دەکات. من پێم وایە قارەمانە. ئەو دەبێ قارەمانێکی بەتوانا بێ". بەهادور پێی وایە کە ئەو دایکێکی باش دەبوو. کاتێ کە پێم گوت دایکی ئەو ڕەزامەندیی نووسراوی دەربڕیوە و ئەمی داوەتە دەستی دایک و باوکە بەخودانکەرەکەی، ئەم بێدەنگ بوو. ئەمە ئەو وێنە ڕۆمانسییەی لە مێشکیدا بۆ دایکی کێشابوو دەشێوێنێ.

دەبێ ئەم حەز بکا بچێتە سەردانی دایکی؟ نە، تەنانەت بیر لەو شتەش ناکاتەوە، ئەگەر بزانێتیش ئەندامانی خێزانەکەی بەکۆمەڵ لە ئێرانەوە بەرەو کەمپی ئەشرەف دەچن. "من نامەوێ ڕابردووم بەبیر بێتەوە. هەست بەئازارێکی زۆر دەکەم".

لە کۆتاییدا حەبیب خوڕەمی و کوڕەکەی دادوەریان لەگەڵدا کرا. لە دادگەی پێداچوونەوەدا گەیشتە ئەو ئەنجامەی دەیخواست: دادوەری شاری لووڤاردنی باکوری هۆڵەندا لە کۆتاییی ساڵی ٢٠٠٦دا بڕیاری دا کە حەبیب کوڕی خۆی نەڕفاندووە و بێ تاوانە. هەموو ئەوەی ماوە ئەوەیە کە چاوەڕوانی گەڕانەوەی بەهادور بێت لە ناوەڕاستی ساڵی ٢٠٠٧ لە ئێران بگەڕێتەوە و لەگەڵ باوکی و باوەژنی و دیاکۆی کوڕیان بەیەک شاد ببنەوە.

دوای ناردنی منداڵەکان بۆ دەرەوە لە ساڵی ١٩٩١دا هاتنی هیچ منداڵێک مایەی پێشوازی نەبوو و پێویست بوو دەسبەرداری منداڵ بن. ئەمە بەسەر ئیلاهی و ئەلمیرادا هات کاتێ لە ساڵی ١٩٩٤ دایک و باوکیان لە هۆڵەندا پێوەندییان بەموجاهیدینی خەلقەوە کرد. دوای ئەوە بۆ ماوەی شەش ساڵ لە یەکتر جیا کرانەوە. کاتێ قسەم لەگەڵ ئیلاهیی کچە گەورەدا کرد باسی ئەو هەستە ئاڵۆزانەی

خۆی کرد کە پێش گەیشتنەوە بەدایکی بەر لە ساڵێک هەیبوو.

"دایکم بەو شێوەیە نەمابوو کە لە یادگەمدا بوو. ئەگەر لە شەقام بەلایدا تێ پەڕیمایە نەمدەناسییەوە"، ئەو بەتەلەفۆن و بەتاسەوە ئەمەی گوت. "ئەو زۆر مۆدێرنتر بوو لەوەی لە بیرم بوو. پێم وایە هێمنتریش بوو. لەو وێنانەی پێش چوونی بۆ عێراق جێی هێشتبوون زۆر جیاواز بوو. وام دەزانی یەکێ لە سەرپۆشە سوورەکانی لەسەر دەبێ".

کاسێتی چاوپێککەوتنەکەیان مەرجان مالیک پێشان دەدات دەگری و پێدەکەنێ – پرچی کورت و قاوەییە و چرایەکی مۆدێرن شوێنەکە ڕووناک دەکاتەوە – و ئەمیش بەبەردەوامی منداڵەکانی لە ئامێز دەگرێ. کچەکانیش خۆیان بەودا هەڵدەواسن، بەڵام ئاشکرایە کە نازانن چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو هەستە بەهێزانەیاندا بکەن. "سەرەتا نەمدەزانی چی بڵێم" ئیلاهی لەمەڕ یەکەم دیمانەوە وا دەڵێ. "جاری دوایی باشتر بەڕێوە چوو. ئەمجارەیان بەڕاستی توانیمان قسە بەیەکەوە بکەین".

کاتێ مەرجان لە ساڵی ٢٠٠٣ لە هۆڵەندا بوو، ڕێگەیان پێ درا پێنج جار یەکتری ببینن. "وام زانی ئەو لەگەڵمان دەمێنێتەوە"، کچە ١٤ ساڵانە نائومێدەکەی دەڵێ. بەڵام لەگەڵ یەکگرتنەوەیاندا شەڕێکی سەخت دەستی پێ کرد کە کەس نەتوانێ بیباتەوە.

ئیلاهی و ئەلمیرا لە تەمەنی شەش ساڵی و دوو ساڵیدا بوون کە مەرجان لە هۆڵەندا جێی هێشتن. لە ساڵی ١٩٩٧دا موجاهیدینی خەلق ناردیانە عێراق بۆ ئەوەی مەشق بکات و بچێ لە ئێران هێرش ئەنجام بدات. ئەم خێزانە یەکێکە لەو سەدان خێزانەی توانرا لە سەنتەرەکانی داواکەرانی مافی پەنابەری لە ئەوروپا بەکێش بکرێن بۆ ڕێکخراوەکە. کاتێ لە ساڵی ١٩٩٤ مەرجان و مێردەکەی زانییان داوای پەنابەرییان لە هۆڵەندا ڕەت کراوەتەوە و دەبێ بگەڕێنەوە ئێران، موجاهیدین پێوەندییان پێوە کردن و چیرۆکێکی نوێیان بۆ داڕشتن بۆ داواکارییەکەیان و پارێزەرێکی نوێشیان بۆیان گرت. وەک قۆناغی یەکەم خێزانەکە برانە خانەیەکی بەکۆمەڵی موجاهیدین و دواتر برانە نووسینگەی سەرەکیی هۆڵەندا لە دەنهاگ.

ڕێکخراوەکە داوای دڵسۆزیی تەواوی لێیان کرد و مەرجانی ناچار کرد نەک تەنیا

له مێردەکەی تەڵاق بدرێ بگرە له منداڵەکانیشی جیا بێتەوە. تەڵاقدانە کارێکی سەخت نەبوو، وەک مالیک دواتر وتی، لەبەرئەوەی مێردەکەی لێی دەدا. ڕێکخراوەکە بەڵێنی پێ دەدا چی تر هیچ پیاوێک ئازاری نادات. ئەم ئەو گەرەنتییەی بۆ کچەکانیشی دەوێ. "موجاهیدین ماوەی سێ ساڵ کاریان بۆ ئەوە کرد له منداڵەکانم جیام بکاتەوە. ئەمە وەکو ئەوە بوو ئێسکەکانم بشکێنن، بەڕاستی بەئازار بوو" مەرجان له ڕێی وەرگێڕێکەوە له تاران ئەمەی بەمن گوت، بەڵام ئەم وەڵامەم دوای چەندین جار دووبارەکردنەوەی پرسیاری چۆن وەک دایکێک توانی بەوە قایل بێت منداڵەکانی بەجێ بهێڵێ. "ئەوان پێشانی منیان دا که ئافرەتانی تریش ئەم کارەیان کردووە. منیش هیچم لەوان کەمتر نییە. ئەمان ناکرێ بێنە عێراق".

چەند جارێک له ئێران که له ساڵی ٢٠٠٠ەوە لەوێ دەژی دوای ئەوەی پاش هێرشە ناکامەکەی ڕێکخراوەکەی جێ هێشت، قسەم لەگەڵدا کرد. باسی ئەوەی بۆ کردم چۆن موجاهیدین توانییان بەکێشی بکەن. سەرەتا بەهەڵخەڵەتاندنی بەرپرسی داوای پەنابەری – ئەگەر هاوکاریی ڕێکخراوەکە نەبوایە ئەو لەناو دەچوو. دوای ئەوەش له ڕێی ئەو کاسێتە ڤیدیۆییانە و ئەو وێنانەیەوە که له میدیای ڕێکخراوەکەدا بڵاو کرانەوە. بۆی دەرکەوت "من ئیتر ناتوانم بچمەوە ئێران".

دابڕینی له جیهان، له خانەکانی موجاهیدیندا باسی ئەو ئەشکەنجەدانەی ئێران و باری ناهەمواری ئافرەتی لەوێ بۆ دەکرا. لێم پرسی چۆن بڕوای بەو قسانە کرد ئەوان بۆیان دەکرد. ئەو زۆر لەمێژ نەبوو ئێرانی جێ هێشتبوو و باش دەیزانی ئەو وێنەیە تەواو بەو شێوەیە نییە. ئەمەیانی بۆ زۆر دووبارەبوونەوەی ئەو قسانە و توانای بەهێزی قایلکردنی هاوڕێ نوێیەکانی گێڕایەوە. له کۆتاییدا ئەمیش بڕوای بەو قسانە هێنا، هەروەک چۆن بڕوای بەوەش هێنا که تەنیا مەسعود ڕەجەوی دەتوانێ وڵات ڕزگار بکات. "ئێمە دەبێ بیر له هەموو کچ و کوڕانی ناو ئێران بکەینەوە، ئەوان هەموویان بەشێکن لەو خێزانە ئێرانییە گەورەیەی پێویستە ئێمە هاوکاریی بکەین. ئێمە ئێستە ئامانجێکی زۆر مەزنترمان هەیە له تەنیا مانەوە بەدیار منداڵەکانی خۆمانەوە".

لەو ماوەیەدا ئەو زۆر منداڵەکانی خۆی نەدەبینی. ئەوان له ژێر چاودێریی چەند

ئافرەتێکدا بوون لە ژوورگەلێکی تایبەت بەمندالان. ئەو کاتە ڕێکخراوەکە بەکردەوە دەستی بەپرۆسەی جیاکردنەوەیان کردبوو. "هەر ئەوەتا دەمناسی" ئیلاهی کاتێ لەم بارەیەوە پرسیارم لێ کرد وای بەمن گوت. "دایکم هیچ کاتی بۆ ئێمە بەدەستەوە نەبوو. ئەو دەبوایە بڕۆیشتایە بۆ پارە کۆکردنەوە. ئەو بەفایلێکی پڕ لە وێنەوە دەربارەی ئەوەی لە ئێران ڕوو دەدات دەچووە دەرەوە".

لەپڕ ئەو ڕۆژە هات کە ئامادەکارییەکان بۆ ڕۆیشتن بەرەو ئێران تەواو کران. مالیک قایل بووە و منداڵەکانی لە هۆڵەندا نیشتەجێن. "لێیان پرسیم کەس شک دەبەم بتوانێ چاودێرییان بکات. منیش لە دەرەوەی موجاهیدین کەسم لە هۆڵەندا نەدەناسی. بۆیە ئەوان یەکێکیان هێنا".

ئیلاهی لە بارەی دایەنەکەوە دەڵێ "تا ئەو کاتەی لەگەڵ ڕێکخراوەکەدا بووین چاودێریمانی کرد". هەمدامە ئەمینی گەنج نەبوو، ٥٧ ساڵان بوو، بەڵام ئەندامێکی دڵسۆز بوو و کچێکی لە ڕێکخراوەکە بوو و دوو کوڕی بەهۆی پێوەندییان بەموجاهیدینەوە لە ئێران لە سێدارە درابوون. لە یەکێ لە خانە بەکۆمەڵەکانی ڕێکخراوەکەدا چاودێریی مندالانی دەکرد. مالیک دەڵێ "پێم وابوو دایکێکی باش دەبێ بۆ منداڵەکانم، واش بوو لەبەرئەوەی منداڵەکان بەباشی گەورە کران".

ئیلاهی و ئەلمیرا لەگەڵ دایکە نوێیەکەیاندا چوونە ماڵەکەی لە شاری زقۆلەی هۆڵەندا، ئیلاهی دوایی پێی وتم خانووەکەی زۆر بچووک بوو. بەڵام دوایی گواستیانەوە ئەپارتمانێکی گەورەتر. "زۆر بیری دایکم دەکرد و دەمویست تەلەفۆنێکم بۆ بکات. پێم سەیر بوو هیچی لە بارەوە نەبیستم. دوایی گوتم ڕەنگە نەتوانێ پێوەندیمان پێوە بکات. بەڵام ئێستا دەزانم ڕێی پێ نەدەدرا تەلەفۆنمان بۆ بکات".

دایکی لە کەمپی ئەشرەف بوو و لەوێ تەنانەت ڕێگەی پێ نەدەدرا بڵێ زۆر بیری کچەکانی دەکات. تەنانەت لەگەڵ ئافرەتانی تریش کە وەکو ئەو بوون نەدەبوو ئەو جۆرە باسانە بکات. "نەماندەوێرا باسی منداڵەکانمان بکەین، تەنانەت لەو کۆبوونەوانەش کە بۆ دانان بەوەی لەو ڕۆژەدا کردوومانە ئەو باسەمان نەدەکرد. دوای ساڵ و نیوێک چەند وێنەیەکی ئاهەنگی یادی لە دایکبوونم لە یەکێ لە کچەکانەوە پێ گەیشت. بەدەگمەن دەموێرا سەیریان بکەم. چوومە حەمامەوە بۆ

ئەوەی بتوانم بەدزییەوە تەماشایان بکەم و دوایی لە دوو توێی کتێبێکدا وێنەکانم شاردەوە".

لە سەرەتادا هەوڵی شاردنەوەیانی دەدا، بەڵام دوایی هەستی بەتاوان کرد و بەپێویستی زانی دانی پێدا بنێ. بەمەش ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی زۆر بووەوە: هێشتا خۆی بەتەواوی لەو کەسانە دانەبڕیوە کە خۆشی دەوێن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دڵسۆزی ڕێکخراوەکە و مەسعود ڕەجەوی نییە. لەبەر ئەم ناپاکییەش پلەی حزبیی پلەیەک دێتە خوارەوە.

"دوای ئەمە جاربەجار بەنهێنی وێنەکانم دەردەکرد و تەماشام دەکرد و هەرگیز بەکەسم نەگوت" بەپێکەنینێکی زۆلانەوە ئەمەی گوت. پرۆتستۆ هەبوو؟ نا، ئەمە ویستێکە کۆنترۆڵ ناکرێ و لە پاڵەپەستۆی ڕێکخراوەکە بەهێزترە.

دڵسۆزیی بۆ موجاهیدین ئەو دەمە ئاشکرا دەبێ کاتێ شووبرای مالیک لە هۆڵەندا ڕای دەگەیەنێ کەوا دەیەوێ منداڵەکان بگرێتە خۆی. ئەو دژی ئەوەیە منداڵەکان لەگەڵ کەسێکی سەر بەڕێکخراوەکەدا بژین. مالیک لەمە بەگومانە بەڵام بڕیار دەدا کە بیرۆکەیەکی باش نییە. ئەو ژنی نییە. "بۆ منیش وەک ئافرەتێکی ئێرانی مەحاڵ بوو قایل بم کچە شوونەکردووەکان لەگەڵ مامێکی بێ ژندا لە یەک ماڵدا بژین". بۆ ڕێ گرتنیش لەوەی مامەکەیان پلان و ئارەزووەکەی خۆی بەجێ بگەیەنێ موجاهیدین مالیک و مێردەکەیان بەوە قایل کرد کە سەرپەرشتیاریی ئیلاهی و ئەلمیرا ببەخشن بەهەمدامە ئەمانی – بەمەش بەموجاهیدینی خەلقیان بەخشین.

مەرجان مالیک ئێستا پێی وا نییە ئەو بڕیارەی دروست بووبێ. نەخێر کەس ناچاری نەکرد "بەڵام ئەو کاتە من خۆم نەبووم. خەڵکی تر بڕیاریان بۆم دەدا".

لەبەر هەمان ئەو هۆیانە ئەو ئێستا ترسی لە کاریگەریی موجاهیدین بەسەر منداڵەکانیدا هەیە، بەخستنە بەرچاوی ئەوەی ڕەجەوی منداڵانی موجاهیدین هەر بەگەیشتنیان بەتەمەنی ١٦ ساڵی لە ئەورووپاوە دەنێرێتە عێراق. گلەییش لە دایکە بەخودانکەرەکەی کچەکانی دەکا و دەڵێ "ئەو دەیانباتە کۆبوونەوەکانی ڕێکخراوەکە. تەنانەت لە خۆپێشاندانەکانی دژ بەدەسگیرکردنی مریەم ڕەجەوی کە ئافرەتان خۆیان تێدا دەسووتاند بەشداریی پێ کردوون!". ئاماژەش بۆ خۆپێشاندانەکانی

چەند دەوڵەتێکی ئەوروپایی لە حوزەیرانی ٢٠٠٣ دەدات کە دوو ئافرەتیان تێدا سووتان.

کە پرسیاری لێ کرا ئیلاهی گوتی ئەو پرۆسەی خۆکوشتنی نەدیوە و تەنانەت ناتوانێ جۆری کۆبوونەوەکان لەیەک جیا بکاتەوە. ئەو دەڵێ "ئەو کۆبوونەوانە جێی خۆشی نەبوو. بەڵام من پێم ناخۆش نەبوو بچم". هەروەها گوتی هەندێ ڕەنگە خۆش بن، وەک ئەو ئاهەنگانەی موزیک و خواردنی باشی ئێرانییان تێدا پێشکێش دەکرا.

کە لە مالیکم پرسی بۆ ئەو دژی ئەم شتانەیە گوتی "من نامەوێ کچەکانم بەهەمان ڕێی مندا بچن. ئەو ترسی ئەوەی هەیە بەهۆی زۆر بەگوێدا خوێندنەوە کچەکانی بەموجاهینەوە ببەسترێنەوە. "پێویستە ئەوان وەک مرۆڤی ئاسایی ژیان بەسەر بەرن".

پێ دەچێ ترسی ئەو لە جێی خۆیدا بێت. چونکە بۆم دەرکەوت کچەکانی لەو کاتەدا زۆربەی کاتی خۆیان لەگەڵ مندالانی موجاهیدین بەسەر دەبەن. ئیلاهی دەڵی کە ئەو ڕۆژنامەی هۆڵەندی ناخوێنێتەوە. کە لێم پرسی چی لە بارەی ئێرانەوە دەزانێ تەنیا ئەوەندەی پێ کرا پڕوپاگەندەی موجاهیدینم بۆ دووبارە بکاتەوە و گوتی "ژیان بۆ ئافرەت زۆر سەختە لە ئێران. خەڵک لەوێ لەسەر ڕا دەربڕین ئەشکەنجە دەدرێن و لە سێدارە دەدرێن".

نموونەی کچێکی ١٦ ساڵی هێنایەوە کە لە سێدارە دراوە، بەڵام نەیدەزانی پێشینەی ئەو چیرۆکە چییە. ئەو کچە بەوە تاوانبار کرابوو کە سێکسی لەگەڵ پیاوێکدا کردووە کە مێردی نەبووە، دەنگۆی ئەوە هەبوو پیاوەکە زۆرگێی کردووە، بەڵام ئەم زانیارییانە سوود بەئامانجەکانی موجاهیدین ناگەیەنن کە هەموو جۆرە سێکسێک بەلایانەوە قەدەغەیە. ئەوان تەنیا مەبەستیان ئەوەیە کەوا لە سێدارەدانی کچی ١٦ ساڵی لە ئێراندا شتێکی باوە. هەرچەندە تا ئێستا خەڵکانێک لە ئێران بەهۆی بیرەوە زیندانی کراون و ئەشکەنجە دەدرێن بەڵام ئەم نموونەیە تەواو جیاوازە لەو بابەتە.

لە بارەی ئەو کۆبوونەوەیەی بۆ زیندوو ڕاگرتنی یادی مەرگی دایکی کرابوو پرسیارم لە ئیلاهی کرد و ئەویش هەر ئەوەتا لە بیری مابوو. مالیک دەڵێ ئەو لە

تەلەفزیۆنی موجاهیدین کچەکانی خۆی دی لە ئاهەنگێک لە فەرەنسا بۆ یادکردنەوەی ئەو ساز درابوو. لەبەرئەوەی دەسەلاتدارانی ئێران ڕایان گەیاندبوو کەوا کردە شکستخواردووەکەی لە تاران بووە هۆی کوشتنی، بۆیە موجاهیدینیش بەزێدەڕۆییەوە ئەویان بەشەهید ناساند.

دەبێ ئیلاهی شانازی بەدایکییەوە بکات؟ ئەم پرسیارەم لێی کرد. ئەو ئێستا سەرەڕای هەموو شتێک شەهیدێکی بەڕێزە. ئەو لە وەلامدا گوتی "شانازیی پێوە ناکەم، بگرە دلگرانم".

ئەو ناتوانێ لەو ماوەیەی دوای ئەوە تێ بگات. بەخەمەوە دەلێ "دوای ئەوە وا دیار بوو لە ناکاو ڕقیان لێی هەلسا"و کە لێم پرسی هۆکارەکە چی بوو گوتی "لەبەرئەوەی چووە ناو ڕێکخراوێکی ترەوە".

لە نیسانی ٢٠٠١دا دایکی لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی لە تاران قسەی کرد و کتێبی موجاهیدینی بەڕووی خەلکدا کردەوە، ئەوانیش لە بەرامبەردا یەکسەر ئەویان لە ئەدەبیاتی خۆیاندا سڕییەوە و ئەویان وەک سیخوڕێکی ئێران ناساند. ئیلاهی دەلێ "من وام دەزانی ئەوەی ئەو کردوویەتی باشە، شەڕ بۆ ولاتەکەمان دەکات. ئێستاش هەر وای دەبینم. بەلام بەلێ، هێرشەکەی ئەو بووە هۆی چەندین کێشە". کێشەی چی؟ "ئەو لە کۆتاییدا کەوتە زیندانەوە".

بێگومان بەئیلاهی گوتراوە دایکی "سیخوڕە" و "ناپاکە". زیندانی ئێران ئاکامەکەی بۆ مەرجان باش بوو - بووە هۆی ڕزگاربوونی نەک زیندانیکردنی - ئەمەش هۆی سەرسوڕمان بوو بۆ ئیلاهی. تەواو وەک ئەو زانیارییە دژ بەیەکانەی پێی دەدران لە دایکە بەخودانکەرەکەی و دایکییەوە کە بەردەوام لە ڕێی مۆبایلەوە پێوەندیی پێوە دەکرد.

ئیلاهی زۆر حەز دەکا دایکی لەگەلیدا لە هۆلەندا بێت. بەلام بێ ئەوەی لە دایکە شیرییەکەشی جیا بێتەوە، لەبەرئەوەی "ئەو کاتە زۆر بیری دەکات". حەز دەکا ئەوان نزیکی یەک بن و "بەڕاستی پێی خۆش نییە بچێتەوە ئێران".

مەرجان مالیک لە تاران ئارامی لێ هەلگیراوە و تەنیا شتێکی کە دەیەوێ گێڕانەوەی مندالەکانیەتی. حکوومەتی ئێرانیش پشتگیریی هەولەکانی لەم بارەیەوە

دەکات و پاڵپەستۆ دەخاتە سەر هۆڵەندا بۆ ئەوەی منداڵەکان بنێریتەوە ئێران. پێ دەچێ ئەو هەست بەو ئازاری هێنان و بردنەی کچەکانی لە نێوان خۆی و دایکە بەخودانکەرەکەیاندا نەکات.

جگە لەمانە ئەم کێشەی لەگەڵ بەڕێوەچوونی داواکارییەکەی لە هۆڵەندا هەیە. مافی سەرپەرشتیاریی منداڵەکانی، دوای ئەوەی بێ شوێنێکی یاسایی نیشتەجێبوون، جێی هێشتبوون، کەوتە دەستی ڕێکخراوی سەرپەرشتیاریی هۆڵەندی (نیدۆس). ئەو وای دەبینێ ئەوان لە دژیدا کار دەکەن و تەنانەت هاوکاریی موجاهیدینیش دەکەن، لەبەرئەوەی لەو کاتەی لە هۆڵەندا بوو تەنیا پێنج جار هێشتیان منداڵەکانی ببینێ.

کە لە قسەکەرێکی نیدۆسم پرسی بۆمی ڕوون کردەوە "ڕەنگە لەبەرئەوە بێت چاودێرەکە وتبێتی ئەو کارە پاڵەپەستۆی زیادی لێ دەکەوێتەوە". ئەو دەڵێ بۆ نیدۆس "بەرژەوەندیی منداڵەکە دەبێ بەجیا لە گرینگیی سیاسی سەیر بکرێ، ئەگەر وا نەکات ئەوە ڕێکخراوەکە دەبێتە بەشێک لەو شەڕە. ئێمە لەسەر بنەمای بێلایەنی لە لایەن وەزارەتی دادەوە بۆ ئەم کارە دەستنیشان کراوین".

ئاماژە بۆ ئەوەش دەکا کەوا لە ساڵی ١٩٩١ شەپۆلێکی منداڵانی موجاهیدین ڕوویان لە ڕۆژئاوا کرد، ڕێکخراوەکە دژ بەویستی موجاهیدین سەرپەرشتیاریی ئەو منداڵانەی بۆ خۆی وەرگرت. "مەبەستی ئێمە پاراستنی منداڵە".

لەبەرئەوەی "لە بەرژەوەندیی دوو منداڵی بچکۆلەدا نەبوو" نیدۆس ڕێی نەدا قسە لەگەڵ ئیلاهی و ئەلمیرادا بکەم. هەرچەندە ئیلاهی لای خۆیەوە بڕیاری دابوو کەی دایکی باسی ئەو گفتوگۆیەی نێوان من و ئەوی لە تاران لەسەر ئەم بۆ کرد ئەو کاتە قسە بکات. ئەو ڕێم پێ دەدا بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵدا بکەم و سەرەتا بەتووڕەیی قسە دەکات و دواتر ژیرانەتر باسی ویستی گەیشتنەوەی بەدایکیم بۆ دەکات.

مالیک پارێزەرێکی بەکرێ گرتووە بۆ ئەوەی لە دادگەکانی هۆڵەندا داوای گێڕانەوەی مافی دایکێتیی بۆ بکات. لە هۆڵەندا ئەگەری ئەمە بۆ دایک زۆرە بەتایبەتی لەو کاتەدا کە مێردێکی نەبێ دژی ئەمە بووەستێ. مێردەکەی مەرجان لە کوردستانی عێراق کوژرا کاتێ کوردەکان دوای ڕووخانی بەغدا بۆ تۆڵەسەندنەوە

هێرشیان کردە سەر کەمپێکی موجاهیدین، هەندێکیش دەڵێن بەهۆی بۆمبارانی کەمپی ئەشرەف لە لایەن ئەمەریکاوە کوژرا. بەڵام ئەمە بەمەرجێک دەبێ ئەگەر بتوانێ مۆڵەتی نیشتەجێبوون لە هۆڵەندا وەرگرێ و سیاسەتی هۆڵەندا بۆ یەککگرتنەوەی خێزان، ئەم خاڵە تا ڕادەیەکی زۆر بەهەند هەڵدەگرێ.

دوای ئەمە شتێکی سەیر ڕووی دا، لە ئابی ٢٠٠٥دا دۆستێکی هەردوو لامان ئیمێلێکی بۆ ناردم دەیگوت "مەرجان لە هۆڵەندایە". کاتێ دەرگەی ئەپارتمانەکەی بۆ کردمەوە لە شاری ئارنهیمی ڕۆژهەلاتی هۆڵەندا بۆنی گۆشت ئەو ناوەی تەنی بوو. ڕادیانت، یەکسەر باوەشی بەمندا کرد و کچەکانیشی وەکو ئەویان کرد. ساردی و میوەیان هەبوو. مێزەکەیان مریشک و برنجی لەسەر بوو. ئەو کاتە سێ هەفتە بوو مەرجان و کچەکانی بەیەک شاد بووبوونەوە.

لەو ماوەیەدا لە تاران شووی بەکۆنە ئەندامێکی موجاهیدین کردبوو و ئەویش دوای ماوەیەکی کورت بەرەو ئەڵمانیا هەڵاتبوو و لەوێ داوای مافی پەنابەریی کردبوو. دوای ئەوەی ئیلاهی داوای لە باڵیۆزخانەی هۆڵەندا لە تاران کردبوو دایکی بهێننەوە، لە نیسانی ٢٠٠٥دا مالیک ڤیزایەکی نوێی پێ درا بۆ ئەوەی سەردانی کچەکانی بکات. ئەمجارەیان مالیک نەوەستا. یەکسەر داوای پەنابەریی لە هۆڵەندا کرد و داوای سەندنەوەی سەرپەرشتیاریی منداڵەکانی لە نیدۆس کرد. لە زڤیلە ئیلاهی و ئەلمیرای هەڵگرت و دۆستان هاوکارییان کرد بۆ ئەوەی ماڵێک لە ئارنهیم بدۆزێتەوە کە زۆر لە بنکەی پەنابەرانی ئەڵمانیاوە دوور نییە و مێردە نوێیەکەی ئێستا لەوێیە. پێ دەچێ مێردەکەی پێوەندیی لەگەڵ کچەکاندا باش بێت.

ئێستا دەردەکەوێ کچەکان چەندیان ئازار بەم گرفتەوە چەشتووە. ئەوان لە قوتابخانە باش نین. ئەلمیرا بەشەو مێز بەخۆیدا دەکات و خراوەتە ژێر چاودێریی پەیمانگەیەکی هاوکاریی دەروونییەوە. ئەو قسە بەڕووی مەرجاندا دەداتەوە، ئەمیش بەپێی باکگراوندە ئێرانییەکەیەوە نازانێ چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات. کچەکە ئەو کێشانەی لەگەڵ دایکە شیرییەکەشیدا هەبووە. ئەویش منداڵەکانی چەند مانگێک لای ناسیاوان بەجێ دەهێشت تا بتوانێ بچێتە کەمپی ئەشرەف. کە لە ئیلاهیشم پرسی ئەوە باش بوو گوتی "زۆر خراپ نەبوو".

ئیلاهی بەمنی گوت حەز دەکات چەند ڕۆژێک بچێتە لای دایکە بەخودانکەرەکەی. بەڵام مالیک ناتوانێ بەمە قایل بێ و دەڵێ "دەترسم دووبارە موجاهیدین دەستیان بەسەردا بگرنەوە". ئیلاهی کڕ و گوێڕایەڵە و حەز ناکات گوێی لە یەک وشەی خراپ لە بارەی دایکە بەخودانکەرەکەیەوە بێت ئەمەش وا دەکا بۆ موجاهیدین ئامانجێکی ئاسان بێت.

ئەمە یەکێکە لەو هۆکارانەی وایان لە مەرجان کرد لە ناوەڕاستی ۲۰۰۷دا بڕیار بدات بەتەواوی خێزانەکەیەوە بگەڕێتەوە ئێران و وەک دەڵێ "لەوێ هەموو خێزانەکەم هی خۆمە". ئیلاهی تەلەفۆنەکە هەڵدەگرێ و دەڵێ "من ئێستا لە گوندێکی بچووک دەژیم و ئەمە بەتەنیا زۆر سەختە. لە ئێران دەتوانم قسە لەگەڵ خەڵکەکەی بکەم". وا دەردەکەوێ ئەم کچە لەپڕ گەورە بووبێت "دایکم خەمبارە". ئەو و خوشکەکەی ئێستا بەئارامی دەژین. بەم زووانەش دەچنە قوتابخانە و بەدڵنیاییەوە دەڵێ "فارسییەکەم بایی ئەوەندە باشە".

کە مەرجان خۆی تەلەفۆنەکە هەڵدەگرێ هۆکاری ڕاستەقینە ئاشکرا دەبێ. ئەو توانیی مافی نیشتەجێبوون لە هۆڵەندا وەرگرێ بەڵام مێردە نوێیەکەی (١ئێف)ی وەرگرت کە لە هۆڵەندا بەو پەنابەرانە دەدرێ تاوانی جەنگیان کردووە و مافی مرۆڤیان پێشێل کردووە. بەم شێوەیەش ڕێی پێ دەدرێ لە هۆڵەندا بێت بەڵام بۆی نییە لە سنوور بپەڕێتەوە و مەترسیی ئەوەش هەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان تاوانبار بکرێ. موجاهیدینیش بەردەوامن لە ڕاونانی مەرجان مالیک و ئەوانیش یەکێکن لە هۆکارەکانی بێبەشکردنی مێردەکەی لە مافی پەنابەری. گەڕانەوە بۆ ئێران واتە دابڕانی یەکجاری لە موجاهیدین بۆیە پێی وایە "لە ئێران هیچ کێشەیەکم نابێ".

مەرجان دەزانێ ئەگەر منداڵەکانی بەکەسانی دڵسۆزی ڕێکخراوەکە بسپێرێ ئەوا موجاهیدین کاریگەریی زۆریان لە سەریان دەبێ. ئەو بەردەوام ترسی ئەوەی هەبوو لە ناکاو موجاهیدین کچەکەی ڕەوانەی عێراق بکەنەوە یان هەر وڵاتێکی تر کە دوای ڕووخانی بەغدا بڕیاری لەسەر درابێ. لەگەڵ ئەمەشدا ئاشکرایە زۆر لە گەنجان لەوێ ناگیرسێنەوە و ڕێگەی گەڕانەوەشیان بۆ ڕۆئاوا لێ دەگیرێ. یاسر عیزەتی یەکێکە لەو خەڵکە کەمەی توانیویانە هەڵێن. بەلای کەمیشەوە یەک کچ کە ناوی ئالان

محەمەدی بوو و لە ئەڵمانیا گەورە بووبوو، لە کەمپی ئەشرەفدا خۆی کوشت.

موجاهیدین ڕێیەکی دووریان دەبڕی بۆ ئەوەی منداڵەکان بهێننەوە کەمپی ئەشرەف. باوک و دایکی منداڵەکانیشیان بۆ ئەو مەبەستە بەکار دەهێنا. نەسرین دادخان، تەمەنی ٢٣ ساڵە و دایک و باوکی ئەندامن لە موجاهیدین ئەمەی چێشتووە.

نەسرین لەگەڵ باپیر و داپیری لە ئێران گەورە دەبێ. لە ئەسفەهان بەمنی گوت کەوا ئەو توانیی لە منداڵ دزینەکەی ڕەجەوی خۆی ڕزگار بکات بەڵام تا ئێستا موجاهیدین دەست لە ژیانی وەردەدەن. لەسەر ڕۆخی کورسییەکەی دانیشتووە و جاربەجارێ سەیرێکی ئەو پەڕەیە دەکات کە تێبینییەکانی خۆی تێدا نووسیوە، تەنیا بۆ ئەوەی دوای ئەوە دووبارە چاوی هەڵێنێ و سەیری من بکاتەوە.

ئەندازیاری کارەبایە و زیرەکە و ئافرەتێکی گەنجە و بڕوای بەخۆی هەیە. ئەمە لە جلوبەرگەکەیدا دەردەکەوێ کە بەگوێرەی تێگەیشتنی نوێی ئێرانە بۆ جلوبەرگ: کراسێکی سپی و پانتۆڵێکی لۆکە و لەسەر ئەمانەوە چاکەتێکی تەنکی ڕەش و کورت و تەنگ. پرچە ڕەشەکەی لە ژێر ئەو سەرپۆشە شل بەستراوە ڕەشەی سەرییەوە دەردەکەوێ. زەنگی مۆبایلەکەشی چەند جارێک گفتوگۆکەمان پێ دەبڕێ و ئەویش بەنەرمی و گەرمییەوە وەڵام دەداتەوە.

تەمەنی نەسرین دوو ساڵ بوو کە خومەینی ساڵی ١٩٨٣ دایکی لە سێدارە دا و باوکی لە زیندانی ئەڤینی تاران ڕای کرد و ماوەیەک لە پاریس وەک ئەندامی ئەنجوومەنی بەرگریی نیشتمانیی ئێران کاری بۆ موجاهیدین کرد. مامێکیشی لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا بەهۆی سۆزدارییەوە بۆ موجاهیدین لە سێدارە درا.

باپیر و داپیری، ئەویان لە ئەسفەهان پەروەردە کرد. "تا تەمەنم گەیشتە دە ساڵ، کەس لە ماڵەوە باسی موجاهیدین و پێوەندیی دایک و باوکمی بەوانەوە نەدەکرد. بۆیە منیش لەو بارەیەوە بێدەنگ بووم و لە ناکاو هەموو شتێکیان پێم وت". ماڵەوەیان بوونەتە دوو بەش، یەکێکیان نەرێنییە و دژی ڕۆڵی موجاهیدینە لە شەڕی دژ بەعێراق و ئامانجەکانی ڕێکخراوەکەیە. ئەوەی تریشیان باوک و دایکی نەسرین بەخەڵکی ئازا دەناسێن. ئەم ئاڵۆزییە نەسرین تووشی گومان دەکات سەرەڕای ئەمەش ڕێکخراوەکە خۆی کار بۆ بەرگریی هەتاهەتایی لە ئێراندا دەکات.

که تەمەنی گەیشتە ١٤ ساڵ بۆ یەکەمین جار گوێی لە دەنگی باوکی بوو. دەربارەی ئەو پێوەندییە تەلەفۆنییەی لەگەڵیدا کرا دەڵێ "وام زانی گاڵتەم لەگەڵدا دەکەن. پیاوێک گوتی: تۆ نەسرینی؟ من باوکتم". داپیری تەلەفۆنەکەی لێ وەردەگرێ. "داپیرم گریا، کەواتە ئەوە" بەگریانی داپیری لە ڕاستیی ئەو قسەیە دڵنیا بوو.

"لێرەوە ژیانێکی نوێ دەست پێ دەکات، ئەو دووبارە منی دۆزییەوە". دوای سێ ساڵ چاوەڕوانی ئینجا تەلەفۆنی دووەمی کردەوە. "زۆر گرژ بووم. بەشەو لە خەومدا دەمبینی تەلەفۆن دەکا و بۆ لای تەلەفۆنەکە دەڕۆیشتم". بەڵام کە چی تر تەلەفۆنی نەکردەوە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ڕێکخراوەکەی بەلاوە لە کچەکەی گرینگترە. ئەمان یەک ناگرنەوە و ئەویش ناگەڕێتەوە ئەسفەهان.

کە تەمەنی نەسرین دەبێتە ١٩ ساڵ ئافرەتێک تەلەفۆنی بۆ دەکا و دەڵێ ناوی ئازادییە زڕکچی باوکیەتی. "ئازادی بەمنی گوت: بابە زۆر حەز دەکا بتبینێ و زۆر بیرت لێ دەکاتەوە". دوای ماوەیەک ئافرەتێکی تر بۆ گەیاندنی هەمان پەیام تەلەفۆنی بۆی کرد. "بەلامەوە سەیر بوو، بۆ بابە خۆی تەلەفۆنم بۆ ناکات. دەبێ ڕێی پێ نەدەن، یان خۆی نایەوێ؟ بۆیە بەو ئافرەتەم گوت من بڕوات پێ ناکەم".

دوای هەفتەیەک باوکی تەلەفۆن دەکات. "لێی دەپرسێ: دێی کارم لەگەڵدا بکەی؟ شووت کردووە؟" نەسرینیش تووڕە دەبێ. "پێم گوت: تۆ دەزانی من ئەم هەموو ساڵە چۆن ژیاوم، دەزانی چی دەخوێنم؟ پێم بڵێ تۆ چی لە بارەی منەوە دەزانی؟". ئەویش بێدەنگی دەکاتەوە و ئەدرێسی ئیمێلێکی دەداتێ بۆ ئەوەی بەبەردەوامی پێوەندییان هەبێ و بەڵێن دەدا کەسێک بنێرێتە لای بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵدا بکات".

ڕۆژێک بەتەنیا لە ماڵەوەیە، سێ بێگانە دێن، ئەو بەپاکستانییان دەزانێ، وێنەیەک و نامەیەکی باوکیان بۆی هێناوە. "لە نامەکەدا نووسرا بوو: "ئێستا زستانە. هیوادارم بۆ بەهار لای من بیت". ئەو فەرمووویان لێ ناکات. ئەوانیش پێی دەڵێن: باوکت لە ئوتێلەکە چاوەڕوانتە"." بەڵام ڕۆژێ دوای ئەوە کە دێن بیبەن لەگەڵیاندا ناڕوات. "من لەگەڵ خێزانەکەی باوکم شاد بووم. ئەوان زۆریان بۆ من و بۆ ئەوەی خوێندن تەواو بکەم کرد. ڕەوا نییە بەجێیان بهێڵم".

ئەو لە گۆڕینەوەی ئیمێل لەگەڵیدا بەردەوام دەبێ، بەڵام گومانی هەیە کە ئەوە

خۆیەتی ئیمێلەکانی بۆ دەنێرێ و پێی وایە ئیمێلەکانی خۆشی ناگەنە ئەو. کاتی ئەم گومانەی ئاشکرا دەکات بەئیمێل نامەیەکی بەدەست نووسراوی سکانکراوی بۆ دێت و بەوە بۆی دەردەکەوێ کە ئەو لە ئەوروپا نییە وەکو خۆی بۆی دەچوو، بگرە لە عێراقە. "لە نامەکەدا نووسیبووی: "ئەندامانی تری خێزان بێنە و وەرنە سەردانم". بۆیە پاسپۆرتم وەرگرت و لەگەڵ باپیر و داپیرم چووین بۆ کەمپی ئەشرەف".

کانوونی یەکەمی ۲۰۰۳ بوو. ئەو کات چەند کۆنە ئەندامێک ژمارەیەک گەشتیان بەپاس بۆ ئەندامانی خێزانەکانیان ساز کرد و سەردانی کەمپەکەیان کرد. بەڵام نەسرین لەگەڵ داپیر و باپیری بەجیا ڕۆیشتن. بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا باوکی خۆی دی، لە کەرەڤانێکدا بوو لە خانووانەی تایبەت بوون بۆ میوان لە کەمپی ئەشرەفدا. "وەک پیاوێکی ئاسایی و ڕێک هاتە بەرچاوم. دەشیا باوکێکی باش بوایە".

ئەو لەو کەرەڤانە نەدەژیا، بەڵام پێشی نەگوت لە کوێ دەژی. لە کاتێکدا باپیر و داپیر دەنووستن ئەوان بەدرێژاییی شەو قسەیان دەکرد. پرسیارم لێی کرد بەئاشکرا قسەتان دەکرد. ئەویش گوتی ئەوەندەی ئاگەدارە کەس گوێی بۆ قسەکانیان هەڵنەخستبوو. بەڵام کە پرسیاری لە بارەی کارەکەیەوە لێ دەکرد باوکی وەڵامی زۆر لێڵی دەدایەوە. کاسێتێکی ڤیدیۆی دەربارەی ژیانی ماڵەوەیانی لە ئێران پێشان دا بەڵام ئەو گوێی نەدایە. هەروەها ئەو زۆر گرینگیی بەژیانی ئەمیش نەدەدا.

لە بارەی ژنە نوێیەکەیەوە پرسیاری لێی کرد، ئەو ژنەی لە ژێر پاڵەپەستۆی موجاهیدیندا تەڵاقی دابوو. "لێم پرسی: "ئەگەر ئەمە دایکی منیش بوایە تەڵاقت دەدا؟" گوتی: "بەڵێ، ئەمە پرسێکی ئایدیۆلۆجییە". منیش لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەم باوکەی من چەند بێ مێشکە، پێم گوت: "ئەمە دیکتاتۆرییەتە، تەنانەت لە ئێرانیش کەس ناچار ناکرێ ژنی خۆی تەڵاق بدات یاخۆ لە منداڵی خۆی دوور بکەوێتەوە".

لەو سێ ڕۆژەی لەوێدا بوو هەر شتێکی لەگەڵ ئێراندا بەراورد بکردایە بۆی دەردەکەوت ئەوەی لە ئێراندا هەیە باشتر و ئەرێنیترە. لەوێ تەنیا یەک تەلەفزیۆن هەبوو دوو کەناڵی موجاهیدینی دەکێشا و موزیک بوونی نەبوو. "لێرە هەر منداڵێکی دە ساڵان ئەدرێسی ئیمێلی خۆی هەیە کەچی لەوێ پیاوی تەمەن چل و پەنجا ساڵ

ئەمەی نییە. لە ئێران قسەیەکمان هەیە لە بارەی ئەو کەسانەوە کە زۆر ئاگەداری دنیا نین: دەڵێی لەو دیوی چیاوە هاتووە. هەمان ئەم قسەیە دەشێ بەخەڵکی ناو موجاهیدین بگوترێ".

ئەم سەردانە زۆر شتی بۆ ڕوون کردەوە. پێشتر وای دەزانی تەلاقدانی بەزۆر درۆیە و موجاهیدین خۆیان ژیانی ناو کەمپیان هەڵبژاردووە. "بەلاّم بۆم دەرکەوت ئەمە درۆیە و ئەو خەڵکەی ئەوێ وەکو ئەوانەن کە ڕاژەی سەربازی تەواو دەکەن، بەلاّم ئەمەی ئەمان سی ساڵ درێژەی هەیە".

موجاهیدین دەیانویست سەرنجی بۆ زانکۆکەی خۆیان بەکێش بکەن، بەلاّم تەواو پێچەوانەی ئەمە ڕووی دا، ئەوان کتێبیان لە کورتیی داوە و ئەو چەند کۆمپیوتەرەی هەیانە قفڵ دراون و بەڕای ئەو خوێندنێکی وایان نییە شایانی باسکردن بێت. کە ئەمانەی بەبیر دێتەوە بەپێکەنینەوە دەڵێ "ئەوان وا تێ گەیشتبوون من لەو دیوی چیاوە هاتووم".

لەوێ چاوی بەنزیکەی سی لاوێک دەکەوێ لە تەمەنی خۆی و پێی دەڵێن ئێمە یاسا دەخوێنین، ئەوان هەموویان بەرگی فەرمیی موجاهیدینیان لەبەردا بوو و دابەش کرابوونە دوو پۆلەوە یەکێکیان پێنج کوڕی تێدا هەبوو و ئەوەی تریش بیست و پێنج کچ. ڕەنگە هەموو ئەمانە لە ڕۆئاواوە هێنرابنەوە.

نەسرین دەڵێ ئەو کچانەی چاوی پێیان کەوت "زۆر بەستەزمان بوون". ئەوان لە ژیانی ئەوێ تەنیا خواردن و خەویان هەیە و هیچی تر. "ئەوان شانازییان بەوەوە دەکرد کە هەفتەی فیلمێکی سینەماییان پێشان دەدەن و پێیان وایە ئەمە باشترین شتە لە جیهاندا!". لە کاتی گەڕانەوەشی داوایان لێی کرد هەر کاتێ هاتەوە کتێب و سیدییەکانی خۆیان بۆ بهێنێ. کچێک پێی گوت دایک و باوکی لە سێدارە دراون، ئەمیش وتی دایکی هەمان ئەو چارەنووسەی هەبووە. "لێرەدا یەکێکیان بەمنی گوت: کەواتە تۆ لە تۆڵەسەندنەوە دواکەوتووی!". زۆربەی ئەو لاوانەی ئەوێ هیچ لە بارەی کۆماری ئێرانەوە نازانن. تەنیا شتێکیش بیری لێ دەکەنەوە تۆڵەسەندنەوەیە بۆ یەکێ لە ئەندامانی خێزانیان".

باوکی زۆری لێی نەکرد بۆ مانەوە. "لەو بڕوایەدا نیم بیەوێ لەوێ بم، ئەو بەردەوام

پرسیاری ئەوەی دەکرد ئاخۆ گوزەرانم باشە". "ئەو گوتی: "من نەمدەزانی کچەکەم ئەوەندە ڕۆشنبیر و بەهرەدارە".

بەڵام ئافرەتانی کەمپەکە پاڵپەستۆیان دەخستە سەری بۆ ئەوەی بمێنێتەوە. بۆ پشتئەستوورکردنی قسەکانیان نەسرینیان بردە پێشانگەیەکی پڕ لە وێنەی فۆتۆگرافیی خەڵکێک لە ئێران لە سێدارە دراون یان ئەشکەنجە دراون. بەڵام ئەم بەئاسانی ناخەڵەتێ. "پێم وایە ئێرانی ئێستا زۆر باشترە لەو کاتەی دوای شۆڕش. بەڵام لەو کەمپە تەنیا یەک ئازادییەک نییە".

نەسرین ڕێی نەدەدا لە بارەی مانەوە قسەی لەگەڵدا بکرێ. ئەو وەکو منداڵە "دڕاوەکانی" ساڵی ۱۹۹۱ ئامادەکراو نەبوو. بۆیە قسەی خۆش و پڕوپاگەندە کاری لێ نەدەکرد.

دوای ئەوەی کەمپەکەی بەجێ هێشت جارێکی تر هیچی لە باوکییەوە نەبیست، هەرچەندە ئیمێلی بۆ دەنارد، پێی وایە ئەو ئیمێلانە نەدەگەیشتنە باوکی. "من ڕقم لە ستراتیج و ئایدیۆلۆجیای موجاهیدین دەبێتەوە. ئەگەر یەکێک کچەکەیان نەبینێ ئەوان ناتوانن وەڵامی ئیمێلەکانی بدەنەوە، نابێ بەئارەزووی خۆیان تەماشای تەلەفزیۆن بکەن، ئەمە چ جۆرە ئازادییەکە؟ مرۆڤ پێش هەموو شتێک دەبێ لە ژیانی خۆیدا ئازاد بێت ئینجا دەتوانێ باسی ئازادیی خەڵکی تر بکات".

# پشکی شەشەم

## ئەوروپا وەک تەڵەزگە و ڕێگەیەک بۆ دەربازبوون

یاسـر عـیـزەتـی بەترسـەوە هـاوار دەکـا "بەڵام ئەوان هـێـشـتـا لێـرەن لە کـۆلۆن"، بەدەستـیشـی ئامـاژە بۆ خـولگەی بەرامبـەریان دەکات. "بڕۆ تەمـاشـای کارشـتـاد، بازاڕەکە، بکە. ئەوان هێشـتـا لەوێن، پارە بۆ مـوجاهـیـدین کۆ دەکەنەوە. پۆلیسـیش هیچ ناکات. ئەوان ڕێکخراوێکی یاساغن، مەگەر وا نییە؟"

یاسر عـیزەتی خۆی وەک هەرزەیەک ئەم کـارەی دەکرد، ئەوە پیـشـەی هەمـوو ئەو منداڵانە بوو کە لە خـانەکانی مـوجاهـیدیندا بوون. لە سـووچی جادەکان دەوەسـتـا، کـەشـوهەوا چۆن بوایە گـرینگ نەبوو، تابلۆیـەکی بەدەسـتـەوە بوو پڕ بوو لـە وێنەی خـەڵکی لە سـێـدارەدراو و منداڵـی ناو چادر. دەبوایە ئەوەش بڵێ کـە ئەو منداڵانە منداڵی ئەوانەن کە لە سـێدارە دراون لە شـوێنێکن لەسـەر سنووری نێوان ئێران و کوردستانی عێراق.

لە هەمـوو کونجێکی ئەورووپادا ئەو وێنانە بۆ پارە کۆکردنەوە بەکار دەهێنران، بێ ئەوەی کەس بیر لـەوە بکاتەوە بزانـێ ئایا ڕاستە ئەو منداڵانە بوونیان هـەیە. کەسیش خۆی بەوەوە ماندوو نەدەکرد بزانـێ ئەو موجاهیدینەی خۆی بەخـەمخۆری چارەنووس و ئازاری منداڵانی ئێران پێشـان دەدات، خـۆی منـداڵانی ئێرانـی دەچەوسـێنێتـەوە و دەیانخاتە سەر جادەکان بۆ ئەوەی سواڵی بۆ بکەن.

منداڵانی کـۆنە ئەندامـانـی مـوجاهـیـدین لە هۆڵەندا بەمنـیـان گـوت کە ڕێگەیان پێ نەدەدرا بێنەوە تا ئـەو کـاتـەی بڕە پارەیەکی دیاریکراو لـەگـەڵ خـۆیانـدا نەهێننەوە. منـداڵان لە دەرۆژەدا سـەرکـەوتوو دەبن و مـوجـاهـیـدین منداڵ و پیـریان بۆ پارە پەیداکردن بەکار دەهێنان. من لە بیرمە شوێنێکی دیاریکراویان هـەبوو بۆ سواڵکردن لە نزیک کۆگەیەک لە گەڕەکی ئێمە و شێوازی پارە پەیداکردنەکەیان بەزۆر بوو.

ئەمە کاری ڕۆژانەی مەرجان مالیک بوو لە هۆڵەندا لەو ساڵانەی ئامادە دەکرا بۆ ئەوەی بچێ بۆ عێراق. "مەشقێکی دوو ڕۆژیم پێ کرا، تایبەت بوو بەو کەسانەی بەباشی فێری زمانی هۆڵەندی نەبوونە" لێرەدا باسی سەرەتاکانی دەکات لە ساڵی ١٩٩٤دا. ئەو کاتە فێری چەند فێڵێک کرا بۆ دەرهێنانی پارە لە گیرفانی خەڵک.

دوای دە ساڵ لە نووسینگەی ڕێکخراوی کۆنە ئەندامانی موجاهیدین لە تاران، کە ئەو لەوێ ئەندام بوو، چاوم پێی کەوت و داوام کرد ڕوونی بکاتەوە کارەکانی پارە پەیداکردن چی بوون.

"لە ڕۆژە باشەکاندا نزیکەی ١٥٠٠ گیلدەرم دەبردەوە، بەڵام بەگشتی ئەوەی ڕۆژانە دەستم دەکەوت لە دەوروبەری ٨٠٠ گیلدەر بوو" ئەو بەبێ هیچ شانازییەکەوە ئەمەی گوت. بەهای یەک گیلدەری ئەو ڕۆژە بەرامبەر بەدۆلارێکی ئێستا بوو. ئەو ڕۆژانە لە نۆی بەیانییەوە تا شەشی ئێوارە کاری دەکرد و دەبوایە هەموو ئەوەی دەستی دەکەوێ بەڕێکخراوەکەی بدات، تەنانەت ئەو هاوکارییە کەمەش کە وەک داواکارێکی پەنابەریی ئێرانی لە حکوومەتی هۆڵەندای وەردەگرت.

لە ژێر پەردەی کاری خێرخوازیدا، موجاهیدین توانییان لە هەموو شوێنێکی ئەورووپاوە پارە بۆ خۆیان بەکێش بکەن. لە بەریتانیای مەزن، کە لەوێدا ئەم شێوازی سواڵکردنەیان داهێنا، بەناوی (ئێران ئەید) کاریان دەکرد و لە نەوەتەکاندا لە هۆڵەندا بەناوی (ئێس ئای ئێم) و لە ئەڵمانیا بەناوی (فلووخـتلینگسـهیلف) و لەنەرویج بەناوی (ئێم ئێس ئێف) و لە دانمارک بەناوی (ئێم ئێس ئێس) و لە هەموو شوێنەکانیش هەر یەک لۆگۆیان بەکار دەهێنا: دەستێک پارێزگاری لە ژنێک و منداڵێک دەکات. هەروەها هەموویان دەڵێن ئەوان پارە بۆ ئەو منداڵانە کۆ دەکەنەوە کە قوربانیی "دیکتاتۆریزمی ئاینیی بەرەبەری"ن لە ئێران. ئەوەش کە سەیر بوو بەلامەوە ئەو وێنانەی بەکاریان دەهێنان لە بڵاوکراوەیەکی کۆمپانیای ئێران ئەیری باڵەفڕوانیی سەر بەحکوومەتی ئێراندا هەبوون. وێنەکەش هی کۆمەڵێ منداڵ بوو وێنەگری ناسراوی ئێرانی کاوە گوڵستان، کە بەم دواییانە لە کاتی کارکردنی وەک کامێرامان بۆ BBC لە عێراق کوژرا، کۆی کردبوونەوە و وێنەی گرتبوون.

لە هۆڵەندا تەنانەت پەرلەمانی ئەو وڵاتە گفتوگۆی لەسەر ئەو شێوازە توندوتیژە

کرد کە ئەوانەی پارە کۆ دەکەنەوە دەیگرنە بەر و ڕەخنەی لێ گرت. ئەمانە لەو مەشقانەی مەرجان کردبووی فێر دەکران چۆن ئەم کارە بکەن و کتێبێکی فارسی هەبوو بۆ فێربوونی ئەم کارە لە هەموو ئەوروپادا بڵاو بوو. ئەم کتێبە ئەو کەسانەی پارە کۆ دەکەنەوە فێر دەکات چۆن قسە لەگەڵ خەڵکدا بکەن و ببنە جێی باوەڕیان.

سەرەتا ناوی ئێرانیان نەدەهێنا، بگرە بۆ دەست پێکردنی قسە لەگەڵ ئەو کەسەدا دەیانگوت "ئێمە ئەرکێکی جیهانیمان بەدەستەوەیە لە پێناوی ئەوانەی بوونەتە قوربانیی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ"، ئەگەر ئەو کەسەی قسەی لەگەڵدا دەکرێ ڕووی وەرنەگێڕا، ئەم پرسیارەی لێ دەکەن "ئاگات لێیە چی لە ئێران ڕوو دەدا؟" ئینجا بەپێی زانیاریی ئەم کەسە کە چاوەڕوان دەکرێ پارە ببەخشێ کتێبەکە دەکرێتەوە و وێنەیەکی دیاریکراوی پێشان دەدرێ. دوا ئەمە پێی دەگوترێ "لە ئێران نەوەت هەزار کەس لە سێدارە دراون کە زۆرینەیان منداڵن. لە ئێران ئافرەتی دووگیان و منداڵ لە سێدارە دەدرێن". وێنەش لە شوێنی تایبەتدا بەپێی قسەکان پێشان دەدرێن.

ئەگەر قوربانییەکە بیەوێ بەیەک یۆرۆ لەو وێنە و قسە قێزەونانە ڕزگاری بێت، نۆرەی دوا لاپەڕەی کتێبەکە دێت، پێی دەڵێن "دەتوانی چەکێکمان بۆ بنووسی". هەر بەبینینی چەکی هەزار گیلدەری یاخۆ مارکی ئەڵمانی یاخۆ پاوەنی بریتانی زۆربەی قوربانییەکان وایان لێ دەکرێ شەرم بیانگرێ و لەوە زیاتر ببەخشن کە نیازیان بوو.

نامەکانی سواڵکردنی کۆنە (ئێس ئای ئێم)ی هۆڵەندا و هەواڵنامەکانیان وا داڕێژراون کار لە خوێنەر بکەن و پڕن لە پرۆپاگەندەی موجاهیدین و وێنەیەکی باشی ئەو شتە پێشان دەدەن کە ئەندامانی ئەو ڕێکخراوە بڕوایان پێی هەیە. ئەوانە هاوکارییان دەبەخشی هەڵخەڵەتاو بوون لە لایەن کەسانێکەوە لەوان زیاتریان نەدەزانی. بۆیە لە بڵاوکراوەکانی (ئێس ئای ئێم)دا باسی لە سێدارەدانی سەد هەزار کەس و سەد و پەنجا هەزار زیندانی سیاسی کە لە ژێر ئەشکەنجەدانن و پێنج ملیۆن ئێرانی دەکرا کە وڵاتی خۆیان لە ترسا بەجێ هێشتووە. ساخکردنەوەی ئەم ژمارانە کارێکی سەختە لەبەرئەوەی هیچ ئامارێکیان لە بارەوە نییە. بەڵام کاتێ ئەو ژمارانەم لەگەڵ ژمارە ڕاستەقینەکاندا بەراورد کرد بۆم دەرکەوت موجاهیدین تا چ

ئاستێک داهێنەرن لە سەلماندنی ئەو کارە ناڕەوایانەی لە ئێراندا ئەنجام دەدرێن.

دیارە لە ساڵانی ١٩٨١ تا ١٩٨٥ کە لووتکەی لە سێدارەدانەکان لەو ماوەیەدا بوو، نزیکەی دە هەزار لە موجاهیدین کوژران. ئەوان ئەو کاتە گرینگترین گرووپی بەرهەڵستکار بوون کە خومەینی مەبەستی بوو لەناویان ببات. لە ساڵی ١٩٨٨یش دووبارە هەزاران بەرهەڵستکار کوژران و لە ساڵانی دواتر زۆر لە پیاوکوژ و تریاکچییەکان کوژران. بەڵام بەڕای من ڕێژیم چەندە پیاوکوژ بێت سەد هەزار کەس ژمارەیەکە زۆری پێوە نراوە.

بۆ ژمارەی ئەشکەنجەدراوەکانیش کارەکە سەختترە لەبەرئەوەی ئەوان دوای دەرچوونیان لە زیندان یان گەڕاونەتەوە سەر کار و ژیانی جارانیان یان وڵاتیان بەجێ هێشتووە یان بەکێش کراونەتە ناو موجاهیدینەوە. ڕاستە هەزاران لە بەرهەڵستکارانی مەلاکان گیران و بۆ ماوەگەلی کورت و درێژ کەوتنە ژێر ئەشکەنجەدانەوە بەڵام هیچ بەڵگەیەک نییە بیسەلمێنێ ژمارەی ئەمانە سەد و پەنجا هەزارە. هەمان کێشەم لەگەڵ ئەو پێنج ملیۆنەشدا هەیە کە گوایە ژمارەی ئەو کەسانەیە لە ئێران هەڵاتوون، ڕەنگە ئەمە ژمارەی هەموو ئەو ئێرانییانە بێت کە لە دەرەوەی وڵاتن جا بەهۆی باری ئابوورییەوە بێت یاخۆ بۆ خوێندن یان هەر هۆیەکی تر لەگەڵ ئەوانەشدا کە لەبەر هۆکاری سیاسی وڵاتیان بەجێ هێشتووە.

پرسیار لێرەدا ئەوەیە بۆ دەبێ کردەوە خراپەکانی ڕێژیمی ئێران پێویستیان بەوە بێ گەورە بکرێنەوە. بەڵام موجاهیدین لەوە باشتریان لا نییە و ئەو "ڕاستییانە"ی پێشتر لە ناوەوە بەکار دەهێنران تێکەڵ بەژیانیان بوو. ئەم شتە بۆ پرسی لە سێدارەدانی ئافرەتی دووگیان و منداڵانیش کە لە کتێبی "گفتوگۆی فرۆشیاران"ی سەر شەقامەکاندا هاتووە ڕاستە. لە ڕاستیدا ئەوەی لەو سەردەمە خوێناوییەدا ڕووی دا کە خومەینی دەیویست موجاهیدین قڕ بکات بەسە و بەهیچ شێوەیەک پێویست نییە وا پێشان بدرێ کە ئەو بارە تا ئێستا بەردەوامە و ئەمە بووەتە نەریتێکی هەمیشەیی ئێران.

(ئێس ئای ئێم) لە بڵاوکراوەکانیاندا لە هۆڵەندا دەڵێن ئەوان لە ئێراندا خۆیان بەخت کردووە بۆ "دابینکردنی شوێنی نیشتەجێبوون بۆ قوربانییان و فێرکردنی

منداڵان". منداڵانی بەدخۆراک و نەخۆشیش هاوکاری دەکرێن. لە دەرەوەی ئێرانیش کار بۆ بەدیهێنانی "کەشێکی سۆسیالیستی کۆمەڵایەتیی کولتووری" دەکەن کە منداڵە ئاوارەکانی ئێران "دەبرێنە ئەوێ و ڕێی پێشکەوتنیان پێ دەدرێ".

با ئەوە بخەینە لاوە کە هەر ڕێکخراوێک بەبۆنیش بگاتەوە موجاهیدینی خەلق ڕێی پێ نادرێ لە ناو ئێراندا کار بکات، بەڵام لەمەڕ ئەو پڕۆژانەی لە دەرەوە بۆ منداڵان دەکرێن هەرگیز هیچمان نەبیست. هیچ بەڵگەیەکیش نییە کە کەمترین بڕە پارە لەوەی کۆ کراوەتەوە بۆ ئەم جۆرە پڕۆژانە خەرج کرابێ. باشە بۆ چ منداڵگەلێکی خەرج دەکەن؟

لە نەوەتەکاندا یەک منداڵی ئێرانی لە کەمپەکانی پەنابەراندا نەما، بێجگە لە کەمپی پەنابەرە کوردە ئێرانییەکان لە عێراق کە زۆر لە کەمپی ئەشرەفەوە دوور نییە. سەدامیش ڕێی نەدەدا کارمەندانی دەزگاکانی فریاکەوتن بچنە کەمپی ڕەمادی، هەرچەندە ئەوان هاوڕێی ڕێژیمی عێراق بوون و نووسینگەیەکیشیان لەوێ هەبوو بەهیچ جۆرێک دیار نەبوو موجاهیدین ئارەزووی ئەم کارەیان بووبێت. کوردەکانی کەمپی ڕەمادی بەهیچ جۆرێک نایەتە بیریان تەنانەت یەک ڕێکخراوی خێرخوازیش هاوکاریی کردبن. لەگەڵ ئەم زانیارییانەدا بۆم دەرکەوت کە شەکری تاڵە ئەوەی لە بەڵاڤۆکی (ئێس ئای ئێم)دا بۆ ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٩٨ و ١٩٩٩ نووسرابوو گوایە تێچووی پارە پەیداکردن لە ساڵی ١٩٩٥ لە هۆڵەندا بەڕێژەی ٥٪ زیاد بووە و خەرجیی ڕێکخراوەکە خۆی "زۆر کەمە" تەنیا ٩.١٪ی پارەی تەرخانکراوی ئەو ساڵەیە. پەیامەکە تەنیا ئەوەیە ئەو پارەیە هیچی بەفیڕۆ ناڕوات. ڕەنگە ئەمەش ڕاست بێ لەبەرئەوەی پارەکە هەمووی بۆ شوێنی مەبەست دەچێ.

ئەوانەی کاتی خۆی ئەو کارەیان کردووە مەزەندەی کۆکردنەوەی دەیان ملیۆن یۆرۆ لە هەر ساڵێکدا دەکەن. ئەو پارەیە یەکسەر دەچووە بارەگاکانی موجاهیدینی خەلق و بۆ کڕینی ئەو جۆرە چەکانە بەکار دەهێنرا کە سەدام حوسێن نەیدەتوانی بەڕێکخراوەکەی بدات. ئەندامەکانیش هەموویان ئەمەیان دەزانی. فەرەح کەریمی نووسیویەتی "وێنەکان هەموویان ڕاستی بوون" باسی ئەو فایلانە دەکات کە لە ساڵی ١٩٨٥دا بەکاری دەهێنان بۆ ئەوەی کڕیارانی بازاڕی هامبۆرگ قایل بکات هەندێ

پارەی بدەنێ. "ئێمە پێمان نەدەگوتن ئەو پارانە بۆ خێزانی قوربانییەکان خەرج ناکرێت بگرە بۆ خەباتی چەکدارانەی ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلقە".

هۆڵەندا لە چەند ساڵێکی کەمدا سیاسەتی بەرامبەر (ئێس ئای ئێم) بەشێوەیەکی بەرچاو توند کرد. خاڵی وەرچەرخانەکەش دوابەدوای تەقینەوەکانی ١١ی ئەیلوولی نیویۆرک هات. لە ڕاپۆرتی هەواڵگریی هۆڵەندا AIVD لەسەر ساڵی ٢٠٠٣دا هاتبوو: "دەزگا هەواڵگرییە بێگانەکان و دەزگاکانی ئاسایش دڵنیان لەوەی بەلایەنی کەمەوە بەشێکی گرینگی ئەو پارەیەی (ئێس ئای ئێم) و ڕێکخراوە هاوشێوەکانی کۆیان دەکەنەوە لە لایەن ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلقەوە بەکار دەهێنرێن" کە بەپێی دەزگای هەواڵگریی هۆڵەندا ئێستا "بەتەنگژەیەکی ئابووریدا تێ دەپەڕێ". هەروەها لە وەڵامی ئەو پرسیارانەی لە ئەیلوولی ٢٠٠٤دا لە پەرلەمانی هۆڵەندا ئاراستە کران ڕون بووەوە کە AIVD لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوە لە بارەی پارەدارکردنی تیرۆر بەهۆی ڕێکخراوگەلی قازانج نەویستەوە چاودێریی (ئێس ئای ئێم) دەکات.

موجاهیدینی خەلق بووە قوربانیی خراپ بەکارهێنانی ئەو پارانەی موسڵمانان دەیانبەخشی لەلایەن قاعیدەوە. ئیسلام ئەوەی بەسەر موسڵماناندا سەپاندووە زەکات بدەن. موسڵمانە دەوڵەمەندەکانی کەنداو ڕێژەیەکیان لە داهاتی خۆیان بۆ کاری چاکە تەرخان کردبوو. بۆ ئاسانکاریی ئەم کارە حکوومەتە عەرەبەکان و هەندێ لایەنی تایبەت ژمارەیەک ڕێکخراوی خێرخوازیان دامەزراند بۆ ئەوەی پێشانی موسڵمانە دەوڵەمەندەکانی بدەن ئەو پارەیەی دەیبەخشن بەباشی خەرج دەکرێ. لەگەڵ ئەوەی هەندێ لەو ڕێکخراوانە بەڕاستی کاری باشیان دەکرد، بەڵام بەشی زۆری ئەو پارەیە لە کۆتاییدا دەکەوتە بەردەستی قاعیدە یاخۆ بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بۆ هەندێ گرووپی تری ڕادیکاڵی وەکو حەماسی فەلەستین دەچوو، کە ئەوانیش ناویان لە لیستی نێودەوڵەتیی ڕێکخراوە تیرۆریستەکاندا هەیە. کاتێ ئەمە ئاشکرا بوو چەندین کۆمیتە پێک هێنران بۆ لێکۆڵینەوە لە بارەی ڕێکخراوە خێرخوازەکان بۆ ئەوەی ئەگەر پێویستی کرد ناوەکانیان بخرێنە لیستی ڕەشەوە. دامەزراوەکانی موجاهیدینیش، وەک ئێس ئای ئێم، بوونە قوربانیی ئەو لیستانە.

حکوومەتی هۆڵەندا تەنیا لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤دا هەموو جۆرە چالاکییەکی

موجاهیدینی خەلقی قەدەغە کرد. ئەمەش ئەنجامی ئەو پاڵەپەستۆیە بوو کە پەرلەمانی هۆڵەندا خستیە سەر حکوومەت بۆ قایلبوون و کارکردن بەلیستی تیرۆریزمی یەکێتیی ئەوروپا. بەم کارەش ئێستا موجاهیدینی خەلق وەک ڕێکخراوێکی تیرۆریست لە هۆڵەندا تەماشا دەکرێ و لەو کاتەوە قەدەغە کراوە و چی تر ڕێی پێ نادرێ ئەندامی نوێ بۆ خۆی بەکێش بکات یاخۆ پارە بۆ خۆی کۆ بکاتەوە و هەر کەسێک ئەم کارانەی بۆ بکات بەیەک ساڵ زیندانکردن سزا دەدرێ. لەگەڵ ئەمەشدا کۆنە ئەندامان پێیان وایە پرۆسەی بەکێشکردنی ئەندامی نوێ بەردەوامە و وەکو جاران بەڕێوە دەچێ.

لە هەموو شوێنێکی تری ئەورووپادا گومان لە دامەزراوەکانی موجاهیدین پێش ئەم مێژووە سەری هەڵدابوو. دادوەری بەریتانیا لە ساڵی ١٩٩٧ەوە بڕیاری قەدەغەکردنی ئێران ئەیدی دابوو کە یەکێکە لەو دامەزراوانە، ئەویش دوای ئەوەی دەرکەوت ئەو پارانەی کۆیان دەکاتەوە بۆ ئەو مەبەستانە خەرج ناکرێن کە ئاشکرا کراون. مەسعوود خودابەندە کە دوای دەرچوونی لە ڕیزەکانی موجاهیدین گەڕایەوە ئینگلتەرا بەپێکەنینەوە دەڵێ "ئێستا دەزانن تاوانبارەکە من بووم". ئەو بەمنی گوت دوای ئەوەی ئەو بەرپرس بوو لە چالاکییەکانی ئێران ئەید، حکوومەتی بەریتانیا لە ساڵی ١٩٩٦دا بڕیاری دا لێکۆڵینەوە لەسەر ڕێکخراوەکە بکرێ. موجاهیدین کۆنە ئەندامێکی تر بە"ناپاکی" تاوانبار دەکەن و خودابەندە بەئارامییەکی زۆرەوە دەڵێ "دوای ئەمە وڵاتان یەک لەدوای یەک ڕێکخراوەکانی ئەو گرووپەیان قەدەغە کرد".

دەبێ چ پارەیەک کەوتبێتە ژێر دەستی ئەو دامەزراوە جۆراوجۆرانەوە. خودابەندە بەباشی ئاگەداری ئێران ئەیدە و دوا ساڵی کاری ١٩٩٧ بەنموونە دێنێتەوە "یانەکە لە نیوەی ڕێ لەو ساڵەدا داخرا، تا ئەو کاتە هەشت یان نۆ ملیۆن پاوەن کۆ کرابوونەوە. ساڵانە نزیکەی سی ملیۆن پاوەن کۆ دەکرایەوە (دەکا ٤٥ ملیۆن یۆرۆی خزمەتکارتان). ئەم ژمارەیەش کۆی ئەو پارانەیە کە بەچەک دەست دەکەوتن، بەڵام ئەوەی وەک پارەی وشکە دەهات باس نەدەکرا".

ئەم نموونەیەی بەریتانیا ناکرێ بەوەی وڵاتانی تر بەراورد بکرێ، لەو وڵاتانەدا بەپێی قسەی خودابەندە تەنیا چەند ملیۆن یۆرۆیەک کۆ دەکرانەوە. "هەروەها پارەی

عەرەبیش هەبوو. سعوودیە بۆ ماوەیەک هاوکاریی موجاهیدینی کرد، لەمەش زیاتر پارەی نەوتیش هەبوو". ئاماژە بۆ سوودەکانی پسووڵە تایبەتەکانی نەوت دەکا، کە سەدام حوسێن بەهۆیانەوە فێڵی لە ڕێککەوتنی نەوت بەخۆراک دەکرد و زۆری لەو پسووڵانە بە"دۆستانی" خۆی دەدا.

دەشێ بگوترێ لە هەموو شوێنێک ئەو موجاهیدینەی لەسەر شەقامەکان بەتابلۆیەکی پڕ وێنەوە دەبینران، نەمان. بەڵام ڕێکخراوەکە ئامادە نییە وا بەئاسانی دەستبەرداری ئەو سەرچاوە بێ ئەرکەی داهات بێت. خودابەندە دەڵێ "لە کۆڵۆن دووبارە گەڕانەوە سەر شەقامەکان". لە حوزەیرانی ٢٠٠٥دا چوار کەس لە لەندەن گیران بەگومانی کارکردن بۆ موجاهیدین و خودابەندە پێی وایە ئەمە تەنیا ڕووداوی لەو جۆرە نییە و نابێ. لە سەرەتای ٢٠٠٤دا بۆی دەردەکەوێ کە پێویستە دیسانەوە زەنگی مەترسی لێ بدات، بۆیە ئاگەداری خاچی سووری نێودەوڵەتی دەکاتەوە کە موجاهیدینی خەڵق هەوڵ دەدا دەیان هەزار قوربانیی مردوو و دەربەدەری بوومەلەرزەکەی شاری بامی باشووری ئێران بەکار بهێنێ بۆ پارە کۆکردنەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، بۆ ئەم مەبەستەش، بەبێ بەدەستهێنانی هیچ جۆرە ڕێ پێدانێک، ناوی خاچی سوور بەکار دێنن.

لە ڕۆژی دوای بوومەلەرزەکە، مریەم ڕەجەوی بانگهێشتنی بەرپرسانی باڵای لە ئەورووپا بۆ کۆبوونەوەیەک لە پاریس کرد بۆ تاوتوێکردنی چۆنیەتیی بەکارهێنانی ئەو کارەساتە بۆ بەدەستهێنانی دارایی. خودابەندە دەڵێ لەوێ بیرۆکەیەکی زیرەکانەیان داهێنا ئەویش بەکارهێنانی ناوی خاچی سوور بوو بۆ پارە کۆکردنەوە. "بەڵام کێ دەتوانێ پارەبەخشەکان لەمە ئاگەدار بکاتەوە" خودابەندە ئەمەی بەناڕەحەتییەوە گوت.

ئەم چیرۆکەی بۆ پێشاندانی ئامرازە ناشیرینەکانی ڕێکخراوەکە بۆم گێڕایەوە، ئەوان ئامادەن تراجیدیایەکی گەورەی وەک ئەوەی بام و ناوی ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیی وەک خاچی سوور زۆر بەخراپی بۆ خزمەتی خۆیان بەکار بێنن. بەڵام نابێ ئەو پارەیە بەڕاستی بۆ خەڵکی بام بێت؟ لەو کاتەدا کە حکوومەتی ئێران بەهیچ شێوەیەک پارەی موجاهیدینی ناوێت و خاچی سووریش ئامادە نییە هاوکاریی

ڕێکخراوێکی تیرۆریست بکات. خودابەندە بەبەڵگەوە دەڵێ نە.

نەمانی چالاکییەکانی سواڵکەری زیانێکی گەورە بوو بۆ موجاهیدین لە دەرەوەی عێراق. چونکە سەرەڕای گرینگیی داهاتەکەیان، ئەو چالاکییانە ئامرازی باش بوون بۆ گرێدانی خەڵک بەڕێکخراوەکەوە. بەتایبەتی لەو کاتەدا کە دەبوو لایەنگران و ئەندامانی نوێ بەسواڵکردن لە شەقامەکان دڵسۆزیی خۆیان بۆ ڕێکخراوەکە بسەلمێنن. هەروەها ئەو چالاکییانە ئامرازێک بوون بۆ سەرقاڵکردنی خەڵک کە ڕێگەیەکی باش بوو بۆ ڕێگەگرتن لەوەی ئەو خەڵکە ئەوەندە کاتیان بەدەستەوە هەبێ تا بتوانن بیر لەو بارە بکەنەوە کە تێی کەوتوون.

من سەرسام نەبووم کاتێ لە کۆتاییی ۲۰۰۵دا هەواڵی پەیدابوونی گرووپێکی نوێی ئێرانیم لە هۆڵەندا بیست، کە پارەیان بۆ پاڵپشتیی مافەکانی مرۆڤ لە ئێران کۆ دەکردەوە: دامەزراوەی ئەندامانی خێزانی ئێرانی، کە سەردانی ماڵەکەتیان دەکرد و تەلەفۆنێکیان بۆت دەکرد تا لە ڕێی سایتەکەیانەوە پارەیان پێ ببەخشی (بەلام لە ٦٠٠ یۆرۆ زیاتر بێت). ئەمانە دوای بابەتێکی یەکێ لە ڕۆژنامە هۆڵەندییەکان ئەو نیشانانەیان لە سایتەکەیان لابرد کە ئاماژەی ئاشکرا بوون لە بارەی پێوەندییان بەموجاهیدینەوە، بەلام شێواز و زانیارییەکانیان هەر بەو شێوەیە مانەوە کە لە زۆربەی سایتەکانی سەر بەڕێکخراوەکەدا بەکار دێن.

چۆن موجاهیدین دەتوانن بەم شێوەیە خۆیان حەشار بدەن لە کاتێکدا هەزاران کەس لە ئەورووپا کاریان بۆ دەکەن و جیهانی دەرەوە بەخۆشحاڵییەوە بێ ئاگایە لەو بەگوێداخوێندنەی نێو ڕێکخراوەکە؟ فەرەح کەریمی کە سیاسەتوانێکی هۆڵەندییە نووسیویەتی دەڵێ ئەوان کاری زۆریان بۆ ئەمە کرد و دەڵێ موجاهیدین لە پاریس وەک "دەوڵەتێکن لە ناو دەوڵەتێکی تردا. لە خانووگەلێکی گرانبەها، کە لە گەڕەکگەلی هێمندا بەتەنیشت یەکەوەن، سەدان کەس دەژین و کار دەکەن بەبێ ئەوەی کەس لە دەرەوە ئاگای لێیان بێ. ئەوان ڕێنوێنی کراون تا بەتەواوی ڕێز لە یاساکانی ژیانی فەرەنسا بگرن. باخچەی دەرەوەی ماڵەکانیان زۆر بەجوانی ڕێک خستووە، هەموو ڕۆژێک لەو کاتەی فەرەنسایییەکان پەنجەرەکانیان دادەخەن ئەوانیش دایان دەخەن و لە ڕۆژانی پشووودا هێمنیی تەواو دەپارێزن تا خەڵک وا بزانن ئەوانیش وەکو خەڵکی

تر چوونەتە دەرەوە بۆ سەیران". ئەوان ڕێیان پێ نەدراوە سەرنجی خەڵک بۆ خۆیان بەکێش بکەن: "سەرپێچیی یاساکانی هاتوچۆ وەک لێدانی تیشکی سوور و سواربوونی هۆیەکانی گشتیی گواستنەوە بەبێ پسووله، ئەمانە هەمووی شتگەلێکن سەرنجی نەخواستراو بەکێش دەکەن بۆیە خۆیانی لێ بەدوور دەگرن".

مەرجان مالیک یەکێک بوو لەو چواردەیەی "فوول تایم" لە هۆڵەندا بۆ موجاهیدین کاریان دەکرد، پێی گوتم کە لە نەوەتەکاندا لە جۆرێک لەو خانووە بەکۆمەڵانەدا دەژیا. کە تیایاندا ژن و پیاو و منداڵ شوێنی جیا لە یەکتریان هەبوو و ژووری خێزان وناندین و نووسینگەشیان تێدا بوو. مەرجان ئاگەداری سێ لەو ئەنجوومەنانە (ئەو ناوەی بۆ ئەو جۆرە خانووانە دانرابوو) هەبوو لە هۆڵەندا. ئەو پارەیەی کۆ دەکرایەوە دەدرایە یەکێ لەو نووسینگانە. هەروەها لەو خانووانەدا کۆبوونەوە هەفتانەکان بەڕێوە دەچوون و تیایاندا نوێترین کاسێتە ڤیدیۆییەکانی مەسعوود و مریەم ڕەجەوی پێشان دەدران. هەندێ جاریش فیلمێکی کۆن پێشان دەدرا. کۆبوونەوەی واش هەبوو لایەنگران، ئەوانەی لەو جۆرە خانووانەدا نەدەژیان، ئامادەیان دەبوون. هەروەها لە ئاهەنگەکانیش ئامادە دەبوون، لە یادە ساڵانەکانی موجاهیدین و لە نەورۆزی سەری ساڵی ئێرانیشدا کە دەکەوێتە کۆتایی مانگی ئادارەوە.

خانووە بەکۆمەڵەکان لە ناوچەکانی نیشتەجێبووندا بوون، هەر خانوویەکیش نەدەبوو لە دە کەس زیاتری تێدا بژی نەوەکو سەرنج بەکێش بکەن و ئاشکرا بێ ئەوانەی لەو خانووەدان خێزان نین. پیاوان و ژنان بەجیا لە خانوودا دەبوون. کۆنە ئەندامەکان دەڵێن ئێستاش ئەو خانووانە لە زیادبوونن و حکوومەت لێیان بێ ئاگایە.

لە ناو ئەنجوومەندا ڕۆژ بەنوێژکردن تا پێنجی بەیانی دەست پێ دەکات و ئێوارانیش بە"دانیشتنی پێشکێشکردنی ڕاپۆرتی ڕۆژانە" تەواو دەبێ. ئەم دانیشتنانە زۆر پێویستن بۆ دوورکەوتنەوە لە جیهانی دەرەوە. لەبەرئەوەی کۆنترۆڵکردن لە ئەوروپا وەکو ئەوەی عێراق بەهێز نییە لەبەر هەندێ کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵایەتی گرینگیی زیاتری دەبێ.

هیچ کەسێک نابێ بەتەنیا بچێتە دەرەوە، بگرە دەبێ هاوڕێیەکی هەبێ کە هاتەوە

راپۆرتێک لەسەر دەرچوونەکەیان پێشکێش بکات. کۆنە ئەندامێکیان کە سالآنێک لە ئەلمانیا چالاک بوو دەلّێ "تەنانەت ئەگەر سەیری پەنجەرەی دوکانێک بکەیت دەبێ باسی بکەیت و گفتوگۆی لەسەر بکرێ". کەس لە موجاهیدین شتێکی نییە هی خۆی بێت، هەموو شتێک موڵکی ڕێکخراوەکەیە. ئەو دەلّێ ئەو سەیرکردنی دوکانە بێ سوودە و تووشی لێ پرسینەوەت دەکا. "دەتەوێ شت بۆ خۆت بکڕی، دیارە لە ناخدا دڵسۆز نیت بۆ ڕێکخراوەکە؟"

لە ناو ڕێکخراوەکەدا، لە ئەوروپاش خێزان بوونی نییە. منداڵەکان هی هەمووانن و ژمارەیەک ئافرەت چاودێرییان دەکەن. دوای هاتنەوەیان لە قوتابخانەش ئیشی ناوماڵیان پێ دەکرێ وەک چێشت لێنان و پەنجەرە شوشتن.

لە فەرەنسا لە نزیک بارەگاکەیان لە ئوڤێرس سور ئۆیس موجاهیدین قوتابخانەی تایبەتیان هەیە. هەندێ لە کۆنە ئەندامەکانیان دەڵێن بەهۆی جیاکردنەوەیان لەو قوتابخانەیەدا منداڵەکان تەنانەت نازانن پارە و تەلەفۆن بەکار بێنن و هەر بەگەیشتنیشیان بەتەمەنی ١٦ ساڵی یەکسەر ڕەوانەی عێراق دەکرێن.

دەبێ ئێستا ژمارەی ئەندامانیان لە ئەوروپا چەند بێ؟ حکوومەتی هۆڵەندا لـ کۆتاییی ئەیلوولی ٢٠٠٤دا گوتی "دەیان ئەندامی چالاک و سەدان لایەنگریان هەیە" هیچ ژمارەیەکی نوێش لە بەردەستدا نییە. ئەم پرسیارەم لە مەرجان مالیک کرد ، ئەویش گوتی شانەیەکی بچووکی موجاهیدین لێرەن بەشی هۆڵەندای ڕێکخراوەک بەڕێوە دەبەن و چاودێریی پرۆسەی بەکێشکردنی ئەندامانی نوێ دەکەن. لـ سەردەمی ئەودا شانەیەک لە پێنج ئەندام پێک دەهات. هەندێ جار لە دەرەو هاوکاری دەکرێن، بۆ نموونە لەو کاتەی پێویست بکات خۆپێشاندان بکەن. دوایـ گوتی "شانە بەبەردەوامی لە گۆڕاندایە و خەڵکەکە دەگوێزرێنەوە". بۆیە کەس ماوە ئەوەی نابێ زمانی ئەو وڵاتە فێر ببێ کە کاری تێدا دەکات و بەم شێوەیە ناتوانـ پێوەندی بەکەسانی دەرەوەی ڕێکخراوەکەوە بکەن.

لایەنگرانی ڕێکخراوەکە ئازادترن، ئەوان خێزانیان هەیە و لە ماڵی خۆیاندا دەژێز زۆر جاریش منداڵانی ئەو ئەندامانەی ڕەوانەی عێراق دەکرێن لای ئەوان دادەنرێز بۆ ئەوان کۆبوونەوەی هەفتانە لە بارەگای موجاهیدین زۆر گرینگە، چونکە لەوێ د

هەواڵەکانی ڕێکخراوەکە دەزانن و دوا وتەکانی سەرکردەکانیان دەبیستن. ئەم لایەنگرانە وەک ئاپۆڕەی هەڵبژاردنەکانن: هەر کاتێ موجاهیدی بیەوێ "ماسوولکەکانی نیشان بدات" کۆیان دەکاتەوە. بۆ نموونە لە خۆپێشاندانەکاندا هەموو ئەندام و لایەنگرانی خۆیان لە گشت شوێنێکی جیهان کۆ دەکەنەوە، هەر وەکو ئەوەی لە ساڵی ١٩٩٨ لە نیویۆرک کردیان کاتێ سەرۆکی خاوەن جەماوەری ئێرانی خاتەمی، لە کۆبوونەوەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکاندا قسەی کرد. موجاهیدین پارەی بلیتی باڵەفڕ و کرێی ئوتێلیان بۆ خۆپێشاندەرەکان دا. بەم شێوەیە هەزاران کەس بەشدارییان لەو خۆپێشاندانەدا کرد. پۆلیس و میدیاکان گوتیان دوو هەزار کەس بەشدارییان کردووە و موجاهیدینیش گوتی دە هەزار کەس بوون.

ژمارە بۆ ڕێکخراوەکە گرینگە. چونکە ئەوان پێش هەموو شتێک مەبەستیانە ئەوە پێشان بدەن کەوا هێشتا خەڵکی زۆریان لەگەڵدایە، بەتایبەتی ئێستا کە زۆر لە ئەندامان بەجێی دەهێڵن. گردبوونەوەکان کەمبوونەوەی پشتگیرییان لە ئەورووپا نیشان دەدەن. بەشەکانی ڕێکخراوەکە لە هەر وڵاتێکدا زۆر گرفتیان دێتە پێش لە کۆکردنەوەی ئەو ژمارەی خۆپێشاندەرانەی سەرکردایەتی داوای دەکات. هەموو جارێک ئاڵاکان و وێنەکانی ڕەجەوی لە ژمارەی خۆپێشاندەران زیاترن.

لە حوزەیرانی ٢٠٠٤ کە لە پاریس خۆپێشاندانیان کرد توانای کۆکردنەوەی دوو هەزار کەسیان نەبوو. مەسعوود خودابەندەی ئاگەدار دەڵێ "٥.٣ ملیۆن یۆرۆیان لەو خۆپێشاندانەدا خەرج کرد. ئەگەر تۆ توانای کۆکردنەوەی خەڵکت نەبێ ناتوانی بەم جۆرە خەرجییە بڵێی کاریگەر". ئەو ژمارەی ئەندامانی ڕاستەقینە لەو خۆپێشاندانە بە٧٠٠ ئەندام دەخەمڵێنێ". ئەگەر ئەم ٧٠٠ە ژمارەی تەواوی ئەندامانی چالاک بێ لە دەرەوەی عێراق، ئەوە بۆمان دەردەکەوێ دوای داگیرکردنی عێراق لە لایەن ئەمەریکاییەکانەوە، دەرچوون لە ڕێکخراوەکە لە ئەورووپا گەیشتووەتە چ ڕادەیەک. بەڵام ڕەنگە ژمارەکە دەستکاری کرابێ چونکە ئێستا ئەندامان ناتوانن لە عێراقەوە بفڕن بۆ بەشداریکردن لە خۆپێشاندانەکان دوای ئەوەی ئەمەریکاییەکان کەمپی ئەشرەفیان خستووەتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە.

کاتێ لە ئەیلوولی ٢٠٠٤ موجاهیدین ویستیان خۆپێشاندانێک لە بەردەم نووسینگەکانی یەکێتیی ئەورووپادا لە برۆکسل ساز بکەن بۆ داواکردنی سڕینەوەی ناویان لە لیستی یەکێتیی ئەورووپا بۆ ڕێخراوە تیرۆریستەکان، بەشی بەلجیکای ڕێکخراوەکە گشت ڕێیەکی گرتە بەر. تەنانەت داوەتی کۆنە ئەندامەکانیشیان کرد و بەهۆی پلانی بلیتی بەخۆڕاییی باڵەفڕەوە توانییان ژمارەیەکی زۆری ئێرانییەکانی ئەورووپا و ئەمەریکا و کەنەدا و تەنانەت ئوستورالیاش بەکێش بکەن هەروەها تورک و ئەفغان و خەڵکی تریش بەشێوەیەکی گونجاو بۆ بەشداریکردن کۆ بکەنەوە. لە هەموو ئەمانەش سەیرتر گەیشتنی پاسێکی قوتابخانەی پڕ لە منداڵی سویدی بوو کە مامۆستاکەیان بەوە خەڵەتابوو ئەمە تاقیکردنەوەیەکی بەسوود دەبێ بۆیان. بەڵام لە ئەنجامدا تەنیا ٣٥٠٠ کەس بەلای زۆرەوە کۆبوونەوە.

لە ئاداری ٢٠٠٧ موجاهیدین تەنانەت پەنایان بردە بەر بەکرێ گرتنی نزیکەی ٦٠ ئەکتەری ئێرانی بۆ خۆپێشاندانێک لە برۆکسل بۆ هەمان پرسی لیستی تیرۆر و ڕۆژانە بەهەر یەکێ لە ئەکتەرەکان ٥٠ یۆرۆیان دەدا. ئەمانە لە ڕێی ئاژانسێکی نواندنی ئەڵمانییەوە و لە ژێر پەردەی تۆمارکردنی دیمەنێکی سینەماییدا بەکرێ گیرابوون.

لە سەرەتای تەمووزی ٢٠٠٧دا ڕێکخراوەکە خۆپێشاندانێکی لە پاریس دژی هێشتنەوەی موجاهیدین لە ناو لیستی یەکێتیی ئەورووپا بۆ ڕێکخراوە تیرۆریستەکان ڕێک خست. ئاژانسی ئەسۆشیێتد پرێس لە ڕێکخراوەکەی گواستەوە کە بەشداربووان بەپەنجا هەزار لایەنگر لە هەموو ئەورووپاوە دەخەمڵێنن. سیاسەتوانی ئەمەریکاییی لایەنگری موجاهیدین دانیال پایپس لەوێ ئامادە بوو و ژمارەکەی بەبیست هەزار دانا.

هەرچۆنێک بێت ئەم ژمارەیە لەچاو تاقیکردنەوەکانی ساڵانی پێشوودا زۆر گەورەیە. کۆنە ئەندامانی موجاهیدین ئەو وێنە ڤیدیۆییانەی سەر ئینتەرنێتیان دیبوو و سوێندیان دەخوارد کە ژمارەکە لە نۆ هەزار تێ ناپەڕێ. "لەبەرئەوەی ئەو هۆڵەی کۆبوونەوەکەی تێدا کراوە لەو ژمارەیە زیاتر ناگرێ"، ئەوان ئەمەیان بەتاقیکردنەوە بۆ ئاشکرا بووە. هەروەها ئامادەبووانیش هەموویان ئێرانی نین. لە

پاڵ ئەکتەرە بەکرێگیراوەکانی لۆس ئەنجلس، تورکی ئەورووپایان تێدایە لەگەڵ مەراکشی و ئەو پەنابەرانەی لە دەرەوەی سەنتەرەکانی داواکارانی پەنابەرین، بەداوەتێک بۆ بەسەربردنی پشوویەکی خۆڕاییی کۆتاییی هەفتە لە پاریس بەکێش کراون.

ڕۆژئاوا بۆ چەندین ساڵ باشترین شوێن بوو بۆ بەکێشکردنی شەڕکەری نوێ بۆ ڕەجەوی. لە هەفتاکان و هەشتاکاندا زۆر بەئاسانی دەتوانرا لە ناو ئەو هەموو گەنجە ئێرانییەی بۆ خوێندن لە دەرەوە بوون خەڵکێک بەکێش بکرێن. مەسعوود خودابەندە نموونەیەکی باشی ئەمەیە. ئەو لە ساڵی ١٩٧٧دا کۆمیتەیەکی پشتگیری لە موجاهیدینی خەلق لە نێو قوتابییاندا لە نیوکاسل پێک هێنا. ئەم شتە لە شارەکانی تری بەریتانیا و ئەورووپاش کرابوو.

لە نەوەتەکاندا ڕێکخراوەکە ڕووی بەرەو ئەو ئێرانییانە وەرگێڕا کە داوای پەنابەرییان دەکرد. بەتایبەتی ئەوانەی هۆکاری سیاسیی بەهێزیان نەبوو و ئەوانەی چیرۆکی وایان نەبوو بتوانن مافی پەنابەریەتیی پێ وەرگرن، ئەمانەش دەبوونە پارووپەکی ئاسان. کۆنە ئەندامانیان لە ئەڵمانیا دەڵێن ئەم کارە زۆر سەرکەوتوو بوو. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە باسی ئەوەیان کرد چۆن لە ساڵی ١٩٨٥دا توانییان نزیکەی شەش هەزار لایەنگر لەم جۆرە خەڵکە بۆ خۆیان پەیدا بکەن و لە خۆپێشاندانێکی دژ بەڕێژیمی ئێران لە بۆن بەشدارییان پێ بکەن. بەقسەی ئەوان ئەوە "گەورەترین خۆپێشاندانی موجاهیدین بوو لە ئەڵمانیا" و لام وابێ ئێستاش دوای ئەوەی چەند ساڵێکە پشتیان لە ڕێکخراوەکە کردووە، شانازی بەو کارەیانەوە دەکەن.

موجاهیدین لە ساڵی ١٩٩٤دا توانییان مەرجان مالیک و مێردەکەی لە کەمپێکی داواکەرانی پەنابەری لە هۆڵەندا بۆ خۆیان بەکێش بکەن. ئەوان ئەوەیان زانیبوو کە هەر کاتێ مەرجان منداڵی دووەمی بوو ئەوان دەردەکرێن. مالیک لە بیریەتی کە موجاهیدین لە کەمپی ئاوارەکاندا خەڵکیان هەبوو وێنەی ڕەجەوییان هەڵواسیبوو. ئەمە یەکەمین جاری بوو ئەوان بناسێ. پێم وایە ئەمە بەسەر زۆر ئێرانی تردا هات کە وەک مالیک فریان بەسیاسەتەوە نەبوو و وڵاتی خۆیان لەبەر بێکاری و بێزاری لە ڕێژیمەکەی بەجێ هێشتبوو. بەلای حکوومەتی ئێرانیشەوە ئەو خەڵکە کرابوونە سێ

ەش: ئەو ئێرانییانەی موجاهیدین دەناسن و ڕقیان لێیانە، گرووپێکی بچووک
یەنگری ڕێکخراوەکەن، زۆرینەیەک هیچ پێوەندییان بەسیاسەتەوە نییە و زۆر کەم
خۆ هیچ لە بارەیانەوە نازانن. تاران لە ڕاپۆرتەکانیدا بەمونافیقین ناوی
وجاهیدینی خەلقی دەهێنا. تەنیا ئەوانەی شارەزاییان لە سیاسەتدا هەبوو
یانزانی مەبەست لەو وشەیە چییە. مالیک ئەمەی نەدەزانی: "ئێمە سیاسەتوان
بووین".

بۆ دۆزینەوەی چارەیەک بۆ کێشەی مافی پەنابەرییەکەی مالیک نێردرایە
وسینگەی موجاهیدین لە شاری زقۆلەی هۆڵەندا. لەوێ کارەکەیان بۆی کرد و
ـرۆکێکی نوێیان بۆی دارشت و پارێزەرێکی نوێیان بۆی گرت. یەکسەریش
زانەکە توانی لەوێ بمێنێتەوە و نەگەڕێنەوە کەمپی پەنابەران.
الیک پارێزەرێکی باش و بەڕێزی بۆ گیرا. پێوەندیم بەو پارێزەرەوە کرد بۆ ئەوەی
نم ئاخۆ ئاگای لێیە لەگەڵ چ جۆرە ڕێکخراوێکدا کاری دەکرد. ئەویش گوتی
ێزەرە هۆڵەندییەکان لە نەوەتەکاندا بێ دوودڵی ئەوەیان دەکرد لەبەرئەوەی پێیان
ۆ موجاهیدینی خەلق ڕێکخراوێکی بەڕێز و یاساییە و پاڵپشتیی ئەو کەسانە
ـات کە داوای مافی پەنابەری دەکەن، ڕێکخراوێک کە پێوەندیی بەزۆر لە
ارەتەکانی هۆڵەنداوە هەبوو و بەوەزارەتی کاروباری دەرەوەشەوە. هیچ سەیر
ۆ بەلامەوە کە ئەو هیچی لە بارەی چیرۆکە دروستکراوەکانی پەنابەرانەوە
زانی چونکە کۆنە ئەندامان ئەوەیان بۆم ڕوون کردبووەوە کە ئەو چیرۆکانە زۆر
 بوون لەو ڕاستییەی بەڕاست دەهاتنە پێش چاوان.
ەرەح کەریمی لە سالانی ١٩٨٥ و ١٩٨٦دا بەرپرس بوو لە دارشتنی ئەو جۆرە
ۆکانە لە پاریس. لە ماوەی یەک ساڵدا توانی هاوکاریی نزیکەی سەد و پەنجا
 بکات لە ڕێی ئەو چیرۆکانەوە و زۆربەیان مافی نیشتەجێبوونیان وەرگرت.
ەکەشی هەر ئەو کارەی دەکرد.

ەح پێی وتم "زۆر لەوانە بەبێ یەک و دوو مافی پەنابەرییان وەرگرت. بەلام بۆ
ـتنی ڕێکخراوەکە هەموو چیرۆکەکەیان نەدەگێڕایەوە. چونکە مەبەستیان بوو
ەڵەی نێودەوڵەتی بەئامرازەکانی ئۆپەراسیۆن و چالاکییەکانی ڕێکخراوەکە

نەزانێ، هەروەها بۆ ئەوەی ئەو زانیارییانە دزە نەکەن و نەکەونە بەردەستی دەزگاکانی هەواڵگریی ئێرانەوە".

ئەو چیرۆکە ڕاستییەکانی دەگێڕایەوە بەڵام ناوەکانی دەگۆڕی و بەخۆپێشاندان و هەڵمەتەکانی پۆلیس و هێرشی چەکدارییەوە گرێی دەدان. دوای ئەوە ئەو بەشەی لە پاریس بەرپرس بوو لە دروستکردنی بەڵگەنامەی ساختەی ئێرانی بەبەڵگەنامەی لە دایکبوون و مۆڵەتی شۆفێری کارەکەی ئەمی تەواو دەکرد.

کەریمی وای دەبینێ کە دەسەلاتدارانی فەرەنسا بەتەواوی ئاگەداری ئەم کارانە بوون. "بەگشتی نزیکەی هەزار کەس هەبوون لە پاریس کاریان دەکرد" لە کتێبەکەیدا وا دەڵێ. لە کاتی قسەکردنیشماندا ئەمەی زیاد کرد: "هەروەها پێوەندییەکی ئاست بەرز لە نێوان حکوومەتی فەرەنسا و سەرکردایەتیدا هەبوو".

چیرۆکەکەی مەرجان کالیک ئەوە پێشان دەدا کە بەلای موجاهیدینەوە گرینگ نەبووە هاوکاریی داواکارانی مافی پەنابەری بکەن، ئەمە ڕای پارێزەرەکەشیەتی؛ بگرە تەنیا مەبەستیان بەکێشکردنی ئەندامی نوێ بووە. ئەو دەڵێ لە کۆبوونەوەیەکی موجاهیدیندا لە دەنهاگ وێنەی فۆتۆگراف و ڤیدیۆییان بۆی گرت، لەو کاتەوە زانی چوونەوەی بۆ وڵاتی خۆی مەحاڵە چونکە لەوێ بەساغی دەرناچێ و بەمەش بەتەواوی پشتی بەموجاهیدین بەست، چونکە ئەگەر ئەوان هاوکاریی نەکەن و مافی پەنابەری لە هۆڵەندا وەرنەگرێ جێی تری بەدەستەوە نییە بۆی بچێ.

موجاهیدین خەڵکەکەیان قایل دەکرد تا بۆ وەرگرتنی مافی پەنابەری سوود لە وێنانە وەرگرن. زۆر لە ئێرانییەکان بۆ ئەو مەبەستە بەشدارییان لە خۆپێشاندانەکانی موجاهیدیندا دەکرد. ئەو وێنانە وەک بەڵگە بەکار دەهاتن بۆ ئەوەی بڵێن بەهۆی چالاکیی سیاسییانەوە لەگەڵ ڕێکخراوێکی بەرهەڵستکار ناتوانن بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان و ئەگەر بچنەوە ئێران تووشی کێشەی زۆر گەورە دەبن. بەمە ئەمانە بەموجاهیدینەوە گرێ دەدران تەواو وەک ئەوانەی بەپاسپۆرت و بەڵگەی ساختەی موجاهیدین مافی پەنابەرییان وەردەگرت. مەرجان ناوی زۆر لەو کەسانە دەزانێ.

لەبەرئەوەی تا ئێستا لێکۆڵینەوە لەم بوارەدا نەکراوە، ژمارەی ئەو موجاهیدینانە

نەزانراوە کە لە ڕێی چیرۆکی ساختەوە پەنابەرییان بەدەست هێناوە و چیرۆکی کەریمیش بەڵگەیەکە بۆ ئەمە. لەبەرئەوەی زۆر لە کۆنە ئەندامانیش بەو شێوەیە مافی پەنابەرییان وەرگرتووە، کە لەم بارەیەوە پرسیارم لێیان دەکرد وەڵامی ڕاستیان نەدەدایەوە.

حەبیب خورەمی بەشێوەیەکی سەیر لەمە بەدەرە. ئەو لە ساڵی ١٩٩١ەوە موجاهیدینی بەجێ هێشتووە و لەو کاتەوە هەر بەهاوکاریی ئەوان دێتە هۆڵەندا و جاری یەکەم بەچیرۆکێکی ساختەوە خۆی بەدەستەوە دەدات. "لەگەڵ قاچاخچییەکی پرچ زەرد گەیشتمە باڵەفڕخانەی شیفۆل لە ئەمستەردام، خۆم و خوشکێک و زاوایەکم. موجاهیدین بڕیاریان دا بچمە هۆڵەندا. من دەمویست بچمە لای کوڕەکەم لە کەنەدا و خوشکەکەم دەیویست بچێتە لای منداڵەکەی لە بەلجیکا. چیرۆکەکەی ئێمە نیمچە ڕاستییەکی تێدا بوو، گوتمان ئێمە لە مەشهەد خۆپێشاندانمان کرد و ژنەکەم لەوێ گیرا. ژیانمان لە ئێران لە مەترسیدایە. ڕێکخراوەکە ویستی ئەمە بقۆزێتەوە بۆ ئەوەی وای نیشان بدا کە هێشتا لە ئێراندا چالاکی هەیە و ئەندامەکانی لەوێ لە مەترسیدان".

هەر زوو مافی پەنابەری وەرگرت، بەڵام بەهۆی چیرۆکەکەیەوە بەهیچ شێوەیەک نەیدەتوانی بەکوڕەکەی بگاتەوە چونکە ناتوانێ ڕوونی بکاتەوە چۆن کوڕەکەی گەیشتووەتە کەنەدا. خورەمی دوایی شتێکی کرد کەم لە داواکەرانی مافی پەنابەری بیری لێ دەکەنەوە: دەچێتە لای پۆلیسی کاروباری بێگانەکان و ڕاستییەکەیان پێ دەڵێ. "من دەمزانی کارێکی ترسناک دەکەم و ڕەنگە داننانم بەدرۆکەم ببێتە هۆی ئەوەی مافی پەنابەریم لێ بسەنرێتەوە. بەڵام هیچی تر نەبوو بیکەم و دەمویستم کوڕەکەم وەرگرمەوە. بەڵام خۆشبەختانە چیرۆکەکەم پەسند کرا".

ئاشکرایە موجاهیدین توانییان لە ساڵانی دواییدا ژمارەیەکی زۆر لە پەنابەران بەلای خۆیاندا بەکێش بکەن و هاوکاریان بوون بۆ بەدەستهێنانی ناسنامەی نوێ. ئەم کارە بەهۆی کەمبوونەوەی ژمارەی داواکەرانی مافی پەنابەرییەوە زۆر کز بوو، ئەو کەمبوونەوەیەش بەهۆی سیاسەتە توندە نوێکانی وڵاتانی ئەورووپاوە بوو لە وەرگرتنی پەنابەراندا.

لەگەڵ ئەمەشدا بەیەکجاری نەوەستان، ئەمەم لە گفتوگۆیەک لەگەڵ کەریمی لە ناوەڕاستی ٢٠٠٥دا بۆ ئاشکرا بوو کە بۆمی باس کرد چۆن دەزگای هەواڵگریی هۆڵەندا لە ٢٠٠٢دا ئاگەداری کردەوە کەوا بۆیان دەرکەوتووە موجاهیدین ناوی ئەویان بەخراپی لە پرۆسەکانی بەکێشکردنی خەڵکدا بەکار دەهێنا. وتی بەداواکەرانی مافی پەنابەرییان گوتبوو "کارەکانیان زوو تەواو دەبن لەبەرئەوەی موجاهیدین پێوەندییان بەخاتوو کەریمییەوە کردووە و ئەو کارەکەیان بۆ تەواو دەکات".

سەرکەوتوویی موجاهیدین لە بەکێشکردن و کارکردنە سەر ئەو هەموو داواکەری پەنابەرییە لە ئەورووپا جێی سەرنجە و بەبێ ئەوان ئەو کەسانە هەرگیز بەڵگەنامەی دروست و پاسپۆرتیان نەدەبوو. داواکەری پەنابەری ڕێی پێ نادرێ ئەو وڵاتە بەجێ بهێڵێ تا ئەو کاتەی بڕیار لەسەر داواکەی دەدرێ. لەگەڵ ئەمەشدا ئەوان بەوڵاتانی ئەورووپادا دەیانگێڕان و خۆپێشاندانیان پێ دەکردن و بۆ ئەم مەبەستەش سوودیان لە سنووری کراوەی نێوان وڵاتانی ئەورووپا وەردەگرت، کە بەپێی ڕێککەوتنی شینگن لە ساڵی ١٩٨٥ نزیکەی هەموو خاڵە سنوورییەکانی نێوان وڵاتانی یەکێتیی ئەورووپا هەڵگیران. مەرجان مالیک لە ساڵی ٢٠٠٦ مافی پەنابەری لە هۆڵەندا وەرگرت، بەڵام زۆر پێش ئەوە چووبووە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپا بۆ خۆپێشاندان.

تەنیا لە بابەتە تایبەتەکاندا ستۆپێک دادەنرێ. کاتێ لە ساڵی ١٩٩٩دا سەرۆک خاتەمی سەردانی فەرەنسای کرد، حکوومەتی فەرەنسا ڕێی نەدا موجاهیدین خۆپێشاندان لە دژی ئەودا بکەن و سنوورەکانی داخست، بەوەش ڕێی لە هەزاران خۆپێشاندەر گرت کە بێنە ناو وڵاتەکەوە.

فەرەح کەریمی لە کتێبەکەیدا هەندێ شتی کەم ئاشکرا دەکات. ئەو بۆی باس کردم چۆن ئەندامانی "تازەهاتوو" لە هامبۆرگەوە دەنێردرانە بارەگاکان لە پاریس بەبەکارهێنانی بەڵگەنامەی ئەو ئەندامانەی مافی پەنابەرییان هەبوو. بەردەوامیش بەشەمەندەفەری شەوانە هاتوچۆیان دەکرد چونکە بەشەو هەلی ئاشکرابوونی وێکنەچوونی ئەو کەسە لەگەڵ وێنەی سەر پاسپۆرتەکەی کەمترە.

ئەوەی لە ئەورووپا دەکرا تەنیا سەرەتای ناساندن بوو و کاری ڕاستەقینە لە

ـێـراقـدا دەكـرا. تازەهاتـووەكـان مـاوەی چەند مـانگێک لە ئەوروپا دەبوون، ئینجـا
ەوانەی عێراق دەكرانەوە، سەرەتا بۆ یەک مانگ، مەشقی سەرەتایی یەک مانگ بوو.
ایان پێ دەگوترا، گوایە دوای ئەو مانگە وەک سەربازی یەدەگ دێنەوە ئەوروپا.

لە تـەک ئەوەشـدا ئـەوان لە كـەمـپی ئەشـرەف بەكـردەنی كـۆمـەڵگەی یـەكـسـانی
ـوجاهیدین دەبینن، ئەمە بەتازەهاتووە بێگومانەكان دەگوترا. كۆمەڵگەی یەكسانیی
نیاتنراو لەسەر بیری ماركسی - ئیسلامی تا ئەمڕۆ بەشێكی گرینگی قسەكانی
ەكێشكردنە. بەڵام ڕاستیی كارەكە لە كەمپی ئەشرەفەوە دەست پێ دەكات، لەوێ
سەكردن دەربارەی گەڕانەوە نییە. پاسپۆرتەكان دیار نامێنن و دەخرێنە ناو فایلی
ـوجاهیدینەوە و تەنیا ئەو كاتە دەردەكرێن ئەگەر بۆ ئەوە پێویست بێ كەسانی تر
ەكاریان بهێنن.

دەشێ مـوجـاهیـدێكی دڵسـۆز دوای مـێـشک شـوشـتنەوەیەكی چڕوپڕ بگەڕێتـەوە
ەوروپا و بەرپرسیاریی بەشێكی بخرێتە ئەستۆ، چ بۆ كاری دیپلۆماسی یاخۆ بۆ
ئەوەی هەندێ وانەی باش بەئەندامەكانی ئەوێ بڵێتەوە. "بۆیە دەگوترێ تۆ دەچیتەوە
ەوروپا بۆ نوێكردنەوەی خوێنی شەهیدان" ئەمە قسەی كۆنە ئەندامێكە لە ئەڵمانیا.

"خـوێن نـوێكەرەوەكـان"یش زۆر ئازاد نین. پارە زۆر ترسناكـە و "سـەرچاوەی
گەندەڵییە". بۆیە ئەو ئەندامانەی لە ئەوروپان پارەی زۆر كەمیان دەدرێتێ و هەموو
ـەفتەیەک لێپرسینەوە هەیە بۆ ئەوەی بزانرێ ئەو پارەیە چی بەسەر هاتووە. ئەمەش
ای كردووە گەورە وەكو منداڵ پشت بەڕێكخراوەكەوە ببەستێ.

فەرەنسا ڕۆڵێكی تایبەتی هەبووە لە مێژووی موجاهیدینی خەلقدا. كە مەسعود
ڕەجەوی سـاڵی ١٩٨١ لە ئێـران هەڵات و چووە ئەوێ بارەگـاكـەی بووە بارەگـای
سەرەكیی ڕێكخراوەكە. تەنانەت دوای ئەوەی لە ١٩٨٦دا ناچار كرا ئەو وڵاتە بەجێ
بهێڵێ ئەو بارەگایە بۆ ماوەیەكی زۆر ڕۆڵی سەرەكیی دەبینی بەهۆی ئەو هاوكارییە
ـارابییەوە كە لە حكوومەتی فەرەنسای وەردەگرت.

دوای ئەوەی لە سـاڵی ١٩٨١ ڕەجـەوی توانی بارەگـاكـانی لە ئـەوروپادا بكاتەوە
ڕێكخراوەكە بووە ڕێكخراوێكی تەواو جیاواز لەوەی ئێران. ئەو گرووپانەی قوتابییان
كە لە هەفتاكاندا لە زۆربەی ئەو شارە ئەوروپاییانەی زانكۆیان هەبوو بۆ پشتگیریی

موجاهیدین دامەزابوون پێشکەوتوو و ژیرن. ئەوان درێژەیان بەو گفتوگۆیانە داوە کە لە سەرەتاوە لە ئێران دەستیان پێ کرد لە بارەی ئایدیۆلۆجیایەک تەنیا لەسەر بنەمای مارکسیزم دروست نەکرابێ بگرە ئاوێتەی ئیسلام کرابێ.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٨١ەوە ئەوە ئاشکرا بوو تا چەند ڕێکخراوەکە لە ناوەوە و دەرەوەی عێراقدا گەورە بووە، کاتێ کۆمیتەی بریتانی بۆ پشتگیریی موجاهیدین لە ئێران سەردانێکی بۆ ئێران ئەنجام دا. ڕەزا ڕەیسی کۆمیتە بنچینەییەکەی گۆڕی بۆ فیدراسیۆنێکی ڕێکخراوەکانی قوتابییان لە ئەوروپا و ئەمەریکا، ئەم فیدراسیۆنە ڕێکخراوێکی چالاک بوو، بەڵاڤۆکی چاپ دەکرد و بەچەندین زمان دەیوەشاند و سیمینار و کۆبوونەوەی ساز دەکرد.

سەردانەکەی تاران شەڕێکی لێ کەوتەوە. ڕەزا ڕەیسی لە کار لادرا. ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی پایەبەرزی موجاهیدین لە عێراقەوە بەرەو ئینگلتەرا کەوتنە ڕێ بۆ ئەوەی بەئەندامەکانی ئەوێ بڵێن لە ئێستا بەدواوە تەنیا کاریان ئەوە دەبێ کوێرانە دوای ڕێکخراوەکە بکەون. ئەوەی بەلامەوە سەیر بوو تەنیا ژمارەیەکی کەم لە ئەندامان بڕیاریان دا لە ڕێکخراوەکە جیا ببنەوە و زۆرینەی ئەندامان مانەوە بەبیانووی ئەوەی هێشتا زۆر ماوە بکرێ و بەدڵسۆزییەوە کاریان بۆ کرد.

کاتێ ڕەیسی گەڕایەوە لەندەن، تەنیا ئەوەی بۆ مایەوە خوێندنی خۆی تەواو بکات. بەنەبوونی ئەویش ڕێکخراوەکەی لە ڕیشەوە گۆڕا. وانە و گفتوگۆکان بەیەکجاری نەمان. لە بری ئەوەش تەنیا خۆپێشاندان لە دژی خومەینی دەکران. ئەندامەکان فەرمانیان پێ درا پارە بۆ موجاهیدین پەیدا بکەن و یەکێ لەو ڕێیانەی بۆ ئەم مەبەستە گیرانە بەر، کردنەوەی کەبابخانە بوو. هەروەها دەستیان بەداواکردنی پارە کرد بۆ پاڵەوانێکی ماراسۆنی ئێرانی، ئەم کارەش دوایی پەرەی سەند و بووە بناخەیەک بۆ ڕێکخراوی خێرخوازی ئێران ئەید.

ڕێکخراوەکە دوای ئەوەی ڕێکخراوی بیرکردنەوە و گفتوگۆ بوو بووە ڕێکخراوی کارکردن. ڕەجەوی چاوەڕوانی ئەوە بوو شوێنکەوتووانی لە بەیانی زووەوە تا شەوێکی درەنگ کاری بۆ بکەن، کەم بخەون و بێ یەک و دوو کار و ئەرکەکانی خۆیان ئەنجام بدەن. بیرکردنەوە و پرسیارکردن و تێگەیشتن تەنیا کاری

سەرکردایەتین و ئەندامانی ئاسایی بۆیان نییە خۆیان لەم شتانەدا هەڵقورتێنن. دروشمەکەشیان ئەمە بوو "تا زۆر ببەخشی شۆڕگێڕتری".

بارەگا سەرەکییەکانی ئوڤێرس سور ئۆیس، کە گەڕەکێکی دەوڵەمەندی پاریسە، دوای ساڵی ١٩٨١ لە گەشەی بەردەوامدا بوون. ئەوەی بەخانوویەکی بەسەوزایی دەورە دراوەوە دەستی پێ کرد، کە وەک نووسینگەیەک بەکار دەهات، بوو بەچەند خانوو و بەنگەڵە و نووسینگەیەک کە هەمووویان بەباخچە دەوریان درابوو. نووسینگەی تایبەت هەبوون بۆ دارایی و ناونووسکردن. دراوسێکانیان سەر بەموجاهیدین و برای ڕەجەوی بوون: ساڵح و ئەحمەد و هۆشەنگ ڕەجەوی. دوایی دوو لەو برایانە چوونە ئەمەریکا و بەلجیکا و هەرسێ براکە ئەندامی ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەرەنگاری بوون.

هادی شەمس حایری ماوەیەک لەوێ کاری کردووە. بەمنی گوت ئەو شوێنە لە هەشتاکاندا لە لایەن موجاهیدینەوە بۆ پاراستنی پێوەندی لەگەڵ ئێراندا بەکار دەهات. حکوومەتی فەرەنسا بۆ ئەم مەبەستە دوو سەد هێڵی تەلەفۆنی بۆیان دابین کردبوو. شەمس حایری دەڵێ "مەبەستمان بوو پێشانی ئێرانی بدەین کە هێشتا ماوین ئەگەرچی لەوێ بەدۆڕاوی دەرچووبووین".

لە ساڵی ١٩٨٥دا ئەو بەرپرس بوو لە ناردنی لێدوان و بەلاڤۆک بۆ ئێران. "ئێستا دەزانین ئەو کارە هەڵە بوو. زۆر لە ئێرانییەکان بەهۆی ئەو بەلاڤۆکانەوە تووشی کێشە بوون و بەتۆمەتی پێوەندی لەگەڵ موجاهیدیندا خرانە بەندیخانەوە". باشە ئەو کاتە نەیدەزانی ئەو بارەی بۆ ئێرانی دەنارد چی لێ دەکەوێتەوە؟ ئەو بەزمانی موجاهیدینەوە دەڵێ "ئەندامی باش دەبێ ئەو کارە بکا کە پێی دەگوترێ. ئەو بارە نارێکەی لەو کارە کەوتەوە ئاشکرا نەکرا. لەبەرئەوەی ئاشکراکردنی ئەو شتە مێشکت تێک دەدات و ئێمە دەبوو لە کار بەردەوام بین".

شەمس حایری بۆ ماوەی شەش مانگ لە ساڵی ١٩٨٥دا لەگەڵ ژن و منداڵەکانی لە پاریس دەژی. لەو کاتەدا ئەو بەرپرسی پارێزگای کرمانی ئێرانی بوو، بەتەلەفۆن پێوەندیی بەلایەنگرانەوە دەکرد و فەرمانی پێ دەدان بەیاننامەکانی موجاهیدین بەدەبدەبەوە بکەن و هەڵی بدەن بۆ ئەوەی بڵاو ببنەوە و تایەی ئۆتۆمۆبێلی پاسداران

بتەقێنن. ئەم کارەی ناو نابوو "ئۆپەراسیۆنگەلی هەراسانکردن. دوای ئەو کارانەش هەر کەسێک هەستی بەمەترسی بکردایە پێوەندیی پێمەوە دەکرد و لەڕێی قاچاخچییەوە بەپاکستاندا دەگەیەنرایە عێراق".

هەروەها دەبوو پێوەندی بەو لایەنگرانەوە بکات کە لە زیندانەکانی ئێران دەردەچن، ڕەنگە پێوەندی بەمامی یاسر عیزەتیشەوە کردبێ کە دوای چەند ساڵێک لە زیندان بەربوو. "ئێمە وازمان لەوان نەدەهێنا - هەرچەندە ئەوان زۆر دەترسان- هەرچەندە دەبوایە وازیان لێ بهێنین. جاری وا هەبوو ئەوەندە تەلەفۆنمان دەکرد تا دەسەڵات دەکەوتە گومانەوە و دووبارە ئەو کەسانەی ڕەوانەی زیندان دەکردەوە. مەبەستەکە ئەوە بوو هەر کەسێک لە زیندان دەرچوو دەبێ بێتە عێراق، ئەگەر نا باشتر وایە بچێتەوە زیندان کە لەوێ هیچ نەبێ بۆ پرۆپاگەندە بەکار دێ".

شەمس حایری و کەریمی بابەتی جیاکردنەوە و کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵایەتی پشتڕاست دەکەنەوە، کە موجاهیدینیان پێ تا ئاستی پارێزراوی لە جیهانی گەورە و خراپ دوور دەخرانەوە، ئەگەرچی نەدەکرا بەیەکجاری دایانبڕن. شەمس حایری دەڵێ بەدرێژاییی ئەو ماوەیەی لە فەرەنسا بوو بەدەگمەن پێوەندی بەخەڵکی فەرەنسایی یاخۆ ئێرانییانی دەرەوەی ڕێکخراوەکەوە کردووە. لە لایەک لەبەرئەوەی زۆر سەرقاڵ بوو "دەبێ بەردەوام ڕاکەی چونکە ڕەنگە ڕژێمی ئێرانی سبەینێ بڕووخێ و کاری ئێمە هێشتا تەواو نەبووە" و ڕۆژگاری سەختی بەسەر دەبرد، بەتایبەتیش لەبەرئەوە بوو کە بۆی نەبوو بچێتە ناو شەقامەکانەوە بەبێ ئەوەی یەکێک دوای بکەوێ. دوای ئەوەی شەوی لەگەڵ خێزانەکەی لە یەکێک لە ژوورە خێزانییەکاندا بەسەر دەبرد، هەموو بەیانییەک بەیەک ڕێدا بۆ یەکێ لەو شەش بینایەی دەیناسین، لە کۆی بیست بنکەی موجاهیدین لە فەرەنسا، دەبرا.

شەمس حایری دوایی دەزانێ کە لەوێ بەتەواوی دابڕابوو. قەدەغەیە تەلەفزیۆنی فەرەنسا داگیرسێنن چونکە سێکسی زۆری تێدایە. ئەو و هاوڕێکانی ناتوانن ڕۆژنامەی بێگانە بخوێننەوە لەبەرئەوەی کەسیان بێ لە فارسی زمانی تریان نەدەزانی. ئەو کۆوارانەی گرووپە ئۆپۆزسیۆنەکانی تری ئێرانی بڵاویان دەکردنەوە نەدەگەیشتنە دەستیان. "ئێمە نەماندەزانی لە کوێ بیانکڕین. تەنیا شتێک کە هەبوو

بەلاڤۆکێکی موجاهیدین بوو. بەڵام هەرگیز بۆت نەبوو بیر لەوە بکەیتەوە کە هی ترت دەوێ یاخۆ پێویستت پێیەتی".

لە پاریس ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەرەنگاری، کە ڕەجەوی لەگەڵ سەرۆکی پێشوو ئەبولحەسەن بەنیسەدر دوای گەیشتنی بۆ فەرەنسا دای مەزراند، بووە چەتری هەمیشەییی ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلق. موجاهیدینیش ئەمەیان دەزانی و من لە کتێبەکەی مەسعود بەنیسەدر ئەمەم بۆ دەرکەوت. ئەم برازایەی کۆنە سەرۆک لە هەشتاکاندا بەرپرسی "دیپلۆماسی" بوو لە ڕێکخراوەکەدا. دوای ئەوەی هەوڵی زۆری بۆ بەدەستهێنانی پشتگیری بۆ بڕیارەکانی موجاهیدین لە دژی ئێران لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا دا، ڕەجەوی لە کۆتاییی هەشتاکاندا کردی بەبەرپرسی نووسینگەی سکرتاریەتی ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەرەنگاری.

زۆربەی تواناکان بۆ نووسین و بڵاوکردنەوەی کۆواری ئەنجوومەن (شوورا) و بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوە ئەندامەکان بوو. بێجگە لەمانە کۆبوونەوەی هەفتانە هەبوون و بەنیسەدر لە بارەی ئەمانەوە ڕاپۆرتی بۆ ڕەجەوی بەرز دەکردەوە کە دەیویست ئەنجوومەنەکە بەئاوازی ئەو هەڵپەڕێ. گرینگترین کاری بەنیسەدریش هەڵسوکەوت بوو لەگەڵ "بڕیارەکانی پێوەست بەناکۆکییەکانی نێوان موجاهیدین و ئەندامانی تری ئەنجوومەن، کە لە جیاوازیی بۆچوونەکانەوە سەبارەت بەوەی کێ مەزنترین نوێنەری بەرهەڵستکارییە و کێ دەبێتە بەرپرسی یەکەم دادەکەوتن".

بەنیسەدر دەڵێ بەلای موجاهیدینەوە ڕوون بوو کە بەرهەڵستکاری ڕاستەقینە لە ئێران ئەوانن. ئەوان تەنیا لەو کاتانەدا گرووپەکانی تریان قبووڵ دەکرد ئەگەر لەگەڵ بۆچوون و بڕیارەکانی ئەوان بوونایە. ئەو ئەندامانەی ئەنجوومەن کە لە بڵاوکراوەکانیاندا ڕەخنەیان لە موجاهیدین دەگرت بەرتیلیان دەدرایە بۆ ئەوەی دەست لەو کارە هەڵگرن تا وێنەیەکی یەکگرتوو پێشانی جیهانی دەرەوە بدرێ. هەروەها بۆ ئەوەی ئەم یەکێتییە لەرزۆکە نەکەوێتە مەترسییەوە، بەنیسەدر هیچ شتێک لە بارەی هەندێ لەو چالاکییانەی بەناوی ئەنجوومەنەوە ئەنجامیان دەدات، بەئەندامانی تری ئەنجوومەن ناڵێت.

ئەو بڕوای تەواوی هەیە کەوا کارێکی باش دەکات. بەڵام لە ساڵی ١٩٩٤ دوای

ئەوەی گۆڕانێکی تر بەسەر ستراتیجی ڕەجەویدا دێ، بۆی دەردەکەوێ هەموو ئەو کارەی کردوویەتی لە پێناوی هیچدا بووە. چونکە بۆی دەرکەوت "بەدەستهێنانی پشتگیریی خەڵکی ئێران هەرگیز یەکێک لە ئامانجەکان نەبووە". ئامانجی ڕاستەقینەی ڕەجەوی "پێشاندانی هێزە، بەتایبەتی لە ڕێی خۆپێشاندان و کۆکردنەوەی لایەنگرانمان، هەروەها ڕێگەنەدان بەپێکهێنانی هاوپەیمانییەکی دژ بەئێمە لە لایەن بەرهەڵستکارانمانەوە و دروستکردنی جێگرەوەی سیاسیی نوێ". زۆر درەنگ زانی کە ئەم خاڵەی دوایی ئەرکی سەرەکیی ئەو بووە لە ناو ئەنجوومەن بێ ئەوەی ڕۆژێک بەبیریدا بێت بەهای ئەم کارە بنرخێنێ. بەنیسەدر دەزانێ ئەو وەک ئامرازێک بەکار هێنراوە و گەلی ئێران بەلای موجاهیدینەوە گرینگ نییە، پرسەکە تەنیا پێگەی ڕەجەوییە لەگەڵ ئەوەشدا نایەت ئەمە بەچەند ڕستەیەک بڵێت.

بەنیسەدر ئەو کتێبەی دوای دەرچوونی لە ڕێکخراوەکەدا دەنووسێ، وەک بەڵگەیەک بەکاری دێنێ لەسەر ئەو شێوازەی مامەڵەی پێ لەگەڵدا کراوە، بەتایبەتی لە کۆبوونەوەکانی گرووپەکەدا و ناچێتە ناو زۆر لە هەڵچوونەکانی ناو ڕێکخراوەکەوە. بەمەش وێنەیەکی سەرنجڕاکێش بۆ موجاهیدین لە ڕۆئاوادا دەکێشێ. ئەو موجاهیدەی لە ئەورووپایە ئازادیی زیاتری لەوانەی عێراق هەیە بەڵام بۆ هەڵاتن لە بەگوێدا خوێندن بەکاریان ناهێنێ. هەروەها پڕە لە باوەڕ بەئامانجەکانی موجاهیدینی خەلق و بێ ئەوەی گوێ بەهەڵسەنگاندن بدات بەردەوام پارە و ئەندامی نوێ بۆ ڕێکخراوەکە بەکێش دەکات و بەهەر نرخێک بێت بەرگری لە ڕێکخراوەکە دەکات.

دوایی بەنیسەدر دەگاتە ئەوەی موجاهیدین لە ڕۆئاوا گرینگییەکی سنوورداریان بۆ ڕەجەوی هەیە: ئەو تەنیا بۆ کۆکردنەوەی پارە و بەدەستهێنانی پاڵپشتیی سیاسەتوانانی ڕۆئاوا پێویستی بەوانە. "ئەو زۆر باش دەیزانی هەرگیز ناتوانین وا بکەین ئەمەریکا و ئەوروپا لەگەڵ ئێمەدا بن ئەگەر دەست بەکرانەوە و بەدیموکراتبوون نەکەین". بەنیسەدر دەنووسێ لەبەرئەوە ڕۆڵێکی گرینگی ئەنجوومەن "خەڵەتاندنی ئەمەریکایی و ئەورووپاییەکان بوو بۆ ئەوەی ئەو موجاهیدینانەمان تێدا نەبینن کە بەرپرس بوون لە کوشتنی ئەمەریکایی لە ئێران و دروشمی دژ بەئیمپریالیزمیان بەرز دەکردەوە".

ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەرەنگاری، وردە وردە دەبووە قسەکەری ڕەجەوی. کاتێ لە ٢٠٠٢دا موجاهیدینی خەلق نەک تەنیا چووە ناو لیستی ئەمەریکاییەکان بگرە هی ئەوروپاییەکانیشەوە لەمەڕ ڕێکخراوە تیرۆریستەکان، ئەوەی لە میدیاکاندا هاتە گۆ ئەنجوومەن بوو. لە ئابی ٢٠٠٣دا ئەمەریکا ئەنجوومەنیشی خستە ناو ئەو لیستەوە و کارکردن بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم بڕیارەش بێ سوودە.

پێش ئەمەش مەسعود ڕەجەوی دەیزانی ڕووی درۆیینەی بەرهەڵستکاری ئێرانی دەشێ بۆیە بکرێ، بۆیە مریەمی ژنی خستە پێشەوە وەک ڕووی بەرهەڵستکاری ئێران لە دەرەوەی وڵاتدا. لە ساڵی ١٩٩٢ش بێ سوود هەوڵی دا ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەرەنگاری قایل بکات مریەم وەک سەرۆکی چاوەڕوانکراوی ئێرانی ئازاد هەڵبژێرێ. لەبەرئەوە بڕیاری دا ئەنجوومەنەکە بەچەند سەد دۆستێک فرەوان بکات و بەرتیلەکانی لەوانە بڕی کە دژی ئەم کارە بوون. لە ئابی ١٩٩٣دا ئەم کارە سەری گرت و مریەم بوو بە"کاندیدای سەرۆکایەتی". هەر لەگەڵ ئەمەدا شێر و ڕۆژ کە بەشێک بوون لە ئارمی دەوڵەتی شای لادراو، خرانە سەر ئارمی ئەنجوومەنەوە.

مریەم نێررایە پاریس. ئەو دەبوایە ئەو زیانە سیاسییەی هاوکاری نێوان سەدام حوسێن و موجاهیدین قەرەبوو بکاتەوە، ئەمە هاوکات بوو لەگەڵ هەڵمەتێکی هێرشی تیرۆریستی لە ئێران کە ئەنجامدەرانی لە عێراقەوە بۆ ئەو کارە سنووریان دەبڕی.

مریەم بەحەشاماتێکی سەد و پەنجا کەسییەوە لە ڕۆشنبیرترین و بەتواناترین ئەندامانی موجاهیدین گەیشتە فەرەنسا. فەرەنسا بەمە خۆشحاڵ نەبوو و ئامادە نەبوو ئەو پشتگیرییەی کاتی خۆی لە ڕەجەویی کردبوو لەویشی بکات. بۆیە هیچ پشتگیرییەکی ئەمنی و دارایی چنگ نەکەوت. جگە لەمەش وەک داواکەرێکی ئاسایی مافی پەنابەری هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کرا و فەرمانی پێ درا بێدەنگ بێت. بەهۆی ئەو خۆپێشاندانە گەورانەی ئەندامان کردیان دوایی توانی بچێتە لەندەن و دۆرتمۆند. لەندەن بەو مەرجە قایل بوو پێشوازیی بکات ئەگەر گەرەنتییەکی فەرەنسای پێ بێت تا ڕێی پێ دەدرێ بگەڕێتەوە پاریس. ئەم گومانە شتێکی نوێ بوو بۆ موجاهیدین کە لە دوای شۆڕشی ئێرانەوە توانای باشی کارکردنیان لەگەڵ حکوومەتەمانی ڕۆئاوادا هەبوو.

مریەم ڕەجەوی وەک شاژنی بێ تاجی بەرهەڵستکاری ئێران لە پاریس دانیشت، بەڵام دەبێ خۆی بڕوای بەم شتە هەبێ؟ ئەی ئەوانەی لە دەوروبەرین؟ دووبارە پەنام بۆ مەسعود خودابەندە بردەوە، ئەو لە پاریس بەرپرسە لە ساغیی مریەم و لە نزیکەوە ڕووبەڕووی دەبێتەوە. ئەو ڕۆژانەی بەبیر هاتنەوە "کە هاتە ئێرە باسی مێپەروەریی دەکرد". مریەم پێوەندی بەمێپەروەرانی ڕۆئاواییەوە کرد و هەوڵی دا خۆی وەک "پاڵەوانی مافەکانی ئافرەت" نیشان بدات". لەبەرئەوەی لە ناو موجاهیدیندا ئافرەت لە سەرووی پیاوەوەیە. سەرەڕای ئەوەش مریەم وەک کاندیدی سەرۆکایەتی لە وڵاتێکی ئیسلامی وەکو ئێران هەڵبژێرراوە. لە ژمارەیەک سایتی ئینتەرنێتدا وانەی پڕ لە قسەی زلم دی لە لایەن مێپەروەرانی ڕۆئاواوە کە زۆر بەو قسانە سەرسام بوون مریەم بۆیانی کردبوو.

لە پاڵ ئەم وێنەیەدا مریەمی وەک شەڕوانێک لە پێناو مافی ئافرەت پێشان دەدا، شتێکی تریشی بۆ خۆی هەڵبژارد کە زۆر لە ئەندامانی لێی دوور خستەوە. ڕێی بەخۆی دا وێنە لەگەڵ هونەرمەندانی ئێرانیدا بکێشێ کە ڕێکخراوەکە چەندین ساڵە وەک "لیبراڵ" دەیانناسێنێ و لە ڕووی سیاسییەوە ناشێ مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ. هەموو ئەمانەی دەکرد لەبەرئەوەی موجاهیدین پێویستیان بەپاڵپشتیی سیاسیی زیاتر هەبوو. هەر وەک نەریتی موجاهیدینی خەلقیشە، ئامانج پاکانە بۆ ئامراز دەکات. بەڵام زۆر لە ئەندامان نەیانتوانی ئەمە تێ بگەن.

ئەو بەرگە یەککگرتووەکەی موجاهیدینیشی داکەند (بێجگە لە سەرپۆشەکە هەرچەندە ئەویش ئێستا ڕەنگاوڕەنگە) کانتۆرێکی گرانبایيشی بۆ خۆی کڕیوە - زۆر لە کۆنە ئەندامان دووپاتیان کردەوە نرخەکەی لە یەک ملیۆن دۆلار زیاترە. یەک پرسیار دەمێنێتەوە، دەبێ ئەو قاتە ڕەنگاوڕەنگانەی ئێستا مریەم لەبەریان دەکا بەڕاستی گرانبایی بن، ئەی دەبێ ڕاست بێ کە ئەو بۆ ئارایشتی خۆی هەزاران دۆلار خەرج دەکات. بێ ئومێدبوونەکە زۆر گەورەیە لەبەرئەوەی مولکداریی تایبەت بۆ خەڵکە ئاساييیەکەی موجاهیدین هەڵگیراوە.

مریەم خۆی وەک وێنەی شاژن دەنوێنێ. خودابەندە دەڵێ "ئەو هەوڵ دەدا وەک فەرەح دیبا دەرکەوێ" کە ژنی شا بوو. بەکارهێنانی ئەو شاڵەی شا کە ڕۆژ و شێری

لەسەر بوون پێ ناچێ تەنیا وێکچوونێک بێت. "تەنانەت لە وێنەکانی مەسعود و مریەمدا هەمان ئەو کورسییەی لویسی حەوتەم دەردەکەوێ کە لە وێنە کۆنەکانی شا و ژنەکەیدا هەیە".

هەندێ لە کۆنە ئەندامان ئەوەیان ئاشکرا کردووە کە مریەم نەوەی ئەو خێزانە قاجارییەیە کە پێش پەهلەوییەکان حوکمی ئێرانیان دەکرد. هەندێکی تریش دەڵێن ئەمە پلانێکە بۆ زیندووکردنەوەی ئەو مەیلەی بۆ حوکمڕانانی پێشوو هەبوو و بەهۆی شکستی سیاسییەوە لە ئێران گەشەی کردووەتەوە.

موجاهیدین کە تا ئێستا دڵیان پڕە لە ڕق لە شا ناتوانن هیچ یەکێک لەمانە تێ بگەن و ئەندامانی نوێش ڕێ بەخۆیان نادەن بەم شتانەوە سەرقاڵ بن. ئەم نمایشە شانۆییانەی پاریس ڕەنگدانەوەیەکی لاوازی گەمە ڕاستییەکەیە کە خێزانی شایانەی دوورخراوە لە لۆس ئەنجلسەوە دەیکەن و لە ڕێی کەناڵەکانی سەتەلایتەوە و بەسەرکردایەتیی میر ڕەزا پەهلەویی جێنشین پێشانی جیهانی دەدەن. دەبێ ئەمە گەمە بێت، یان ڕەجەوییەکان بەڕاستیانە دەیانەوێ حوکمێکی شاهانەی نوێ لە ئێران دامەزرێنن؟ پرسەکە هەر چییەک بێت من وای دەبینم مریەم دەبێ هەوڵی زۆر بدات بۆ ئەوەی بتوانێ بەکەرامەتەوە ئەو تاجە قورسە هەڵگرێت. خودابەندە دەڵێ ئەو لە پاریس گرژ و ناشادە. "ئەو بەتوانا نەبوو. ئەو بەڕێوەبەرێکی باش نەبوو، ئەو هەموو چاودێرییەکی لە دەست دا. ئەوەی زۆر جار دەیبینی: چەند لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەت باشتر بیت، ئەوەندە لەگەڵ کارمەندەکانت خراپتر دەبی. ئەو ڕەجەویی کردە خوایەک بەڵام هیچی پێشکێشی ئەندامەکان نەکرد". ئاشکرایە خودابەندە زۆر ئەو ئافرەتەی خۆش ناوێ کە چەند ساڵێک لێیەوە نزیک بووە و لە لایەن شوێنکەوتووانیەوە خۆشەویست بووە. "هەستم کرد زۆر غیرە دەکات و گرژە. بەڵام توندیشە و بەهێمنی و وردی گەمەکە دەکا. ئەو گوێی لێ نییە ئەگەر کەسێک ئەشکەنجە بدرێ. زۆر جار خۆی ئەو کارە دەکا".

بۆ مێردەکەی، پاریس شوێنی هەناسەدانە دوای کەمپی ئەشرەف. کۆنترۆڵ کەمترە، هەروەها بەگوێچکەدا خوێندن. دوای ماوەیەکی کەمیش ئەمە بەدەرچوونی دەگەیەنێ. "سەرەتا شەش مانگە، دوایی ساڵێکە" خودابەندە شیی دەکاتەوە،

"بۆشاییی ساڵێک، تیایدا ڕوحت لە ژێر بۆمباراندا نییە و لەگەڵ تیمێکی نوێشدا کار دەکەیت". لەگەڵ خەڵکێکی نوێ کە بەشدار نەبوونە لە هەموو "دانیشتنە ڕۆژانەکانی ڕاپۆرت پێشکێشکردن" کە تیایاندا ناچار دەکرای خۆت و خۆشییەکانت ڕووت بکەیتەوە. "هەروەها ئازادییەک، لە کۆنترۆڵەکان هەبوو چونکە ئێمە تێکەڵاوی بێگانە دەبووین. سەرەڕای ئەمەش مریەم هەمان ئەو دەسەڵاتەی ڕەجەویی نەبوو وەک سەرۆکی تایەفەکە کە کۆنترۆڵی بیر و مێشکی خەڵکەکە بکات. بۆیە تەنیا چەخماخەیەک بەس بوو".

کە لە ساڵی ١٩٩٦دا مریەم بانگ کرایەوە بۆ ئەشرەف، سێیەکی ئەو موجاهیدینانەی سێ ساڵ لەگەڵی بوون ڕۆیشتبوون. مەسعود خودابەندە یەکێک بوو لەوان، مەسعود تەیبی یەکێکی تریانە و ڕەجەوی توانی قایلی بکات بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە. دوای ئەوە، وەک خودابەندە دەڵێ "بووەوە گیانێکی بێ ڕوح". بەڵام دوای شەش ساڵ تەیبی دووبارە بەجێی هێشتنەوە، لەبەرئەوەی وەک خودابەندە دەڵێ ئەوەی جارێک بکەوێتە گومانەوە هەرگیز ناتوانێ لە گومان ڕزگاری بێت و لە کۆتاییدا هەر ڕێکخراوەکە بەجێ دەهێڵێ.

تەیبی ماوەیەک ئەندامی ئەنجوومەنی ناوەندیی موجاهیدینی خەلق بوو و یەکێک بوو لەو خەڵکە کەمەی تا ئێستا دەستی لە ناوونیشانە کۆنەکانی بەر نابێ، دوای چەند ساڵێکی کەم لە دەرچوونی لە ڕێکخراوەکە قسەم لەگەڵیدا کرد و بۆمی باس کرد کارەکان چۆن بەڕێوە دەچوون. لە ساڵی ١٩٩٣دا وەک کامێرامانێک یاوەریی مریەمی کرد. دوای ئەوە ماوەیەک لە بەشی پرۆپاگەندەی موجاهیدین کاری کردووە کە لە پاڵ کۆمەڵێ کاری تردا کاسێتە ڤیدیۆییەکانی ڕەجەوییان بەرهەم دەهێنا، ڕۆژانە پێشانی ئەندامان دەدرێن. خۆشی بەرنامەیەکی لە کەناڵی سەتەلایتی ڕێکخراوەکەدا هەبوو. کاتێ لەگەڵ مریەمدا بەوڵاتانی ئەورووپادا دەگەڕا ئەو کاسێتانەی تۆماری دەکردن، دوایی لە کەناڵەکەدا لێ دەدرانەوە.

لە پاریس بواری ئەوەی بۆ ڕەخسا تەماشای هەندێ کەناڵی تەلەفزیۆنی ڕۆژئاوا بکات، کە ئەم کارە لە کاتی تردا بۆ موجاهیدین یاساغە. بێجگە لەمەش پێویستە ئەو وێنەکانی BBC و CNN و ڕۆیتەرز و ئەسۆشیەیتد پرێس بۆ هەواڵە

سانسۆرکراوەکانی خۆی بەکار بهێنێت. لە عێراق ئەوە مەحاڵ بوو، لەوێ زۆر بەسادەیی ناتوانی بەو کەناڵانە بگەی. دیمەنە تەلەفزیۆنییەکان چاویان کردەوە. دۆزینەوەی گرینگیش ئەو گۆڕانە گەورەیە بوو کە بەسەر ئێراندا هاتووە، چ کارێکی زۆر بۆ شاردنەوەی زانیاری لە ئەندامان کراوە. تەیبی دەڵێ "لەوێ هەستم کرد هۆی دەردەسەرییەکانی ڕێکخراوەکە چییە. بۆم دەرکەوت ئەو قسەیەی دەکرا گوایە تەنیا موجاهیدین لە دژی ئێران شەڕ دەکا درۆ بوو. چەندین گرووپی ئۆپۆزسیۆن هەبوون".

دەبێ کۆنترۆڵی کەمتر لە پاریس لەوەی لە کەمپی ئەشرەفدا هەیە، ئەوەندە پڕ مەترسی بێت؟ ئەو پێی وایە. تەیبی دەڵێ "ئەگەر لەوێ لە سەدا سەد بێت، لە پاریس لە سەدا نەوەتە. لەبەرئەوەی دەتتوانی خەڵکی تر ببینین، تەنانە هەندێ جاریش لەسەر شەقامەکان قسەیان لەگەڵدا بکەی". بەم شێوەیە لە شەقامەکانی پاریسدا بۆی ئاشکرا بوو ئەوەی ڕەجەوی دەیلێ گوایە گەلی ئێران لە پشتی موجاهیدین ڕاست نییە. ئەو چاوی بەخەڵکێکی ئێرانی کەوت بۆ گەشت و سەیران لە پاریس بوون. "ئەوان بەنەفرەتمان دەکەن و دەڵێن ئێوە لە عێراق چی دەکەن! ئەو سۆزەی لە سەرەتادا هەبوو نەماوە".

لە چیرۆکەکانی خودابەندە و بەنیسەدر و تەیبییەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەوروپا تەنیا تەڵەیەک نەبوو بۆ ڕاوکردنی موجاهیدینی نوێ، بگرە ڕێیەکیش بوو بۆ ڕاکردن لە موجاهیدین. لەبەرئەوەی سەرکردەی مەزن بەجەستە لێرە نییە کۆنترۆڵەکەش زۆر بەهێز نییە، سەدان لەو ئەندامانەی ڕەوانەی ئەوروپا کراون وردەوردە ڕایان کردووە و ڕێکخراوەکەیان بەجێ هێشتووە.

نەبوونی ڕوویەکی پەسند بۆ موجاهیدین چەندین ساڵە کێشەی گەورەیان بۆ دەنێتەوە. بەهۆی ئەندامە هەڵاتووەکانیشەوە بەردەوام زانیاری لەسەر ناوەڕۆکی پیسیان بڵاو دەبنەوە. هەر ئەمەش وای کرد ماوەیەک ئەنجوومەنی نیشمانیی بەرەنگاربوونەوە وەک ڕوویەکی جوان بۆ ڕێکخراوەکە بەکار بهێنرێ، چونکە وەک مەسعود تەیبی دەڵێ ئەو ئەنجوومەنە بەپێچەوانەی موجاهیدینەوە پەڵەی ناشیرین بەڕوویەوە نەبوو "ئێمە دەمانویست شتێکی وەکو شین فینی باڵی سیاسیی سوپای کۆماریی ئێرلاند دروست بکەین".

بەڵام کە ئەنجوومەنی بەرەنگاربوونەوە سەرەتا هاوکاری لەگەڵ موجاهیدیندا ڕەت کردەوە و دواتر قایل نەبوو مریەم بکاتە کاندیدی خۆی بۆ سەرۆکایەتی، پلانێکی نوێ هاتە پێشەوە. "بەرە"یەکی نوێ دەکرێ بەڕواڵەتی موجاهیدین کە پێک هاتووە لە چەند ڕێکخراوێکی بچووکی مافەکانی ئافرەتان و منداڵان و ڕێکخراوی قوتابییان و هونەری و لەم جۆرە ڕێکخراوانە. لە ڕووی فەرمییەوە ئەمانە یانەگەلی ناحکوومی دەبن و لە ڕاستیدا بەتەواوی گرێدراوی موجاهیدینی خەلقن. هەر لەگەڵ دامەزراندنی ئەو یانانەدا ئەم ڕاستییە ئاشکرا بوو، لەبەرئەوەی ئەندامەکان زۆر بەدڵسۆزییەوە لە خۆپێشاندانەکانی موجاهیدینیان نیشان دا و نامەی نارەزایییان دەنووسی و بەمۆری دیاری ڕێکخراوەکەوە دەیانناردن.

ڕووی شەپۆلەکە بەئاسانی وەرناگەڕێ. لە کۆتاییی نەوەتەکاندا وێنەی موجاهیدین زیاتر ناشیرین بوو. لەگەڵ ئەوەی سیاسەتوان هەن لە ئەورووپا و ئەمەریکا هێشتا پشتیوانیی ڕێکخراوەکە دەکەن. بۆ نموونە لۆرد کۆربێتی کاسل ڤێل کە ئەندامی ئەنجوومەنی لۆردانی بەریتانیایە، وین گریفتسی ئەندامی ئەنجوومەنی ژێرووی بەریتانیا، ئەندامە سویدییەکەی پەرلەمانی ئەورووپا هێرمەن شمید. لە پەرلەمانی ئەورووپا پەرلەمانتاری هۆڵەندی ئێریک مایەر سەرکردایەتیی گرووپی دۆستانی ئێرانی ئازاد دەکات و لە ناوەڕاستی ساڵی ٢٠٠٥دا توانی ئەو ڕاپۆرتەی ڕێکخراوی چاودێریی مافی مرۆڤ لەسەر زیندانەکانی موجاهیدینی خەلق پێشکێشی کردبوو، بەهەڵایەکی زۆرەوە بخاتە ناو تەنەکەی زبڵەوە.

ئەو لیستی سیاسەتوانە دۆستانەی لە سایتەکەی مریەم ڕەجەوی چاوم پێی کەوت زۆر درێژترە. لە ئایاری ٢٠٠٤دا ستیف مەککەیبی ئەندامی پەرلەمانی بەریتانیا لەسەر لیستی پارتی کرێکاران ئامادەی کۆبوونەوەیەکی ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەرەنگاری دەبێت. ریچارد پێرلی ڕاوێژکاری سیاسیی ئەمەریکا کە لە حکوومەتەکەی ریگندا یاریدەری وەزیری بەرگری بوو و لە حکوومەتی بوش سەرۆکی دەستەی سیاسەتی بەرگرییە، ئامادە بوو لە هەڵمەتە بەدناوەکەی کۆکردنەوەی پارە لە ئەمەریکا بۆ قوربانییانی بوومەلەرزەکەی بامدا وتارێک بخوێنێتەوە. هەروەها شەش لە ئەندامانی کۆنگرێسی ئەمەریکا ئیمزای خۆیان خستە سەر بەیاننامەیەکی

پشتگیری له ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەرەنگاریدا.

دوای ڕووخانی بەغدا کۆمەڵێ فیلم و بەڵگەنامەی دەزگا سیخوڕییەکانی عێراق ئاشکرا بوون کە بەشێوەیەکی بەڵگەنەویست پێشان دەدەن تا چ ئاستێک مەسعود ڕەجەوی و سەدام حوسێن هاوکار بوونە. بۆیە تەنیا ڕێککەوت نەبوو کە دوای سێ مانگی تەواو، لە حوزەیرانی ۲۰۰۳دا پۆلیسی فەرەنسا هەڵمەتێکیان کردە سەر ئۆڤێرس سور ئۆیس و بیناکانی تری موجاهیدین لە پاریس. پێش هێرشکردنە سەر عێراق بەماوەیەکی زۆر کورت مریەم ڕەجەوی و گرووپێکی زۆر دڵسۆز داوای پەنابەرییان لەوێ کردبوو. پۆلیس ۱٦٥ کەسی گرت کە مریەم ڕەجەوی و ساڵح ڕەجەویی شووبرای و ئەندامی ئەنجوومەنی بەرەنگابوونەوەیان تێدا بوو. هەروەها دەست گیرا بەسەر ملیۆنان دۆلار پارەی وشکەدا کە زۆربەی سەد دۆلاری بوو، بێجگە لە ژمارەیەکی زۆری فایلی کۆمپیوتەر و نوێترین ئامێرگەلی پێوەندی.

فەرمانی ئەو هەڵمەتە لە لایەن دادوەری لێکۆڵینەوەی بەناوبانگی فەرەنسایی جان لویس بروگێرەوە دەرچووبوو، کە بەرپرسە لە کاروباری دژە تیرۆر. حکوومەتی فەرەنسا گوتی هۆکاری هەڵمەتەکە "هاوکاریکردنی تاوانکارانە بۆ ئەنجامدانی چالاکیی تیرۆریستی" و "پارەدارکردنی ڕێکخراوێکی تیرۆریست" بووە. وەزارەتی دادی فەرەنسا لە ساڵی ۲۰۰۱ەوە چاودێریی چالاکییەکانی ئەو گرووپەی کردووە و ترسی ئەوە هەبووە کە ئەندامانی خۆیان بۆ ئەنجامدانی هێرش لە ئەورووپا و ئێراندا بەکار بهێنن.

وەزیری ناوخۆی فەرەنسا نیکۆلاس سارکۆزی، کە لە ساڵ ۲۰۰۷ بووە سەرۆکی فەرەنسا، گوتی موجاهیدین دەیانەوێ بارەگا سەرەکییەکانیان لە عێراقی داگیرکراو لە لایەن ئەمەریکاوە بگوێزنەوە بۆ پاریس و ئەو زۆر دژی ئەم کارەیە.

لە کۆتاییدا ۱۷ کەس لە گیراوەکان بەفێڵکردن و پارەدارکردنی ڕێکخراوێکی تیرۆریست تاوانبار کران. یەکێک لەوانە مریەم ڕەجەوی بوو کە دوای چەند هەفتەیەک زیندانیکردن بەکەفالەت ئازاد کرا ئەویش دوای هاتنە ناوەوەی خەڵکانێک و لەوانە دانیال میتیرانی ژنی سەرۆکی کۆچکردووی فەرەنسا. لە سەرەتای مانگی تەممووزدا موجاهیدین کەفالەتەکەی ۱۱ لە ئەندامە پلەبەرزەکانی خۆی دا، کە بۆ

هەر یەکێکیان ٩٢ هەزار دۆلار بوو. زیاتر لە یەک ملیۆن دۆلار، ئەمە پارەیەکی زۆرە بۆ ڕێکخراوێک کە بەقسەی دەزگای هەواڵگریی هۆڵەندا "کێشەی دارایی هەیە". نۆ لەو ئەندامە ئازادکراوانەی موجاهیدین وەکو بێگانەی نەویستراو لە فەرەنسا دەرکران.

موجاهیدین یەکسەر پەنایان بردە بەر ئامرازە بەهێزەکەیان: خۆپێشاندان. هەر دوای دەسگیرکردنەکان ئەندام و لایەنگرانی خۆیان لە ئەورووپا خستە گەڕ. لە زۆر شوێن خۆپێشاندان کرا و داوای ئازادکرنی مریەمیان دەکرد. هەروەها مانگرتن لە خواردن و دانیشتن لە بەردەم کۆنسولخانە و باڵیۆزخانەکانی فەرەنسا هەبوون. پۆلیسی فەرەنسا زیاتر لە دوو سەد خۆپێشاندەری گرت و ژمارەیەکی لەوانە کردە دەرەوەی وڵاتەکەوە. ڕەنگە بەم کارە کۆتاییی کردەوەی بەیەک جار هێنانە ناوەوەی ئەو هەموو ئێرانییە بەبەڵگەنامەی ساختە و هی خەڵکی ترەوە نزیک بکاتەوە.

ئینجا لە ڕێی بەیاننامەی ڕۆژنامەوانییەوە ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەرەنگاریی ئێران ڕۆژانە ناڕەزایی دژ بە"ئەو هێرشە دڕندانە و نایاساییەی کرایە سەر ماڵی مریەم ڕەجەوی و ماڵی پەنابەرانی سیاسیی ئێرانی لە فەرەنسا" دەردەبڕی. هەروەها ئەنجوومەن قسەی سیاسەتوانانی دۆستی کۆ دەکردەوە و ئەو تۆمەتانەی بە"نادروست و دەستکرد" ناو دەبرد. ئەمە "پەڵەیەکە بەتەوێڵی فەرەنساوە کە بەپارێزوانی مافی مرۆڤ ناسراوە" لەبەرئەوەی مریەم سەرەڕای هەموو شتێک پەنابەری سیاسییە. هەروەها ئەنجوومەن هەوڵی دەدا وای پێشان بدات کە هەڵمەتەکە نەکراوەتە سەر بارەگاکانی موجاهیدینی خەلق بگرە کراوەتە سەر بارەگای تایبەتیی مریەم.

کاتێ سارکۆزیی وەزیری ناوخۆ لە دیمانەیەکی ڕادیۆدا گوتی: خەڵکێک خەریکی هیچ نەبن چۆن لە ناکاو ٥.٨ ملیۆن دۆلار پارەی وشکە لە شوێنی نیشتەجێبوونیان دەردەکەوێ، ئەنجوومەن یەکسەر کاردانەوەی دەبێ و دەڵێ ئەو پارەیە خەڵکی چاوتێر لە ناوەوە و دەرەوەی ئێرانەوە بەخشیویانە و ئەمە بەهیچ شێوەیەک نایاسایی نییە. هەروەها ڕەخنەی زۆریان بەرامبەر وتەی "هیچ ناکەن" هەبوو لەبەرئەوەی ئەنجوومەن "وەک پەرلەمانی دووره وڵاتی ئێران ڕۆڵێکی گرینگی هەیە".

ئینجا له خۆپێشاندانەکانی پاریس و لەندەن و بەرلین خۆپێشاندەران ئاگریان له خۆیان بەردا. دوان لەوان مردن. له نزیک بارەگاکانی ئوڤێرس سور ئۆیس دەیان کەس (موجاهیدین دەڵێن ۲۰۰ کەس) مانیان له خواردن گرت و ڕەتیان کردەوه هیچ جۆره شلەیەک وەرگرن. ساڵح ڕەجەوی کە له ۲۲ی حوزەیران بەمەرج ئازاد کرا سەردانی ئەمانه دەکات و داوایان لێ دەکات بەهەر شێوەیەک بێت بەردەوام بن و سوێندیان دەدات تەنیا شت بخۆنەوه بۆ ئەوەی مانگرتنەکەیان درێژ بخایەنێت. مریەمیش له زیندانەوه بانگەوازێک بڵاو دەکاتەوه و داوای ڕاگرتنی خۆکوشتنەکان دەکات، بەڵام دوای ئەوەی ده کەس خۆیان سووتاندبوو.

دوای ئەمه بێدەنگی دێت. دەبێ پۆلیسی فەرەنسا چی دۆزیبێتەوه؟ له حوزەیرانی ۲۰۰٤، پارێزەرەکەی موجاهیدین داوای وەلانانی تۆمەتەکه دەکات له کاتێکدا هێشتا ڕوون نەبوو ئایا ۱۷ گومان لێکراوەکه دەدرێنه دادگه یان نه. مریەمیش لەو کاتەوەی ئازاد کرابوو دەستبەسەر بوو و بۆی نەبوو وڵات بەجێ بهێڵێ. بۆیه له ڕێی نامه بۆ نووسیارانەوه پێوەندی بەمیدیاکانی جیهانەوه دەکرد. پارێزەرەکه دەسەڵاتدارانی فەرەنسای بەوه تاوانبار کرد کە مەبەستیان لەو هەڵمەته ڕێ خۆشکردن بووه بۆ ئەوەی دواتر کاری بازرگانی لەگەڵ ئێران و له ناو ئێراندا بکەن. ئەو گەیشته ئەو ئەنجامەی دوای ئەوەی له هەردوو مانگی ئادار و نیساندا کۆمپانیاکانی ئەلکاتێل و تۆتالفینا و ڕینۆ، بۆندی ملیۆن دۆلاریان لەگەڵ تاراندا مۆر کرد. پارێزەرەکه گوتی "تەنیا دۆلار و پێترۆل جێی سەرنج و گرینگین لای فەرەنساییەکان". هەر وەک ئەوەی له فەرەنسا دەسەڵاتی دادوەری و دەسەڵاتی جێبەجێکردن له یەکتر جیا نەبن.

دوایی کۆمەڵێ زانیاری درەیان کرد، دەگوترا له هەڵمەتانەدا لیستی ئەو ئامانجانه دۆزراونەتەوه کە نیازی هێرشکردنه سەریان هەبووه، وەک ئەو کۆنه ئەندامانەی زمانیان درێژه. دوایی باس لەوه کرا هۆی درێژەکێشانی لێکۆڵینەوەکان ئەوەیه کە لێکۆڵەرەکان تووشی گرفتی گەوره هاتوون لەبەرئەوەی ئەو بەڵگەنامانەی دەستیان کەوتوون و هی ڕێکخراوەکەن بەزمانی موجاهیدین نووسراون. هەر ئەمەش وای کرد زۆر له کۆنه ئەندامان ئامادەیی خۆیان بۆ هاوکاری له لێکۆڵینەوەکاندا نیشان دا.

له ئابی ۲۰۰٤یش ڕاگەیەنرا کە وەزارەتی دادی فەرەنسا کەسێکی تری دەسگیر

کردووە: ژمێریارەکەی موجاهیدین. یەکسەر جارێکی تر بێدەنگی باڵی بەسەر پرسەکەدا کێشایەوە.

ڕەنگە موجاهیدین دوای ڕووخانی بەغدا و ئەو هەڵمەتەی کرایە سەر بارەگاکانیان لە پاریس زۆر ترسا بن. باشە ئێستا ڕوو لە کوێ بکەن؟ دوای هەڵمەتەکەی پاریس ژمارەیەک هەڵمەتی تر لە شوێنگەلی جیاجیاوە کرانە سەر نووسینگەکانی موجاهیدینیان، گرینگترینیان لە ڕۆما بوو لە نیسانی ٢٠٠٤. لە بینا جۆراوجۆرەکاندا دەست بەسەر کۆمپیوتەر و بەڵگەنامەکانی موجاهیدیندا گیرا چونکە پێیان وا بوو ئەمانە "فایلی کەسی"ی چەوری ئەندامانن. ئەم ڕاستییە بەهێزتر بوو کاتێک ئیتاڵیاییەکان گوتیان مەبەست لەو هەڵمەتە ڕێگرتن بوو لەوەی موجاهیدین بارەگاکانیان لە بەغداوە بۆ ڕۆما بگوێزنەوە. دەبێ فایلە کەسییەکانیان پێش خۆیان ناردبێتە ئەوێ؟

ئەو ئەندامانەی لە ساڵانی پێشوو بەئاسانی مافی پەنابەرییان پێ دەدرا، دوای داگیرکردنی عێراق لە لایەن ئەمەریکاوە جێی بەخێرهێنان نین. لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٣دا دەسەڵاتدارانی ئەڵمانیا بە١٢ ئافرەتی ئێرانییان ڕاگەیاند کە پەنابەرییان لێ سەندراوەتەوە و پێویستە ئەو وڵاتە بەجێ بهێڵن لەبەرئەوەی وەک مەترسییەک لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی تەماشا دەکرێن. ئەو ١٢ ئافرەتە تەنیا چەند ساتێک پێش هێرشی ئەمەریکا لە ئاداری ٢٠٠٣ عێراقیان بەجێ هێشتبوو. ڕەنگە ئەمانە لە ئەندامە پلە بەرزەکان بن کە ڕێکخراوەکە مەبەستیەتی لە عێراق دەریان بکات.

هەروەها موجاهیدینی خەلق لە هەوڵی ئەوەدایە ئەو مافی پەنابەرییەی بەئەندامەکانی دراوە بۆ دەرکردنیان لە عێراق لە دوای هێرشەکەی ئەمەریکاوە بەکار بهێنێ. لە دانیمارک و کەنەدا و بەریتانیای مەزن پارێزەرەکانیان بێ هوودە شەڕ لە پێناوی ئەمەدا دەکەن و دەڵێن حکوومەتی ئەو وڵاتانە بەپێی ئەو مافی پەنابەرییەی بەوانی داوە ئەرکی پاراستنیانی دەکەوێتە سەر شان. حکوومەتەکانیش لە بەرامبەردا دەڵێن ئەو هاووڵاتییانە کاتی خۆی بەدرۆ و دەلەسە توانیویانە ئەو مافە وەرگرن و ئەوان ئەندامن لە ڕێکخراوێکی تیرۆریست لە عێراقدا.

هیچ وڵاتێکی ئەورووپا ئامادە نییە پێشوازی لە هاتنی چاوەڕوانکراوی مەسعود

ڕەجەوی بکات. هەموو حکوومەتەکانیش لەوە ئاگەدارن کە ئەو بەپەرۆشەوە بەدوای شوێنێکدا بۆ ڕێکخراوەکەی دەگەڕێ. لەم دۆخە نەرێنییەدا نەرویج یەکێکە لەو ژمارە کەمەی لەمە بەدەرن. نەرویجی ئەندامی یەکێتیی ئەوروپا لە ساڵی ۲۰۰۳دا ڕای گەیاند کە هیچ هەنگاوێک لە دژی موجاهیدینی خەلق ناهاوێ، دەسەڵاتداران بەمیدیاکانی نەرویجیان ڕاگەیاند کە تەنیا ئەگەر کارێکی نایاسایی بکەن ئەمان هەڵوێست وەردەگرن. لە هەموو شوێنێکی ئەوروپادا پاڵپشتی بۆ موجاهیدین لە کەمبوونەوەیە و لە بەرامبەر ئەمەشدا ڕێکخراوەکانی کۆنە ئەندامانی موجاهیدین بایەخی زیاتر بەلێدوانەکانیان دەدرێ کە باس لەوە دەکەن ئەم ڕێکخراوە زیاتر بەتایەفەیەکی ئاینی دەچێ.

وا دەردەکەوێ کە ڕۆڵی موجاهیدین لە ئەوروپا بەرەو نەمان دەچێ، ئەمە کاتێک دەرکەوت کە لە هاوینی ۲۰۰۵ لە ناو کۆنە ئەندامان‌دا دەنگۆی ئەوە هەبوو گوایە مەسعود ڕەجەوی لە کەمپی ئەشرەف هەڵاتووە و چووەتە سویسرا. ڕاستیی ئەو قسەیە کە موجاهیدێکی هەڵاتوو بڵاوی کردەوە دیار نییە. بەڵام ئەوەی دیارە ئەوەیە کە لە کۆتاییی ۲۰۰۵دا کارەکانی بەکێشکردنی ئەندام لە زیادبووندا بوون و ئەو لایەنگرانەی ساڵێک بەسەر وەرگرتنی ئەو پلەیەیان تێ پەڕیبوو (وەک دایکە بەخودانکەرەکەی ئیلاهی و ئەلیرا و دایکی نەدا حەسەنی) بانگ کرانە کەمپی ئەشرەف و دوای گەڕانەوەیان بۆ ئەوروپا کرانە ئەندامی ڕێکخراوەکە.

دوای ئەمە لە حوزەیرانی ۲۰۰٦دا هەواڵ بڵاو بوونەوە کە دادوەری فەرەنسا بەشێوەیەکی ناتەواو ئەو کۆت و بەندانەی لاداوە کە دوای هەڵمەتەکەی ۲۰۰۳ بۆ سەر بارەگاکان سەپێنرابوون، ئەمەش دوابەدوای داواکارییەکی موجاهیدیندا هات. ئێستا مریەم ڕەجەوی و ۱۷ کەسی تر بۆیان هەیە بچنە دەرەوەی وڵات و پێوەندی بەیەکەوە بکەن. لەگەڵ ئەمەشدا لێکۆڵینەوە لە باکگراوندی تیرۆریستییانەی ڕێکخراوەکە بەردەوامە، هەروەها قەدەغەکردنی چەک و پارە پەیداکردنیش. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا مریەم ڕەجەوی وەک سەرکەوتنێک ئاهەنگی بەم بۆنەیەوە گێڕا و گوتی: "تۆمەتی تیرۆر درۆیەک بوو و هیچی تر. دادگە بۆی دەرکەوت ئەو تۆمەتانەی ئاراستەی بەرهەڵستکاری ئێران کرابوون بێ بنەما بوون".

ئاكامەكانی ئەمەش یەكسەر وەدەركەوتن. لەو ساتەوە موجاهیدین كەوتنەوە تۆزكردن. دووبارە خۆپێشاندان و ڕووبەڕووبوونەوەی سیاسەتوانان و كۆبوونەوە و سایتگەلی نوێ و ڕێكخراوگەلی لاوەكی. لە هەندێ شەقامی ڕۆئاوادا پۆستەری مریەم ڕەجەوی دەركەوتن وەك ڕووی ئۆپۆزسیۆنی ئێران. دەبێ ئەوەش بزانرێ هەر زوو لە سایتە نوێیەكاندا لینكەكانی موجاهیدین (وێنەكانی مریەم و ئەو لینكانەی بەسایتەكەی ئەوەوە بەسترابوو) لابران، بەڵام هێرشكردنە سەر "سیخوڕەكانی ڕێژیمی ئێران" (كۆنە ئەندامەكان) بەردەوام بوون.

ئەو هەڵمەتەی لە پێناو سڕینەوەی ناوی موجاهیدین لە لیستەكانی تیرۆر بەهێزەوە دەستیان پێ كرایەوە، لە كۆتاییی ٢٠٠٦دا ئەنجامی بەرچاویان بوو. دادگەی ئەوروپا بۆ مافەكانی مرۆڤ ڕای گەیاند كە یەكێتیی ئەوروپا بەهۆی زانیاریی ناتەواو و نابەجێوە موجاهیدینی خەڵقی خستە ناو لیستی ڕێكخراوە تیرۆریستەكانەوە. موجاهیدین ئاهەنگیان بۆ ئەم سەركەوتنەش گێڕا. بەڵام یەكێتیی ئەوروپا داوای پێداچوونەوەی ئەم بڕیارەی كرد و لە ئایاری ٢٠٠٧دا لیستێكی نوێی ڕێكخراوە تیرۆریستەكان دەرچوو و ناوی موجاهیدینی تێدا هەبوو. ئەمەش بووە مایەی تووڕەییی موجاهیدین و داوای یەك ملیۆن یۆرۆیان وەك قەرەبوو كرد ئەگەر بێتو یەكێتیی ئەوروپا یەكسەر پێبەند نەبێ بەبڕیاری دادگەكەوە.

# پشکی حەوتەم

## چوکلێت یاخۆ تێهەڵدان

یاسر عیزەتی دەڵێ "خەڵک نەیاندەزانی باوکم پاسەوانی بەندیخانەیە. زیندانەکان
ـهێنی بوون. ئەوان هەر ئەوەندەیان دەزانی کە فەرماندەیەکی گەورەیە و هەندێ
جاریش شۆفێری ئەبریشەمچییە، کە کەسی دووەمە لە دوای ڕەجەوی".

یاسر لە ساڵی ۲۰۰۲دا کاتێ ئەوە ڕەت دەکاتەوە چی تر بەشێک بێ لەم کارە و
اشکرای دەکات کە دەیەوێ وەک مرۆڤێکی ئاسایی دوور لە موجاهیدین بژی،
ەکەوێتە زیندانەکەی باوکییەوە. ئەم دەیەوێ بچێتە ئێرانی پڕ نەهامەتی بەڵام لەگەڵ
ڕەجەویدا نەبێ، ئەمەی پێیان گوت. بۆیە خرایە زیندانی تاکەکەسی لە ژوورێکی
یسکاندا، کە شوێنێکی لاچەپی کەمپی ئەشرەفە و پێش ئەوەی منداڵەکان دوور
خرێنەوە جێی بەسەربردنی پشووی هەفتانەی خێزانەکان بوو. باوکیشی
اسەوانیەتی و بەبێ ئەوەی قسەی لەگەڵدا بکات هەموو ڕۆژێک لە ژێر دەرگەکەوە
خواردنەکەی بۆ دەخاتە ژوورەوە.

دەبێ ئەم پێوەندییە کەسییە چەند بەهێز بێت، یاسر تەنیا یەکێکی ترە لەو هەموو
ـوجاهیدینەی بدرێژاییی چەندین ساڵ خراونەتە بەندیخانەکانی ڕەجەوییەوە و
اوڕێکانی خۆیان کراونەتە پاسەوانیان. هەروەک دوای هێرشە شکستخواردووەکەی
۱۹۸ زۆر قورستر بوو بۆ مەسعود ڕەجەوی بتوانێ وەڵامی ڕەخنەکان بداتەوە بۆیە
ەدوای وەڵامی تردا گەڕا. بەتایبەتیش دوای هەڵاتنەکانی ۱۹۸۸ و ۱۹۹۱ ئاشکرا
وو ئەوانەی دەردەچن بێدەنگ نابن و ناوی موجاهیدینی خەلقیان لە قوڕ وەردا. بۆیە
ەو کاتەوە دەرگەی سەرەکی تەنیا بەیەک ئاراستەدا دەکرێتەوە، بەڕووی
ازەهاتووەکاندا بۆ ئەوەی بێنە ناوەوە.

ڕەخنە لای موجاهیدین یەکسانە بەناپاکی. ئەمەش بووە هۆی "دانیشتنەکانی

ڕاپۆرتی ڕۆژانە" کە تیایاندا ئەو موجاهیدینەی بوێرن پرسیار بکەن نەک تەنیا بەقسە بگرە بەکردەوەش مامەڵەی خراپیان لەگەڵدا دەکرێ.

هەموو ئەندامێکی پێشوو بەهەناسەساردییەکی ڕاستەقینەوە دەڵێ "پرسیاری زۆرم هەبوو". حوسێن فورقانی بەتاڵییەکەوە دەڵێ "ڕەجەوی بواری بۆ پرسیارکردن نەهێشتبوو، تەنیا دەبوو بڕوای پێ بکەین". یاسر دوای هەڵاتنی، تا ئێستاش لەوە تۆقیوە کە بەسەریدا هات. ئێستا لە کێڵگەکەی باوانی لە باکوری ئێراندا کار دەکات، بەڵام هەر بەیادگارییەکانی سالانی ناو موجاهیدینەوە دەناڵێ، ئەمەی لە گفتوگۆیەکی بزوێنەردا لە تاران بەمن ڕاگەیاند.

یاسر گوتی "ڕەجەوی مەبەستەکانی خۆی لە تۆدا دەچاند و ئاپۆڕەکەی بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنا. ئەو سەرکردایەتیی ئاپۆڕاکەی لە دژی تۆ دەکرد". ئەمە ئەو خاڵەیە کە تێیدا ئەندامێکی موجاهیدین چی تر خۆی لەگەڵ هاوڕێکانی نابینێتەوە بگرە لە سەنگەر بەرامبەریدا دەبن.

پرسیاری کاریگەریی کۆبوونەوەکانم لێی کرد، چۆنە کاتێ هاوڕێکانت بەئاشکرا دژی تۆ دەبن. بەخەمەوە گوتی "ئێمە بەهەست بەردەباران دەکراین. تۆ تەنیا بەرازێکی و هیچی تر نییت، هەموو کەسێک ئامادەیە هەموو شتێک بکات بۆ ئەوەی لە تۆ بەدوور بێ. زیندانی تاکەکەسی بۆ من جێی ئارامی بوو".

تەنانەت لە شوێنێکی وەک کولانەی مریشکیش بەند کرابوو، بەم شێوەیە باسی زیندانەکەی دەکات کە یەکەمین ٤٥ ڕۆژی تێدا گوزەراند، دوای ئەوەی بڕیاری دا "چی تر نایەوێ ئەندامی موجاهیدین بێ". ئەو زۆر بەزەحمەت دەیتوانی لە کولانەکەدا خۆی درێژ بکات، بەڵام هەموو شتێک لەو بۆردمانی هەستە باشتر بوو کە لە لایەن کەسانێکەوە دەکرا ئەو بەهاوڕێی خۆی دانابوون.

لەو زیندانە بچووکەدا و لەوانەش کە لەوە گەورەتر بوون و پێنج ساڵی دوای ئەوەی تیایاندا گوزەراند، ئەوەی فورقانی لە شەڕی ساڵی ١٩٩١ی کەنداو بەدی کرد واتایەکی جیاوازی لای هەبوو. ئەو لە بیریەتی چۆن لەسەر ئەوەی ئامادە نەبوو تەقە لە هەڵاتوویەکی بێ چەکی عێراقی بکات و بیکوژێ، ئەو کاتەی شوفێری تانک بوو گواسترایەوە یەکەیەکی تر. لە نزیک یەکێ لە سەنگەرەکانی موجاهیدین ژمارەیەک

هەڵاتووی عێراقی بینران. ئەو جۆرە کەسانە بەشێوەیەکی ئاسایی دەبرانە کەمپی ئەشرەف و لەوێ دەدرانە دەست سوپای عێراقەوە، بەڵام ئەم جارەیان فەرمان بەفورقانی درا دوا کەسی ئەو کۆمەڵە خەڵکە بکوژێ. ئەمیش فەرمانەکە ڕەت دەکاتەوە. ئەو بەپەرۆشەوە دەڵێ "ڕۆژی دواتر گوێزرامەوە یەکەیەک کە بەو دواییە نزیکەی هەموو ئەندامەکانی کوژرابوون، بۆ ئەوەی منیش بکوژرێم".

یەکەمین بەیانی لەوێ و بە بەرچاوی ئەوەوە سێ تانکی سەر بەیەکەکەی ئەو بەچەکی خۆیان تێک شکێنران، بەبێ ئەوەی هیچ دوژمنێک لەو نزیکانە هەبێ. دوای کەمێک ئەو شتە بەسەر تانکەکەی ئەویشدا دێت. "هەرچەندم کرد نەمزانی لە کوێوە تەقەمان لێ دەکرێ. چوومە دەرەوە – نەبێگومان، من سەربازی ڕاستەقینە نیم. تەنیا خەڵکی خۆمانم دی، بەرەو لای ئەوان چووم و بەوانم وت کە تانکەکەم ئەنگواوە. نیشانەیان لە تانکەکەم گرت و تەقەیان لێی کرد. هاوارم کرد: "بۆ وا دەکەن؟" کلاشینکۆفەکەیان لێم سەند و وتیان هێمن بە. منیان بردە لایەکەوە، منیش هاوارم کرد: "بۆ برادەرەکەمتان کوشت؟"

دوای چەنین ساڵ ئینجا ماوەی هەبوو بیر بکاتەوە و بۆی دەرکەوت لەسەر ئەو چیایەی کوردستانی عێراق لە ساڵی ١٩٩١دا و لەو نزیکانە هیچ هێزێکی دوژمن نەبوو و موجاهیدین خۆیان تەقەیان لە تانکەکان دەکرد، کە لەبەر هۆیەکی شاراوە برێکی زۆر گازیان پێ بوو. ڕزگاربوون بێگومان مەحاڵ بوو لەبەرئەوەی تانکەکان بووبوونە تۆپەڵێ ئاگر. ئینجا بۆی دەرکەوت کە ئەو چەند بەختیار بوو.

دوایی بۆی دەرکەوت نیشانچیی سەر تانکەکەی هاوئاهەنگیی لە بارەی "شۆڕشی ئایدیۆلۆجی"یەوە نەکردووە. ئەو ئەنجامەی پێی گەیشت ئازاربەخش بوو، دوای چەند ساڵێک لە ڕێکخراوێکدا کە متمانەی پێی هەبوو. وەک چۆن زۆربەی ئەوانەی لە ئۆپەراسیۆنی مۆرقەریدی ساڵی ١٩٩١دا کە لە ڕیزەکانی موجاهیدین کوژران، بەئاگری دۆستانی نێودەوڵەتی مردن. ئەو ئەندامانەش کە ڕەخنەیان هەبوو بەو شێوەیە لەناوچوون، ئەمەی بەدڵنیاییەوە گوت.

پرسیاری هۆکاری شتێکم کرد زۆر نامرۆڤانەیە، چۆن هاوڕێ دەستی دەچێتە خوێنی هاوڕێی خۆی؟ "ڕەجەوی پێویستی بەشەهید بوو. هەروەها توانای قایلکردنی

کەسانێکی نەبوو بە"شۆڕشی ئایدیۆلۆجیایی". ئەوێش جێیەکی باش بوو بۆ لە کۆڵکردنەوەیان، لە هەمان کاتیش شەهیدی دەست دەکەوت". باشە ئەم دەتوانێ ئەمە بسەلمێنێ؟ "نە، بەڵام لەمە دڵنیام".

دەبێ ئەمە بۆچوونی پیاوێکی بەیەکجاری ڕووخاو بێت؟ نازانم و هیچ بەڵگەیەکم بەدەستەوە نییە. بەڵام ئەگەر یەکێ بتوانێ دوورخراوەکان بۆ چەند ساڵێک بەند بکات و بەخۆکوشتن قایلیان بکات، بۆ ناتوانێ بەدەستی ئەو هاوڕێیانەیان بەکوشتیان بدات کە توانیویە بڕوایان پێ بهێنێ ئەمانە "سیخوڕی ئێرانن"؟

پاشماوەی چیرۆکەکەی فورقانی وام لێ دەکات بڕوای پێ بکەم. ئەوەی فورقانی پێی زانیوە وای لێ دەکات بەهیچ جۆرێک نەتوانێ بگەڕێتەوە ناو ڕێکخراوەکە. ئەو نایەوێ هیچی تر لە بارەی موجاهیدینەوە بزانێ. لە کۆتاییدا ساڵی ٢٠٠٠ ئەو بەدەستی عێراقییەکان درایەوە بە ئێران، وەک بەشێک لە پرۆسەی گۆڕینەوەی دیلەکانی شەڕ. ئەمە بۆ موجاهیدین وەک حوکمی کوشتن وایە: بێگومان ئێرانییەکان ئەم کەسانە ئەشکەنجە دەدەن و هەڵیان دەواسن.

بەڵام فورقانی بۆی دەرکەوت کە ئەوێ ئەوەندە خراپ نییە وەک ئەوەی چاوەڕوانی دەکرد، بەتایبەتی ئەگەر لەگەڵ مامەڵەی هاوڕێکانی لەگەڵیدا بەراورد بکرێ. بێگومان ترسی سانسۆر باڵی بەسەر چیرۆکەکەیدا کێشابوو، بەڵام لە کۆتاییدا لێرە گوتنی ڕاستی باشتر وەردەگیرێ لەوەی لە ناو موجاهیدیندا هەبوو. لە ڕاستیشدا ڕێژیمی ئێران لەبەر هۆکاری پراگماتی، زیاتر لە هۆکاری مرۆیی ئەم جۆرە مامەڵەیە دەکات.

"ئێرانییەکان پرسیاریان لێم دەکرد و ئەگەر بمگوتایە: "نازانم" وازیان دەهێنا و دوای دوو ڕۆژ لە ناو کەسوکاری خۆمدا بووم. ئێستاش لێرە بەئازادی دەژیم. ڕەجەوی مەبەستی بوو بەدەستدانەوەی من بۆ پڕۆپاگەندەی دژ بەڕێژیم بەکار بهێنێ. بەڵام ئەمان لەو زاناتر بوون".

محەمەد حوسێن سوبحانی، ئەم دوای چەند ساڵێک زیندانی درایەوە دەستی ئێران. ساڵانی ناو زیندان شوێنەواریان بەکۆنە بەرپرسی پاسەوانانی ڕەجەوییەوە دیارە، لەبەرئەوەی زۆربەی ماوەی زیندانیکردنی لە زیندانی ئینفرادیدا بەسەر برد. دوای ئەوەی ساڵی ١٩٩٢ ڕووبەڕووی ڕەجەوی بووەوە، بۆ ماوەی چوار ساڵ خرایە

زیندانی تاکەکەسییەوە لە مۆڵگەی ئەشرەف، دوای ئەوە بۆ ماوەی سێ ساڵ خرایە زیندانێکی تری نیمچە تاکەکەسی لەو شوێنەی زیندانییەکان پێیان دەگوت "ئوتێلەکەی ڕەجەوی" کە لە بنکەیەکی تردا بوو.

کاتێ لە ژووری دانیشتنەکەی لە کۆلۆن چیرۆکی خۆی دەگێڕایەوە، لەگەڵ هەموو ئەوەی بەسەریدا هاتبوو پێ دەچوو نەڕووخابێ. بەزەقی بەڵام بەنەرمییەوە جار بەجار قسەی بەوەرگێڕەکە دەبڕی. لە کۆتاییدا ئەو بۆ ئینگلیزیی وەردەگێڕا کە دیار بوو تا ڕادەیەک شارەزاییی لێ هەیە. چایە و گێلاسی پێشکێش کرد و داوای لێبوردنی کرد بۆ ئەو ناڕێکییەی لە ماڵەکەیدا دیار بوو. ژنەکەی لە ماڵەوە نییە، بۆ چەند ڕۆژێک چووەتە سەردانی دۆستان.

زیندانەکەی لە کەمپی ئەشرەف کەمێک لە کولانە مریشکەکەی فورقانی باشتر بوو، بەڵام وەک بۆ منی باس کرد چوار ساڵ لەبەر چرای هەڵکراودا دەنووست، شوێنەکە پڕ بوو لە سیسرک و مێشوولە، ژانەسەرێکی بێ ئەندازەشی هەبوو. ئەشکەنجەی جەستەیی و دەروونی دەدرا. لە هەموو ئەمانەش ناخۆشتر هەموو ئەمانە خەڵکێک بەسەریاندا دەهێنە کە بەهاوڕێی خۆی دانابوون. "هەستێکی زۆر ناخۆش بوو. لە ئێراندا لەگەڵ خەڵکێکی باش بووم، کە ئێستا بەنەفرەتم دەکەن. ئەمانە تا دوێنێ برادەرم بوون و ئێستا لێم دەدەن".

باسی ئەوەم بۆ دەکا چۆن گازەندەی کرد و بۆ بینینی ژنەکەی و کچەکەی لێیان دەپاڕایەوە. تەنیا دوای چوار ساڵ مانەوە لە زیندان هێشتیان بۆ ماوەی دە خولەک لەگەڵ ژنەکەیدا قسە بکات. "مەبەستیان ئەوەبوو چۆکم پێ دادەن. ڕەجەوی نامەیەکی بۆم نوسیبوو داوای دەکرد ڕابردوو لە بیر بکەم و دڵنیای کردمەوە ئەوەندەی نەماوە ڕژێمی ئێران لەناو بچێ". ئەو بەڵێنە چەند بارەیە بەوەی ڕێی پێ دەدەن بەتەلەفۆن قسە لەگەڵ کچەکەیدا بکات، کە لەساڵی ١٩٩١ەوە برابووە دانیمارک، هەرگیز جێبەجێ نەکرا. تەنیا چەند نامەیەکی کۆنیان دایێ کە چەندین ساڵ بوو ناردبوونی و ڕێکخراوەکە شاردبوونیەوە.

لە کۆتاییدا هەلی هەڵاتنی بۆ دەرخسێ. لە تەمووزی ١٩٩٩دا لە یەکێ لە سەردانە مانگانەکانیدا بۆ بەغدا بۆ خۆشۆرین و سەرتاشین و سەردانی پزیشک، کە لەو

ڕۆژەوە بۆ ئوتێلەکەی ڕەجەوی گواستراببووەوە ڕێی ئەمەی پێ دەدرا بەڵام پاسەوانی لەگەڵدا بوو، هەرچۆنێک بێ توانی لە دەستیان ڕا بکا. ئەو شەوە لە بەغدا بوو و نەیدەزانی چی بکات. هەوڵەکەی بۆ پێوەندیکردن بەBBC یەوە سەرنەکەوت. ئێوارە توانی خۆی بگەیەنێتە بارەگای UN و لەوێ خۆی بەدەستەوە بدات.

"لەوێ چوار کەسی سەر بەڕێکخراوەکەم دی لە ناو لانکرۆزەرەکەیان دانیشتبوون بەهیوای ئەوەی من بگرن. لە بەردەم دەروازە لە شووشە دروستکراوەی باڵەخانەکەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هەوڵی ئەوەیان دا بەپاڵ بمخەنە ناو ئۆتۆمبێلەکەیانەوە". خەڵکەکەی ناوەوە ئاگەداری ئەمە بوون و کارمەندانی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پاراستنی بردیانە ژوورەوە. بەڵام زۆر لە ژوورەوە نەما و پیاوانی ئەمنی عێراقی هاتن و بردیانە بنکەیەکی پۆلیس. دوای نزیکەی نیو سات گواسترایەوە بۆ بنکەی موجاهیدین لە پایەتەختی عێراق و لەوێوە یەکسەر نێردرایەوە کەمپی ئەشرەف.

"لەوێ بۆ ماوەی حەوت تا هەشت سات ئەشکەنجەیەکی زۆری جەستەیی و دەروونی درام. لێیان دەدام و شەقیان تێ هەڵدەدام و هاواریان بەگوێمدا دەکرد. ئەوەی زیاتر شتەکەی سەخت کردبوو ئەوە بوو دوو ڕۆژ بوو نەخەوتبووم و لە شەقامەکانی بەغدادا وێڵ بووم".

بەقسەی سوبحانی بێ، موجاهیدین لەوە دەترسان پێوەندی بەمیدیاکان و خێزانەکەیەوە بکات. هەوڵیان دا کاغەزێکی پێ پڕ بکەنەوە بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی ئەوەی لە باڵەخانەکەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا ڕووی دا، ژمارەیەکی تر لە کۆنە ئەندامانیش باسی ئەم کردەوەیان بۆم کردووە. زۆر جار موجاهیدین هەوڵیان داوە خۆیان لە تاوانبارکردن بپارێزن بەپێشکێشکردنی بەڵگەنامەگەلێک کە پاکانەیان بۆ دەکەن و لە لایەن کەسی پێوەندارەوە واژوو کراون.

دوای چەند مانگێک ئەو و سێ ئەندامی تر کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەوانیش پلەی بەرزیان هەبووە درانە دەستی عێراقییەکانەوە. دوای ساڵێک ئەشکەنجەدان، ساڵێکی تر لە بارەگاکانی تۆقێنەری هەواڵگریدا دەمێنێتەوە. لەوێ لە ژوورێکی سێ مەتر بەسێ مەتر لەگەڵ ١٢ کەسی تردا زیندانی دەکرێ. "لەسەر یەکتر دەنووستین. ئاودەست و دەستشۆرەکە سێ یەکی ژوورەکەیان داگیر کردبوو. دیوارەکان ڕەنگیان

خوێنین بوو. بەئاستەم ڕووناکی دەهاتە ژوورەوە".

گلەیی مامەڵەی خراپیانی بۆ ئەو عێراقییە کرد کە وەک ئەفسەری پێوەندیی موجاهیدین کاری دەکرد، ئەویش بەڵێنی دا بگوازرێتەوە و پرسەکەی لەگەڵ نەتەوە یەککگرتووەکاندا باس بکات. لە شوباتی ۲۰۰۱دا بەوەوە چوار لە موجاهیدین گواسترانەوە بەڵام بۆ شوێنێک لەوەی خۆیان خۆشتر نەبوو. برانە بەندیخانەی ناوبانگ خراپی ئەبوغرێب، ئەو بەندیخانەیەی دوای چەند ساڵێک ناوبانگی دەرکرد، پاش ئەوەی ئەمەریکاییەکان لە دوای شەڕی ۲۰۰۳دا زیندانییەکانیان تێدا ئەشکەنجە دابوو. ئەوەی جێی سەرسوڕمانی ئەم چوار موجاهیدینە بوو، بەگوتەی سوبحانی، کە لەوێدا چل هاوئازاری خۆیان دیتەوە، ئەم ژمارەیەش دوای چەند مانگێک تا ساڵی ۲۰۰۲ بوو بەهەشتا. لێرە هیچ هەلێک نییە بۆ گەیشتن بەنەتەوە یەککگرتووەکان.

عەلی قەشقەوی دەڵێ "ئێمە لە بەشی زیندانییە بێگانەکاندا بووین، کە لە ناوەڕاستی ئەبوغرێب بوو". ئەو بەپیاڵە و ژێرپیاڵەکەی سەر مێزەکە نەخشەی شوێنەکەی بۆمان ڕوون دەکردەوە. "لەو بەشەدا ۷۰۰ کەس هەبوون، هەر پێنج تا دە کەسێک لە ژوورێکدا بوون و تێکەڵ کرابوون، موجاهیدین و خەڵکی تر بەیەکەوە. لێرەدا توانای ئەوەمان هەبوو بەیەکەوە قسە بکەین، لەگەڵ ئەوەشدا تەواو ئازاد نەبووین بەڵام هەر چۆنێک بێت ئازادتر بووین لەوەی لە ناو ڕێکخراوەکەدا بین".

کاتێ سوبحانی گەیشتە ئەوێ، ئەم نزیکەی سێ ساڵ بوو لە ئەبوغرێب بوو و لەو ماوەیەدا فێر بووبوو چۆن لەوێ بژی. بەرپرسی باڵای موجاهیدین، بەتایبەتی مەهدی ئەبریشەمچی، هەفتەی جارێک سەردانی ئەوێیان دەکرد بۆ ئەوەی بزانن زیندانییەکان چۆنن و هەموو جارێک هەوڵی ئەوەیان دەدا لە ڕەخنەکانیان پەشیمانیان بکەنەوە. بەڵام هەموو جارێک بەدەستی بەتاڵ دەگەڕانەوە و هەرگیز نەبیسترا یەک موجاهید لە بەندیخانەی ئەبوغرێبەوە گەڕابێتەوە ناو ڕێکخراوەکە.

کاتێ لە سەرەتای ساڵی ۲۰۰۳دا سەدام حوسێن بڕیاری لێبوردنی گشتیی دەرکرد، ئەو بڕیارە موجاهیدینی ئەبوغرێبی نەگرتەوە. پێش ڕووخانی بەغدا بەماوەیەکی کورت عێراقییەکان نزیکەی ۵۰ کەسیان لەوان دایەوە بەئێرانییەکان.

هەوڵەکانم بۆ دۆزینەوەی ئەمانە و زانینی چارەنووسیان هیچیان لێ نەکەوتەوە. بەڵام ڕەنگە هەواڵگریی ئێران لێکۆڵینەوەی لەگەڵیاندا کردبێ و دابیانیەوە بەکەسوکاریان، هەر وەک ئەوەی پێشتر لەگەڵ حوسێن فورقانییاندا کردبوو.

ئەو ئەندامانەی موجاهیدین کە باسی ماوەی ناو ئەبوغرێبم لەگەڵیاندا کرد، وێنەی ڕێژیمێکی دڕندانەی زیندانیکردنیان بۆم کێشا، تیایدا موجاهیدین شان بەشانی عێراقییەکان کاریان دەکرد. بێگومان نەتەوە یەکگرتووەکان ڕێیان پێ نەدەدرا بچنە ناو بەندیخانەکەوە، بەڵام جاروبار ڕێ بەخاچی سووری نێودەوڵەتی دەدرا. ئەو سەردانانەش ئەوەندە بەسوود نەبوون، لەبەرئەوەی زیندانییەکان ئەوەندە ترسێنرابوون و ئەشکەنجە درابوون کە نەتوانن یاخۆ نەیانەوێ هیچ زانیارییەکی بەسوود بدەن. زیندانییەکانی موجاهیدینیش دەشاردرانەوە بەشێوەیەک کە پێوەندی بەوانەوە مەحاڵ بوو.

عەلی قەشقانی، ئەبوغرێب لە سەرووی زیندانەکانی موجاهیدینەوە دادەنێ، پاسەوانەکان ئەو و هاوڕێکانیان بەزبڵوزاری ڕەجەوی دەزانی، ئەو ڕەجەوییەی هاوڕێی سەرۆکەکەیان بوو و دەیویست ئەو زبڵە لە کۆڵی خۆی بکاتەوە. ئەو بەدەم هەڵگرتنی بۆنبۆنێکەوە لەسەر مێزەکەی بەردەممان گوتی "تەنیا شتێک لە لای ڕێکخراوەکە باشتر بوو، خواردن بوو" ئەمەش لەبەرئەوە بوو سەدام باش موجاهیدینی بەخێو دەکرد. لەو کاتەی ئابلووقەی نێودەوڵەتی بووبووە هۆی کەمی هەموو شتێک لە هەموو شوێنێکی عێراقدا، موجاهیدین بەزیادەوە گۆشت و تەڕەیان هەبوو، زیندانییەکانیشیان سوودیان لەمە وەرگرتبوو. "بەڵام لای موجاهیدین نانم پێ نەدەخورا، تەنیا خەریکی بیرکردنەوە بووم. تووشی هەوکردنی گەدە بووبووم. لە ئەبوغرێب ئەمە نەما بەڵام خواردن نەبوو".

لە ژووری کۆبوونەوەکانی ڕێکخراوێکی ئەڵمانی-هۆڵەندیی کۆنە موجاهیدیندا، قەشقانی زۆر بەپەرۆش بوو بۆ ئەوەی چیرۆکی خۆیم بۆ بگێڕێتەوە. کە وەرگێڕەکە جاروبار دەچووە دەرەوە ئەو لە قسەی خۆی بەردەوام دەبوو بەئینگلیزییەکی سەرەتاییەوە و زۆر هەوڵی دەدا وشەی دروست بدۆزێتەوە. ئەو بەو ئینگلیزییە شڕەشەوە زۆر بەڕوونی دەیتوانی خاڵە بەئازارەکان نیشان بدات. "ئەوەی ئێمە لە

عێراقدا کردمان هیچ پێوەندی بەتێکۆشان دژ بەڕێژیمی ئێرانەوە نەبوو. ئێمە تەنیا بەخۆمانەوە سەرقاڵ بووین، لەجیاتی ئەوەی دان بەوەدا بنێین کاتی شەڕی چەکدارانە بەسەر چووە".

پرسیارم لە بارەی ژیانی ناو بەندیخانە بەدناوەکەوە لێی کرد، کە تێیدا پاسەوانەکان هیچ ڕێزیان لێیان نەدەگرت و لە پشت دەرگەی زیندانەکاندا بوون و لەسەر بەشەکەیان نووسرابوو "لە ژێر چاودێریی موجاهیدینن". ئینجا گوتی "ئەبوغرێب شوێنێکی ترسناک بوو بۆ موجاهیدین. پاسەوانەکان لێیان دەداین، لەبەرئەوەی ڕێکخراوەکە بەو شێوەیە ڕینوێنییانی کردبوو. دوای ئەوە بەجۆرە کوتەکێکی تایبەت دەست و قاچمانیان دەشکاندن"، قەشقەوی دەڵێ ژمارەیەک موجاهید دەناسێ بەهۆی ئەو لێدانەوە تووشی شەلیی هەمیشەیی بوون.

پاسەوانەکان چاوەڕوانی ئەوەیان لە زیندانییە کۆکراوەکان دەکرد سەرسامی چالاکیی ئێسک شکاندنەکەیان بن. ئەوان چەندین جار ئەوەیان ئاشکرا دەکرد کە ڕقی زۆریان لە زیندانییە ئێرانییەکانیان هەیە "تەنانەت لە جوو زیاتریش" کە لە عێراقدا لە سەرووی لیستی دوژمنەکاندان، بێگومان ئەوە بارودۆخێک نییە مرۆڤ بتوانێ تێیدا بەدڵنیاییەوە شەو بخەوێ.

قەشقەوی بەهێمنییەوە دەڵێ "بەڵام ئازاری لێدان زۆر سووکترە لە ئازاری دڵشکاندن. ئەمەش ئەو کارە بوو کە ڕێکخراوەکە کردی. من باشترین هیوام بۆ وڵاتەکەم دەخواست و بۆ بەدیهێنانی ئەو هیوایە چوومە ناو ڕێکخراوەکەوە. من وا تێ گەیشتبووم یەک ئاواتمان هەیە. بەڵام دوایی بۆم دەرکەوت ئەوە درۆ بوو. ئەمەش دڵمی شکاند".

وێنەیەکی گرت بەدەستییەوە. وێنەکەی دایە دەستمەوە و تەنیا ئەوەندەی گوت "تەماشاکە". ئەم لە هەموو ئەو پیاوانە لاوازتر بوو. "ئەو کاتە تازە بڕیاری یەکجاریی دەرچوونم دابوو". سەرەتا ئەو خۆی بەوە قایل دەکرد بمێنێتەوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٩٨دا بڕیاری یەکجارەکی دا. ڕێکخراوەکە خۆشحاڵ نەبوو بەوەی بەجێی بهێڵێ.

"بەرپرسەکەم پێی دەگوتم "دەرچوون مەحاڵە، تۆ ئێستا سیاسی"". لە ناو موجاهیدین سیاسی ئەوەیە "ڕا دەربڕێ لە ناو ڕێکخراوەکەدا". ""من تەنیا دەمەوێ

بژیم" وام گوت. ئەویش گوتی "ئەگەر ئەوە ویستی تۆ بێ ئەوا دەچیتە زیندانەوە"".

ڕەنگە ناوی خراپی ئەبوغرێب لەو کارە خراپانەوە هاتبێ کە سەدام لەوێ ئەنجامیانی دەدا، بەڵام عەلی قەشقەوی بەمنی گوت ئەو ژیانی ئەوێی بەلاوە ئاسانتر بوو لە ژیانی ناو زیندانەکانی کۆنە هاوڕێکانی. بۆیە ئەوە چوار ساڵەکەی ناو ئەبوغرێب نەبوون کە کاریگەریی زیاتریان لەسەر ئەو هەبوو، کاریگەرییە زۆرەکە هی مردنی دوو هاوڕێی بوو بەهۆی ئەشکەنجەدانیانەوە لە زیندانەکانی موجاهیدین. مردنی ئەو هاوڕێیانەی وای کرد بەهیچ شێوەیەک لە بڕیاری بەجێ هێشتنی ڕێکخراوەکە پەشیمان نەبێتەوە.

زستانی ١٩٩٤ بوو و موجاهیدین زۆر ناڕەحەت بوون. نزیکەی سێ چارەکیان دەیانویست ڕێکخراوەکە بەجێ بهێڵن. بۆیە ڕەجەوی بیر لە فێڵێک دەکاتەوە. ئەو دڵنیایە تەنیا بەتوندوتیژی دەتوانێ ڕێ لە شۆڕشێک بگرێت، بەڵام نایەوێ هیچ سەگێکی تری نووستوو بەئاگا بهێنێ یاخۆ ئەندامەکان لە هیچ ئاگەدار بکاتەوە. بۆیە ئۆپەراسیۆنێکی تری سەربازی لە دژی ئێران ڕادەگەیەنێ و داوا لە شوێنکەوتووانی دەکا هەر پێشنیازێکیان هەیە سەربازی یاخۆ سیاسی یا بۆ پرۆپاگەندە پێشکێشی بکەن. دەبێ بەنووسین وەڵامی ئەم بانگەوازە بدەنەوە و دوای ئەمە دەکرێنە سێ گرووپ و مەشقیان پێ دەکرێ. بەم شێوەیە بزربوونی دەیان کەس، بەلای کەمەوە ٥٠٠ کەس خرابوونە زیندانەوە، هەستی پێ ناکرێ. وا ڕێک کەوت خەڵکەکە بزانن ئەمانە بزر نەبوونە. ئەم ماوەیە ناوی "پشکنینی ئەمنییەتی" لێ نرا.

"من دەمویست واز بهێنم بۆیە خۆم بۆ ئۆپەراسیۆنە نوێیەکە ناونووس کرد، بەڵکو ئەم کارە هەلی هەڵاتنم بۆ دەستەبەر بکات" دوای چەند ساتێکی کەم عەلی ڕەزا میرازگەری لە هەمان ژوور لەو شارەی ئەڵمانیا ئەمەی پێم گوت، ئەم جارە چایە و بۆنبۆنی زیاتر لەسەر مێزەکەدا هەبوون. وەک ئەوەی بیەوێ پاکانە بکا دەڵێ "لەو کاتەدا هێشتا هەندێ بڕوام بەرەجەوی مابوو". عەلی قەشقەوی بەبێدەنگی گوێی گرتبوو و تەنیا کە بێدەنگ دەبووین شتێکی دەگوت. ئەم دوو پیاوە بەمنیان گوت ئەوان لە زینداندا بوون بەنزیکترین برادەری یەکتر.

کاری میرازگەری مەشقکردن بوو بەو تیمە تایبەتانەی بۆ ئەنجامدانی هێرش لە

ناو ئێران ئامادە دەکران، لەسەر ئەم کارە بەرز کرایەوە بۆ پلەی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، بەڵام لە پاڵ ئەوەوە گومانی لە سوودی ئەمە هەبوو. ئەو گومانە بوو بەهۆی ئەوەی پلەکەی داگیریتەوە. کاتێ لە زستانی ١٩٩٤دا خرایە زیندانەوە، چەند مانگێک بوو وەک سەگێکی گول هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرا.

شەوێک پێش ئەوەی بێتە ئەوێ، دەدرێتە لاوە و کاغەزێکی لە بەرپرسی هەواڵگریی موجاهیدینەوە پێ دەدرێ کە داوای لێ دەکات واژووی بکات. لەو کاغەزەدا نووسرابوو کەوا ئەم سیخورە کار بۆ هەواڵگریی ئێران دەکات. "کاغەزەکەم دڕی و پرسیارم کرد ئەمە چ جۆرە گاڵتەیەکی ناڕێکە. ئەو دوای ئەمە مێزێکم بۆ تێ دەگرێ". دوای لێدانێکی باش هەردوو دەستی میرازگەری و چاوەکانی دەبەسترێنەوە و فڕێ دەدرێتە ناو ئۆتۆمۆبێلێکەوە و دەیبەن، "بەشێوەیەک کەس نەمبینێ". ئەو بەتەواوی سەرسامە. "نەمدەزانی چی ڕوو دەدات، کودەتایە یاخۆ لەتبوونە؟ ئەوەشی کە هیچ باوەڕم نەدەکرد ڕوو بدات ئەو چاوبەستنەم بوو".

کاتێ دەگەنە ئەو زیندانە، کە ئەو هەرگیز نەیزانیبوو موجاهیدین زیندانیان هەیە، دەبوایە بەرگی یەکگرتووی موجاهیدین دانێ و بەرگی سڤیل لەبەر بکات. دوای ئەوە فڕێ درایە زیندانەوە. "لەوێ چەند کەسێکم دی، کە پێش چوار مانگ لە ناکاو دیار نەمابوون، بەئێمە گوترابوو چوونە بۆ ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنێک. من توانای ئەوەم نەبوو بڕوا بەم شتانە بکەم کە ڕوویان دەدا. وام لێ هات جارێکی تر نەوێرم بڕوا بەکەس بکەم. بەدیوارەکەدا هەڵگژام و هاوارم کرد: "دەمەوێ بێمە دەرەوە، من لێرە چی دەکەم. من ئەندامم لە موجاهیدین". ئەوانەی تر بەمنیان گوت: "هەوڵ بدە هێمن بی، ئێمەش هەوڵمان دا نارەزایی دەربڕین بەڵام سوودێکی نەبوو".

لەو بیست کەسەی لەو زیندانەدا بووین شەوی یەکێکیان دەبرد و کاتێ دەهاتەوە هەموو گیانی شین و مۆر بووبوو و خەڵتانی خوێن کرابوو. قسەکردنیش قەدەغە کرابوو. هاوڕێیانی میرازگەری لە زیندانەکەدا لە ڕۆژانی دواتر بەوردی شتەکانیان بۆی باس کرد. ئەو دەیزانی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکرێ و ئەو کاتەش دووبارە داوای واژووکردنی پارچە کاغەزێکی لێ دەکرێ تیایدا دان بەوەدا دەنێ بۆ کوشتنی ڕەجەوی بەکرێ گیراوە. ""دەبێ واژووی بکەی، ئەگینا لێت دەدەن"، بەم قسانە

هەڕەشەیان لێم کرد. من ئامادە نەبووم بڕوا بەمە بکەم، ئەوان ناشێ بەم شێوەیە قسە بکەن".

بەڵام قسەی ئەوان ڕاست دەرچوو و میرازگەری تووشی لێدان هات و جوێنی زۆری پێ درا. هەستم کرد جوێنەکان کاریگەریی زۆریان لەسەری هەبوو، بۆیە لەم بارەیەوە پرسیارم لێی کرد. "کارێکی سەرسامکەر بوو. شتی وایان دەگوت پێشتر ئەوانم نەبیستبوو وەک "دایکت بگێم"". ئەو کاتەی پاڵپەستۆم خستە سەری بۆ وەڵامێک پێی وتم جوێنەکان شێوەی هەڕەشەی سێکسییان لەخۆ گرتبوو و تەنیا ئاراستەی ئەو نەدەکران بگرە دایکی ئەویش. لەو زمانە پیسەشدا بوتڵی کۆلا ڕۆڵی بەردەوامی هەبوو. ئەم جۆرە هەڕەشە و جوێنانە ئەگەر کولتووری بەشەرمی ئێرانی لەتەکدا لە بەرچاو بگیرێ، کە تیایدا ئافرەت ڕۆڵێکی گەورەی هەیە زیاتر لە ئێمەی ڕۆئاوایی ئازادتر بەرێزە، دەردەکەوێ چەند سەختن. لە ماوەی سێ ڕۆژی لێکۆڵینەوە شەق و تێهەڵدان بەردەوام بوون. "دوای دوو ڕۆژ گوتم من بێگومان بۆ کوشتنی کەسێک هاتووم. دوای ئەمەش دووبارە دەستیان بەلێدانم کردەوە، لە ڕاستیدا نەمزانی چییان پێ بڵێم بۆ ئەوەی دەست لە لێدانم هەڵگرن. پێیان وتم: "تۆ چوویتە لای پاسداران و وا و وات وت..." منیش وتم: "باشە". دوای ئەمە دەبوو ئەوە بنووسمەوە. بۆ ڕۆژی دوای ئەوە وتیان ئێمە لەو شتانەمان کۆڵیوەتەوە و ڕاست دەرچوون، تۆ کارت بۆ هەواڵگریی ئێران کردووە. ئینجا دەستیان کردەوە بەلێدانم".

لەم ژوورە ئارامەی ئەڵمانیا کە دوورەدەستی ئەشکەنجەدەرانیەتی پێکەنینی بەو شتانە دێ. لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێ تا ئێستاش ترسێکی زۆری لە دڵە. لەبەرئەوەی نازانێ چی چاوەڕوانی دەکا. شەوێکیان لە کاتی لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا، گوێی لە قیژە و هاوارێکی بێ ئەندازە بوو لە ژوورەکەی بەرامبەرەوە دەهات، بەمەش ئەوەندەی تر ترسەکەی زیاد دەبوو. ئەو دەڵێ: "ئەو کەسەی هاواری دەکرد هیچی نەدەگوت و هیچی نەدەکرد". دیار بوو "ئەو کەسەی لەوێ ئەشکەنجە دەدرا زۆر ئازا بوو و هێشتا باوەڕی بەموجاهیدین مابوو...".

کە هاتەوە بۆ زیندانەکە باسی ئەو پیاوە و هاوارەکانی بۆ عەلی و عەباس کرد کە بووبوونە برادەری. ئەوان هەردووکیان لەوێ لە ناو زیندانەکەدا بڕوایان بەوە هێنا

موجاهیدینی خەلق ئەوە نین کە دێنە بەرچاو و بەزووترین کات هەر کە توانییان بەجێی دەهێڵن.

لە نیوەی شەودا یەکێ لە هاوزیندانانیان، کە پەرویز ئەحمەدی بوو، هێنرایە ژوورەوە. "وای لێ هاتبوو نەدەناسرایەوە، زۆر بەخراپی لێیان دابوو. لاقەکانی لە ناو پانتۆڵەکەیدا ئەستوور بووبوون. دەستەکانی شکابوون، هەروەها پەنجەکانیشی. هەر لە شێوەی مرۆڤ نەیانهێشتبوو". ئەو هاوارەی میرازگەری گوێی لێ بووبوو هاواری پەرویز بوو.

پەرویز لە باوەشی هاوزیندانەکانیدا دەمرێ. عەلی قەشقەوی دەڵێ "داوای ئاوی کرد. ویستم ئاوی بدەمێ بەڵام لەبەرئەوەی دەمی پڕ بوو لە خوێن پێی نەخورایەوە". دوای ماوەیەکی کورت پاسەوانەکان هاتن و لاشەکەیان برد. "ئێمە زۆر تووڕە بووین. نەماندەتوانی باوەڕ بەوە بکەین. ئەو فەرماندەیەکی دیار بوو. ئەگەر ڕێکخراوەکە بەو ئاسانییە بتوانێ ئەو بکوژێ، ئەی دەبێ چی لە ئێمە بکات؟ ئێمە بڕوای تەوامان بەوە هەبوو کەوا ئێمەش دەکوژرێین".

پەرویز ئەحمەدی تەنیا کەسێک نەبوو لەو ماوەیەدا لە ژێر ئەشکەنجەداندا بمرێ. چەند هەفتەیەک پێش ئەوە عەلی ڕەزا میرازگەری برادەرێکی ئێرانیی خۆی لە زینداندا دەبینێتەوە. قوربان عەلی تورابی ماوەیەک لە ماڵی میرازگەریدا خۆی شاردبووەوە و توانی ئەم بۆ ڕیزەکانی موجاهیدین بەکێش بکات. ئەم برادەرە بەم دواییە بووبووە بەرپرسێکی گەورە لە ناو موجاهیدیندا و ئەو کەسەی لێکۆڵینەوە لەگەڵ میرازگەری دەکات باسی دەکات. ئەو دەڵێ "ئەو سیخوڕە" میرازگەریش دەڵێ "نا، ئەمە نابێ، لەبەرئەوەی خێزانی ئەو چەندین شەهیدیان داوە کە بەهۆی ئەندامبوونیان لە موجاهیدین لە سێدارە دران". ئینجا میرازگەری دەدرێتە بەر لێدان تا دان بەوەدا دەنێ برادەرەکەی سیخوڕە.

"منیان بردە ژوورێکەوە و لەسەر کورسییەکیان دانام. دوای ئەمە تورابییان هێنا. هەموو گیانی تێک شکابوو و خەڵتانی خوێن کرابوو. لێیان پرسی "میرازگەری سەر بەدەزگای هەواڵگریی ئێرانە؟" ئەویش گوتی: "نا". ئینجا بەچاوبەستراوی تێریان لێی دا و بردیانەوە دەرەوە".

میرازگەری وا تێ گەیشت، تورابی کە ئێستە ڕووبەڕووی ئەو کراوەتەوە نایەوێ دان بەو شتەدا بنێ پێشتر دانی پێدا نابوو. "هەمان ئەو شتانەی بەمنیان کرد و پێیان نووسیم. گوایە من و تورابی بۆ هەواڵگریی ئێران کارمان کردووە و پلانمان بەیەکەوە بۆ کوشتنی ڕەجەوی داڕشتووە".

بەڵام ئیتر بواری ئەوە نەما تورابی ڕزگاری ببێت. عەباس سادقی نەجات لەو زیندانەدا بوو کە برادەرەکەی میرازگەرییان دوای ئەشکەنجەدانێکی زۆر بۆ هێنا، بەر لە گواستنەوە میرازگەری و عەلی قەشقەوی بۆ ئەوێ بەچەند ڕۆژێکی کەم. ئێستاش وەک ئەوەی دوێنێ بێ، بەڕوونی ئەوەی لە بیرە تورابی لە چ بارێکدا بوو کە فڕێ درایە زیندانەکەوە. "بەهیچ شێوەیەک چاوەکانی دیار نەمابوون، دەموچاوی ئەستوور بوویوو و خوێن دای پۆشیبوو" سادقی نەجات بەم شێوەیە بۆمی دەگێڕایەوە. "هەموو لەشی بریندار بوو و ئێسکەکانی شکا بوون. کاتێ فڕێیان دایە ناو زیندانەکەوە تەنیا ٢٠ خولەک ژیا".

ئێستاش دوای ئەوەندە ساڵە ئەم سێ کۆنە زیندانییە ناتوانن لەوە بگەن چ هۆیەک وای کرد پێویست بکات هاوڕێکەیان بەو شێوەیە بمرێ. قەشقەوی پێی وایە ئەوە ئامرازێک بووبێ بۆ ترساندنی ئەوانەی تر. میرازگەریش دەڵێ بۆ ترساندنی ئێمە بوو تاوەکو هیچ نەکەین و بەئارەزووی خۆیان گەمەمان پێ بکەن. سادقی نەجات دەڵێ "بزانە قوربان تورابی کێ بوو، ئەویش کەوتە زیندانەوە، هەمووومان بەوە سەرسام بووین، پلەی ئەو زۆر بەرز بوو. بەڵام ئەمە ئەوەشی ئاشکرا کرد کە نارەزایی و بەرهەڵستی گەیشتووەتە ئاستەکانی سەرەوەی ڕێکخراوەکە. ئەگەر یەکێکی وەکو ئەو بیەوێ بچێتە دەرەوە، ئەوە ئەوانی تریش زات دەیانگرێ و دەڕۆن. بۆیە ئەو خرایە ژێر پاڵەپەستۆیەکی زۆرترەوە. ئەو زانیاریی لا بوو، لە پلەیەکی بەرزدا بوو و ئامادە نەبوو هیچ بکات. پاڵەپەستۆی سەر ئەو زۆر زیاتر بوو".

سادقی نەجات چەند جارێک لەو ڕۆژانەی پێش مردنی قسەی لەگەڵ تورابیدا کردبوو. "ئێمە لە خۆمان دەپرسی بۆ لێرەین. تورابی گوتی: "نازانم، نەدەبوو ڕێکخراوەکەمان ئەم جۆرە زیندانەی هەبێ". ئەو پێی وا بوو کە ڕەجەویی ڕابەر بێئاگایە لەمە و ئەمانە گرووپێکن بەبێ ئاگاداری و ڕەزامەندیی ئەو ئەم کارە دەکەن.

ئەمە شێوەی بیرکردنەوەی ئێمە بوو".

من ئەم گومانەم لای زۆر لە کۆنە ئەندامانداا بەدی کرد. ئەوان بەهیچ شێوەیەک بڕوایان نەدەکرد کە ئەوەیان بەسەردا دێت. ئەگەر کەسێک پێیانی بگوتایە موجاهیدین بەندیخانەی هەیە و لەو بەندیخانەیەدا خەڵک ئەشکەنجە دەدرێن باوەڕیان پێی نەدەکرد. تەنانەت ئەو کۆنە ئەندامانەی خۆیان نەخرابوونە زیندانەوە، جاری یەکەم بڕوایان بەوە نەبوو پێشتر ئەندام بوونە لە بزووتنەوەیەک کە خەڵکی خۆی بەند بکات و ئەشکەنجەیان بدات.

نزیکەی هەموو کۆنە زیندانییەکان باسی ژووره بچووکەکانی لێکۆڵینەوە دەکەن کە بۆنی خوێنیان لێ دێت و بەدیوارەکانیانەوە خوێن و تۆپەڵە پرچ بەدی دەکرێن. هەر لێکۆڵینەوەیەک نزیکەی یەک ساتی دەخایاند و ڕۆژێ هەبوو و ڕۆژێک نەبوو و هەمان شێوازە کلاسیکەکانیان تێدا بەکار دەهێنران. هەندێ چیرۆک باس لەوە دەکەن چۆن هەندێ ئەندامی موجاهیدین بەناچاری دانیان بەتۆمەتەکاندا ناوە دوای ئەوەی خوشکیان، کە ئەویش ئەندامی موجاهیدین بووە، بە بەرچاویەوە زۆرگێ کراوە.

ئەم جۆرە چیرۆکانە لای ئەو زیندانییانەش باون کە لە سەردەمی حوکمی سەدام حوسێن لە زیندانەکانی عێراقدا زیندانی بوونە و بەراوردکردنیان شتێکی سەیر نییە لەبەرئەوەی پاسەوانەکانی موجاهیدین لە لایەن عێراقییەکانەوە مەشقیان پێ دەکرا. هەندێ چیرۆک هەن باس لە کەسانێک دەکەن ئەوەندە ئازاری دەروونی دراون هەر بەهاتنە دەرەوەیان لە لێکۆڵینەوە، خۆیان کوشتووە.

"دوو ڕێت لە پێشدا هەبوون بۆ گەڕانەوە بۆ ژووری زیندانەکەت: یان بەچوکلێتەوە یاخۆ بەگیانێکی شین و مۆرەوە" ئەمە قسەی سادقی نەجاتە. "ئەگەر ئەوەی ئەوان دەیڵێن بڵێیت و بنووسی ئەوە چوکلێتت دەدەنێ".

کۆنە زیندانییەکان ئەوەش دەڵێن کە لە ژێر چاودێریی بەرپرسانی گەورەی موجاهیدیندا ئەشکەنجەدان و لێکۆڵینەوەکان بەڕێوە دەچوون، ئەمان هەرچەندە چاویان بەسترابوو یاخۆ توورەگەیان لەسەر کرابوو ئەوانیان ناسیبووەوە. بۆ نموونە ناوی موحسین ڕەزاییی بەرپرسی بەندیخانەکە و حەسەن موحەسیل لە "نووسینگەی سیخوڕیی پێچەوانە" و نادر نافیع نەشاد کەسی دووەم لە بەشی دیپلۆماسیی

موجاهیدین و ئەندامی ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەرەنگاری. هەروەها ناوی حەسەن عیزەتییان هێنا کە باوکی یاسرە و بەنەریمان ناسرابوو. بۆ ئەوەی ڕۆڵی ئەمانە لە زیندانەکاندا لە کەسانی تری ناو موجاهیدین شاراوە بێت هەر یەکێک لەمانە دوو جۆرە ژیانی هەبوو، یەکێکی ئاشکرا و یەکێکی نهێنی. لەمەوە بۆم ئاشکرا بوو زیندانەکان فەرمان لە لووتکەوە وەردەگرن، لەو بڕاردە کەمەوە کە ژیانی هەزاران موجاهیدیان بەڕێوە دەبرد.

دیار نییە چەند بەندیخانەیان هەبووە. کۆنە زیندانییەکانیش دوایی بۆیان دەرکەوت چەند ساڵێک لە نزیکی یەکتردا بەند کرابوون. بەپێی محەمەد حوسێن سوبحانی موجاهیدین یەکەمین بەندیخانەی خۆیان لە ساڵ ١٩٨٩دا لە نزیک کەرکووک، لە ناوچەی کوردان، دروست کرد. دوای شەڕی ١٩٩١ی کەنداو بۆیان دەرکەوت ئەو بەندیخانەیە بچووکە و جێی گشت یاخیبووانی تێدا نابێتەوە. بۆیە بەندیخانەیەک لە مۆڵگەی ئەشرەفدا دروست کرا، کە هەر یەکێک لە ژوورەکانی دە تا بیست کەسێکی دەگرت. دوای ئەوە بینای زیاتر لە کەمپەکەدا دروست کران بەشێوەیەک بتوانرێ هەڵگەڕاوەکانی تێدا بەشێوەی تەنیایی زیندانی بکرێن. هۆکاری بێ ئاگاییی زۆربەی موجاهیدینیش لە بوونی ئەو بەندیخانانە بەزۆری بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو باڵەخانانە لە پشتی دیواری دەرەوەی کەمپەکەدا شاردرابوونەوە و لەسەر دەروازەکەیان نووسرابوو ئەوێ کۆگەی کەلوپەلی سەربازییە.

ڕێکخراوی چاودێریی مافی مرۆڤ لە ڕاپۆرتەکەیدا کە بەناوی (تەڵەزگە. پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لە کەمپەکانی ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلقدا، ئایاری ٢٠٠٥) بوو سێ جۆر بەندیخانەی دەستنیشان کردووە. یەکەمیان میوانخانەیە کە ئەو شوێنەیە پێشتر بۆ خێزانەکان تەرخان کرابوو و تیایدا دەشێ زیندانییەکان بەتەنیایی زیندانی بکرێن. دووەمیان جۆریکە لە کابینەی گەڕۆک یاخۆ بەنگەڵەی بچووک تیایاندا خەڵک زیندانی دەکرێن بۆ ئەوەی بیر لەو هەڵانە بکەنەوە کە کردوویانن و دوایی ڕاپۆرتیان لەسەر بنووسن. هەر کەسێکیش بخرێتە ئەو زیندانانەوە پێی دەگوترێ بەنگەڵەیی. جۆری سێیەمیش کە چاودێریی مافی مرۆڤ باسی دەکات زیندانە نهێنییەکانە وەک ئەوەی لە شەقامی ٤٠٠ی کەمپی ئەشرەفدا

ەبوو و قەشقەوی و میرازگەری و سادقی نەجاتی تێدا زیندانی کرابوون.

قەشقەوی لە بارەی ئەو جێیەوە دەڵێ "هەر وامدەزانی تەقەمەنی و دۆکیومێنتگەلی گرینگ لەوێ شاردراونەتەوە". ئەو سوێند دەخوا کە ئەو جێیە پێشانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەدات و ناوی ئەو جەللادانەشیان دەداتێ کە ئەشکەنجەی خەڵکیان تێدا بۆ ئەوەی بدرێنە دادگە. هەروەها یاسر عیزەتیش بەئاشکرا دەڵێ ئەگەر لە ئەڵمانیا هەر یەکێک لە پاسەوانەکان یاخۆ جەللادەکان ببینێ دەیداتە دەستی پۆلیسی ئەڵمانەوە.

کاتێ لە عەلی ڕەزا میرازگەریشم پرسی هەستی بەرامبەر بەو هاوڕێیانەی پاسەوانییان لێی دەکرد یاخۆ ئەشکەنجەیان دەدا چییە، زۆر بەسادەیی گوتی "ڕقم لێیانە". دوای ئەوەی ئەو لە ساڵی ١٩٩٤دا گەڕایەوە ناو ڕێکخراوەکە، یەکێ لە جەللادەکان بووبووە بەرپرسی ئەو، لێم پرسی تۆ بەوە قایل بووی؟ توانای ئەوەت هەبوو لەو بارەدا بژیت؟ "ئەی چیم پێ دەکرا؟ من تەنیا لەبەرئەوە لەگەڵ ڕێکخراوەکەدا مامەوە تا ژیانی خۆم بپارێزم. من دڵنیام زۆر کەسی تر هەمان ئەو هەستەیان هەبوو".

ئەی بۆ هاوڕێکانیان وا دڕندانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکردن، ئەمەیان نازانن. پێم وایە ژمارەیەک لە پاسەوانان بڕوایان وا بووە کە ڕاستە زیندانییەکان بەکرێگیراوی ئێران بوون. ئەمە لە وەڵامیان بۆ گازەندەی زیندانییان لە مامەڵەتی خراپیان دەردەکەوێ، کە پێیان دەگوتن: "ئەمە هەمان ئەو شتەیە ئێوە لە ئەڤین لەگەڵ موجاهیدیندا دەیکەن"، وەک ئەوەی ئەم زیندانییانە بەرپرس بن لەو شێوازەی مامەڵەتەی شا و خومەینی لەگەڵ زیندانییەکانی خۆیاندا. میرازگەری دەڵێ "هەندێ جار وامدەزانی دەسکاریی مێشکیان کراوە. وەک ئەوەی من بەدەستی حەسەن وحەسیلەوە دیم ئەو بەشێوەیەک لێی دەدام هەرگیز مرۆڤی ئاسایی ئەوە ناکات".

ئەمە ڕاست بوو من ئەمەم لە پسپۆڕی سایکۆلۆجیی کۆمەڵایەتی پرسی. بۆ نموونە سایکۆلۆجیستی ئەمەریکایی فیلیپ زیمباردۆ کە لە ساڵی ١٩٧١دا باڵێکی لە زانکۆی ستافۆرد هەبوو کرابووە زیندانێکی بەکۆمەڵ. ١٨ قوتابی کاریان لەو تاقیکردنەوەیەدا دەکرد کە تیایدا باری ناو بەندیخانەیەک لاسایی دەکرایەوە. نۆ

لەوان ڕۆڵی پاسەوانیان دەگێڕا و نیوەکەی تریشیان ڕۆڵی زیندانی. ئەو قوتابییە ئاساییانە لە ماوەیەکی کورتدا بوون بەپاسەوانگەلێک سڵیان لە سووکایەتی و توندوتیژی نەدەکردەوە. هەر بۆیە تاقیکردنەوەکە پێش بەکۆتا گەیشتن ڕاگیرا نەوەکو بارەکە لەوە خراپتر ببێت.

بەر لەوەش لە ساڵانی ١٩٦١ و ١٩٦٢دا سایکۆلۆجیستی کۆمەڵایەتیی ئەمەریکایی ستانلی میلگرام تاقیکردنەوەی لەسەر بابەتی گوێڕایەڵی بۆ کەسایەتیی دەسەڵاتدار کرد. ئەوانەی تاقیکردنەوەکەیان لەسەر کرا خەڵکی ئاساییی شاری نیوهێڤن بوون، فەرمانیان پێ درا هەندێ قوربانیی بێ تاوان لە کارەبا بدەن بەبێ ئەوەی بیانبینن، بەڵام گوێیان لە دەنگیان بوو. ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو ٦٥٪ی ئەو خەڵکە ئامادە بوون فەرمانی ئەو پیاوە جێبەجێ بکەن کە کراسێکی سپیی تاقیگەی لەبەردا بوو و بۆ زیادکردنی کاریگەریی کارەباکە ئامادەبوون هێزەکەی بگەیەننە ٤٥٠ ڤۆلت کە ئاستێکی کوشندەیە. دوایی ئاگەدار کرانەوە کە ئەو بەکارەباوەکردنە ڕاستی نەبوو و قوربانییەکان ڕووبەڕووی ئەو کارە کرانەوە کە کردوویانە. دەرکەوت ژمارەیەکی زۆر لەو "ئەشکەنجەدەرانە" هیچ کێشەیەکی نەبووە لەگەڵ ئەو کارەی کردوویەتی چونکە ئەوان سەرەڕای هەموو شتێک تەنیا ئەو فەرمانانەیان جێبەجێ کردووە کە لە چوارچێوەی تاقیکردنەوەیەکی زانستیدا پێیان دراوە.

مەسعود ڕەجەوی، کە زۆر دەخوێنێتەوە و ڕەنگە ئاگەداری ئەم تاقیکردنەوانە بێ، دەزانێ چۆن یاری بەخەڵکی خۆی بکات بەشێوەیەک وایان لێ بکات بەخۆشحاڵییەوە یەکتری بەند بکەن و ئەشکەنجە بدەن. میرازگەری پرسیاری لە خۆی دەکرد بۆ نەکوژرا، کە کارێکی زۆر ئاسان بوو، وەک ئەوەی لە تاقیکردنەوەکەی پێشوودا بۆمان دەرکەوت. بەڵام هەر خۆی دەگاتە ئەو ئاکامەی کە کوشتنی چەند سەد کەسێک ڕەنگە ببێتە هۆی زیادکردنی ئەو ئاڵۆزییەی هەبوو و، سەرهەڵدانی پرسیاری زۆر لە لایەن ئەندامان و لایەنگران و کۆنە ئەندامانەوە لە ئەورووپا، ئەمەش دەبووە مایەی شەرمەزاری بۆ ڕێژیمی سەدام. لەبەرئەوەی سەدام زۆر گوێی دەدا بەکاردانەوەکان لە بەرامبەر پێشێلکردنەکانی مافی مرۆڤ لە لایەن خۆیەوە.

ئەمە ئەو ڕاستییە ناشارێتەوە، کە لە قسەکانی حوسێن فورقانی دەردەکەون و لەو

چیرۆکانەشی باسی "خۆکوشتن" لە باری نادیاردا دەکەن. کۆنە ئەندامان ئەوەیان بەمن گوت کە ژمارەیەک لە هاوڕێیانیان چەندان ساڵە هیچ ئاماژەیەکیان لێ ئاشکرا نەبووە نیشانەی ئەوە بێت لە ژیاندا مابن. ئەوانیش دەیانەوێ لیستێک بەناوی ئەو کەسانەوە دروست بکەن کە شوێن بزرن.

بۆ خەڵک ئەم جۆرە ئازارانە بەکەسانی تر دەگەیەنن؟، ئانیک فان دن براندی هەواڵنێری ڕۆژنامەی تراوفی هۆڵەندی لە سەرەتای ۲۰۰۵دا پرسیاری لە سایکۆلۆجیستی کۆمەلایەتیی هۆڵەندی ساندەر کوول لە زانکۆی ئەمستەردام کرد (بابەتەکە لە ژمارەی ٥ی ئاداری ۲۰۰٥ی ڕۆژنامەکەدا بلاو کراوەتەوە بەناوونیشانی "کەسایەتیی بەهێز ئەشکەنجەی خەڵک نادات"). دیمانەکە لە بارەی ئەشکەنجەدانی زیندانییە عێراقییەکان بوو لە لایەن سەربازانی ئەمەریکا و بەریتانیاوە، بەلام هاوکارم بوو بۆ تێگەیشتنی ئەوەی لە بەندیخانەکاندا چی ڕوو دەدات. کوول کە کاری لەسەر تاقیکردنەوە ئەمەریکاییەکان کردووە و گەیشتووەتە ئەوەی پاڵەپەستۆی بەکۆمەڵ زیاد دەبێ لەو کاتەی مرۆڤ ڕووبەڕووی بێتوانایی و سنوورداری دەبێتەوە.

ئەوەی ناوی لێ نرا تیۆری بەڕێوەبردنی تیرۆر، پێوەستی بەڕووبەڕووبوونەوەی پاڵنەرە نەستییەکانی خۆپاراستن لەگەڵ ترسی ئیفلیجکەر لە مەرگ هەیە. بۆ ئەوەی بەردەوام بەدەوری ئەو تەوەرەدا نەسووڕێنەوە، خەڵک بەبێ ئەوەی مەبەستیان بێ ترسی مردن لە مێشکی خۆیان دەسڕنەوە. ئەگەر واش نەکەن ئەوا لە کار دەکەون و تووشی کێشەگەلی سایکۆلۆجی دەبن. بۆیە بۆ بەزاندنی ئەو ترسە دەچنە پاڵ ئەو هێزانەوە کە خەڵکێک لەخۆ دەگرن وەکو یەکتری بیر بکەنەوە و یەک کولتووریان هەبێ و لە ڕێی بینینی ڕۆڵێکی ئەرێنی لەو گرووپەدا، بەگوتەی کوول ئەوە "هەست بەئارامییەکی سۆزداری دەبەخشێ، کە جۆرێکە لە نەمریی هێمایی و ئینجا هەستێکی باش بەدەست دەهێنێتەوە".

هەروەها کوول دەڵێ لە کاتی ترسدا کاردانەوەی خەڵک سۆزدارانە دەبێ نەک لۆجیکی. بۆ ڕەواندنەوەی ترس تا پێیان بکرێ لەگەڵ گرووپەکەیان زیاتر تێکەڵ دەبن و بەدڵ و بەگیان بەرگری لێ دەکەن و ئەگەر بەپێویستی بزانن توندوتیژیش بەکار

دێن. بەبۆچوونی ئەوە ئەمە لە کاتی ناردنی سەربازانی ئەمەریکا بۆ عێراق ڕووی دا کە لە دوای ئەوەی شوێنکەوتووانی سەدام بە"بەرجەستەکارانی ئەهریمەن" ناسێنران. "سوپاکە لە سەلامەتیی گیانی سەربازانی دڵنیا نییە. سەرباری ئەمەش ئەو پێدا هەڵدانە زۆرەی سەرۆک بوش بەکولتووری خۆیاندا کە کولتووری ڕۆئاوایە. ئەمانە بێ ئەوەی هەست بکەن مافی سووکایەتی و تێکشکاندنی کولتوورەکەی تریان بەو سەربازانە دا. گرووپەکە داوا دەکات وەکو تۆنێک بەرد بکەون بەسەر دوژمندا. ئەوانیش وا دەکەن".

کوول پێی وایە ئەمە باوە و بەهۆی کەمتەرخەمی لە ڕێکخستنیانەوە نییە، ئەو کەسانەی سۆز پاڵنەریانە دەبنە قوربانی ئەم میکانیزمە. هەر ئەمەش هۆی ئەو پێشێلکارییانە بوو کە ئەمەریکاییەکان لە بەندیخانەی ئەبوغرێبدا کردیان. "لە کاتی ئاساییدا ئەوان خەڵکێکن بەڕەوشت، لەبەرئەوەی سەرکردایەتییەکەیان داوای ئەوەیان لێ دەکات". ئەگەر کارەکەشیان شایانی سەرزەنشت بێ، خەڵک دەیانەوێ بەئەخلاقەوە لەسەر پێ بمێنن. "ئەوان پێیان وایە ئەو کارەی دەیکەن هۆکارێکی باشی لە دواوەیە".

تاکگەلێکی کەم دەتوانن لەم پابەندییە بەکۆمەڵە خۆیان بەدوور بگرن. ئەو خەڵکەی دووچاری سەرکوتکردن و شڵەژانی کاری دەمارەکان بوونە و خەڵکی کەللەڕەق بەکەمی گوێ بەوە دەدەن کە دەوروبەریان لە بارەیانەوە دەیڵێ و ڕێ بەخۆیان نادەن بەئاسانی بکەونە ژێر کاریگەریی گرووپەکەیانەوە و کاری نابەجێ و ئەشکەنجەی خەڵکی تر بدەن. کە قسەکانی کوولم خوێندەوە، یەکسەر یاسر عیزەتیم هاتە بیر، ئەو کەسە خاوەن ویستەی قایل نەبوو لە هەتیوخانەکاندا دەستەمۆ بکرێ. هەروەها باوکی کە سەرەڕای کارەکەی لە زیندانە نهێنییەکاندا بەردەوام بوو لە کارکردن لەگەڵ ڕێکخراوەکەدا و مێشی مێوان نەبوو، بگرە شانازیی بەوەوە دەکرد کاری باشی بۆ مەجاهیدینی خەلق کردگە.

بۆ من تیۆرییەکەی کوول بەشێکی زۆری مەتەڵەکەی هەڵێنا. ئەوەم بۆ دەرکەوت کە پاڵەپەستۆی گرووپ ئەو بناخەیە کە موجاهیدینی خەلقی لەسەر ڕاوەستاوە. کۆنە ئەندامان بەتەواوی دەشڵەژان کاتێ ڕووبەڕووی ئەو کارانەم دەکردنەوە بەرامبەر

بەیەکتر کردوویانە و چۆن لە سەرکوتکردنی یەکتریدا هاوکار بوونە و یەکترییان ڕەوانەی بەندیخانە کردووە و پاسەوان بوونە بەدیار یەکترییەوە و تەنانەت ئەشکەنجەی یەکتریشیان داوە. هیچی ترمان لە پێشدا نەبوو بیکەین، ئێمە بڕوای تەواومان هەبوو ئەوانە ناپاکن و بەو کارەمان هاوکاریی ڕێکخراوەکەمان دەکرد و ئەو کارە زۆر پێویست بوو بۆ ئەو شەڕەی دژی ئێران دەمانکرد، ئەوان بەم قسانە پاساویان بۆ کارەکانیان دەهێنایەوە.

حوسێن فورقانی بەم شێوەیە دان بەو کارانەدا دەنێ: "من هاوڕێیانی خۆم ئەشکەنجە دەدا بۆ ئەوەی هەموو گومانێک لەوەی کار بۆ خومەینی یان ساواک دەکەم، لەسەر خۆم لادەم". دوای کۆتاییی شەڕی ئێران عێراق، ڕەجەوی داوای لە شوێنکەوتووانی خۆی کرد بیسەلمێنن کە مانەوەیان بەهۆی ئەوەوە نییە هاوکاریی ڕێژیمەکانی شا یان خومەینییان کردبێ. ئەم شتە بەزۆری ئاراستەی ئەو کەسانە دەکرا کە لە دوای ١٩٨٨ گومانیان هەبوو و پشتیان لە ڕێکخراوەکە کردبوو. موجاهیدین دەیانتوانی خۆیان لە لێپرسینەوە دوور بخەنەوە بەتوندترکردنی پاڵەپەستۆی سەر هاوڕێکانیان. لێرەدا تیۆرییەکەی کوول بەدی دێت: هاوڕێکان وەک بەکرێگیراوی دوژمن، کە لێرەدا ڕێژیمی ئێرانە، پێشان دەدرێن. ئەمەش کارێکی ناشیرین و قێزەونە. بۆیە پێویستە شتێک بەرامبەر بەمە بکرێ. ڕەفتاری ئەمانیش ئەو شتە بوو.

تەنانەت دوای چەندان ساڵیش فورقانی هێشتا زۆر بەکەمی هەست بەتاوان دەکات. ئەو زیاتر بەو پرسیارەوە سەرقاڵە کە بۆ پێویست بوو هەموو ئەندامان ئەوە بسەلمێنن هاوکاریی ڕێژیمی ئێرانیان نەکردووە، لە کاتێکدا مەسعود ڕەجەوی لە سەردەمی شادا حوکمی لە سێدارەدانەکەی کەم کرایەوە بۆ زیندانی هەتاهەتایی. "بۆ ساواک نەیانکوشت؟ لەبەرئەوەی کاری بۆ ئەوان یان بۆ ئاژانسی ناوەندیی هەواڵگریی ئەمەریکا دەکرد؟ ئەم پرسیارە تا ئێستاش مێشکمی داگیر کردووە".

من پێم وایە ئەو زۆر شڵەژاوە، لەبەرئەوەی فورقانی وەکو زۆربەی هاوڕێکانی، زۆر بەدەستی پاڵەپەستۆی بەکۆمەڵی سایکۆلۆجییەوە لە کۆبوونەوەکاندا ئازاریان دیوە. ئەوان تا درەنگی شەو دەهێڵرانەوە و قوربانییەکانیشیان بۆ بەئاگا دەهێنران. ئەو

قوربانییانە هێشتا چاویان بەخەوەوە بوو، کە خۆیان بەرەورووی پەنجا تا سەد کەس دەبینییەوە هەموویان پرسیاریان ئاراستە دەکردن و هەر کەس دەیویست پێش ئەوانی تر بەقسە قایلی بکات و دوای ئەوە هەڕەشە و توندوتیژی دەستی پێ دەکرد.

مەسعود خودابەندە، کە لە هەواڵگریی موجاهیدیندا کاری دەکرد و بەرپرس بوو لە چاودێریکردنی هاوڕێکانی دانی بەوەدا نا کاتێ لە پۆستی خۆیدا بوو، هەروەکو فورقانی، محەمەد حوسێن سوبحانیی نارده زیندانەوە. ئەو کاتە ئەو بەشێک بوو لە گرووپەکە و هەرچییەکی پێ بگوترایە لە پێناوی بەرگریکردن لە گرووپەکەیدا جێبەجێی دەکرد، من ئەم ڕاستییەم لە ڕوونکرنەوەکانی کوولەوە بۆ دەرکەوت.

بەپێی قسەکانی خودابەندە، ڕەجەوی پێی وابوو کە لە ناو گرووپەکەی خۆیەوە هێرشی دەکرێتە سەر و ڕەنگە لە لایەن هێزە ئەمنییەکانی خۆیەوە ئەو کارە بکرێ. سوبحانیش بەرپرسی دەزگا ئەمنییەکەی ڕەجەوی بوو. بۆیە خودابەندە فەرمانی پێ درا بۆ ئەم مەبەستە چاودێریی بکات. "ئەگەر هەر ئاماژەیەکەیشمان بۆ دەرکەوت یەکسەر بیگۆڕین". ئەم کارە بەبەردەوامی بوو. سوبحانی هەندێ شتی گوماناویی لێ دەرکەوت، ڕەخنەی هەبوو و ئەو ڕەخنانەی باس دەکرد، بۆیە وەک مەترسییەک لەسەر ئاسایش سەیری دەکرا. بۆیە پێویست بوو لەوێ نەمێنێ.

خودابەندە وەک خاوەن کارێک دەڵێ "هەندێ جار دوای ماوەیەکی کەم ئەو کەسانە دەهاتنەوە و هەندێ جاری تریش نەدەهاتنەوە". ئەم دەزانێ هەندێ لە زیندانییەکان ناچار کران خۆیان بکوژن. سوبحانی نەگەڕایەوە. دوای هەشت ساڵ مانەوە لە زیندان و بەدەستەوەدانی بەئێران توانی ڕا بکات.

ئەرکی دەزگای هەواڵگریی موجاهیدین تەنیا چاودێریکردنی ئەو خەڵکانە نەبوو کە ڕەنگە پلانیان لە دژی مەسعود و مریەم ڕەجەویدا هەبێ بەفەرمانی ئێران یاخۆ بەهەر شێوەیەکی تر ئەو پلانانەیان هەبێ. خودابەندە دەڵی هەواڵگریی ئێران توانیبوویان دزە بکەنە ناو ڕێکخراوەکەوە، بۆیە بەشێکی هەواڵگری بەرپرس بوو لە چاودێریکردنی ئەو کەسانەی گومانیان لێ دەکرێ بۆ ئێرانییەکان کار بکەن. بەڵام ئەم گومانانە وایان کرد هەر کەسێک ڕەخنەی لە "شۆڕشی ئایدیۆلۆجیایی" هەبێت مۆری "سیخوڕی ئێران"ی لێ بدرێ. ئینجا هەواڵگری ئەمانەی دەخستە بازنەی

گومانەوە. "ئەوەی ڕێی بۆ ئێران خۆش کرد دزە بکاتە ناو بەرزترین ئاستەوە، ئەوە بوو پێویست بوو وەکو دوو خوا تەماشای مەسعود و مریەم ڕەجەوی بکەیت" خودابەندە وا دەڵێ.

دوای چەند مانگێک لە زیندان، وردە وردە پاڵەپەستۆ لەسەر عەلی ڕەزا میرازگەری کەم بووەوە. لەبەرئەوەی سەرکردایەتی پێی وابوو ئەو ئەوەندە ترساوە کە بکرێ دووبارە بگەڕێتەوە ژێر بارەکە. ڕۆژێک حەسەن موحەسلی بەرپرسی لێکۆڵەوەکان بەپێکەنینەوە لێی دەپرسێ: "ئەم هەموو شتە تۆ نووسیوتە، ئەمانە هەموویان ڕاستن؟" منیش وتم: "من سەر بەهەواڵگریی ئێرانم" ئەویش وتی "نە. تۆ کوڕی مەسعودی". من شڵەژابووم و زۆر دەترسام بڵێم بەڵێ و دەشترسام بڵێم نەخێر لە ترسی ئەوەی دیسان ئەشکەنجە بدرێمەوە. دوای سێ ڕۆژ میوەیان بۆم هێنا و گوتیان ئێستا ڕاستییەکەمان بۆ دەنووسی. "باشە ئەو هەموو قسە قۆڕە چی بوو بەمنت دەگوت؟" ئەو پرسی، "دەزانی ئەوە چ وزەیەکی پێویست بوو؟".

دوای ئەمە میرازگەری بەرگە یەککگرتووەکە لەبەر دەکاتەوە و دەخرێتە ناو ئۆتۆمۆبێلێکەوە. ئەو ترسا هیچ پرسیارێکی تر بکات، بەڵام سەرسام بوو بەوەی خۆی لە ژوورێکی بنکەیەکدا بینییەوە نزیک شاری فەلووجەی عێراق، لە ژوورەکەدا ڕەجەوی لە پشت مێزێکی گەورەوە دانیشتبوو. ئەوەی لەمەش سەیرتر بوو ڕەجەوی پرسیاری قوربان تورابیی هاوڕێی لێی کرد و وتی "قوربان لەگەڵ تۆ بوو؟ نە؟ باشە، ئەمە دڵخۆشم دەکا کە نەتانکوشتووە". ئەو کاتە میرازگەری ئاگای لێ نەبوو تورابی مردووە. "ڕەجەوی شتێکی پیشانم دا کە قوربان نووسیبووی و وای پیشان دا کە ئەو نووسینە وای کرد من بخرێمە بەندیخانەوە. دوای ئەوە گوتی قوربانی خۆی کوشتووە ئەوەش ئەمانی لەوە دڵنیا کردووەتەوە کە ئەو بۆ هەواڵگریی ئێران کاری دەکرد. بەڵام ڕێمان پێ نەدەدرا باسی ئەو بابەتە بکەین، چونکە خێزانە پڕ لە شەهیدەکەی ئەو لەکەدار دەکات".

ئینجا کۆبوونەوەیەک لەگەڵ مەسعود و مریەم کرا نزیکەی ۳۰ کەس بەشدار بوون. تیایدا ئامێرێکی وۆکیتۆکی و تفەنگێک و چەند پلانێکیان نیشان دا و گوتیان ئەو شتانە هی هەواڵگریی ئێرانن. میرازگەری دەڵێ ئەو پیاوانە سەبارەت بەتێوەگلانیان

لەو پلانانەدا درۆیان دەکرد. بەپیاسەیەکەوە وردە وردە خێراتر دەبوو و دەنگیشی بەرەبەرە بەرز دەبووەوە و بەخەمێکی زۆرەوە چیرۆکی خۆی دەگێڕایەوە. ئەو و هاوڕێ بەدبەختەکانی لە ژێر ئەشکەنجەدا ناچار کرابوون دان بەو شتانەدا بنێن. "ڕەجەوی گوتی: "ئێوە ناشێ بەوە بڵێن ئەشکەنجە، ئەوان چاودێر بوون جەللاد نەبوون. هۆ شی مین بەیەک شەو سەد ئەندامی پەرلەمانی کوشت، بەڵام ئێرە ڤێتنام نییە، ئێمە شتگەلی وا ناکەین". مریەمیش گوتی ئەو لێمان خۆش بووە، بەڵام ئێمە خەرجیی زۆرمان تێ چووە. ئێمەش نەمانوێرا بڵێین وا نییە".

بەڵام عەلی قەشقانی کە نۆرەی هات بۆ بینینی ڕەجەوی نەیتوانی بێدەنگ بێت. ئەو دەڵێ لەو کاتەوە تێ گەیشتبوو ڕەجەوی پیاوێکی ترسناکە و هیچ ڕێزێک بۆ خەڵکی خۆی دانانێ. "لێم پرسی: "بۆ پەرویزتان کوشت؟" ئەویش گوتی لەبەرئەوەی سیخوڕی ئێران بوو. من ڕەتم کردەوە و گوتم: "بەڵام ئەو وەک فەرماندەیەک زیاتر لە سەد ئۆپەراسیۆنی دژ بەڕێژیمی ئێران بۆ تۆ بەڕێوە برد!" ئەویش گوتی: "باسی ئەو مەکە باسی خۆت بکە. تۆ ئامادەی بۆ ئۆپەراسیۆنێکی نوێ لە ئێران؟" وەڵامم دایەوە: "دەبێ بیری لێ بکەمەوە". ڕەجەوی وتی: "ئەو خەڵکەی ناو زیندانەکە ئەرکی خۆیان ئەنجام دا. ئێمە نازانین تۆ سەر بەڕێژیمی یان نە، دەبێ لەمە بکۆڵینەوە. ئەگەر سەر بەڕێژیم نەبی ئەوە سەر بەخۆمانی".

بێگومان دوای ئازادکردن، قەشقەوی و ئەوانی تریش ڕێیان پێ نەدەدرا سەبارەت ئەوەی لە زینداندا بەسەریان هات قسە بۆ کەس بکەن. بگرە فەرمانیان پێ درا بڵێن لەو ماوەیەدا لە ئەوروپا بوون، ئەمەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە دەموچاویان کاتی خۆی لەبەر خۆری گەرمی عێراقدا ڕەش بووبوو ئێستا ڕەنگی سپی بووەتەوە.

میرازگەری و سادقی ڕێیان پێ درا بگەڕێنەوە ناو ڕێکخراوەکە. بەمنیان گوت خۆیان ئەمەیان هەڵبژارد بۆ ئەوەی لە گەڕانەوە بۆ بەندیخانە ڕزگاریان ببێ، چونکە عەلی قەشقەوی گەڕایەوە زیندان. بەڵام ئەوەیان پێ قبووڵ نەبوو لە "دانیشتنی دانپیانانی ڕۆژانەدا" بەشداری بکەن، هەروەها لە کۆبوونەوەکانی تریش و بەردەوام بەبەرپرسەکانی خۆیان دەگوت دەیانەوێ ڕێکخراوەکە بەجێ بهێڵن.

تەنانەت ئەو پێشتەماڵە تەڕەی ڕەجەوی تازە خۆی پێ وشک کردبووەوە و دایە

دەستی عەلی ڕەزا میرازگەری وەک ئاماژەیەک بۆ ئاشتی، نەیتوانی وای لێ بکات ڕای خۆی بگۆڕێ. ئەو پێشتر ئەو پێشتەماڵەی بەشتێکی پیرۆز دەزانی، بەپێکەنینەوە دەڵێ "بەڵام ئێستا دەزانم ڕەجەوی خۆی بەرپرس بوو لەو زیندانانە".

ڕێکخراوەکە میرازگەری بەبۆندێکی دوو ساڵی دەبەستێتەوە، کە دوای ئەوە ڕێی پێ بدەن بڕوات. ئەوان پێیان وابوو لەو ماوەیەدا مێشکی بەباشی دەشۆڕێتەوە و خۆی داوای مانەوە دەکات. میرازگەری بەهەناسەساردییەوە بۆندەکە واژوو دەکات. ئەو هیچ بژارەیەکی تری بەدەستەوە نەبوو و بڕوای نەبوو بارەکە بەرەو باشتر بچێ.

دوای ئەمە ژیانی دەگۆڕێ لەبەرئەوەی دەست بەدڵداری دەکات کە گەورەترین گوناهە لای موجاهیدین. بەڵام بۆ میرازگەری ئەوە ڕۆژ بوو بۆ جارێکی تر خەریک بوو هەڵبێت. زۆر بەشیرینی باسی موناى بۆم کرد، کە فەرماندەی تانکێک بوو، کچی پارێزەرێکیش بوو ئەویش بەژیانی کچەکەی لە کەمپی ئەشرەفدا خۆشحاڵ نەبوو. سەیرە لە ڕێکخراوێکدا سەختترین کۆنترۆڵی باری کۆمەڵایەتی پێڕەو دەکات و پێوەندیی نێوان پیاوان و ئافرەتان قەدەغەیە، ئەم دووە بتوانن لە کۆتاییی هەر هەفتەیەکدا لە گۆڕستانی شەهیداندا یەکتری ببینن. ئەمەیان چۆن دەکرد، ئەوەی بۆم باس نەکرد، تەنیا ئەوەی گوت کە وایان دەکرد. ئەوان باسی دواڕۆژێکیان دەکرد بەیەکەوە کۆیان بکاتەوە دوور لە ڕێکخراوەکە. میرازگەری بەشەرمەوە دانی پێدا دەنێ "تەنیا دادەنیشتین و دەستی یەکتریمان دەگرت". لە کۆتاییدا دوای نزیکەی مانگێک ئاشکرا بوون و بۆ ماوەی چەند مانگێک نەیتوانی مونا ببینێ.

لە سەرەتای ١٩٩٦دا سێ ئافرەتی ئەندام لە موجاهیدین بەڕووداوی ئۆتۆمۆبێل مردن، دەنگۆی ئەوە هەبوو مونا کە ئۆتۆمۆبێلەکەی لێ دەخوڕی بۆ ئەوەی خۆی بکوژێ ئەو کارەی کردووە. بۆ لەباربردنی ئەو قسەڵۆکانەش مونا بەشێوەیەکی زۆر شەرەفمەندانە نێژرا، بە بەرچاوی هەموو سوپای ئازادیخوازەوە. میرازگەری لەوێ ئامادە نەبوو. "من تووشی خوێنبەربوونی گەدە بووبووم و لە نەخۆشخانە بووم. ئێمە بەڕاستی یەکتریمان خۆش دەویست. پێم وایە ئەویان خستبووە ژێر پاڵەپەستۆی زۆرەوە بۆیە خۆی کوشت".

ئەو ڕووداوە هەشت ساڵی بەسەردا تێ پەڕیوە بەڵام ئەو هێشتا بەئازارێکی

دیارەوە باسی دەکات. "ئەو هێشتا لەگەڵمدایە. کەس ناتوانێ جێی ئەو لە دڵمدا بگرێتەوە. زۆر بیری لێ دەکەمەوە".

چیرۆکەکەی میرازگەری کاری زۆری تێ کردم و بۆ من بووە سیمبولێک بۆ ئەوەی بەسەر خەڵکی ناو موجاهیدیندا دێ. لەو دوو ساڵەی دوای ئەوەدا، ئەوەی لە ژووری لێکۆڵینەوەدا بینیبووی بۆ کارێکی تری بەکار هێنا، ئەم بەرپرس بوو لەوەی بزانێ ئەو کەسانەی تازە دێنە ناو ڕێکخراوەکەوە جێی متمانەن، هەڵبەت ئەمەی بێ بەکارهێنانی توندوتیژی دەکرد، لەسەر ئەمە سوێندی بۆم خوارد. دوای تەواوبوونی دوو ساڵ ویستی وا لە موجاهیدین بکا ئەو بۆندە جێبەجێ بکەن کە لەگەڵیاندا واژووی کردبوو: وەک بەڵێنیان پێی دابوو، دەبێ ڕێکخراوەکە بیباتە ئیسپانیا. بەڵام پێیان گوت: "تۆ زانیاریی زۆرت لایە و ناکرێ بڕۆی". ئەو ئەمەی زۆر بەلاوە سەیر نەبوو، بەڵام ئەم کارە دواتروسکاییی هیوای لێ سەندەوە دوای مەرگی مونا.

ئینجا دەستی بەرەخنەگرتنی ئاشکرا کرد لە کۆبوونەوەکاندا، بەتایبەتی کە بۆی دەرکەوت موجاهیدین بەپەرویز ئەحمەدی، کە بە بەرچاوی ئەوەوە لە بەندیخانەی ئەشرەفدا مرد، دەڵێن شەهیدە و بەدەستی سیخوڕانی هەواڵگریی ئێران کوژراوە. بەرپرسەکەی جۆرێک لە تێگەیشتن پێشان دەدا، پێوەندیی بەوەوە لە ڕووی مرۆڤانەوە زۆر پێویست بوو. "هەموو شتێکم بۆی باس کرد. لە بارەی بەندیخانە و بۆندەکەوە. بڕوام پێی کرد و وامزانی ئەویش چیی تر نایەوێ لە ناو موجاهیدین بمێنێتەوە. ئەویش پرسەکەی منی بۆ سەرکردەکان بەرز کردەوە".

بەڵام ئەم کارە میرازگەریی ناردەوە بەندیخانە. باسی ئەوەی بۆم کرد ژنێک لە سەرکردایەتی بەناوی بەتوول ڕەزایی لەوێ چاوەڕوانی بوو. تووڕە بووبوو و وشەکان لە دەمی دەفڕین و زۆر بەخێرایی دەهاتنە دەرەوە. "جوێنی بەمن دەدا. قیژاندی بەسەرما "ئەوەی تۆ لەو خوشکەمانت کرد کەس نەیکردووە". من هیچ لەمە تێ نەگەیشتم. ئینجا وتی: "فاتیمە غولامی هەموو شتێکی بۆمان گێڕاوەتەوە، ئێوە سێکستان بەیەکەوە ئەنجام داوە. نکووڵی لەمە نەکەی. ئەمە پێشتر ڕووی نەداوە، پێوەندیی لەگەڵ کەسی سەرووی خۆتدا بکەیت. دەبێ لە سێدارە بدرێیت"."

میرازگەری سەری لەقاند و تەماشای منی کرد و گوتی: "فاتیمە بەدایکی من دەشیا".

میرازگەری گوتی ئەم جارە کەمتر لە زیندان دەترسا، لەبەرئەوەی دەیزانی چی ڕوو دەدا. بەڵام دوایی پێیان گوت دایک و باوکی لە ئێران گیراون و خوشکەکەی لە سێدارە دراوە. ڕێکخراوەکە ئەمەی بەدەستی ئەنقەست کرد بۆ ئەوەی هیچ هۆیەکی بۆ نەهێڵنەوە بۆ ژیان لە دەرەوە. "ئیتر ویستی ڕۆیشتنم نەما، لەبەرئەوەی کەسم لە دەرەوەی موجاهیدیندا نەما".

دوای هەشت مانگ زیندانیکردن ئەویان گێڕایەوە ناو ڕێکخراوەکە وەکو داواکەرێکی پەنابەری و بەهیچ شێوەیەک ڕێی پێ نەدەدرا بچێتە بازنەی متمانەی هاوڕێیانیەوە. بۆ ماوەی سێ ساڵ لە باخچەکاندا کاری کرد و تێکەڵی هیچ کەسێک نەدەبوو و هەموویان خۆیان لێی بەدوور دەگرت. بەمنی گوت ئەو وەکو ئەوە بوو لە ناو قۆزاخەدا بێت و لە ڕووی جەستەیی و دەروونییەوە گەیشتبووە ئەوپەڕی لاوازی. "من ڕووخابووم. تەنیا لاشەیەکی بێ گیان بووم بەڕێوە دەڕۆیشت. تەنیا لەشم بەئاستەم کاری دەکرد و هیچی ترم نەمابوو".

بەڵام میرازگەری ناڕووخێ و دەست بەهەموو ژیانبەخشێکەوە دەگرێ کە بێتە سەر ڕێیەوە. کاتێ وەکو پەرجوویەک توانی پێوەندی بکاتەوە بەمریەمی خوشکی کە لە هۆڵندا دەژیا، هیواکانی زیندوو بوونەوە. "موجاهیدین ویستبوویان خۆی و مێردەکەی بهێننە عێراق. بۆیە هەلی ئەوەیان پێی دابوو نامەیەکم بۆ بنووسێ. ئەو ١٢ ساڵ بوو هیچی لە بارەی منەوە نەبیستبوو و ئێستا لە هۆڵەندایە، دەیەوێ دەنگوباسی من بزانێ. بەڵام ڕقی لە ڕێکخراوەکەش بوو".

بۆ ئەوەی هانی بدا بۆ هاتن بۆ کەمپی ئەشرەف، بەمیان وت نامەی بۆ بنووسێ و لە ڕێی تەلەفۆنەوە هانی بدات. لە پێوەندییەکی درێژی تەلەفۆنیدا بۆی دەرکەوت باوک و دایکی لە ئێرانن و زۆر باش و سەلامەتن، هەر وەکو خوشکەکەی. لەو ساتەوە کەمتر هەستی بەلاوازی دەکرد: ئێستا کەسێک هەیە لە ئەوروپا دەزانێ ئەم لە بارێکی زۆر خراپدا دەژی و هەوڵی بۆ دەدا. ئێستا جیهانێک لە دەرەوە هەیە و ئەم دەتوانێ بچێتە ناوی. ئەمە وورەی بەرز کردەوە.

باسی ئەو فێڵانەی بۆم کرد کە توانی بەهۆیانەوە خوشکەکەی تێ بگەیەنێ ئەم لە چ بارودۆخێکی خراپدایە، بۆ نموونە نامەیەکی بۆ خوشکەکەی نووسی بەشێوەیەک

له سانسۆری موجاهیدین دەرباز ببێ، تیایدا بەخوشکەکەی دەڵێ وەرە بۆ عێراق و من لێرە زۆر باشم، بەڵام وێنەیەکی خۆی بۆ دەنێرێ کە زۆر بەڕوونی باری خراپی پێشان دەدات.

بڕیار دەدا ئامۆژگاریی برادەرێکی جێبەجێ بکات و وا نیشان بدا هاوکاریی موجاهیدین دەکا، بەمەش هەلی باشتری بۆ هەڵاتن دەبێ. ئەم کارەی دەبێتە هۆی پاداشتکردنی و ئەم جارە لە لایەن ڕێکخراوەکەوە، لە پێناوی ڕێگرتن لە هەڵبژاردنەوەی سەرۆک خاتەمی، چالاکیی پارتیزانیی پێ دەسپێردرێ.

ڕەجەوی چەند ساڵێک بوو بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ڕێژیم زۆری نەماوە بڕووخێ. بەڵام کە خاتەمی لە ٢٠٠١دا هەڵبژێررایەوە و زۆرینەی دەنگی بەدەست هێنا، وەک میرازگەری دەڵێ ڕەخنە دووبارە لە ڕێکخراوەکەدا سەری هەڵدایەوە. "مستەفای کوڕی ڕەجەوی یەکەم کەس بوو پێی گوت: "ئەوەی تۆ وتت هیچ واتایەکی نەبوو". بەڵام جوێنی پێ درا و تێهەڵدانی خوارد".

مستەفا کوڕی ڕەجەوییە لە ژنی یەکەمی، ئەشرەف، کە لە بۆردوومانکردنی بنکەی ژێرزەوییان لە تاران مرد بەڵام مستەفا ڕزگاری بوو. جگە لەوەی کوڕی ڕەجەوییە ئەو لە ناو موجاهیدیندا وەکو کەسێکی ئاسایی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ بەتایبەتی ئەگەر بوێرێ ڕەخنە بگرێ.

لەو ماوەیەدا زۆر لە ئەندامان هەوڵی ڕاکردن دەدەن. هەر لەبەرئەوەش زۆربەیان دەخرێنە زیندانەوە. زۆریشی پێ نەچوو میرازگەری دووبارە خرایەوە بەندیخانە، بەڵام ئەم جارە لە زیندانێکی نوێ و بەندیخانەیەکی نوێ لە مۆڵگەی ئەشرەفدا، ئەم جارەش خرایەوە زیندانی تەنیایی. دیسان بۆندێکی لەگەڵدا واژوو دەکەن کە دوای دوو ساڵ زیندان دەینێرنەوە ئێران. "من ئەو کاتە گوێم بەهیچ نەدەدا".

ئەو دوو ساڵەی بەڕاوی دووپشک بۆ ئەوەی قسەیان لەگەڵدا بکات و هەوڵی بیرکەوتنەوەی فیلمی کۆنەوە سەرقاڵ دەکات، ڕۆژانە سێ سات وەرزش دەکات. مانگێک پێش هێرشەکەی ئەمەریکا لە زیندان دەری دەکەن. بۆی ڕوون دەکەنەوە کە بۆیان ئاشکرا بوو مانەوەی لەگەڵیان هیچ سوودێکی بۆ موجاهیدین نییە. ئەمە بەدوای ئەوەدا هات کە کۆنە ئەندامانی وەکو محەمەد حوسێن سوبحانی و مەسعود

تەیبی چیرۆکی خۆیان لە ئەورووپا گێڕایەوە. بۆیە ئەم ڕەوانەی ئێران دەکرێ.

"کاغەزێکی زۆریان پێم دا بۆ ئەوەی واژوویان بکەم. سەیری هیچیانم نەکرد و تەنیا واژووم کرد. پێیان وتم دەتەوێ سوپاسی ڕەجەوی بکەیت لەبەرئەوەی ئازادی کردی. هەر کە وتم "نە" ئەوانیش یەکسەر وتیان تۆ بەکرێگیراوی ئێرانی".

بڕیار بوو قاچاخچییەکان بۆ چوونە ئەودیوی سنوور هاوکاریی بکەن، بەڵام لە ناوەڕاستی ڕووباری سنووری یەکاوی عەرەبدا بەجێیان هێشت. دوای ئەوە تەقەیان لە بەلەمەکەی کرد بۆ ئەوەی پاسەوانانی سنووری ئێرانی لێ ئاگەدار بکەنەوە، ئەوانیش دەستیان بەتەقەکردن لە بەلەمەکەی کرد. هەرچەندە ئەو ماوەیەکی زۆر لە ناو موجاهیدین بوو بەڵام ئاگای لێ نەبوو چی ڕوو دەدات. بەکەسەرەوە دەڵێ: "ئەوە گەورەترین کۆستی ژیانم بوو، کە موجاهیدین هەوڵیان دا بەو شێوەیە لە کۆڵم بکەنەوە. تەنیا دەمتوانی بیر لە ڕەجەوی بکەمەوە، چی وت و چی کرد. خەمبار بووم، خەریک بوو لە ترسا دەمردم و زۆرم پێ بوو بیڵێم".

هەرچۆنێک بێ توانی خۆی لە پشتی بەلەمە نوقمبووەکەی بشارێتەوە و دوای چەند ساتێک خۆی بگەیەنێتە ئەوبەری ڕووبارەکە. دوای ئەوە چووە لای دایک و باوکی لە تاران. "دایکم کە منی دی بوورایەوە". ئینجا دوای چوار مانگ لە ڕێی تورکیاوە چووە ئەڵمانیا. میرازگەری بەختیارە. لەبەرئەوەی بیستوومە کەسانی تری سەر بەموجاهیدین دوای ئەوەی چەندان ساڵ زیندانی کراون، بەوە قایل بوونە لە ڕێی وشکانییەوە بچنەوە ئێران و لەوێ پیاوانی هەواڵگریی عێراق لە ناوەڕاستی کێڵگەی میندا بەجێیان هێشتوون و زۆربەیان ڕزگاریان نەبووە.

عەلی ڕەزا میرازگەری بڕیار دەدات لەگەڵ باوک و دایکە دەوڵەمەندەکەیدا لە ئێران نەمێنێتەوە و نەچێتە پاڵ باوکی لە کارکردن لە دوبەی. ئەو دوای مانەوە بۆ چەند مانگێک لە ئێران بۆی دەردەکەوێ شتێکی بزر کردووە. بۆم دەرکەوت ئەو وەکو تریاکخۆرێکە تریاکی لێ بڕابێ، بەڵام خۆی هەست بەمە ناکات. "من نەمتوانی تەنیا بیر لە خۆم بکەمەوە و ژیانێکی هێمن بەسەر بەرم. پێویست بوو من تاقیکردنەوەکانی خۆم بۆ پاراستنی خەڵکی تر لە دووبارەکردنەوەی ئەو هەڵانەدا بەکار بهێنم. پێویست بوو جیهان بهەژێنم و بەئاگای بێنمەوە".

بڕیاری میرازگەری بۆ چوونە ئەورووپا دیارە بەباشی بیری لێ کردووەتەوە، بەڵام ئەمە بۆ محەمەد حوسێن سوبحانی ڕاست نییە، ئەم لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٢دا لەگەڵ ٤٩ ئەندامی تری موجاهیدین بەنزیکەی ٦٥٠ دیلی شەڕی عێراقی گۆڕانەوە. ئەم بەشێوەیەکی سەرەکی لە ترسا ئێرانی بەجێ هێشت بەرەو ئەورووپا.

کاتێ گۆڕینەوەی دیلەکان لە ئەبوغرێب ئاشکرا دەکرێ، ١٢ لە موجاهیدین ئەوە ڕەت دەکەنەوە بگەڕێنەوە ئێران و سوبحانی یەکێک بوو لەوان. ئەو دەترسا بگەڕێتەوە نیشتمانی خۆی و داوای کرد نەتەوە یەکگرتووەکان و خاچی سووری نێودەوڵەتی کار بۆ ئەم مەبەستە بکەن. لە بەرامبەر ئەمەدا بەرپرسانی گەورەی موجاهیدین بەسەرپەرشتیی مەهدی ئەبریشەمچی، مێردی پێشووی مریەم ڕەجەوی، فێڵێکیان داهێنا. ئەو ١٢ کەسە سواری پاسێکی جیاواز کران گوایە دەبرێنە بارەگای خاچی سوور. بەڵام وانەبوو ئەوانیش برانە سنووری ئێرانەوە.

"ئێمە لەو باوەڕەدا نەبووین کەوا کەوتووینەتە ناو تەڵەیەکەوە موجاهیدین و کۆماری ئیسلامی و عێراق بۆمانیان دانابوو" سوبحانی ئەمەی گوت و سەرێکی با دا. هەر وەکو میرازگەری لە ناوەڕاستی شەتولعەرەبدا، ئەمیش دوای ئەو هەموو تاقیکردنەوەیە لەگەڵ موجاهیدیندا، سەرسام دەبوو بەوەی ئەمانە جێی متمانە نین.

سوبحانی پێی وایە ساڵانی بەگوێدا خوێندن تەواو کاریگەر بوونە. "من لە هەموو چرکەیەکدا چاوەڕوانی ئەشکەنجەدانم دەکرد. هەوڵم دا بیر لە ڕێیەک بۆ ڕاکردن بکەمەوە". بەڵام پاسەوانی باشی هەبوون. تا گەیشتە ناو تاران بەهیچ شێوەیەک ئەو هەلەی بۆ نەڕەخسا.

لەگەڵ ئەوەی زۆر بەباشیش هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرا، بەردەوام بیری لای ئەشکەنجەدان و ئەو لە سێدارەدانە بوو کە چاوەڕوانین. ئەمە بەهۆی ساڵانێک لە پرۆپاگەندە لە مێشکی چەسپیبوو. "مردنم بەچاوی خۆم دی".

لە کاتی گواستنەوەی لە بەندیخانەیەکەوە بۆ یەکێکی تر لە تاران، ترسی کوێرانە وای لێ دەکا هەوڵی ڕاکردن بدات. "تەقەیان لێم کرد و کەوتنە دوام، بەڵام هەر ڕام کرد". ئینجا دوای ئەوەی مانگێک لە ژێرزەوینێکدا بەسەر دەبا، لە ئاداری ٢٠٠٢دا وڵاتی خۆی بەجێ دێڵێ.

بۆ عەلی قەشقەوی، کە ئەویش درایەوە دەستی ئێران، ئەو ڕقەی لە وڵاتی خۆیدا بەرامبەر موجاهیدین لە لایەن خەڵکەوە بەدیی کرد وای کرد بڕیاری بەجێ هێشتنی نیشتمان بدات.

لە ساڵ ۲۰۰۱دا ئەویان بە ۱۵ دیلی عێراقی گۆڕییەوە. بۆ ماوەی ۲۰ ڕۆژ لە لایەن هەواڵگریی ئێرانەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کرا، بەڵام چایە و کلـۆ شەکری زۆریان دەدایە، کە ئەمانە بڕگەیەکی گرینگن لە میوانداریی ئێرانیدا. قەشقەوی دەدرێتە دادگە و حوکمی پێنج ساڵ زیندانی و پێنج ساڵ خستنە ژێر چاودێریی بۆ دەردەچێ. لە بارەی زیندانەکانی ئێرانەوە دەڵێ: "زۆر لەوانەی عێراق باشتر بوون، ژوورێکی گەورەم هەبوو، کتێب و تەلەفزیۆنی تێدا هەبوو". کەسوکاری لەوێ سەردانیان دەکرد و دوای ساڵێک بۆی هەبوو پشووی هەفتەیان لەگەڵدا بەسەر ببات.

باشە بۆ لەوێ دانەمەزرا و ژیانێکی نوێی لە ئێران دەست پێ نەکردەوە؟ ئەو باوەڕی نەدەکرد لە سێدارە ڕزگاری دەبێ. "دوای ئەو هەموو ساڵە نەمتوانی بڕوا بەوە بکەم. نەمتوانی لە دواڕۆژی خۆم دڵنیا بم".

بێجگە لەمەش، ئەوەی زۆر بەلایەوە گرینگ بوو ئەو هەستە بوو کە پێی دەگوت ئەو لای هاووڵاتییانی خۆیەوە نەویستراوە. "خەڵک قسەیان لەگەڵمدا نەدەکرد، بگرە لێم دەترسان. من نەمتوانی لە ئێران بژیم چونکە کۆمەڵگەیەکی ئاینی بوو. ڕێژیم ئێمەی ناو نابوو موونافیقین کە ناتۆرەیەکی زۆر خراپە لە ئیسلامدا. بۆیە خەڵک نەیاندەتوانی ڕێز لە ئێمەمانان بگرن". ڕێژیمی ئێران دەستەواژەی موونافیقینی بۆ موجاهیدینی خەلق بەکار دەهێنا. ئەوەش تۆمەتبارکردنێکی خراپە، لەبەرئەوەی بەپێی قورئان ئەوەی لە ئیسلام وەرگەڕێ دەبێ بکوژرێ. هەموو ئەم شتانە ڕۆڵیان هەبوو لەوەی قەشقەوی هەست بکات لە ئێران ڕەت کراوەتەوە. جا ئەم بۆچوونەی ڕاست بێ یان نە.

بۆیە لە پشووی یەکێ لە هەفتەکان ناگەڕێتەوە و لە ڕێی تورکیاوە بەرەو ئەوروپا بەڕێ دەکەوێ و لەوێ لەگەڵ عەلی ڕەزا و عەباسی برادەری یەک دەگرنەوە.

بۆ یاسر عیزەتیش هەمان ئەم هەستانە ڕۆڵیان هەبوو، کە دوای ڕاکردنی لە کەمپی ئەشرەف لە کۆتاییی ۲۰۰٤دا چووە لای باپیر و داپیری لە تەورێز. یاسر

دەڵێ "مامەم کە هەشت ساڵ لە ئێران زیندانی کرابوو پێی وتم وا باشترە وڵاتەکە بەجێ بهێڵم. دەبوایە ڕۆژانە خۆم بەدەسەڵات پێشان بدەم. ئەویش گوتی: "تۆ وا هەست دەکەی ئازادی، بەڵام ئەوان لە چاودێریکردنت بەردەوام دەبن"."

چیرۆکی یاسریش کەمێک بەچیرۆکی کۆنە زیندانییانی تر دەچێ، ئەم وێکچوونە کەمە لەبەرئەوەیە ئەو ماوەیەکی کورت پێش گەیشتنی ئەمەریکاییەکان بۆ عێراق زیندانی کرا، زیندانیکردنەکەشی کاریگەریی بەهێزی باوکی وەکو کەسێکی سەر بەهەواڵگری لەوێ ڕۆڵی تێدا بینی، بێجگە لەمەش بوونی ئەمەریکاییەکان لەوێ.

لە سەرەتاکانی ٢٠٠٣دا ئەو و هەزاران موجاهید چوونە باکوری عێراق، بەناوی ئەوەوە کە هێرشێکی نوێ بکەنە سەر ئێران. هێرش نەکرا، بەڵام شەڕیان لەگەڵ پێشمەرگەی کورددا کرد. یاسر دەڵێ ئەوان لەوێ چاوەڕوانی هێرشی ئەمەریکایان دەکرد، چونکە پێیان وا بوو بنکەکانیان بەهۆی هاوکاری و دەستێکەڵییانەوە لەگەڵ سەدامدا دەبنە ئامانجی هێرشی ئەمەریکاییەکان. هەر واش بوو لە سەرەتای نیسانی ٢٠٠٣ ئەمەریکاییەکان هەموو بنکەکانی ئەوانیان بۆمباران کرد.

یاسر دەڵێ ئەمەریکاییەکان بەسێ جیپی سپییەوە چاودێریی هێزەکانی موجاهیدینیان لە باکور دەکرد. "من چوومە لایان و داوام لێیان کرد هاوکاریم بکەن، لەبەرئەوەی من دژ بەویستی خۆم ناچار کراوم لەگەڵ موجاهیدیندا بمێنمەوە. ئەوانیش ناوی منیان لای خۆیان نووسی، بەڵام گوتیان ناتوانین هاوکاریم بکەن لەبەرئەوەی ئەوان تەنیا سەربازن. دوای ئەوە سەرکردەکان منیان بۆ کەمپی ئەشرەف ناردەوە".

دوای زیندانییەکی تەنیایی سووک و بەبێ ئەوەی ئەو ئەشکەنجە ئاساییەی بۆ ئەم جۆرە ناپاکییە تەرخان کراوە هەبێ، ڕێی پێ دەدرێ دووبارە بگەڕێتەوە یەکەکەی خۆی. دوای ڕووخانی بەغداش موجاهیدین لە لایەن ئەمەریکاییەکانەوە چەک کران و هەموویان برانەوە کەمپی ئەشرەف.

یاسر دووبارە پاڵەپەستۆ دەخاتە سەر بەرپرسەکەی تا ڕێی بدەن بڕوا. "ئەویش گوتی: "دوو ڕێت لە پێشە. یان بگەڕێتەوە ئێران، یاخۆ چاوەڕێی ڕووخانی خاتەمی بکات و دوای ئەوە بچێتە ئەوروپا". ئەمە سەیر هاتە بەرچاوم، بۆ من ناتوانم پێش

ئەو ڕووخانە چاوەڕوانکراوە بچمە ئەورووپا؟ بۆیە گوتم دەمەوێ بچمە ئێران".

ئینجا گواسترایەوە ئیسکان، کە پێشتر جێی حەوانەوەی خێزانەکان بوو، لەوێ پێیان گوت چاوەڕوان بە لەبەرئەوەی ئەمەریکاییەکان ڕێ نادەن کەس دەرچێ. لێرە باوکی پاسەوان بوو بەسەریەوە. پێوەندیش بەزیندانییەکانی ترەوە قەدەغە بوو. ناچاریش دەکرا ڕۆژانە دە سات کار بکات، بەزۆریش برنجیان پێی پاک دەکردەوە.

ئەو دەمە ئەمەریکاییەکان کۆنترۆڵی کەمپی (ئەشرەف)یان کردبوو. ئەو ئەندامانەشی لەگەڵ موجاهیدیندا دەیانکردن گۆڕانکاریی بنەڕەتییان لێ کەوتەوە. ئەو ئەندامانەی ڕەخنەیان لە ڕێکخراوەکە هەبوو دەیانتوانی ڕەخنەکانیان بەوان بگەیەنن و دوای ئەوە لە بەشێکی کەمپەکەدا دەخرانە پەنای ئەمەریکاییەکانەوە. ئەوەی بەلامەوە سەیر بوو یاسر بڕیاری دا نەچێتە لای ئەوان، بەبیانووی ئەوەی "لە زیندانەکاندا نێرباز زۆرن" و لەو چەند ساڵەدا زۆر بەسەختی توانیویەتی خۆیان لێ بپارێزێ.

دوایی بۆم دەرکەوت ترسی ئەو لەو پرۆپاگەندەیەی موجاهیدینەوە سەرچاوەی گرتووە کە هەر کەسێک بچووبایەتە لای ئەمەریکاییەکان پێیان دەگوت لاوازە یاخۆ نێربازە، بەهۆی کولتووری گەندەڵ و تەنراو بەسێکسی ئەمەریکاوە.

بەئەمەریکاییەکان دەڵێ لە ئیسکان دەمێنمەوە و وا بەموجاهیدین پێشان دەدا کە هێشتا لای ئەوانە، بۆیە سوود لە هەردوولا وەردەگرێ. لە هاوینی ٢٠٠٣وە ئەمەریکاییەکان هەموو بەندیخانەکانی کەمپی ئەشرەف دادەخەن. ئەو ئیتر کاری پێ ناکەن، تەنانەت سەتەلایتیش دەبینێ. بەخۆ جیاکردنەوەشی خۆی لە پاڵەپەستۆی موجاهیدین و دەستدرێژیی سێکسی پاراست و خۆی لە هیچ لایەکیان نەکرد.

لەڕاستیدا کەمپەکە بووبووە دوو بەشەوە: بەشێک بۆ ئەو جیاوەبووانەی ئەمەریکا دەیپاراستن و ئەوەی تریش موجاهیدین تێیدا تەڕاتێنیان دەکرد. ئەمەریکاییەکان ماوەی جارێک دەچوونە ئەوێ بۆ ئەوەی بزانن ئەو چاکسازییانەی کردوویانە بەردەوامن.

بەبۆچوونی من یاسر ناتوانی لە خۆجیاکردنەوە بەردەوام بێت. لەو چەند مانگەی دوای هاتنی ئەمەریکاییەکان بەردەوام داوای لە موجاهیدین دەکرد ڕێ بدەن بڕوات

و ئەوانیش دەیانگوت ناتوانن هاوکاریی بکەن و پێویستە چاوەڕێی نەتەوە یەکگرتووەکان بێت. لە هەمان کاتیش باسی ئەوەم بۆ دەکا چەندان کەس لەو چەند مانگەدا هەڵاتن: بەلای کەمەوە پەنجا کەس! "بەتانییان دا بەسەر تەلە دڕکاوییەکاندا و پەڕینەوە ئەودیوی پەرژینەکە. ئەمەریکاییەکانیش لەودیوەوە چاودێرییان دەکرد و هیچ کاردانەوەیەکیان نەبوو". بەڵام بۆ یاسر وەکو ئەوانی نەکرد! ئەمە ڕوون نییە. ئەمە لە عێراق پڕ مەترسییە. ئەم پارەی پێ نییە و پاسپۆرتیشی نییە. بەڵام ئەم بیانووانە ئەو پەنجا کەسەی تری ڕا نەگرت.

دوای بەسەربردنی ١١ مانگ لەو زیندانە کراوەیەدا، نامەیەکی بۆ ئەمەریکاییەکان نووسی و داوای کرد بێن قسەی لەگەڵدا بکەن. دوو جار لەگەڵ دوو سەربازدا قسەی کرد، دوای ئەوە ئەفسەرێکی گەورەی موجاهیدین هات و قسەی لەگەڵدا کرد. "ئەو پرسی: "تۆ چیت هەیە ئەوەندە سەرنجڕاکێش بێ؟" دوای دوو هەفتە پاسپۆرتە ئەڵمانییەکەیان دامەوە. باوکیشم ٤٠٠ دۆلاری پێم دا بۆ ئەوەی پاسپۆرتەکەم لە باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا لە بەغدا نوێ بکەمەوە".

تاکسییەکیان بۆی هێنا بیبات و بیهێنێتەوە کەمپی ئەشرەف. بەڵام یاسر ئەو هەلە دەقۆزێتەوە و ڕا دەکا. لە بەغدا تاکسییەکی تر دەگرێ بۆ سەر سنووری ئێران. دەسەڵاتی ئێران بۆ ماوەی مانگێک لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکەن و پرسیاری لە بارەی موجاهیدین و بارودۆخی ناو کەمپەکەوە لێ دەکەن، دوای ئەوەش دەینێرنەوە ماڵی باپیری لە تەورێز.

دوایی باوکی بەشێکی ئەم چیرۆکە بەدرۆ دەخاتەوە. ئەو لە بەردەم دۆستانی ئێرانی ئازاددا ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە پاسەوانی زیندان بووە و بۆ ئەوەی بەباشی لێی تێ بگەن هیچ وەڵامێکی ڕاستەقینەی پرسیارەکانی ناوەڕاست ناداتەوە. "من ئێستا لەو بەشەدا کار دەکەم کە بەرپرسە لە پێشوازیی مێوان و ئەو کەسانەی تازە دێن. ماوەی حەوت هەشت ساڵێکیش بەرپرسی بەشی بازاڕکردن بووم و هەموو کەسێک لە بەغدا من دەناسێ". کاتێکیش ئەو تۆمەتەی کوڕەکەی بەڕوودا دەدەن کە ئەم پاسەوانی ئەو بووە لە زینداندا، پرسیار دەکا "باشە بۆ باسی ئەمەی بۆ ئەمەریکاییەکان نەکرد... مەگەر پێش ئەوەی بچێتە ئەڵمانیا ئەمەی نەدەزانی؟ تەنیا

که گەیشتە ئەڵمانیا ئەوەی بۆ دەرکەوت؟"

وەڵامەکانی حەسەن عیزەتی ڕوونی دەکەنەوە تا چ ئاستێک فێر کرابوو. بەڕای ئەو یاسر لە لایەن حکوومەتی ئێرانەوە فێر کراوە ئەو تۆمەتانە بداتە پاڵیەوە، بەتایبەتیش ئەوە کاری محەمەد حوسێن سوبحانییە کە بەبەکرێگیراوی حکوومەتی ئێرانی دەزانێ. "ئەمە کولتووری حکوومەتی ئێرانە. ئەوان دەیانەوێ ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلقی ئێران ناشیرین بکەن. بەڕاستی نامەردییە کوڕ بگاتە ئەو ئاستەی باوکی خۆی بەم شێوەیە تاوانبار بکا. کەسوکاری من بەردەوام لە ژێر پاڵەپەستۆدان. ئەوانیش دەیانەوێ ۲۷ ساڵی تەمەنی من بخەنە بازنەی گومانەوە".

عەباس سادقی نەجات دوا کەسی ئەو سێ برادەرەیە لە زیندانەکانی موجاهیدین دەرچێت و ئێستا لە کۆڵن دەژی، ئەو لە ساڵی ۲۰۰۲دا توانی لە بنکەیەکی موجاهیدین لە کوردستان ڕا بکا. چەند ساڵ بوو پلانی وردی بۆ ڕاکردن دادەنا. بەمنی وت ئەو بۆیە توانی ئەوەندە بمێنێتەوە لەبەرئەوەی سەرەڕای ڕەخنەی بەردەوامی توانای ئەوەی هەبوو وەکو کەسێکی هاوکاری ئەوان خۆی بنوێنێ.

هەر لەبەرئەمەش بوو نەکەوتە بەر ئەو تاوانبارکردنانەی هاوینی ۲۰۰۱، کە بەدوای هەڵبژاردنەوەی خاتەمیدا هاتن. بگرە ئەو پەنجا شەست جارێک لەو بۆنانەدا وەکو چاودێر ئامادە دەبوو. ئەوەی ئەو باسیان دەکات دیمەنگەلی قێزەونی "شۆڕشێکی" تری ناو موجاهیدینە. ئەوانەی تۆمەتبار دەکران زۆربەیان کەسانی خاوەن پلە و پایەی بەرز بوون لە ناو موجاهیدین و تەنانەت ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیشیان تێدا هەبوو، هەروەها ئەندامی ئاساییی وەکو یاسر عیزەتیشیان تێدا بوو و بەهەوڵدان بۆ هەڵاتن تۆمەتبار کرابوون.

سادقی نەجات دەڵێ: پێش دادگاییکردنە ڕاستییەکە، کەسی تێوەگلاو لە نێو چل تا پەنجا موجاهید دادەنرێت. ئەوانە دەبێ ڕیسوا و سەرکۆنەی بکەن تا دان بەهەڵەکانی خۆیدا دەنێت و خۆی دەداتە بەدەستەوە. هەندێ جار ئەم کارە زیاتر لە بیست و چوار سات دەخایەنێت و دواتر ئەو گرووپە چل تا پەنجا کەسییە چەند جارێک دەگۆڕێت. پاشان تۆمەتبار دەبێ هەرچی هەڵەیەکی کردبێت لە ژیانیدا لەسەر کاغەز بینووسێت، بەلایەنی کەم سەد شت. ئەمەش گرووپەکە بەزۆر پێی دەکەن.

دوای ئەم کەینوبەینە، پەتێکی بەملەوە دەکەن و دەبێ لەسەر دەست و ئەژنۆکانی بەگاگۆڵکی، وەک ئاژەڵ، بڕوات و پێی یەکە یەکەی ئامادەبووان ماچ بکات.

بەپێی قسەکانی سادقی نەجات، وا دیارە تۆمەتبار لە مرۆڤێکی ئاساییەوە دەگۆڕێت بۆ جۆرە ئامێرێک، داوای هەرچییەکی لێ بکرێت دەبێ ئەنجامی بدات. ئەمە ئەو ساتەیە کە دەهێنرێتە لای مەسعود و مریەم ڕەجەوی، کە هەردووکیان پێکەوە لەگەڵ هاوڕێکانیان دادگاییی ڕاستەقینە ئەنجام دەدەن، بەلایەنی کەم لە بەرچاوی دوو هەزار ئەندامی ڕێکخراوەکە. سادقی نەجات دەڵێ: تاوانبار بەزەبری هێز ناچار دەکەن هەرچییەکی کردبێت بەڕەجەویی بڵێت. هەروەها ئەندامەکانیش داوا لە ڕەجەوی دەکەن حوکمی مردنی تاوانبارەکە بدات. ئەمە هەمووی لە یەک کاتدا ڕوو نادات. واتە هەموو ئەندامەکان ناچار دەکرێن بەشدار بن لەم دادگاییکردنەدا. بەم شێوەیە هەموو ئەندامێک دەستی هەیە و بەرپرسە لەوەی بەسەر هاوڕێکانیاندا دێت.

پاشان ڕەجەوی بەهەموو ئامادەبووان دەڵێ: ئێوە دەتانەوێ حوکمی لە سێدارەدانی بدەم. ئەوە من لێی خۆش دەبم، بەڵام دەبێ بەڵێن بدات ببێتە موجاهیدێکی ڕاستەقینە. نەجات بەقێزەوە دەڵێ: پاشان تاوانبار دەبێ دان بەوەدا بنێ کە ژیانێکی ئاساییی دەوێت، دەیەوێ ژن بهێنێت، مێرد بکات و بچێت کارێک بکات. وەک بڵێی ئەمانە تاوان بن. پاش ئەوەی تاوانبار پەشیمان دەبێتەوە لەو ویستانە (ویستی ژنهێنان و ژیانی ئاسایی و کارکردن)، ڕەجەوی دوا وتەی خۆی پێ دەڵێ: ئێستا تۆ موجاهیدێکی ڕاستەقینەیت. ئێستاش هەموو ئامادەبووان دەبێ بۆ خۆیان هەمان شت بکەن، ملکەچ بن و دانپیانانەکانی خۆتان بنووسن.

یاسر عیزەتی، کە قوربانییەکە چەندین جار بەم شێوەیە لە ویستەکانی پاشگەز بووەوە، وەسفی ئەمانە بۆ ڕێکخراوی مافی مرۆڤ دەکات و دەڵێت "ئەمانە شکێنەری دەروونی مرۆڤن". من دەبوایە چەندین جار دڵسۆزیی خۆم بۆ موجاهیدینی خەلق دووپات بکردایەتەوە لە کاتی ئەو کۆبوونەوانەدا. دوای چوار مانگ لە پاڵەپەستۆی دەروونی، بەڵگەنامەکانم ئیمزا کرد کە دەبێ من لە ڕیزی ڕێکخراوەکەدا بمێنمەوە.

باشە بۆچی ئەندامانی موجاهیدین هاوکاریی یەکتر دەکەن و هەڤاڵانی خۆیان

دەخەنە ژێر بارێکی وا تۆقێنەرەوە؟ کۆنە ئەندامانی موجاهیدینی خەلق ڕاستەوخۆ وەڵامی ئەم پرسیارەم نادەنەوە. گوایە ئەم کارەیان کردووە لە ترسی ڕوحی خۆیان، ئەگەر نەیانکردایە ئەوا دەبوونە قوربانیی ئەمە. من پێم وایە، ڕەنگە هەڵەش بم، کە دەیانویست تاوانبار (واتە ئەوەی بیویستبا ژن بهێنێت و ژیانێکی ئاسایی هەڵبژێرێت) سزای خۆی وەرگرێت.

هەرچەندە سادقی نەجات نازانێت، لە ڕاستیدا سزای لەم جۆرە دراون، لە دوو ساڵ تا پێنج ساڵ لە بەندیخانەدا بووە. دوای ئازار و ئەشکەنجەدان و بەندکردنی بەتەنیا، ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی موجاهیدین لە کۆتاییدا بۆ ئەبوغرێب گوێزرانەوە. یەکێکیان لە ڕاپۆرتی زیندووەکانی ساڵی ٢٠٠٤دا دەڵێ: من دیارە بەختم گەلێک گەورەیە، بۆیە زیندوو ماوم.

مەسعود تەیبی لەبەرئەوەی وێنەگر بووە، زۆربەی ئەو دادگاییيانەی وێنە گرتووە. ئەم وێنانە لە کۆتاییدا دەبن بەدوایین ڕووداوی دڵتەزێن لە ژیانیدا. هەر دوای ئەو وێنانە بەهەر جۆرێک بێت دەتوانێت خۆی دەرباز بکات و بەرەو تورکیا ڕا بکات.

مەسعود تەیبی پێم دەڵێ ڕەجەوی خۆی دادوەر و خۆیشی پارێزەرە و تاوانبار بۆی نییە پارێزەری هەبێت و نابێ وا بزانێت لەسەر هەقە. ئەمەش ڕاستە لەو هەلومەرجەی کە مریەم پێشنیازی سزای مردن دەکات، دوای ئەمە ڕەجەوی یەکسەر لە تاوانبار دەبوورێت و لێی خۆش دەبێت. پرۆسەی داگاییکردنەکان لە مانگەکانی تەمموز و ئاب و ئەیلوولی ٢٠٠١دا ڕوو دەدەن، لە بنکەی باقرزادە، لە بینایەکدایە دەکەوێتە نێوانماڵی مەسعود و مریەم ڕەجەوی. بەپێی قسەکانی تەیبی ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، ئەو پەنجا کەسەی دادگایی کراون جێگری سەرۆکی موجاهیدینی خەلقیشیان تێدا بوو، تەنیا مشتێکە لە خەرمانێک. تەیبی پێم دەڵێت لەو ڕۆژانەدا ڕەجەوی سەرووی خۆی ئاگەدار دەکاتەوە لەوەی چوار سەد موجاهید دەیانەوێت ڕێکخراوەکە جێ بێڵن، ئەوسا تەیبی خۆی یەکێک بووە لە گەورەکان. لەبەرئەوەی پاش ماوەیەکی کەم تەیبی دەتوانێ هەڵبێت، نەیتوانی بەچاوی خۆی بیبینێت، بەڵام زۆر لەوە دڵنیایە کە چوار سەد کەسەکە دادگایی کراون. ئەمە ڕای عەباس سادقی نەجاتە، بەڵام پێی وا نییە ڕەجەوی لە هەموو دادگاییەکاندا ئامادە بووبێت. سادقی

نەجـات دەڵێ: بەپێی زانیـارییـەکـانی خـۆم، بەلایەنی کـەم دوو کـەس هـەبوون ملکەچبوونیان ڕەت کردەوە، تەنانەت لە کاتی دادگاییکردنیش لە لایەن ڕەجەوییەوە ملیان کەچ نەکرد. تەیبی نازانێت کەس لە سێدار دراوە یان نا، بەڵام دەزانێ هەندێ کەس لە ژێر هەلومەرجی تۆقێنەردا گیانیان لە دەست داوە.

مـەسـعـود تەیبی لەو باوەڕەدایە کـە لەوە بەدواوە، ڕەجـەوی بـەندیخـانـەکـان وەک تاکتیکێک بەکار دەهێنێت بۆ هێشتنەوە و چاوترساندنی ئەندامەکانی. ئەمە ئەو کاتە بوو کـە تەیبی بۆ یەکـەم جار دانی بەوەدا نا کە مـوجـاهـیـدین بەندیخـانەیان هـەیە. تەنانـەت ئەوەشی وت کـە ڕەجـەوی زۆر شـانازی بـەو بەندیخـانانەوە دەکـات. تـەیبی دەڵێ: ئەمە تاکە ڕێگەیە بۆ سەرکوتکردنی بەرەنگاریی بەکۆمەڵ.

ڕەجەوی فەرمان دەدات بەتۆمارکردنی دادگاییەکان، کە لە پرۆسەی مۆنتاجکردنی فـیلمـەکـاندا زۆر ژیرانە ئـامـادە دەکـرێن و دواتر لـە نێـو ئەندامـانی ڕێکخـراوەکـەدا دابەش دەکـرێ بۆ چاوشکاندنیـان. تەواوی کـاسـێـتـەکان لە ئەرشـیـڤـێکی نـهـێنیـدا هـەڵدەگـیـرێن، تەیبی ئـەزموونی هـەیە و دەزانێ ئەو کـاسـێـتـانە لە داهـاتوودا بۆ ئەو کەسانە لێ دەدرێنەوە کە پێویستییان بەوە هـەیە جارێکی تر پاڵەپەستۆیان بخرێتەوە سەر بۆ ئەوەی لە ڕیزەکانی موجاهیدینی خەلقدا بمێننەوە.

کەواتە دەبێ ژمـارەیەکی زۆر کاسێت لە نێو ئەرشیڤی موجاهیدیندا هـەبێت. من لە قسـەکـانی تەیبیدا ئەمـەم بۆ دەرکەوتـووە. تۆمارکـردنی هـەمـوو ئەم کرداراـنە لە لایەن موجـاهـیدینی خەلقـەوە تەنیا بۆ ئەوە بووە، وەک سـەدام حوسێن نیشانی بدەن چەندە تینوون بۆ ئەنجامدانی کـارگەلێکی وەها قێزەون. ئەو کەرەسـتـانە ون دەکرێن و لە نێو ئەرشیڤی کـراوە و داخـراودا تەقـەت دەکرێن. تەیبی قـسـەکـانی ئـەو هـەڵگەڕاوانەشی تۆمـار کردووە کـە دەبوایە بیکەن گەر ڕێگە بەخۆیان نەدەن قسـەیان لەگەڵدا بکرێت بۆ مـانەوەیان لە ڕێکخراوەکە. ئەو جۆرە کەسانە دەبێ لە بەردەمی کامێرادا ڕای گەیەنن کەوا دەیانەوێت ڕێکخراوەکە جێ بێڵن لەبەر گرفتەکانی خۆیان. لەسەر بنچینەی ئەو قسانە، ژمارەیەک لەو زیندانییانە پاشان هێنراونەتە نێو بەندیخانە عێراقییەکان.

هـەروەهـا ئەو مـوجـاهـیـدانـەش کـە ڕەوانەی ئـێـران دەکـرێنەوە، دەبێ لە بەردەم کـامـێـرادا ڕای گـەیەنن بەویسـتـی خـۆیان چوونەتـە ئێـران. ئـەم حـاڵەتـە تەنیـا بۆ

ژمارەیەک موجاهید بوو. هەموو شتێک دەکەن لە پێناو دوورکەوتنەوە و دەربازبوونیان لە ئەبوغرێب. کاسێتە ڤیدیۆییەکانیش لەگەڵیاندا ڕەوانەی ئێران دەکرێنەوە.

ئایا ڕەجەوی و ستافەکەی درکیان بەوە نەکردووە کە دەکرێ ئەو کاسێتانە دواتر لە دژی خۆیان بەکار بهێنرێنەوە؟ ئەگەر، بۆ نموونە، چووبایە ژێر دادگاییکردن، کە زۆربەی موجاهیدەکان بەئاواتی دادگاییکردنی ڕەجەوی بوون. مەسعود تەیبی دەڵێ: بەڵێ، بیریان لەوەش کردبووەوە. لەبەر هەندێ کاسێتگەلی دادگاییکردنەکان وەها بەئاسانی نادۆزرێنەوە، چونکە ژمارەی نهێنیی ئەو کاسێتانە "پێنج ئەستێرەیە"، ئەمەش واتە ئەوپەڕی نهێنین. چەند شوێنێکی تایبەت هەن بۆ پاراستن و سووتاندنی ئەرشیڤەکان لە کاتی جەنگدا. لە کاتی جەنگی کەنداودا هەموو ئەرشیڤەکانی خۆیان سووتاند.

قسەکانی تەیبی ئەوەشیان خستە ڕوو لەسەر ئەو حەوت جانتایەی موجیاهیدین هەوڵی دا بەقاچاخ ئاودیویان بکاتە سووریا لە ئاداری ساڵی ٢٠٠٣دا. ئەو حەوت جانتایە نەک هەر تەنیا بەملیۆن دۆلار و چەندین بەڵگەنامەیان تێدا بوو، بگرە چەندین کاسێتی ڤیدیۆشی لەگەڵدا بوو. بەپێی قسەکانی تەیبی، ئەوانە ئەو کاسێتانە بوون کە ڕەجەوی ویستوویەتی بەپەلە بیانپارێزێت.

باشە ئەی ئەرشیڤە نهێنییەکان چییان بەسەر هات کاتێ ئەمەریکاییەکان دەستیان بەسەر کەمپەکانی موجاهیدیندا لە عێراق گرت، ئەمەیان نادیارە. بەڵام هەرچەندە ئەگەر ئەو کاسێتانە لەناو برابن، هێشتا چەندین شاهێدحاڵ و قوربانی هەن لە ڕۆژئاوای بەندیخانەکانی مەسعود ڕەجەوی کە دەتوانن تۆمەتی قورس بخەنە پاڵ ڕەجەوی و ستافەکەی. هەندێکیان زۆر بەپەلە حەز دەکەن دەرفەتێک بقۆزنەوە و ئەو کارە بکەن.

# پشکی هەشتەم

## گەڕانەوە لە ڕۆبۆتەوە بۆ مرۆڤ

یاسر عیزەتی زۆر شتی لە هەگبەدا هەیە بیکات. هەموو ئەو شتانە دەکات کە لە بەشی یەکەمی ژیانیدا لە لایەن موجاهیدینەوە لێی قەدەغە کرا بوو، وەک خوێندن، یاریی تۆپی پێ، چوونە دیسکۆ لەگەڵ برادەران، سەیرکردنی تەلەفزیۆن، چوونە سینەما، هەروەها قسەکردن لە بارەی ئەو شتەی خۆی حەزی لێیەتی، بێ ئەوەی ترسی هەبێت لەوەی هەر شتێک بڵێت بەوانی تر دەگاتەوە و دواتر لە دژی خۆی بەکار دەهێنرێتەوە.

یاسر تازە پشتی لە ڕێکخراوەکە کردبوو، هێشتا ڕێگەیەکی درێژی لە بەردەم مابوو تا لە موجاهیدین دوورکەوێتەوە، بەڵام هێشتا هیچ شتێک نازانێ. وا دەزانێت هەموو شتێک ئاسایی دەبێت و هەوڵ دەدات چێژ لە ئازادییەکەی وەرگرێت.

بەڵام هەموو شتێک ئاسایی نابێت و مسۆگەر نییە و ئەو ئازادییەش داگیر دەکرێت، ئەمە دوو شتن هەموو ئەندامێکی پێشووی موجاهیدین پێتی دەڵێن. چونکە تۆ چۆن لە ڕۆبۆتەوە دەگەڕێیتەوە و دەبی بەمرۆڤێکی ئاسایی؟ مەسعود خودابەندنە لە بارەی ئەو ماوەیە دەدەوێت پاش ئەوەی وازی لە موجاهیدین هێناوە، دەڵێ: دووبارە دۆزینەوەی ناسنامەکەت زەحمەتترین کارە. ناتوانی بەیانیان لە خەو هەڵسی و شتێکت لا گرینگ بێت و ئەنجامی بدەیت. تۆ وەک ڕۆبۆتێکت لێ هاتووە، گوێی لەوە نییە ئەنجامی دەدات، پاشان ناتوانێ هیچ بکات. بۆچی من بتوانم؟ بۆ ئەوەی ئەمە لە دەست بدەیت و دووبارە ببیتەوە بەمرۆڤ، لەگەڵ کەسێتیی خۆت، ئەمە تەنیا سەرەتایە و زۆریش زەحمەتە. هەر کە گەیشتییە ئەو خاڵە، ئەوجا دۆزینەوەی شتەکان خێراتر دەبن.

خودابەندە یارمەتیم دەدات لەوەی کە هەموو کۆنە ئەندامان چییان بەدی کردووە،

بەڵام ناتوانێ تەنیا ناوێکیش بێنێت چونکە تا ئێستا ئەوان لەمە ناگەن. گەڕانەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی ئاسایی زەحمەتە و زۆر جار پرۆسەیەکی درێژ دەبێت. ئەمە لەبەر ئەو هەڵکەوتەی کە لە نێو موجاهیدیندا لە بیریان چووەتەوە چۆن شتەکان ئەنجام بدەن. خودابەندە دەڵێ ئەمە هۆیەکەیە کە هاوڕێ کۆنەکانی تا ئێستاش نایناسنەوە کاتێک چالاک بوو لە ڕێکخراوەکەدا. هاوڕێکانی پێی دەڵێن: ئێمە دەموچاوت دەناسینەوە بەڵام لە ژوورەوە تۆ کەسێکی جیاواز بوویت. خودابەندەش دەڵێت من ئاشنا نەبووم بەوان و لەبەر هەندێش ئێستا تێم ناگەن. تێم ناگەن چونکە من ئەو شتەم نەدەکرد کە خۆم دەمویست، بگرە تەنیا دوای فەرمانەکان دەکەوتم.

هەموو شتێک بۆ ئەندامان، تەنانەت گەشت لە عێراقەوە بۆ ئەورووپا لە سەرەتاوە تا کۆتایی پێشتر ڕێک خراون. ئەندامەکان خاوەنی هیچ پارەیەکی خۆیان نین و بۆیە کاتێک ڕێکخراوەکە جێ دەهێڵن نازانن چۆن مامەڵە بەپارەوە بکەن. شت کڕین لە نێو موجاهیدینی خەلقدا لە لایەن گرووپێکی بچووکی زۆر چالاکەوە ئەنجام دەدرێت. زۆرێک لە کۆنە ئەندامان لە سەرەتادا بێزارییان دەربڕی لەوەی هیچی تر ناتوانن هەڵبژێرن، تەنانەت چی تر ناتوانن پارچە جلێکی سادەش بکڕن.

دوای جێهێشتنی ئەم ڕێکخراوە، دۆزینەوەی کاریش زۆر زەحمەتە، زۆربەی موجاهیدەکان خوێندنیان تەواو نەکردووە یان هیچ ئەزموونێکی کارکردنیان نییە. هەروەها هیچ فەندێکی دارایشییان نییە بەکاری ببەن. چونکە هەموو پارە و پوولیان بەخشیوەتە ڕێکخراوەکە. مامەڵەتکردن، کە لە ئێران زۆر باوە، زۆر زەحمەتە بۆ ئەوان چونکە قەت شتی وایان نەکردووە. ئەو کەسانەی بۆ ماوەیەکی زۆر لە ڕێکخراوەکە بوونە تەنیا دەتوانن هەوڵی تێگەیشتن بدەن، ئەویش زۆر بەزەحمەتی، چونکە ئێستا بەزمانێکی زۆر تێکەڵ قسە دەکەن کە ئێرانییەکان بەزەحمەت تێیان دەگەن. لە قسەکردندا من لەگەڵیاندا قسە دەکەم بەیارمەتیی وەرگێڕێکی زمان، هەست دەکەم زۆر دەگەڕێن بەدوای وشەیەکی فارسیدا، بۆ ئەوەی بەکاری بهێنن لەجیاتی قسەی موجاهیدین کە ئێستا بووەتە دووەم سروشتی ئەوان.

هەر کە چوونە دەرەوە، درک بەوە دەکەن زۆر دواکەوتوونە لە زانیاریی گشتی دەربارەی هەموو شتێک. بۆ نموونە، بەبارودۆخی ڕاستەقینەی ئێران دەزانن، دەزانن

ئێران نەبووە بگرە عێراقە گازی ژەهراوی لە هەشتاکاندا بەکار هێنا. زۆربەی، ئەگەر هەمووی نەبێت، شتە ڕاست و دروستەکان دەربارەی خۆیان و دەوروبەریان کە چەند ساڵە باوەڕیان پێ هەبووە ئێستا بۆیان ڕوون دەبێتەوە هیچی ڕاست و دروست نین. ئێستا هەندێ جار نازانن باوەڕ بەچی بکەن. خودابەندە بیری دێتەوە و دەڵێ: تەنانەت ئەو چیرۆکانەی تۆ خۆت ڕۆڵت تیادا گێڕاوە زۆر جیاواز بوون. بۆ نموونە، هاوسەریەتی و تەلاقدان. ئەو کاتە دەمزانی من چیم دەکرد. پاشان بەچاوێکی سەیر تەماشای کارەکانم نەدەکرد و بەنائاساییم نەدەزانین. بەرگریم لێ دەکرد، ئەوساکە پێم وابوو ئەوانی تر لە ئێمە ناگەن. بەڵام دوای ئەوەی هاتمە دەرەوە، بیرم لەو کارانە کردەوە و بۆ خەڵکیم باس دەکرد، ئەوە منم دەست دەکەم بەپرسیارەکانی خۆم. هیچی تر نەمتوانی بەرگری لەو کارانە بکەم لە بەردەم هاوڕێیە کۆنەکانمدا.

وێڕای ئەمانەش، بارە کۆمەڵایەتییەکان هەر باس ناکرێن. لە نێو موجاهیدیندا تۆ هاوڕێت نییە. خودابەندە دەڵێ: بەلایەنی کەم وا هەست دەکەیت پێویستت بەهاوڕێ نییە. ئێمە وامان هەست دەکرد قسەکردن لەگەڵ خەڵکیدا کات بەفیڕۆدانە. هاوڕێ وزەی تێ دەچێت، بۆیە دەبێ ئەوانیش بێنە ڕیزی ڕێکخراوەکەوە. لە ئەنجامی گفتوگۆ لەگەڵ کۆنە ئەندامانمدا ئەوەم بۆ ڕوون بووەوە کە ماوەیەکی تەواوی دەوێت بۆ ئەوان تا درک بەوە بکەن کە هاوڕێیەتی لە ژیانی ڕۆژانەدا چەند بەنرخ و گرینگە بۆ ئەوان. پێ دەچێت یاسر عیزەتی لەم بارەیەوە بێ هاوتا بێت. بۆم ڕوون دەکاتەوە کەوا هاوڕێکانی لە ئەڵمانیا کە دوا جار دیتنییەوە، مافێکی زیاتریان هەیە بۆ کاتی ئەو تا منی بابایەکی نامۆ کە چەندین پرسیاری زەحمەتی لێ دەکەم.

بەڵام ئێستا زۆربەی کۆنە ئەندامان دەیانەوێ قسە لەگەڵ مندا بکەن دەربارەی ئەو چەند ساڵەی لەگەڵ موجاهیدیندا بەسەریان بردووە. ئەمە کارێکی نایابە و ئەنجامی لێ دەکەوێتەوە بۆ دروستکردنی هاوڕێیەتییەکی نوێ. کاتێ قسەم لەگەڵ مەرجان مالیکدا کرد لە تاران لە ساڵی ٢٠٠٤، کە تا ئەودەم لەگەڵ کچەکەیدا بەیەکتر شاد نەبووبوونەوە. مەرجان وتی: تۆ نازانی چۆن و بەچ شێوەیەک قسە لەگەڵ خەڵکیدا بکەیت دەربارەی شتە ئاساییەکان. بۆیە ئێستا بۆ من زۆر زەحمەتە بچم بۆ ئاهەنگێک. من تەنیا بەرگەی چەند ساتێک دەگرم کە خەڵک لە دەوروبەرم بن. هیچ

بابەتێکمان نییە پێکەوە باسی بکەین. لەو جۆرە ئاهەنگانە کچەکان قسە لەسەر مۆدیل و پارە دەکەن. کاتێ لەو ئاهەنگانە منداڵ دەبینم خۆزگەی بینینی منداڵی خۆم دەخوازم.

ئەندامێکی پێشووی تری موجاهیدین زیاتر لەم بارەیەوە قسە دەکات، کە چەندە پێویستی بەوە هەبووە قسە لەسەر ئەزموونەکانی خۆی بکات لە نێو کەمپەکەدا. دەبێ زۆر لە خۆی بکات گوێ بگرێت کاتێ باسی بابەتێکی تر دەکرێت، چونکە خۆی نازانێت باسی هیچ شتێکی تر بکات.

کێشەی پێوەندیکردن بەکەسانی ترەوە زۆر پێوەندیی بەو ئەزموونە چەند ساڵییەوە هەیە کە هەرشتێک تۆ دەیڵێی دەکرێ دژت بەکار بهێنرێتەوە. کاتێ قسەم لەگەڵ عەلی ڕەزا میرازگەری کرد لە ئەڵمانیا، لەم بارەیەوە پرسیارم لێی کرد، ئەویش دانی پێدا دەنێت و دەڵێ: من وا فێر کراوم نابێ سەد لە سەد متمانە بەهیچ کەسێک بکەم. هەر بۆ نموونە، خوشکەکەم لە هۆڵەندایە و دەیەوێ یارمەتیم بدات، بەڵام من لێی ناگەڕێم. چی بکەم بەدەست خۆم نییە، گومانم لە ڕۆڵی هەموو کەسێک هەیە، دەڵێم نەوەک بیانەوێت بەکارم بێنن.

هەروەها ئاراش سامیتی پوور لە تاران پێی وتم: ناتوانم قسە لەگەڵ هەموو کەسێکدا بکەم. من تەنانەت بەهەموو ئەندامانی خێزانەکەشم نەوتووە بەتەواوی چیم بەسەر هاتووە. ئەو کەسانەی من متمانەیان پێ دەکەم، ئەوانەن لێرە دەیانبینی، کە هاوڕێمن لە (نەجات)دا.

ئاراش باسی ئەو پیاو و ئافرەتانە دەکات کە لەگەڵیاندا ڕێکخراوێکیان دامەزراندووە لە تاران بۆ لەخۆگرتنی کۆنە موجاهیدەکان بەناوی (ڕێکخراوی نەجات) واتە ڕزگارکردن. تەنیا متمانە بەو چەند کەسە دەکات چونکە زۆر باش دەیانناسێت لە کاتی ئەو ساڵانەی لە نێو زیندانەکانی ئێران لەگەڵیاندا بەسەری بردووە. بۆیە ناترسێت لەوەی پیاوانی ڕەجەوی درزە بکەنە نێو ئەو گرووپە بچووکە ڕێکوپێکە، هەرچەندە دانی پێدا دەنێت چەندین هەوڵ هەبووە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە. ئاراش ئاماژە بەوە دەدات و دەڵێ: بەڵام بۆ ئێران ئاسانترە خەڵک بنێرێ بۆ ئەشرەف بۆ سیخوڕیکردن لەوێ نەک بەپێچەوانەوە. لێرە فلتەرەکان زۆر بەهێزن.

چەندین ساڵی پێ دەچێت پێش ئەوەی کۆنە ئەندامان ناسنامەیەکی نوێ بدۆزنەوە. گەلێکیان لە ئەوروپا دەژین، بەڵام ڕوحەکانیان هێشتا لە نێو ڕێکخراوەکەدایە، ئەمە ئەنجامی هەندێ لە کۆنە ئەندامانە. ئەوان دەتوانن درک بەوە بکەن چەوتیی ڕێکخراوەکە چییە، بەڵام ناتوانن ڕۆڵی خۆیان لەوەدا لە بیر بکەن.

حەبیب خورەمی لە ژوورەکەی خۆی لە هۆڵەندا دەڵێ: سەیر کە، من ئێستا بەڕاشکاوی دەڵێم من هەڵە بووم. بەڵام ئێستاشی لەگەڵدا بێت کەسانێک هەن ڕەنگدانەوەی ڕێکخراوەکەیان لەسەرە و پێیان وایە ئەو کاتەی لە موجاهیدیندا بەسەریان بردووە کاتێکی باش بووە. زۆر شانازی بەوەوە دەکەن لە ڕێکخراوێکی سیاسیدا چالاک بوون. ئەوان دەڵێن هەڵە کراوە، بەڵام خودی بیرەکە لە بنەمادا هەڵە نییە. منیش ئەوە دەڵێم کە من بەهەڵە بە کارهێنراوم، بەڵام دانیشی پێدا دەنێم من زۆر ژیر نەبووم. من خۆم گەمژە بووم بۆیە ڕێگەم بەخۆم دا بەخراپی بەکار بێم.

بیر لە وشەکانی دەکەمەوە، فەرەح کەریمی دەخوێنمەوە کە چەند ئازار دەچێژێ کاتێ دوای بیست ساڵ جێهێشتنی ڕێکخراوەکە ئەم وشانە بنووسێت: موجاهیدینی خەلق بووەتە ڕێبازێکی تاوانکاری. باجی کەسیی خۆم کە دەبێ بیدەم لە بەرامبەر بەشداریم لەم ڕێکخراوەدا کەمترین کێشەکانمە. گەورەترین نیگەرانی و دوودڵیی من لەوەی بەئاشکرا و بەڕاشکاوی سەرکۆنەی ئەم ڕێکخراوە بکەم ئەوەیە من نامەوێت دان بەوەدا بنێم و بڵێم مردنی فەرزەندەی خوشکم بێ هوودە بوو. گەلێ لەو کەسانەی من ناسیومن لە نێو ڕێکخراوەکەدا زۆر مەردانە و نەبەردانە جەنگاون. ناڕەزایی و دژایەتیی من بۆ ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلق وەک ناپاکییە لەوان.

لەبەرئەوەی هیچ وازهێنانێکی پاک نییە لە ڕێکخراوەکە، تەنانەت دوای دە ساڵیش جودابوونەوە و هەڵاتن هێشتا ئازارێکی زۆر دەمێنێت. لە کاتی گفتوگۆکردنمان سەمەد نازر زۆر بەشەرمەزارییەوە باسی ئەو مۆتەکانەی دەکرد کە دوای دە ساڵ جێهێشتنی ئەو ڕێکخراوە هەر لەگەڵیدان. سەمەد دەڵێ: کاتێ لە خەو هەڵدەستم، باوەڕ بەوە ناکەم لە ماڵی خۆمم. هەمیشە خەون دەبینم گەڕاومەتەوە نێو ڕێکخراوەکە و ناتوانم لێی بچمەوە دەرەوە.

نەمانی خووەکانی مەسعود ڕەجەوی کاتی دەوێ، کەس ناتوانێ بەتەنیا ئەم کارە

بکات. سامیتی پوور دەڵێ: بەڕاستی پێویستیمان بەڕیستارت هەبوو. ڕێکخراوی نەجات دەبێ ئەم کارە بکات و پڕۆگرامێکی ترمان بۆ دابنێ. ئەوەی لە ڕێبازی ڕەجەوی دێتە دەرەوە نەخۆشە و کاتێکی زۆری دەوێ تا دەگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی. ئێمە لە ڕێکخراوی نەجاتدا بێگومان قسەمان لەگەڵ کۆنە ئەندامانی موجاهیدینی خەلقدا دەکرد کاتێ بۆ ماوەیەک لێرە بوون، بۆ ئەوەی بزانین چۆن هەڵسوکەوت دەکەن و ئەگەر پێویستیان بەیارمەتی بێت بۆیان دابین بکەین، بەڵام ئێمە ناتوانین ئەو پڕۆگرامەی موجاهیدین لە ناخماندا دەربهێنین. ئەی چۆن ئەم کارە دەکرێت؟ خێزان و مامەڵەی باش لە لایەن حکوومەتەوە ڕۆڵێکی کاریگەریان دەبێت لە درککردن بەشتەکان. من بۆ خۆم خێزانەکەم زۆر یارمەتییان داوم. من زۆر هەستم بەشەرمەزاری دەکرد چونکە من هەرگیز چاوەڕێی ئەمەم نەدەکرد، چونکە خێزانەکەم هاوکاریی دارایيان کردم و هەرچییەکم پێویست بوو بۆیان دابین کردم.

مەسعود خودابەندە دەڵێ: خێزان و هاوڕێکان زۆر گرینگن بۆ ڕێگەی ڕاست و دۆزینەوەی ڕاستییەکان. تۆ پێویستیت بەیارمەتییە و ئەو خەڵکانەی لە ڕابردوو لەگەڵ تۆ بوون دەتوانن باشترین یارمەتیت پێشکێش بکەن، وەک هاوڕێکانت، دایک و باوکت، منداڵ و دکتۆرەکانت. ئەو کەسانەی تۆیان خۆش دەوێت بێ ئەوەی چاوەڕێی شتێکی بەرامبەر بکەن وەری بگرن.

بەڵام سەرەڕای ئەوەی خودابەندە چەندین سات لەگەڵ پزیشکی دەروونی قسە دەکات، ئەو پێی وایە هێشتا بەتەواوی لە ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلق ئازاد نەبووە. خودابەندە دەڵێ: ئێستا من سەقامگیرترم، کارم هەیە و ژنیشم هێناوە. بەڵام هێشتا باوەڕ بەوە ناکەم لەو ڕێکخراوە ڕزگارم بووبێ. ئێستا دکتۆرەکان پێم دەڵێن " ئێستا تۆ زۆر باشیت، بەڵام هێشتا شوێنەواری ئەو ڕێکخراوە لە نێو تۆدا دەبینین". من پرسیارم لە خودابەندە کرد "دەزانی ئەمە واتای چییە؟" بەبیرکردنەوە وەڵامی دایەوە و وتی: نەخێر، نازانم مەبەستی ئەوان بەتەواوی چییە!

خودابەندە دەڵێت سەرەتا هەوڵی دا ڕێگەیەکی خۆی بدۆزێتەوە بێ یارمەتییەکی پرۆفێشناڵ و پزیشکی، چونکە زۆربەی موجاهیدەکان وا دەکەن. ئەو دەڵێ: بەڵام پاش چەند ساڵێک، گەیشتمە ئەو ئەنجامەی ناتوانم ئەم کارە بەتەنیا بکەم. سەردانی

چەند دکتۆرێکم کرد و زۆر سەرسام بووم کاتێ زانیم ئەوان لە قسەکانی من دەگەن و دەزانن باسی چی دەکەم. هەموو ئەو شتانەیان پێشتر دیبوو. ئەو دکتۆرانە چەند کتێبێکیان بەدەست گەیشت بوو لە بارەی ڕێبازە ئاینییەکان و کاریگەرییان، بۆیە پاشان چوونە لای خودابەندە.

خودابەندە لەگەڵ پزیشکە دەروونییەکانیەتی لەسەر بنچینەی ئەو ڕایەی هەموو کۆنە ئەندامان پێویستیان بەپڕۆگرامێکی نوێ هەیە بۆ سڕینەوەی کاریگەرییەکانی ئەو چەند ساڵ مێشک شووشتنە لە لایەن ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلقەوە، دەڵێ: "من هەوڵم دا ئەو کەسانەی ڕێکخراوەکەیان جێ هێشتووە هان بدەم قسە بکەن بۆ پسپۆڕانی بواری دەروونزانی." بۆی دەرکەوت چەند زەحمەتە بڕوایان پێ بێنێ، چونکە ئێستاش ئەوان درک بەوە ناکەن کە ڕەجەوی سوودی لە میتۆدی زۆر باش وەرگرتووە بۆ شووشتنی مێشک و هزری ئەوان. دکتۆرەکان دەتوانن یارمەتییان بدەن لەسەر ئەم بنچینەیە. ئەو دەڵێ: "چەند هەفتەیەک لەمەوبەر دکتۆرەکەم تەلەفۆنی بۆ کردم و پێی وتم "مەسعود یەکێک لە موجاهیدەکان لێرەیە و نکووڵی لەوە دەکات ئەم ڕێکخراوە ڕێبازێک بێت." ئەو پیاوە لە لایەن خوشکەکەیەوە نێردرابووە لای دکتۆر، پێمی وت: "ئەوەی موجاهیدین دەیکات شتێکی زۆر جیاوازە و دکتۆرەکە لەمە ناگات." منیش وەڵامم دایەوە و پێم وت "نەخێر، ئەوەی تۆ باسی دەکەیت لەگەڵ قسەکانی دکتۆر یەک شتە."

ئەوانەی ناچنە نێو پرۆسەکە و تەنیا لە ماڵەوە دادەنیشن، تا ئێستا نازانن کراسێک هەڵبژێرن و لەبەری بکەن. بۆ نموونە، لە قسەکانی مەسعود بەنیسەدردا ڕوون دەبێتەوە کە لە ساڵی ١٩٩٦ەوە ڕێکخراوەکەی جێ هێشتووە و تا ئێستا تێکەڵاوی خەڵک نەبووەتەوە. کتێبێکی لەسەر خۆی نووسیوە، بەڵام هیچی لێوە فێر نەبووە چونکە دوای ئەو کتێبە نەیتوانیوە بچێتە دەرەوە. ئەندامێکی پێشوو لە ئێران لای من دانی پێدا نا وتی ئەم کەموکوڕییە لە دەستپێشخەریی گرفتی ئێمەیە. تا ئێستا ناتوانێت بڕیاری خۆی بدات و ژن بهێنێت لە کاتێکدا خێزانەکەی کچێکیان بۆ دۆزیوەتەوە و کچەکەی بەدڵە و ئەویش حەز دەکات مێردی پێ بکات.

بەڵام پرسیاری من ئەوەیە بۆچی تەنیا چەند ئەندامێکی پێشووی موجاهیدین دوای

نموونەی خودابەندە کەوتوون و چوونەتە نێو پرۆسەی چاکبوونەوە بەهۆی پسپۆڕی دەروونییەوە. خودابەندە وەڵامی ئەمە دەزانێت و دەڵێت "بەداخەوە ئەمە بەم شێوەیە لە کولتووری ئێراندا، کە خەڵک بەگشتی کەللەڕەقن و زۆر دوودڵن لە وەرگرتنی یارمەتی لە کەسانی ترەوە. چونکە گەر تۆ بچیتە لای پسپۆڕێکی دەروونی بەشێت لە قەڵەم دەدرێیت." کۆنە ئەندامانی موجاهیدین هەست دەکەن قوربانین، بەڵام شێتن... نەخێر شێت نین.

هەروەها خودابەندە پێی وایە ئەوانەی لە ڕیزەکانی سوپای ڕزگاریخوازدا بوون باشترن. ئەو دەڵێت "کەمتر بیریان لێ کردووەتەوە. ئەوانەی لە لایەنی سیاسییەوە کاریان کردووە، ئەوانەن زۆر ئازار دەچێژن و زۆر بیر دەکەنەوە و بەئاسانی لەوە ناگەن چۆن ڕێگەیان بەخۆیان داوە بکەونە ئەم داوەوە و بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ تیایدا بمێننەوە. یارمەتییان ناوێت، بۆیە چەقیون و ناتوانن دووبارە ببنەوە بەمرۆڤێکی ئاسایی. لەگەڵ ئەوەشدا، وشەی "ئاسایی" واتایەکی نەرێی هەیە لە فەرهەنگی موجاهیدیندا: واتە قێزوبێز. لە ڕاستیدا هەر نایانەوێت ببنەوە بەمرۆڤێکی ئاسایی."

تا چەند زەحمەت و دژوارە لە ڕێکخراوەکە دوور بکەویتەوە؟ ئەم پرسیارە ڕوون دەبێتەوە لە ئەنجامی گفتوگۆکەم لەگەڵ ئیبراهیمی خودابەندەی برای مەسعود خودابەندەدا کە لە تاران لە تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٤دا کردوومە، کە پێش ئەو کاتە ساڵ و نیوێکی لە زیندانی ئەڤیندا بەسەر بردبوو. دەسەڵاتداران لەگەڵ چەند پاسەوانێک ناردیانە دەرەوە بۆ دیمانەکە. لە بارەگای ڕێکخراوی نەجات لە تاران چەند گفتوگۆیەکی لەگەڵ سامیتی پوور و ئەوانی تردا کرد.

لەسەر مێزی نێو ژووری کۆنگرە لە بارەگای ڕێکخراوی نەجاتدا بەرامبەرم دانیشت و پێی وتم چی بەسەر هاتووە، لە کاتێکدا هاموشۆی ئۆتۆمۆبێل لە دەرەوە لەسەر شەقام جمەی دێت و هۆرنەکان زیاتر دەبن و دووبارە دەوەستنەوە. ئیبراهیم بەبیرێکی مەزن و سەرسامەوە قسە دەکات کە لە دەنگیدا دەلەرێتەوە، زۆر ئاشکرایە پێویستی بەوە هەیە باسی بەسەرهاتی خۆی بکات، هەرچەندە پێشتر چەندین جار باسی خۆی کردووە. هەروەها ئەوەشی بەسەروفەساڵەوە دیارە کە چەندە خۆشحاڵە

ێستا لە دەرەوەی زیندانە و بەڕوویکی قایمەوە گفتوگۆکە درێژ دەکاتەوە بۆ ئەوەی
ساتێک زیاتر لە زیندان دوور بێت.
دەتوانم بڵێم بەئینگلیزییەکی باش بەڵام هەر بۆنی ئێرانی لێ دەهات باسی ئەوەی
بۆ کردم چۆن دوای ڕووخانی بەغدا لە نیسانی ٢٠٠٤دا، لەسەر سنووری عێراق –
سووریادا دەسگیر کراوە. هۆیەکەش ئەوە بوو: موجاهیدینی خەلق هەوڵی ئەوە
دەدات چەند هەگبەیەک لەگەڵ دوو ملیۆن دۆلار و چەندین زێڕ و گەوهەر و بەڵگەنامە
و پاسپۆرت و کاسێتی ڤیدیۆ بەقاچاخ بباتە دەرەوەی عێراق. خودابەندە یەکێکە لە
نوێنەرانی ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەرەنگاری لە لەندەن. هەرچەندە دەڵێت هیچ
نازانێت لە بارەی هەگبەکانەوە، کەچی دەگیرێت و ڕەوانەی ئێران دەکرێتەوە.
لە زیندانی ئێراندا، سەرسام دەبێت، چونکە بەهیچ شێوەیەک ناخرێتە ژێر
باڵەپەستۆوە، بۆیە دەڵێ: سەیری تەلەفزیۆن دەکات، ڕۆژنامە دەخوێنێتەوە، جارجار
ڕێگەی پێ دەدرێت بچێتە دەرەوە و لە شەقامەکاندا پیاسە بکات، خێزانەکەی
سەردانی دەکات و هەر شتێک دەستی بگاتێ دەیخوێنێتەوە. دەڵێ "لەو ساڵ و نیوەی
ڕابردوودا ئەوەندەی هەموو ژیانم کتێبم خوێندووەتەوە" من دەزانم ئەمە ڕاستە
چونکە لە نێو موجاهیدیندا هەموو کتێبێک قەدەغەیە جگە لە قورئانی پیرۆز.
ساڵ و نیوێک دوای گەیشتنی بەئێران، خودابەندە لە گفتوگۆیەکدا بێ مەبەست بۆ
منی دەسەلمێنێ مەسعودی برای ڕاست دەکات. چونکە زیاتر نایەتە پێشەوە و قسە
ناکات، هەر خەریکی دەربڕینی هەستەکانیەتی بەرامبەر بارودۆخی وڵاتەکەی، دەڵێ:
ئێران زۆر لە سووریا و ئوردن و عێراق دیموکراسیترە و هەر ڕەخنە لە موجاهیدین
دەگرێ چونکە پێی وایە ئەوان بەشێوەیەکی نادادپەروەرانە بەردەوام باوەڕیان بەوە
هەیە کە ڕووخاندنی حکوومەتی ئێرانی پێویستییەکی بێ چەندوچۆنە. دەڵێت
ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلق تەنیا حەز لە دەسەڵات دەکات و هەموو شتێک دەکات
لە پێناو بەدەستهێنانی دەسەڵاتدا، لە ناچارکردنی تەڵاقدانی نوێنەرەکانی و
هاوقەکردن لەگەڵ سەدام حوسێنەوە تا دەگاتە بەکارهێنانی گولله هاوەن لە نێو
شارەکاندا. نارنجۆک و هاوەنەکان باش نین چونکە ئامانجی دیاریکراو ناپێکن،
باشە گەر مەبەستت کوشتنی یەکێکە بۆ دەمانچە بەکار ناهێنیت و ڕاستەوخۆ
نایکوژیت؟"

بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕەخنەیەکی زۆری هەیە لە پرۆسەی بەمەزەبکردن لە لایەن موجاهیدینی خەلقەوە، کە ئەو دەڵێت هەمیشە مامەڵەی باشی لەگەڵدا کردووە. ئەو ڕەخنەیەی ئەو بەردەوام دەبێت کاتێ تێبینی دەکات دەسەڵاتدارە ئێرانییەکان ئازادی دەکەن گەر ڕازی بێت کاریان لەگەڵدا بکات لە هەر بارێکدا بێت "ئێمە ناتبەینە ئەو کۆبوونەوانەی تیایاندا خەڵک بەسەرتدا بقیرێنن و ڕای خۆیان بەسەر تۆدا بسەپێنن." چونکە ئەمە لە نێو کۆبوونەوەکانی موجاهیدیندا ڕوو دەدات. ئیبراهیم نارەزاییی زیاتر دەردەبڕێت و دەڵێت "ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلق چەندین کەسی گومڕا کردووە و ڕێگەی هەڵەی پێ نیشان داون، ئەو کەسانە چەندین هەڵەیان کردووە چونکە نەیانتوانی لەوە بگەن یان دانی پێدا بنێن کە بارودۆخەکان چەندە گۆڕاون لە ئێراندا".

ئیبراهیم خودابەندە بەشێوەیەکی ڕوون و یەکلاییکەرەوە موجاهیدین یان مەسعود ڕەجەوی ڕەت ناکاتەوە، هەرچەندە ڕوونە کە هیچ نیازێکی نییە بگەڕێتەوە ناویان پاش ئەوەی لە زیندانی ئێران ئازاد دەکرێت. دەیەوێت لە ئێراندا لەگەڵ پیرە دایکەکەیدا بژی، کە ئێستا دوای مردنی باوکی بەتەنیا دەژی.

هیچ قسەیەکی نییە لەسەر ئەو ساڵانەی لە دەستی داون و خۆی لەو کەسانە لە قەڵەم نادات ڕۆژێک لە ڕۆژان مێشکی شۆرابێتەوە. چونکە بۆ منی ڕوون دەکاتەوە کە باوەڕی پێم نییە کاتێ دەڵێم ڕێکخراوەکە ئەندامانی خۆی ئەشکەنجە داوە و کوشتوونی، هەروەها ڕەتی هەموو پرسیارە زیادەکانی من دەکاتەوە لە بارەی هەستەکانی بەرامبەر بەڕێکخراوەکە.

پاش ئەوەی منی بەتەنیا جێ هێشت و ڕۆیشت، من ئەو بۆچوونەم لا دروست بوو کە ئەو ئیبراهیمە هێشتا بەتەواوی لە ڕێکخراوەکە نەپچڕاوە.

ئەو بۆچوونەی من دوویات بووەوە کاتێ لە مانگی یازدەی ساڵی ٢٠٠٤دا، ئیبراهیم نامەیەکی کراوە بۆ مەسعود ڕەجەوی بڵاو دەکاتەوە. لە نامەکەدا چەندین پرسیار دەکات کە گەلێک لە کۆنە ئەندامان بەدوای وەڵامەکانیاندا وێڵن. نامەیەکی تەواو موجاهیدانەیە و بەبڵاوکراوەیەکی ڕۆژنامەوانیی ڕێکخراوەکە دەچێ کە زۆر جار بۆ خەڵکە نەزانەکانی دەرەوە دەنووسران، نامەکە چەندین ڕستەی درێژی تیا بوو کە

خوێنەر خێرا خۆی تیادا ون دەکات. نامەکە پڕە لە ڕەخنە لەسەر ئەو ڕێگەیەی ڕەجەوی بەکاری دەهێنێت و خەڵکی خۆی پێ دەچەوسێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئیبراهیم خودابەندە لە هیچ شوێنێکی نامەکەدا هێرش ناکاتە سەر ڕەجەوی. بەتایبەتی لە دێرەکانی کۆتاییدا، ئەوە بەڕوونی دیارە کە ڕەجەوی بۆ ئیبراهیم هێشتا کتێبێکە بەتەواوی دانەخراوە.

کورتەی پرسیارەکان ئەمەیە: پاش ئەو هەموو ڕووداوانە تۆ هەر پاڵپشتی تیۆرییە کۆنەکانی وەک "پاساو بۆ دەسەڵات و پاڵەپەستۆ و توندوتیژی" و دروشمی وەک "ئێمە هەموومان ڕاستین و ئەوانی تر هەموویان هەڵەن" و "ئەوەی لەگەڵ ئێمەدا نەبێت، دژی ئێمەیە" و هێشتا لەگەڵ ئەو کەشوهەوایە بناوانگرەدای کە هەر پرسیارێک یان ڕەخنەیەک بەکاری ئەو خوانەناس و ناپاکانە دەشێت کە لە دەرەوەی فەرمانەکانی ئێوەدا کار دەکەن؟ یان ئاخۆ بەئاگا هاتوویتەوە و هەوڵ دەدەی ڕێگە و تاکتیکی نوێ بدۆزیتەوە؟

مەسعود خودابەندە پێشتر گەیشتووەتە ئەو بڕوایەی کە دوورکەوتنەوە لەم ڕێکخراوە کاتێکی زۆری دەوێ. لەم ئانوساتەدا، براکەی ناتوانێ بەشتێکی کەم خەریک بێت، بۆیە گەر بۆی بڕەخسێت هەلێکی تر دەداتە مەسعود ڕەجەوی. بەڵام شەش مانگ دواتر، واتە لە مانگی ئایاری ساڵی ٢٠٠٥دا، زۆر جیاواز لەم پرسە دەڕوانێت و بیری لێ دەکاتەوە. دوای ئەمە ئامادەیە زانیاری بدات لە بارەی ڕێکخراوەکە و لە دژی مریەم ڕەجەوی سکاڵا لە دادگای فەرەنسیدا تۆمار بکات.

هەر تەنیا ئەوە زەحمەت نییە لەسەر ئاستی هزریدا خۆت لە تەونی موجاهیدین ئازاد بکەیت، چونکە ڕێکخراوەکەش ناهێڵێت وا بەئاسانی لێی دەرباز بیت و بێیتە دەرەوە. موجاهیدێکی پێشوو لە کۆڵن لە بارەی ڕووداوێکی ئەم دوایییە بۆ من دەدوێت و دەڵێ: پۆلیس لەبەر دەرگە بوون. پرسیاریان لێ کردم ئاخۆ چەکم پێیە یان نا! هەڵسوکەوتیان سەیر بوو، چونکە لێرە زۆر باش منیان دەناسی. بەڵام دەبوایە هەر پشکنینی خۆیان بکەن، چونکە زانیارییان تەواو وەرگرتبوو.

موجاهیدە ئەڵمانییەکەی پێشوو ناتوانێت بەمە پێ بکەنێت. موجاهیدینی خەلق پاش چەندین ساڵ جێهێشتنی توانییان بەچەندین ڕێگە بۆی بچن. بۆ ئەم و

پۆلیسەکانی کۆڵن، هیچ پرسیارێک نییە بیکەن چونکە زانیاریی تەواویان وەرگرتووە، هەروەک گەلێکی تریش بۆ چەندین ساڵە هەر وایان کردووە. هەروەها تەنیا بەهۆی پۆلیسەوە نایەنە ژوورەوە. "خێزانەکەم لە کۆگایەک لە کۆڵن کاری دەکرد. لەوێ نامەیەکیان بەدەست گەیشت کە مێردەکەی لەگەڵ ڕێژیمی ئێراندا کاری کردووە! دەبێ ئەو کۆگایە چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو جۆرە زانیارییەدا بکات و دەبێ چی بکات؟"

موجاهیدینی خەلق ڕێکخراوێک پێک دەهێنێت کە لێیەوە وا بەئاسانی ناتوانی هەڵسی و جێی بهێڵی. هەموو ئەندامە چالاکەکانی پێشوو پێم دەڵێن موجاهیدەکان هەمیشە هەنگاوێک دوای ئەوانن. هەندێکیان زۆر جار ناوی خوازراویان بەکار دەهێنا، یان داوایان لێ دەکردم ناویان نەهێنم. هەندێکیان لە لایەن پۆلیسەوە ئاگەدار دەکرانەوە، ئەوانی تر خۆیان پێیان دەزانی. هەندێ جار بەشێوەیەکی ڕەق، ئێمە پاش هەموو شتێک، مامەڵە لەگەڵ ڕێکخراوێکی سەربازیدا دەکەین کە هەموویان مەشق پێ کراون لە جێبەجێکردنی کاری تیرۆریستی و بەهیچ شێوەیەک ناترسن لە بەکارهێنانی ئەم زانیارییە لە ئەوروپادا، وەک ئەندامێک لە کۆمەڵەی ڕۆشانە کە کۆمەڵەیەکی ئەڵمانییە بۆ موجاهیدە ئەزمووندارەکان.

ئەو ئەندامە لە کۆتاییی ٢٠٠٤دا پێمی وت لە دوکانێکی سەر شەقام لە ناوەڕاستی کۆڵن دوو ئێرانی لێی نزیک کەوتنەوە و دواتر بەردەوام بەدوایەوە بوون. ئەو پیاوە بەزەحمەت دەرۆیشت لە ئەنجامی ئەشکەنجەکانی زیندانەکانی ڕەجەوی. ئەو دوو ئێرانییە هەوڵیان دا بەدەسەڵات زاڵ بن بەسەریدا بەهۆی بەکارهێنانی توندوتیژیی جەستەیی، هەروەها نیازی ڕفاندنیان هەبوو. پیاوەکە دەنگی یارمەتی هەڵدەبڕێت و کەسانی دەوروبەری بەهانایەوە دەچن و ئازادی دەکەن، دواتر پۆلیسیش ئاگەدار دەکەنەوە. کەواتە ئەوەی واز بێنێت، ڕێکخراوەکە وازی لێ ناهێنێت.

ئەوانەی هێرشیان کردە سەر دواتر دەسگیر کران. یەکێکیان دەردەچێت ناوی ئیحسان ڕەزاییە، ئەندامی بەشی زانیاریی نهێنییە لە ڕێکخراوی موجاهیدین کە لە نێو کۆنە ئەندامانداندا بەیەکێک لە لێکۆڵەوەکانی نێو زیندانەکان ناسراوە، دەتوانێت لە ڕێگەی ئازار و ئەشکەنجەدانەوە دان بەخەڵکی بهێنێ.

ئەو بەڵگەنامانەی لە ساڵی ٢٠٠٣دا لە ئەنجامی هێرشێک لە مەڵبەندی

سـەركـردايەتی لە پاریس دۆزراونەتەوە بەڕوونی ئەوە دەردەخـەن ئەوەی ڕووی دا لە کۆڵن لەگـەڵ ئەم پیاوەدا تاکە ڕووداو نییـە بگرە زۆر ڕووداوگـەلی لەم جۆرە ڕوویان داوە بەڵگە هەیە لەسـەر کارێکی بەکۆمـەڵ لە دژی کۆنە ئەندامان، کـە وا پێ ناچێت ڕێگەی لێ گـیـرا بێت بەهۆی ئـەو هەڵکەوتەی ئەمـەریکاییـەکان لـە نیسـانی سـاڵی ٢٠٠٣وە کـۆنتـرۆڵی کـەمپی ئەشـرەفـیـان کـردووە. لە ئۆفـێـرس سـور ئۆیس چەند لیستێک هەبوون ناوی ئەو ئەندامانەی پێشووی تیا بوو کە بەئاشکرا قسەیان لەسەر ڕێکخـراوەکـە کـردبوو، هـەروەها نـاوی ئەو ڕۆژنامـەنووس و سـیـاسـەتوانانەی بەشێوەیەکی ئاشکرا ڕەخنەیان لە موجاهیدین هەبوو.

لە بارەی ئەمـەوە پرسـیارم لە مـەسـعود خـودابەندە کرد، ئایا کێ دوای ئەو هەمـوو سـاڵە، چالاک بوو لە بـەشی کـاری نـهێنی لە ڕێکخـراوەکـەدا. خـودابەندە دووپاتی دەکاتەوە کە بەشێک هەیە لە کارەکان بۆ ئەم جۆرە چالاکییانە تەرخان کراون. دەڵێت "مەسعود و مریەم ڕەجەوی ئەو قوربانییانە دەستنیشـان دەکەن کە بەڵگەیان لەسەر کـۆ بکرێتـەوە. کـۆنـە ئەندامـان زۆر چالاکـیـیـان لە دژ دەکـرا، هـەروەها ئـەندامـانی ئۆپۆزسیـۆنی ئێـران لە تاراوگـە و هەندێ جار پەرلەمـانتارە ئەورووپییەکانیش و ئەو پەنابەرانەی کـە سـەنگەریان گرتوو بوو لە دژی مـوجـاهیدین. کـارەکەش برێتـییـە لە دەرکـردنی فـەرمـان بـۆ گـەڕان بەدوای خـاڵە لاوازەکـان لـە ژیانی ئەمـانەدا و دروستکردنی بەڵگەنامەی تێکشکێنەر لە بارەیان."

بەپێی قسـەکانی خودابەندە وا دەردەکەوێت ئەمە بەسەر هەمـوو ئەندامێکدا هاتووە کە پاش دەمەتـەقێ ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەرەنگاریی بەجێ هێشـتووە. بەڵام ناوی عەلی ڕەزا نوریزادەش دەهێنێت کە ڕۆژنامـەنووس و ئەندامـێکی دیاری ئۆپۆزسیـۆنی ئێـرانە و لـە لەندەن بـەرنامـەیەک لە سـەتەلایت پێـشکێش دەکـات و من دەزانم ئەو بەرنامـەیە بینەری لە ئێران زۆرە. هەروەها ناوی بـارۆنێس ئێـمـا نیکۆلسـۆن، ئەندام پەرلەمـانی ئەورووپا کە بەڕەگەز بـەریتـانییـە و زۆر ڕەخـنەی لە مـوجـاهـیـدین دەگرت. داوای بەڵگەم لە خـودابەندە کـرد بەڵام هـیچ بەڵگەیـەکی پێ نـەبوو، ئەوەنـدەشی وت "بەڵام من دەزانم ئەمان چۆن کار دەکەن."

لە پایزی سـاڵی ٢٠٠٤دا نیکۆلسـۆن سەردانی ئیبراهیمـی برای خودابەندە دەکات

له زیندانی ئەڤین. ڕاپۆرتێکی چڕوپڕ دەکات لەسەر ئەو مامەڵە دادپەروەرانەیەی لەگەڵیدا دەکرێت.

له کاتێکدا موجاهیدین دووپاتی دەکەنەوە کە زۆر بەخراپی ئازار دراوە و هەر خێرا لە سێدارە دەدرێت. لە بەرامبەر ئەمەدا ڕێکخراوی موجاهیدین لە لەندەن کچی ئیبراهیم دەخاتە ژێر پاڵەپەستۆ تا لە بەردەم بارەگای حکوومەتی بەریتانیا ئاگر لە خۆی بەردات، وەک ئەو نارازییانەی لە مانگی یەکی ۲۰۰۳دا هەوڵیان دا بەپاڵەپەستۆ مریەم ڕەجەوی ئازاد بکرێت. کاتێ کچەکەی ڕێگەی پێ دەدرێت لە زینداندا سەردانی بکات، باوکی لەم پاڵەپەستۆیە ئاگەدار دەکاتەوە، ئیبراهیم خودابەندەش نارەزایی دەردەبڕێت لە لای حکوومەتی بەریتانیا. لە نێو زینداندا داوا لە لەندەن دەکات کارێک دژی هەڤاڵانی پێشووی خۆی لە ڕێکخراوی موجاهیدین بکەن.

بەشی کاری نهێنیی موجاهیدین ئێستاش چالاکە. خودابەندە دەڵێ: ئەو زانیارییانەی کە پۆلیس لە کۆڵن وەریان گرت لە بارەی موجاهیدی پێشوو و ئەو بانگەشەیەی کە ئەو ئەندامە کاری لەگەڵ حکوومەتی ئێراندا کردووە هەر لەوێوە هاتووە. کارە نهێنییەکە زانیاری دروست دەکات لە بارەی کەسانێکی وەک ئێمە و لە بارەی ئەو ڕۆژنامەنووسانەی لەسەر ئێمە دەنووسن و پاشان ئەو زانیارییانە دەگوێزرێنەوە دەزگای کارە نهێنییەکانی ئەورووپا.

چۆنیەتی کارکردنی ئەمە ڕوون و ئاشکرایە لە ئەزموونەکانی کەریم حاجی مۆنی، ئەندامێکی پێشووە لە هۆڵەندا. لەوەتەی بەئاشکرا باسی چیرۆکەکەی خۆی کردووە لە ساڵی ۱۹۹۹وە بەسیخۆڕێکی ئێران ناسێنراوە، زۆربەی ئێرانییەکان بەپارێزەوە لێی نزیک دەبنەوە. نەک هەر تەنیا کۆنە ئەندامان، بگرە ئێرانییەکانی تریش ڕوونی دەکەنەوە کە نازانن لە کوێی دابنێن، چونکە لەو شوێنەی دووکەڵ هەیە دەبێ ئاگریش هەبێت.

لە ئاداری ۱۹۹۹، ماڵی حاجی مۆنی لە ئارنهایم لە هۆڵەندا بەوردی دەپشکنرێت. بۆیە بڵاوکراوەیەک بەرهەم دێنێت و بڵاوی دەکاتەوە تیایدا سەکۆیەک پێشکێش دەکات بۆ کۆنە ئەندامانی موجاهیدین و ئێرانییە چەپەکانی تر بۆ دەربڕینی ڕا و بۆچوونە سیاسییەکانیان. وێڕای کۆمپیوتەر و تەلەفزیۆن، سەدان کۆپی لەو

"پەیوەند"ە دۆزرانەوە کە هەمووی ئامادە کرابوون بۆ بڵاوکردنەوە و دابەشکردن.

حاجی مۆنی یەکێکە لە کەسە یەکەمەکان کە بڕیار دەدات، شەش مانگ دوای جێهێشتنی موجاهیدین، تەوقی بێدەنگی بشکێنێت و قسە لەسەر ئەزموونەکانی خۆی لە نێو ڕێبازی ڕەجەویدا بکات، لە نێو هەموویاندا بۆ من ئاخاوت. پێم دەڵێ چۆن سەرۆکی ئاسایش بووە لە ساڵی ١٩٩١، کاتێ دەیەوێت ڕێکخراوەکە بەجێ بێڵێت، هەر لەبەرئەمەش بۆ ماوەی شەش مانگ لەگەڵ خێزان و منداڵەکەی دەستبەسەر دەکرێن. چەندین کەناڵی ڕاگەیاندنی هۆڵەندا دیمانەی لەگەڵدا دەکەن و ئەویش باسی ئەوە دەکات چۆن خێزانەکەی لەبەر پاڵەپەستۆی دەروونیی بەردەوامی ئەو ڕێکخراوە، خۆی دەکوژێت.

موجاهیدین زۆر بەتوندی بەرسڤی ئەمە دەدەنەوە. دوای ئەمە هەموو ئەو کەناڵە ڕاگەیاندنانەی باسی چیرۆکەکەی حاجی مۆنییان کرد سەردان دەکرێن لە لایەن خۆپیشاندەرانی ڕێکخراوەکەوە، دەڕژێنە سەر شەقامەکانی بەردەم بینایەکان لەگەڵ وێنەی ئەو قوربانییانەی ئازار دراون و لە سێدارە دراون لە لایەن ڕژێمی ئێرانەوە. دوای ئەمە گفتوگۆ لەگەڵ سەرنووسیارەکاندا دەکەن و دەست دەکەن بەتەلەفۆنی بێزارکەر تیایدا ئافرەت دەگرین لە نێو تەلەفۆنەکەدا گوایە ئەمانەی دەوترێن هەموویان درۆن.

بەلێشاو نامە دەگاتە دەستی سەرنووسیارەکان، لە نێو شتەکانی تردا هاتووە، وەک لە خزمەتگوزاریی ڕۆژنامەوانیی ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلقی ئێرانی لە دادگای لاهای، کە حاجی مۆنی بەدرۆزن و سیخوڕێکی ڕژێمی ئێرانی پێناسە دەکرێت. دەڵێن، بەڵی ڕاستە حاجی مۆنی ئەندامێک بووە بەڵام یەکێک نەبووە لە سەرۆکەکان و ئەندامی لیژنەی ناوەندیش نەبووە. ڕێکخراوەکە بەڕێکوپێکی هێنایە فەرەنسا، کاتێ ئەو پرسیاری کرد، ئایا ڕێکخراوەکەتان وای نەکردووە؟ ئەمە خۆی لە خۆیدا پرسیاری ئەوە قووت دەکاتەوە بۆچی تۆ شتێکی وەها بۆ سیخوڕێک دەکەیت. هەروەک چۆن حاجی مۆنی بۆ منی باس کرد چی لەو کەسانە دەکەن گەر بەئاشکرا باسیان بکات، بەتەواوی ئەمە بەسەر خۆیدا هات. ڕێکخراوەکە دەیوت خۆکوشتنی خێزانەکەی هیچ پێوەندییەکی نییە بەپاڵەپەستۆی ڕێکخراوەکەوە، بگرە پێوەندیی

هەیە بەدڵتەنگیی ئەو دەربارەی هەڵگەڕانەوەی مێردەکەی لە موجاهیدین.
موجاهیدێک نامەیەک دەنووسێت بۆ پۆلیس لە شوێنی دانیشتنی حاجی مۆنی (ئارنهایم) کە حاجی مۆنی ئەم قسانەی ئێمە دووپات دەکاتەوە. هەروەها بێگومان کۆپیەکی ئەو نامەیە هەیە فاکس کراوە بۆ نووسینگەکانی خۆم و ئەو هاوەڵانەشم کە دەربارەی حاجی مۆنی شتیان نووسیوە.

کەریم حاجی مۆنی دەخرێتە سەر لیستی "سیخوڕەکانی ئێران" کە موجاهیدین لە کەناڵە ڕاگەیاندنەکانی خۆیاندا بڵاوی دەکەنەوە، چارەنووسێک کە حاجی مۆنی و هەموو کۆنە ئەندامان پێی دەگەن. ئەگەر تۆ بۆ ڕەجەوی نەبیت، ئەوا تۆ بۆ ڕێژیمی ئێران کار دەکەیت. ئەمە یاسایەکی بنەڕەتی و حەتمییە (ئەگەر لەگەڵ ئێمەدا نەبیت، ئەوا لەگەڵ ئێراندا کار دەکەیت). ئەندامان، ئەوانەی ئێستاش لە ڕێکخراوەکەن، باوەڕیان بەوە هاتووە کە کۆنە ئەندامان هەموویان سیخوڕی ئێرانن. ڕەجەوی وای وەسف کردوون کە زۆر ڕقیان لێیان ببێتەوە. جارێکیان کتێبەکانی کۆنە ئەندامان دەخاتە سەر مێز وەک ئەوەی شەمس حایری و حاجی مۆنی و وتی "سەیرکەن بزانن ئەو ناپاکانە چییان نووسیوە. تێچووی هەر کتێبێک بۆ ئێمە سەد شەهید وەستاوە. ناچارمان دەکەن وزەی خۆمان دژی ئەوان بەکار بێنین نەک دژی خومەینی. ئێوە لە سەرتان و دەبێ یەک بەیەکی ئەوانە بکوژن."

فەرەح کەریمی ئەو کاغەزەی بیر دێتەوە کە لە ساڵی ١٩٨٦دا ئیمزای کردووە "بێ دووەم تێڕامان"، ئەم کاغەزە دەڵێت کەوا دەیەوێت لە ڕێکخراوەکە بچێتە دەرەوە. کاغەزەکە زیاتری تێدا هاتووە "من بەشێک نەبوومە لە بەرەنگاربوونەوە، من هیچی تر هێزم نییە و ئەو کەسە نیم بتوانم بەردەوام بم لەگەڵ ئەم خەباتە و هەرگیز هیچ شتێک لەسەر کارەکەم لە نێو موجاهیدینی خەلق ئاشکرا ناکەم و ئەگەر وام کرد ئەوا ڕێکخراوەکە دەسەڵاتی ئەوەی هەیە هەرچییەکم لەگەڵدا بکات."

دواتر ڕەجەوی زۆر لەوە زیاتر دەڕوات، بەشێوەیەک کە زۆر لە هەموو هاوەڵەکانی دەکات بەڵگەنامەیەک ئیمزا بکەن و ڕەزامەندی لەسەر ئەوە بدەن موجاهیدین بۆی هەیە زیندانییان بکات و بیانکوژێت ئەگەر بیانەوێت ڕێکخراوەکە بەجێ بهێڵن. ئاراش سامیتی پوور بیری دێتەوە و دەڵێت کەوا ڕەجەوی دوای ئەوە وتی "تەنانەت

ئەگەر ئێمە سەرنەکەوین لە بەدەستهێنانی دەسەڵات لە ئێران، من دەمەوێ ئێوە چەقۆیەک هەڵگرن و کۆنە ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە کە ئێستا لە ئەورووپان بکوژن." ئێمە ئەوانە بەناپاک دەزانین بەرامبەر بەخوێنی شەهیدانمان و ئامانجمان."

موجاهیدین لە عێراق چەند لیستێکی لایە بەسەدان ناوی کۆنە ئەندامانی تیایە کە بۆ کوشتن دانراون، ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕەجەوی دەسەڵاتی لە ئێراندا گرتە دەست. فاتیمە ئەمیری بیری دێتەوە لەو کاتەی لە بەشی کارمەندان لە نێو کەمپی ئەشرەفدا کاری کردووە و دەڵێ: "ناوی مێردەکەم و منداڵەکانیشم لە نێو ئەو لیستانەدا هەبوون." کاتێ بەرپرسی فایلەکان بوو لە سەرەتای نەوەتەکاندا، لیستێکیان ناوی ٦٤٦ کەسی تیا بوو کە موجاهیدینی خەلقیان بەجێ هێشتبوو. فاتیمە ئەوەندەشی بیر دێتەوە "تەواوی خێزان و منداڵەکان لە نێو ئەو لیستەدا بوون."

تا چەند لیستەکە زیادی کردووە پاش ئەمە، زەحمەتە مەزەندە بکرێت. لە نەوەتەکاندا هەڵاتن و دەربازبوون لە موجاهیدین کارێکی زۆر ئاستەم بوو. بەڵام ئەندامانی تیمە تیرۆریستەکان لە ئێران دەدۆزرێنەوە، کە دوای ئەوە ڕێکخراوەکەیان بەجێ هێشتبوو، یان ئەرکەکانی خۆیان بەکار دەهێنا بۆ هەڵاتن. لە ئەورووپا چەندین ئەندام پێوەندییان لەگەڵ ڕێکخراوەکەدا پچڕاند، هەروەها لە زیندانی ئەبوغرێبی سەدام حوسێن چەندین موجاهید بۆ ئێران گوێزراونەتەوە. ژمارەی تەواوی ئەو کەسانەی، ڕێکخراوەکەیان بەجێ هێشتووە لە وەتەی ڕەجەوی لە ساڵی ١٩٨١ەوە ئێرانی بەجێ هێشتووە، لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٥دا بەهەزار تا چوار هەزار کەس مەزەندە دەکرێت. هیچ کاتێک ژمارەیەکی تەواو و دروست نەبووە بۆ ئەو کەسانەی بەتەواوی ئەندامی موجاهیدینی خەلق بوونە و کاریان تێدا کردووە، هەروەها گومانێکی زۆر هەیە لە بارەی ژمارەی تەواوی ئەندامانی پێشووی ئەم ڕێکخراوە.

هۆیەکی ئەم حاڵەتەش لەبەر ئەو هەڵکەوتە بووە کە تەنیا گرووپێکی بچووک وێراویانە بەئاشکرا قسە بکەن دوای ئەوەی ڕێکخراوەکەیان بەجێ هێشتووە، لە تەواوی بیست کەسدا تەنیا کەریم حاجی مۆنی و هادی شەمس حایری لە هۆڵەندا و مەسعود بەنیسەدر لە کتێبەکەی و مەسعود خودابەندە لە ئینگلتەرا و محەمەد

حوسێن سوبحانی و مەسعود تەیبی لە ئەڵمانیا: ئەمانە کەمینەیەکی بچووکی بوێر دروست دەکەن و هەموویان باش دەزانن چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو مەترسییانەدا بکەن کە خۆیان بەهۆی باسکردنی چیرۆکەکانیان دروستی دەکەن. هەر هەمان ئازایەتیی ئەو کەسانەیە، کە سەردەمانێک پلەدار بوونە لە نێو ئەم ڕێکخراوەدا، بەردەوام بوونە و ئێستا دەزانن ئەم ئازایەتییە لە دژی ڕێکخراوەکەیاندا بەکار بهێنن. ئازایەتیی ئەوان بڵاوکردنەوەی لیستێکی بێ ژماری لێ کەوتەوە، هەروەها هەر ئەوانەن یارمەتی پێشکێش دەکەن بەو کەسانەی کە ڕێکخراوەکە بەجێ دەهێڵن و دەیانەوێت قسە بۆ ڕۆژنامەنووسان بکەن.

بەڵام زۆربەی هەرە زۆری کۆنە ئەندامانی موجاهیدین بێدەنگی دەنوێنن و زۆر جار نایانەوێ بەهیچ شێوەیەک تخونی سیاسەت بکەونەوە یان تخونی هەر جۆرە نارەزایییەک بکەون. کاتێ من دەتوانم دوای ژمارەیەکیان بکەوم لە ڕێگەی هاوڕێ ئێرانییەکانمەوە، ئەوان بەهیچ شێوەیەک ئامادە نین قسەم بۆ بکەن و ڕەتم دەکەنەوە. فەرەح کەریمی بۆ ماوەی بیست ساڵ بێدەنگیی نواند لە بارەی ئەو چوار ساڵەی لە موجاهیدین بووە، چونکە پێمی وت "من دەمەوێ ببم بەسیاسەتوانێکی هۆڵەندی و لە سەرووی پارتە ئێرانییەکانەوە بم. ئێستا من ناتوانم پارەی تەنیا پولێک بدەم."

زۆربەی چالاکییەکانی موجاهیدینی خەلق دژی گرووپێک ئەندامی چالاکیی پێشووی ئەو ڕێکخراوە بەکار دەهێنرێن. کاتێ حاجی مۆنی هەوڵی فرەوانکردنی چالاکییەکانی گرووپەکەی دەدات بەناوی "پەیوەند" دووچاری گەلێ کێشە دەبێتەوە. ئەم گرووپەی حاجی مۆنی بۆ کۆنە ئەندامانی موجاهیدینە لە هۆڵەندا و وڵاتانی تری ئەورووپاش. ئەوانەی بەم دواییە ڕێکخراوەکەیان بەجێ هێشتووە زۆر جێی گومانن و ترسناکن، ئەمە لە لایەک، هەروەها پارووی زۆر ئاسانن بۆ هەوڵەکانی ڕێکخراوەکە بۆ ئەوەی لە دژی ئەوانی تردا بەکاریان بێنن، لە لایەکی ترەوە. ئەو ئەندامە پێشووانەی قسە بۆ کەناڵە ڕاگەیاندنەکانی ڕۆژئاوا یان بۆ وێستگە ئۆپۆزیسیۆنە ئێرانییەکان دەکەن چاوەڕێی هەڕەشە دەکەن لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە یان لەوەش خراپتر. لە باشووری شارێکی هۆڵەندی بەناوی تیلبێرگ خانووی ئەندامێکی پێشووی موجاهیدین بەتەواوی سووتێنرا و خاپوور کرا. ئاگرەکە دەستی پێ کرد

کاتێ خێزانەکە بۆ ماوەیەکی زۆر کەم چووبوونە دەرەوە. چەند هەفتەیەک دوای ئاگرەکە، موجاهیدین چەندین جاری تر هەڕەشەیان لەو خێزانە کرد.

لە تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٤دا، ڕێکخراوی فارسی کۆن لە پاریس ڕای دەگەیەنێت کە بەڵگەیان لا هەیە بریکارێکی نهێنیی ئیحسان ڕاجی (ئەو پیاوەی لە مانگی ئەیلوول دوای ڕفاندنی لە کۆلن دەستگیر دەکرێت) بەخۆی نەهاتووەتە ئەوروپا. دەڵێن گوایە لەگەڵ موجاهیدێکی ئافرەت بەناوی فەرماندە مەهڤاش سوپهێری هاتووەتە ئەوروپا بەمەبستی کپکردنی ڕەخنە لە ئاست موجاهیدینی خەلقدا. بەتایبەتی شاردنەوەی ئەو کوشتن و ئەشکەنجەدانەی لە لایەن موجاهیدینەوە دژی ئامانجەکانیان ئەنجام دەدرێت. کۆمەڵەی ڕۆشانە لە کۆلن لە کۆتاییی ساڵی ٢٠٠٤دا لە نامەیەکی کراوە بۆ ئۆتۆ شیلیی وەزیری ئەڵمانی بۆ کاروباری نەتەوەیی، داوای لێ دەکەن لە وڵاتەکەیدا ڕێگە لە چالاکییە تیرۆریستی و نایاساییەکان بگرن و خەڵک بپارێزن.

سەرکردایەتیی موجاهیدین کێشەیەکی گەورەتریان هەیە لەگەڵ کۆنە ئەندامان چونکە زۆر قسان دەکەن، کاتێ قسەکانی ئەوان کاریگەرییان لەسەر بڕیارە سیاسییەکان دەبێت و وا لە لایەنەکانی تر دەکەن بەئاسانی بگەن بەڕێکخراوەکە. لە مانگی حوزەیرانی ٢٠٠٧دا ڕاگەیاندنێکی سەرسوڕهێن لە مەسعود ڕەجەوییەوە دەردەکەوێت، ئەو کەسەی کە چەندین ساڵە هیچ شتێکی ڕەسمیی لە زار نەهاتووەتە دەر و کەسیش گوێی لێ نەبووە. لە ڕاگەیاندنەکەدا باسی ئەو سێ کۆنە ئەندامە دەکات کە سیخوڕی ڕێژیمی ئێرانن. دەڵێت ئەم سیانە لە نێو موجاهیدینی خەلقدا حوکمی کوشتنیان دراوە. ئەو سێ کەسەش ئەمانەن: محەمەد حوسێن سوبحانی، مەسعود خودابەندە و خێزانەکەی بەناوی ئان سینگلتن. ئەمانە کاریان دژی ڕەجەوی و موجاهیدە پلەدارەکانی تر ئەنجام داوە و لە نێو دادگای فەرەنسیدا سکاڵایان تۆمار کردووە کە ئێستا لێکۆڵینەوە لەسەر ڕێکخراوەکە دەکەن. سوبحانیش لای پەرلەمانی ئەوروپا لە دژی ڕێکخراوەکە گەواهیی داوە. خودابەندە و سینگلتن ماڵپەڕێکیان هەیە www.interlink.org زۆر ڕەخنە لە موجاهیدین دەگرێت و زۆر جاریش لە لایەن ڕۆژنامە ڕۆژئاواییەکانەوە لە بارەی ئەزموونەکانیان لەگەڵ

ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلقەوە دیمانەیان لەگەڵدا دەکرێ.

ڕاگەیاندنەکەی ڕەجەوی خێرا ڕووداوێک بەدوایدا دێ، هەرکە سوبحانی لە ناوەڕاستی مانگی شەش لە پاریس لە کۆبوونەوەیەک لە بارەی "ئاشتی و لێبووردن" بەشدار دەبێت لە لایەن گرووپێکی پەنجا کەسییەوە هێرشی کرایە سەر. وا پێ دەچێت ئەم هێرشە بەهاوئاهەنگی لەگەڵ سەرکردایەتیی موجاهیدین لە ئوڤێرس سور ئۆیس، هەروەها لە لایەن موجاهیدەکانی کەمپی ئەشرەف و ئەو ئەندامانەی پێشتر لە ئەورووپا نیشتەجێ بوون جێبەجێ کرابێ. پۆلیسی فەرەنسا لەم بارەیەوە دەڵێت هیچ یەکێکیان ناویان لە نێو ڕۆژنامە فەرەنسییەکاندا نەبووە، بگرە چەند بەڵگەنامەیەکی هەڵەیان لەسەر هەبوو. محەمەد حوسێن سوبحانی بەخەنجەر لێی دەدرێت و لە نەخۆشخانە چارەسەر دەکرێت.

ئەو تۆمەتانەی لە لایەن کۆنە ئەندامانی موجاهیدینی خەلقەوە دراونەتە پاڵ ئەم ڕێکخراوە دیارییەک بوون لە ئاسمانەوە بۆ حکوومەتی ئێرانی. دەزگای نهێنیی ئێران هەوڵی تەواوی خۆی خستە گەڕ بۆ کۆکردنەوەی کۆنە ئەندامانی موجاهیدین. کۆکردنەوەکە لە ئەورووپادا نەبوو چونکە پێیان وابوو لەوێ سەرکەوتوو نابێت. ڕێژیمی ئێرانی لەمێژە متمانەی بەئەورووپا لە دەست داوە بۆیە هەرگیز ئەم ئەندامانە لەوێ کۆ ناکاتەوە. بەڵام ئەو ئەندامانەی کە دەگەڕێنەوە ئێران، ناتوانن خۆیان لە دەزگای نهێنیی ئێران لابدەن. ئەوان لێکۆڵینەوە دەکەن، داوا لە کۆنە ئەندامان دەکەن قسە بۆ ڕۆژنامەنووسانی ڕۆژئاوا بکەن و بەردەوام باسی ئەوە بکەن وەک موجاهیدێکی پێشوو گەڕاونەتەوە نێو ماڵ و منداڵی خۆیان و هەوڵ دەدەن ڕێگەی ژیانێکی ئاسایی بگرنە بەر.

کاریگەرییەکە لە نێو ڕێکخراوی نەجاتیشدا دیارە، کە ڕێکخراوێکە کۆنە ئەندامانی موجاهیدین لە خۆ دەگرێت لە تاران. ئەم ڕێکخراوە بەشێوەیەکی ڕەسمی ڕێکخراوێکی ناحکوومییە، بەڵام تاکە ڕێکخراوە لە نێو ئێراندا هەیە و سوپاسی هاوکاریی دارایی حکوومەتی ئێران دەکات. چالاکەکانیش دان بەوەدا دەنێن کاتێ باسی ئەمەیان لەگەڵدا دەکەم. پێنج لەمانە کۆ دەبنەوە لە نووسینگەیەک لە تاران، لەوانەش ئاراش سامیتی پوور و مەرجان مالیک و حوریە شاڵچی. لە ژێرەوەدا

زەنگی تەلەفۆن چەند جار لێ دەدات، مالیک و شاڵچیش بەخێرایی دەچنە لای تەلەفۆنەکە بۆ ئەوەی وەڵام بدەنەوە.

ڕێکخراوی نەجات زۆر چالاکە لە بەیەکگەیاندنەوەی کۆنە ئەندامانی موجاهیدین و خێزانەکانیان، یارمەتیی خێزانەکان دەدات منداڵەکانیان لە نێو ئەم ڕێکخراوەدا بدۆزنەوە، هەروەها دڵنیایان دەکەنەوە کە ئەوان دەتوانن بەشێوەیەکی باش پێشوازییان لێ بکەن. کۆنە ئەندامان خۆیان کە کەسانی نێو نەجاتن باوەڕیان وایە هاوڕێکانی پێشوویان ناتوانن ئەم کارە بکەن بەبێ یارمەتی و هاوکاریی خێزانەکانیان. لەبەر هەندێ نەجات هەوڵ دەدات بۆ خێزانەکانی شی بکاتەوە کەوا چی ڕووی داوە لە عێراق، هەروەها لە کۆتاییی ساڵی ٢٠٠٣ و سەرەتای ٢٠٠٤دا گەشتێک بەپاس ڕێک دەخەن و سەردانی کەمپی ئەشرەف دەکەن.

لە دووەم گەشتدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە هیچی تر کەس ناتوانێت موجاهیدەکان دووبارە کۆ بکاتەوە لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکانیان بەبێ دەستێوەردانی سەرۆکی گرووپەکان و بەرپرسە پلەدارەکانی تری موجاهیدین، ئەوانەی لە هەندێ حاڵەتدا هەڕەشە لە ئەندامانی خێزان دەکەن و سەرکۆنەیان دەکەن.

من دەپرسم، چۆن ڕێکخراوی نەجات مامەڵە لەگەڵ بەرپرسەکاندا دەکات. ئاراش سامیتی پوور بێ هەستی تۆڵەکردنەوە ئەمە دووپات دەکاتەوە "ئەو سەرۆک گرووپانەی سەرکردایەتیی ئێمەیان دەکرد، وەک ئێمە خەڵکی ئاساین، ئێمەش حەز دەکەین لەگەڵ خێزانەکانیان شاد ببنەوە." سامیتی پوور نایەوێ کاتی خۆی زۆر بەفیڕۆ بدات بەبیرکردنەوە لەم پرسەدا. شادبوونەوە و بەیەکگەیشتنەوە لەگەڵ دایک و باوک و برا و خوشک زۆر گرینگە بۆ هەموو کۆنە ئەندامان، چونکە ئەوانە تاکە کەسن دەتوانن وایان لێ بکەن بەتەواوی پێوەندییان بپچڕێنن لەگەڵ هاوڕێ موجاهیدەکانیان. "ئازادبوون" ئەو شتەیە سامیتی پوور بەم شێوەیە ئاماژەی پێ دەکات. تەنیا خێزان دەتوانێت وا لە موجاهیدەکان بکات درک بەوە بکەن جیهانی دەرەوە زۆر جیاوازە لەوەی ئەوان بیری لێ دەکەنەوە و وایان لێ بکەن هەست بکەن لە جیهانی دەرەوەدا پێشوازییان لێ دەکرێت گەر واز لەو کارەیان بهێنن. هەروەها تێیان بگەیەنن کەوا بەجێ هێشتنی موجاهیدین هەڵبژاردنێکی ڕاستە. "ئێمە

دەمانەوێ هەڤالانمان بتوانن خۆیان بڕیار بۆ خۆیان بدەن، لەبری ئەوەی ڕێکخراوەکە بڕیاریان بۆ بدات."

بەرسڤی نەرێنی لە ئەندامانی خێزانەوە دەکرێ ببێتە گورزێکی کوشندە بۆ کۆنە ئەندامانی موجاهیدین. سامیتی پوور باسی ئەو خێزانانە دەکات کە ڕاستەوخۆ داوایان لە کوڕ یان کچەکەیان کردووە واز لە موجاهیدین بهێنن و بگەڕێنەوە ماڵەوە. مەرجان مالیک دەڵێت "باشە تۆ لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا چیت بەدەست هێناوە؟ بەڕاستی کۆنە ئەندامان زۆر هەست بەشەرمەزاری دەکەن بۆ بەفیڕۆچوونی ئەم ساڵانەی ڕابردوویان، لەو چەند ساڵەدا ئەوەی جاران فێریشی بوویوون لە زانکۆ و نێو کتێبەکان، لە بیریان چووەتەوە. لەبەر هەندێ ڕەخنە لە لایەن خێزانەکانیانەوە وەک گورزێکی کوشندە وایە بۆیان. ئێمە ئێستا ئامۆژگاریی ئەو خێزانانە دەکەین و ئەم جۆرە شتانەیان پێ دەڵێین."

ئەندامانی نەجات بەڵگەی زیندووی ئەو هەڵکەوتەن کە متمانەبوون بەموجاهیدین کارێکی ڕاست نییە، هەروەها ئەوانە ئیتر ترسی ئەوەیان نییە جارێکی تر ئەشکەنجە بدرێن یان لە سێدارە بدرێن لە ئێران. سامیتی پوور و ئەوانەی لە چواردەورین دەیانەوێت ئەوە ڕوون بکەنەوە کە بەجێ هێشتنی ڕێکخراوی موجاهیدین هەڵبژاردنێکە، هەڵبژاردنی گەڕانەوەیە بۆ ژیانی ئاسایی لە ئێران. بەڵام موجاهیدین متمانە بەکەس ناکات. گەلێ ئەندامانی خێزان ئەوە ڕەت دەکەنەوە کە باوەڕیان بەنەجات هەبێت چونکە پێوەندییان لەگەڵ حکوومەتی ئێراندا هەیە. کاتێ پرسیاری لێ دەکەم لە بارەی ئەم پێوەندییانە، سامیتی پوور بەڕوونی دەڵێ: "ئێمە نەخراوینەتە نێو پاڵەپەستۆ"، هەروەها قسە دەکات دەربارەی ئەو بەرپرسانەی دەزگای هەواڵگریی ئێران کە ڕێگەیەکی مسۆگەریان هەبوو بۆ گەیشتن بەزیندانەکانی ئێران، هەروەها گەیشتن بەهەڵبژاردنێکی تەواو ئازاد و توانای هەڵگەڕاندنەوەی یەکێک لە موجاهیدین.

هەموو ئەندامە چالاکەکانی پێشوو یەک شتی هاوبەشیان هەیە: هەموویان حەز دەکەن لە بیابان هاوار بکەن و قسە بکەن، دەیانەوێت هەموو جیهان ئاگەدار بکەنەوە، بەتایبەتی دەیانەوێ نەهێڵن کەسانی تر بکەونە هەمان ئەو چاڵەی ئەوان

تێی کەوتن. مەسعود تەیبی، کتێبێکی بڵاوکردەوە لەسەر ئەو ڕاستییانەی کە موجاهیدینی خەلق دادگای بەکۆمەڵی هەبوو لە ساڵی ٢٠٠٢، ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئەو چالاکییانە لە هەستێکی پڕ لە تاوان بەئاگای دەهێننەوە. " من وەک کردارێکی دڕندانەی دەبینم کە یەکێک بخەیتە ناو زیندان بۆ ئەوەی ببێتە موجاهیدێکی تەواو." من خۆم یەکێک بووم وام بەسەر هات. لە وەتەی هەڵاتووم، هەوڵ دەدەم قەرەبووی ئەوە بکەمەوە لە ڕێی بەئاشکرا باسکردنی هەموو ئەو شتانەی بەسەرمدا هاتوون. بەئەنجامدانی ئەم کارەش، هیوادارم بەڕێگەیەکی بچووک خۆم نوێ بکەمەوە."

فەرەح کەریمی هۆیەکی باش دەدات بەدەستەوە لەسەر ئەوەی درەنگ لە خانەکە هاتە دەرەوە. ئەو لە کارەساتی یازدەی سێپتەمبەر ویستی بەشداری لە زانیاری بەخشین لەسەر ڕێکخراوە ڕادیکاڵەکان بکات. من بەهۆی کۆنە ئەندامان هەست بەتاوان دەکەم بەرامبەر گەلی ئێرانی کە چەندین ساڵە بانگەشەی خەباتی بۆ دەکەن، بەڵام هەر ئەوانیش بوون بوونە قوربانیی هێرشەکانی موجاهیدین لە ئێران. ئەو هێرشە تیرۆریستیانە بۆ ئازادکردنی خەڵک بوون، بەڵام تەنیا بەمردن و وێرانکردن کۆتاییان هات. عەلی قەشقەوی دەزانێت چۆن ئەمە بەچەند وشەیەک باس بکات. "ئەوەی من کردم دواجار دژی باشترین بەرژەوەندیی گەلی ئێرانی بوو. هێرشەکان هیچ سوودێکیان نەبوو تەنیا خەڵکی بێ تاوان بوونە قوربانی."

مەسعود خودابەندە، کە زۆر چالاکە بەهۆی ماڵپەڕی ئینتەرنێت لەسەر موجاهیدین [لە ٢٠٠٧دا دوو ماڵپەڕی هەیە بەئینگلیزی ئەوانیش: www.iran-interlink.org و www.irandidban.com] لێکۆڵینەوە دەکات بۆ "سەنتەری لێکۆڵینەوەی تیرۆر لە پاریس"، لە ڕەهەندێکی فرەوانترەوە دەڕوانێتە پرسەکە. هەتا باسی قەرزێکی مێژوویی دەکات. بۆ من ڕوونی کردەوە کە لە ساڵی ١٩٨١دا هەزاران کەس لە ئێران لە پشتی موجاهیدین بوون. "بەنیو ملیۆن کەس، ئێمە مێژوومان دەگۆڕی لە ئێران. ئەم نەوەیە دەیانتوانی ئێران بگۆڕن. ئەوەی کرا تەنیا بەفیڕۆدانی وزە و توانا بوو."

موجاهیدین دەزانن لە دەرەوەی ڕێکخراوەکە، دوور دەخرێنەوە لەبەر هاوڕێکانیان، هەروەها دەبن بەئامانجێکیش ڕەنگە بێ ترسی سزادان بکوژرێن. ئەمە بەتەواوی شتێک نییە ڕێگە خۆش بکات بۆ چوونە دەرەوە، هەروەها گومانێکیش نییە لەوەی

چی لە دەرەوە دەدۆزنەوە. ئاراش سامیتی پوور بیری دێتەوە و دەڵێت "ئێمە هەندێ جار باسمان لە چوونە دەرەوە دەکرد بەڵام بەنهێنی، بەڵێ بەنهێنی باسی ئەوەمان دەکرد دەبێ لە دەرەوە چی هەبێت. دواجار دەگەیشتینە ئەو بڕوایەی هیچ شتێک لە دەرەوە نییە، وامان دەزانی خەڵکی وەک ئاژەڵ دەژین چونکە وایان لە ئێمە گەیاندبوو. وایان فێر کردبووین ژیانی ڕاستەقینە لە نێو ئەو ڕێکخراوەدایە."

بەڵام، هەروەک مەسعود خودابەندە دەڵێ، هەر کەسێک ڕووناکیی دەرەوە ببینێت لەوە دەگات بەتەواوی لە نێو موجاهیدین چی ڕوودەدات، هەر دوای بینینی ڕووناکیی دەرەوە یەکسەر بیر لە بەجێهێشتن دەکەیتەوە، هەرچەندە ڕەنگە کاتێکی زۆری بوێ تا لێی دەرباز دەبیت. "هەندێکیان خەڵکیان دەبینی لێیان دەدرێت و سووکایەتییان پێ دەکرێت. پاشان بەوەیان دەزانی بەهەڵەدا چوونە، هەستیان بەوە دەکرد هیچی تر نایانەوێت بەشێک بن لەو کارە. پێیان خۆش بوو بچنە زیندانی عێراق نەک بەردەوام بن لەم کارەی نێو ئەم کەمپە. بەڵام تۆ نازانی دەبێ چی بکەیت، چونکە تۆ تەنیا خۆتی، بەتەنیایت. تۆ شتێکت لە ژوورەوە لە دەست داوە، ئەویش دەستپێشخەریی خۆتە."

ئەم وەسفە بەتەواوی یەک دەگرێتەوە لەگەڵ قسەکانی مەسعود تەیبی. تەیبی لەگەڵ خودابەندە لەو گرووپەن لەساڵی ١٩٩٦دا دەیانەوێ موجاهیدین بەجێ بهێڵن، بەڵام تەیبی دەگیرێتەوە دوای ئەوەی هەوڵی ڕاکردن دەدات بۆ ئیتاڵیا و دواتر دەهێنرێتەوە نیو موجاهیدین. تەیبی بیری دێتەوە و دەڵێت "من ئەندامی لێژنەی ناوەندی بووم، ئەوان زۆر دەترسان لەوەی من ڕێکخراوەکە بەجێ بێڵم. منیش زۆر لەوە پەشیمان بووم کە پازدە ساڵ لە ژیانم هەمووی درۆ بوو. بەمنیان وت گوناهە پاش ئەو هەموو هەوڵ و کۆششەی پلەدارێکی وەک من، هەروەها پێیان وتم دەتوانم قسە لەگەڵ ڕەجەویدا بکەم لەسەر گومانەکانم و دواتر بەخێرایی دەتوانم بگەڕێمەوە ئەوروپا، بۆیە لەسەر ئەم قسانە من لەگەڵیاندا چوومە عێراق. بەڵام کە گەیشتین زوو زانیم ئەمە هەمووی تەڵە بوو بۆ من، خراپتریش لە تەڵە، بۆ ماوەی پازدە ساڵ من لەو تەڵەیەدا گیرم خوارد."

تەیبی وای دەبینێت کەوا هەلێکی بۆ هات و لە دەستی چوو، بۆیە بڕیاری دا

ناڕازیبوونەکەی خۆی بشارێتەوە و چاوەڕێی دەرفەتێکی نوێ بکات بۆ هەڵاتن. هەڵکەوتنی ئەم دەرفەتەش شەش ساڵی دەوێت. لە هۆڵی خانووەکەی لە ئەڵمانیا دانیشتبووین، دەتوانم بڵێم، نەیدەزانی بەچ شێوەیەک باسی ئەو ساتە بکات کە گەڕایەوە و ئەو هەموو ساڵەی بەفیڕۆ چوو. دواتر ئەوەی دووپات کردەوە کە زۆر زەحمەتە دان بەوەدا بنێیت تۆ هەڵەیەکی گەورەت کردووە و باشترین ساتەکانی ژیانت بەفیڕۆ داوە. هەرچەندە هێواش هێواش بۆ تەیبی ڕوون دەبێتەوە کە بەتەواوی چی بەسەر هاتووە، وێڕای ئەوەی زۆر سوپاسی پایەکەی دەکات کە زانیاریی زیاتری هەبوو لە چاو ئەندامە ئاساییەکان. تەنیا لە کاتی دادگاییکردنەکان کە ڕەجەوی ئەنجامی دەدا لە دژی ئەو ئەندامانەی دەیانویست ڕێکخراوەکە بەجێ بهێڵن، دەیزانی ئەمەی بەسەردا هاتووە. باسی ئەوە دەکات کەوا کاتێکی زۆری ویست تا زانیاریی تەواو کۆ بکاتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت ڕا بکات "ئەم ڕێکخراوە تیرۆریستە وەک مافیا وایە، چونکە زۆر بەگرینگیان دەزانی شتەکانی ئەوان بەهیچ شێوەیەک ئاشکرا نەکرێن."

هادی شەمس حایری ئەم پرۆسەیە بەدەبدەبەیەک بەراورد دەکات، تۆ دەتوانی لە کاتێکدا تۆزێک هەوا بکەیتە نێو دەبدەبەکە، هەر جارە و تۆزێک تا وای لێ دێت دەتەقێ. ئەندامانی نێو ڕێکخراوەکەش وان. حایری دەگاتە ئەم بڕوایە و دەڵێت "بۆ چەندین ساڵ تۆ سەیری پەنجەکانت دەکەیت. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە تۆ بەڕاستی پەنجەکانت دەبینی. لەبەر هەندێ زۆربەی هاوڕێکان هیچ پاڵدەرێکیان نییە لە نێو ڕێکخراوەکە، چونکە هیچ ئاسۆیەک نابینن و دەشترسن لە هەڵاتن. چەندین ساڵە هیچ شتێکیان لە جیهانی دەرەوە گوێ لێ نەبووە و هیچ یارمەتییەکیشیان لەو لایەنەوە وەرنەگرتووە."

شەمس حایری هەموو تواناکانی خۆی کۆ دەکاتەوە تا بەتەنیا لە ڕێگەی نووسینی کتێبێک لە هۆڵەندا تۆڵە لە موجاهیدین بکاتەوە، دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٩٢دا ڕێکخراوەکە جێ دەهێڵێت کە تا ئێستا بەباشترین دوو کتێب دادەنرێن لە بارەی موجاهیدینی خەلقەوە بەفارسی نووسرا بن. ڕەجەوی کتێبەکەی لە بەردەم دارودەستەی خۆی دادەنێت و دەڵێت ئەم کتێبە لە لایەن ڕژێمی ئێرانەوە نووسراوە.

ئەنجامی ئەوەش ئەوەیە هێرشێک دەکرێتە سەر نووسەرەکەی کاتی لە سەنتەرەکەی لە گرۆنینگن (ئەو شارەی تیایدا دەژیت)، هەروەها دوای ئەم هێرشە لە تەواوی گەڕەکەکەی ئەوان وێنەی لەسەر پۆستەر بەدیوارەکانەوە هەڵدەواسرێت و بە" سیخوڕی ڕێژیمی چەپەڵی ئێرانی" ناو دەبرێت."

مەسعود بەنیسەدریش مێژوویەکی درێژی هەیە لەگەڵ مەسعود ڕەجەوی. دوای بەجێ هێشتنی ڕێکخراوەکەی داوای لێ دەکرێت لەگەڵ خوشکیدا کۆ ببێتەوە. هەرچەندە نایەوێت هیچ پێوەندییەکی هەبێت لەگەڵ ڕێکخراوەکەدا، بەڵام ناتوانێت ئەمەی خوشکی ڕەت بکاتەوە. پەتی ڕێکخراوەکە ئەوەندە توندە وەها بەئاسانی لە ملی نابێتەوە و پێی ڕەت ناکرێتەوە. بەنیسەدر و خوشکەکەی ڕێک دەکەون لە دەروازەی وێستگەی شەقامی بەیکەر لە لەندەن یەکتری ببینن. بەنیسەدر زوو دەگاتە شوێنەکە و لەو ناوە پیاسە دەکات، لە دەروازەیەکی تری وێستگەکە دێتە ژوورەوە. لەوی زۆر سەرسام دەبێت کاتی ئەندامێکی تری ڕێکخراوەکە دەبینێت. ئەوەی دوای ئەمە ڕوو دەدات بەڕۆمانێکی سیخوڕی دەچێت، بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

برایەک پرسیار لە بەنیسەدر دەکات: ئەوە چییە بەتۆشیان وتووە لێرە ئامادە بیت. من دڵنیا بووم لەوەی هێشتا نەیزانیبوو من ڕێکخراوەکەم بەجێ هێشتووە.

منیش وەڵامم دایەوە : بەڵی وایە، من لێرەم بۆ ئەوەی چاوم بکەوی بەخوشکە فریشتە لە دەروازەکەی تر.

ئەویش وتی: تەواوە، بەمنیشیان وت کە لێرە چاوەڕی بکەم و بەهەمەنیش لێرە لە شوێنێکی تر چاوەڕێ دەکات.

پرسیارم لێ کرد بۆچی ئێمە لێرەین؟

وتی: نازانم، بەڵام وابزانم زۆر گرینگە. پێ دەچێت خوشکە نەسرینیش لێرە بێت بۆ ئەوەی یەکێک لەگەڵ خۆی بباتەوە بۆ پاریس.

منیش پرسیم: کێ؟

وەڵامی دایەوە: نازانم. دەتوانی پرسیار لە خۆی بکەیت، لە شوێنێکی نزیکی ئێرە لە نێو ئۆتۆمۆبێلێکدا لەگەڵ برایەکی تر چاوەڕێ دەکات.

یەکسەر بەنیسەدر دەزانێ چی ڕوودەدات. ئەوە خۆیەتی دەبردرێتەوە بۆ پاریس، جا بیەوێت یا نەیەوێت. نەسرین پلەدارێکی چالاکە لە پاریس و بەتایبەتی بۆ ئەم پرسە هاتووە. داوای لێبووردن لە کابرا دەکات و ڕا دەکات بۆ باڵەخانە و شوێنە تەناهەکەی. " دوای ئەوە چەند تەلەفۆنێکم بۆ کرا و لە کۆبوونەوەکەیان دەپرسی، بەڵام من نەمهێشت دووبارە بەهەمان تەڵەوە بکەومە نێو چاڵەکە."

هەندێ موجاهید لەو ساتەی دەگەنە نێو ڕێکخراوەکە بیر لە ڕۆیشتن دەکەنەوە. بەڵام ڕێکخراوەکە دەزانێت چۆن ئەم جۆرە ئەندامانە قۆرخ بکات بەڕێگەیەک کە نەتوانن هیچ بکەن جگە لەوەی مانەوە هەڵبژێرن. ئەوە ئەو چیرۆکەیە عەباس سادقی نەجات پێی وتم کە دۆزیمەوە کاتێ لەگەڵ خێزانەکەی هاتبووە شاری گرۆنیگنی هۆڵەندا بۆ سەردانی هاوڕێیەکی.

پاش شەڕی کەنداوی ساڵی ١٩٩١ و ئەنجامدانی چەند چالاکییەکی موجاهیدین، لە ئێرانەوە دەهێنرێتە عێراق گوایە ئێران زۆر مەترسیدارە بۆ ئەو. فاتیمەی خێزانی سکی هەیە و ناتوانێ لەگەڵی بێت، بەڵام بەڵێنی پێ دەدات دوای سکەکەی خێرا بەدوایدا بێت. لە ڕێگەی کەراچی و ئیستەنبۆڵەوە دێتە عێراق. لەو مانگانەی لە کەمپی ئەشرەفدا دەمێنێتەوە، چەندین جار بەڵێنی پێ دەدرێت هەموو شتێک سەبارەت بەخێزانەکەی باش دەبێت. ئەوەشی پێ دەوترێت کە پێوەندیی ڕاستەوخۆ کارێکی مەحاڵە. هێشتا ئەوە نازانێ ئەم سیناریۆیە چەندین ساڵ دووبارە و سێ بارە دەبێتەوە. هێشتا هیچی نەبینیوە تا گومانی لەم قسانە هەبێت.

پاش ماوەیەک بەسادقی نەجات دەڵێن دوو کەسیان ڕەوانە کردووە بۆ ئەوەی خێزانەکەی بێنن، بەڵام یەکێکیان کوژراوە و ئەوەی تریشیان بێ سەروشوێن بووە. سادقی بیری دێتەوە و دەڵێ: "بەمنیان وت: بۆ ڕزگارکردنی خێزانەکەت دوو پیاومان لە دەست بوو." بۆیە لە چەند هەفتەی داهاتوودا هەر داوای خێزانەکەی دەکات، تا وای لێ دێت پێی دەڵێن نابێ هیچی تر ڕێکخراوەکە لەسەر خێزانەکەت بێزار بکەیت. بەڵام کاتێ دوای سێ مانگ هیچ هەواڵێکی خێزانەکەی نازانێت، میرەکەی پێی دەڵێ پەیامێکی بۆ هاتووە. پێمیان وت "دەڵێن خوشکە مریەم داوای لە ڕەجەوی کردووە یەکێکی تر بنێرێت بەدوای خێزانەکەتدا." من پرسیارم لە سادقی کرد ئاخۆ پاش ئەو

هەموو قسانە تۆ بەڕاستی باوەڕت بەم قسەیە کرد؟ سادقی وتی "بەڵێ چونکە ئەم پەیامە لە لایەن مریەم ڕەجەوییەوە هاتبوو."

دواتر فەرمانی پێ دەکرێت بیر و هزری پاک بکاتەوە و دوای مەشقێکی چڕوپڕی سەربازی بکەوێت. پاشان ڕێکخراوەکە هەوڵ دەدات لە خێزانەکەی بکەنەوە. ئەم کارەش سەری گرت، چونکە ئێستا بە مەشقەکانەوە زۆر سەرقاڵ بوو، بەجۆرێک بۆ ماوەی چەندین مانگ کاتی نەبوو سەردانی کەسی پێوەندار بکات و سۆراخی خێزانەکەی بپرسێت.

ساڵێک تێ پەڕی و ئێستا سادقی نەجات دەیەوێت بەڕاستی ڕێکخراوەکە بەجێ بهێڵێت. هیچی تر بەدرۆکەی ئەوان باوەڕ ناکات. سادقی دەڵێت " پاشان وتیان: ئێمە ویستمان دوو مانگ بەر لە ئێستا ئەمەت پێ بڵێین، ئەویش ئەوەیە خێزانەکەت لە کاتی منداڵبووندا گیانی لە دەست داوە، هەروەها منداڵەکەشت مردووە." بۆ ماوەی مانگێک بەتەواوی شێوا بووم. باشە ئێستا من چی بکەم؟"

لەبەر بێ ئومێدی و پەستییەکەی، ڕێگە بەخۆی دەدات و بڕوا بەخۆی دەهێنێت بمێنێتەوە، ئیتر لەو ساتە بەدواوە بەمەزەبکردن زیادی کرد و کۆبوونەوە شۆڕشگێڕییە ڤیدیۆییەکان زیاتر بوون. سادقی زۆر حەزی لەوە نەبوو، چونکە دەردەکەوێت پیاوێکی دانا و مەنتقییە و وەها بەئاسانی بەمەزەب ناکرێت. هەرگیز ئەو وێنەیەی بیر ناچێتەوە کە لە ئێران بوو، کەچی ئێستا سەری لێ تێک چووە و بەقوڕدا چووە. لە کۆتای کۆبوونەوەکاندا لە هەموو جارێک زیاتر حەز دەکات ئەم ڕێکخراوە بەجێ بهێڵرێت. " ئەوە سەدەی نۆزدەیەم بوو: پارێزگاری ڤیکتۆری! من خۆم نەمویست هیچ شتێکی تر بکەم. باوەڕیشم بەوە نەبوو ئەو قسانەی ئەوان دەیکەن ڕاست بێت، هەرچەندە تەواو دڵنیا نەبووم لەوەی هەموو شتەکانی ئەوان درۆیە."

لەبەر ئەم شتانە ساڵی ١٩٩٤ خۆی لە زینداندا دەبینێتەوە. کاتێ دوای هەشت مانگ لەوێ دەچێتە دەرەوە، بڕیار دەدات بچێتە پێشەوە و دووبارە هاوکارییان بکات تا ئەو کاتەی دەرفەتێکی بۆ دەڕەخسێت هەڵبێت. چەندین جار فەرمانی پێ دەکرێت تەلەفۆن بۆ خێزانەکەی بکات لە ئێران و بپرسێت گەر هەر شتێک لە ژێرەوە ڕێک

بخرێت لەوێ بۆ دزەکردنی ئەو ئەرکانەی موجاهیدین دەیەوێت ئەنجامیان بدات. "
تەلەفۆنم بۆ هاوڕێکانم کرد و پێم وتن من عەباسم - بەڵام هاوڕێکانم پێیان وتم ئەوان وایان زانیوە من مردووم. کاتێ من سوور بووم من بەڕاستی عەباسم، ئینجا پێیان وتم ڕەنگە خێزانەکەت بتوانێت دەنگت بناسێتەوە." دوای ئەم تەلەفۆنە بۆ عەباس ڕوون دەبێتەوە ڕێکخراوەکە درۆی گەورەیان بۆ ڕێک خستووە، چونکە پێی وترا بوو خێزانەکەی لە کاتێ منداڵبووندا مردووە، هەروەها منداڵەکەشی مردووە. " من زۆر سەرسام بووم کاتی زانیم فاتیمە هێشتا زیندووە؟ بەڵێ پێم وترا کچەکەشم ماوە و تەمەنی نۆ ساڵانە."

لەسەر قەنەفەی هۆڵی خانووەکەی لە گرۆنیگن، سارای کچی عەباس زۆر بەپەرۆشەوە گوێ لە چیرۆکەکە دەگرێت، وەک بڵێی باوکی هیچ جارێک ئەم چیرۆکەی بۆ نەگێڕابێتەوە. دایکی دەڵێت "من باوەڕم بەوە نەدەکرد عەباس مردووە." ئەوە چەندین ساڵە بەسارای کچی دەڵێت باوکی سەفەری کردووە بۆ ئەمەریکا. " لە قووڵاییی ناخمدا هەستم بەوە دەکرد هەر دەگەڕێتەوە. هەر لەبەر هەندێش هەرگیز نەمدەویست مێرد بکەمەوە."

فاتیمە بەتەنیا دەمێنێتەوە و چاوەڕێ دەکات سەرەڕای ئەو پاڵەپەستۆیەی خێزانەکەی دەیکاتە سەر، چونکە تەنیایی بۆ ئافرەت لە ئێران زۆر زەحمەتە، تەنانەت ئافرەتێکی وەک فاتیمەش کە کارێکی باشی هەبوو و خاوەنی تاقیگەی زانستی بوو. کاتێ خەون و خەیاڵەکەی ڕاست دەردەچێت لە ناکاو عەباس تەلەفۆنی بۆ دەکات لە ساڵی ٢٠٠٠ زۆر زۆر خۆشحاڵ دەبێت.

دوای ئەمە سێ ساڵی پێ دەچێت خێزانەکە دواجار لە ئەڵمانیا یەک دەگرنەوە، هەروەها سارا بۆ دواجار باوکی خۆی دەبینێت. تەنیا لە ساڵی ٢٠٠٢دا سادقی نەجات وەک پسپۆڕێکی بواری ئەلیکترۆنی دەتوانێت پلانێکی باش دابڕێژێت کە لە بنکەی موجاهیدین لە کوردستانی عێراق هەڵبێت.

موجاهیدینێکی پێشوو بەکاتێکی زۆر زەحمەت تێپەڕ دەبێت تا دەگەڕێتەوە ژیانە ئاساییەکەی، چونکە لە کاتی ئەو چەند ساڵەی لە نێو ئەو ڕێکخراوەدا کاریان لە بازاڕدا بەرەو خراپی دەچوو. ئاراش سامیتی پوور یەکێکە لەو چەند کەسەی کاریان

دۆزییەوە. ئێستا لە تاران وەک وەرگێڕێک کار دەکات و بۆ کۆوارێکی بواری کۆمپیوتەر شت دەنووسێت. حەز دەکات لە ڕێگەی خولی کۆمپیوتەرەوە شتی زیاتر بکات و بگەڕێتەوە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بەڵام پێی وا نییە بەئاسانی بچێتەوە ئەوێ. ئەو دەزانێت " ئەمەریکا من بەتیرۆریست دەزانن."

هەروەها عەلی ڕەزا میرازگەریش ئاگەدارە وەزارەتەکانی داد لە ئەورووپا وەک ئەو دەروانننە خەڵکی، ئەو کەسەی هێرشی کردووەتە سەر ئێران: هێرشی مەترسیدار. عەلی ئەمە بەکارێکی بێ واتا دەزانێت و دەڵێت " ئێستا ئێمە زۆر بەتوندی دژی تیرۆریزمین، چونکە ئێمە هەمووومان باش دەزانین تیرۆریزم دەتوانێت بەرەو چ هەڵدێرێکت ڕاپێچ بکات."

کاتی پرسیار لە کۆنە ئەندامان دەکەم دەربارەی ئەزموونە ئەرێیەکان لەو کاتەی لە نێو موجاهیدیندا بوون، کەس ئامادە نییە و ناتوانێت ناوی کەس ببات. تەنیا ئەندامە سەیرەکان پێیان وایە ئەو چەند ساڵەی لەوێ کاریان کردووە بەفیرۆ نەچووە. بۆ نموونە، میرازگەری بەمن دەڵێت " من کاتێ لەو ڕێکخراوە هاتمە دەرەوە لە جاران بەهێزتر بووم. چونکە ئەو ساڵ و نیوەی بەتەنیا لە نێو زیندان بەسەرم برد، منیان بەهێزتر کرد." هاوڕێکەی بەناوی عەلی قەشقەوی زیاتر لەم بارەیەوە دەڵێت " من دوازدە ساڵ لە ژیانی خۆم فڕێ دا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ئەزموونە بەهای خۆی هەیە. لە شوێنێکم خوێندەوە: نیگەران مەبە ئەگەر ژیانت بڕووخێت، بەڵام نیگەران بە ئەگەر هیچ پەند و ئەزموونێک وەرنەگریت. ئەمە زۆر ڕاستە. من ئێستا گۆڕاوم. ڕەنگە من زۆر سوودی لێ وەرنەگرم بەڵام ڕەنگە ڕۆژێک بۆ خێزان و منداڵەکانم باش بێت. هەتا ئەگەر تەنیا ئاگەدارییان بکەمەوە، ئەم شتە قەت بەسەر ئەوان نایەت."

ئەو دوو هاوڕێیە هێشتا نەگەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی بەتەواوی ڕەخنە لە خۆیان بگرن، کە حەبیب خورەمی ئەم ڕەخنە لەخۆگرتنە زۆر بەپێویست دەزانێت بۆ ئەوەی بەڕاستی لە ڕێکخراوەکە بچڕێن و واز بێنن. ئەوەی بەسەر ئەواندا هاتووە هەمووی دەکەوێتە ئەستۆی مەسعود ڕەجەوی، کە ئەوان زۆر ڕەخنە لەو کابرایە دەگرن. ئێستاش میرازگەری دژی ڕەجەوی خەبات دەکات و نایەوێت ڕەجەوی بیباتەوە. دەڵێت " هەمیشە ڕەجەوی دەیوت (گەر هەر یەکێک لە ئێوە ڕێکخراوەکە بەجێ

بهێڵێت، ئەوا ژیانتان وەک ئەو تلیاککێشە کۆتایی دێت کە خووی بەتلیاکەوە گرتووە و واز دەهێنێت و تەنانەت ناتوانن بژین). من هەوڵ دەدەم مەشق بکەم نەک تلیاک بکێشم، هەوڵ دەدەم دڵخۆش بم. دەمەوێ بیسەلمێنم ڕەجەوی هەڵە بوو." دواتر بەزەردەخەنەیەکەوە، بیری لە کچە هاوڕێیەکەی دەکردەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بەنهێنی لە نێو کەمپی ئەشرەف دەست لە ناو دەست پێکەوە دانیشتبوون، وتی " ئەگەر ئێستا مونا من ببینێت، شانازیم پێوە دەکات."

دۆزینەوەی هاوژیانێک بۆ کۆنە ئەندامانی موجاهیدین کارێکی وەها ئاسان نییە. چونکە تۆ متمانە بەکێ دەکەیت؟ باشە ئەی لەگەڵ کێ بیروڕا ئاڵوویر بکەن و پێوەندییەکە بەخۆشی بپارێزن؟ هەروەها ئەمەش: کامە هاوژیان دەتوانێت لەگەڵ ئەو هەڵکەوتە بژیت کە هەموو جۆرە قسەیەک هەر دەچێتەوە سەر یەک بابەت، ئەویش کارکردن لەو شوێنە؟ زۆربەی خەڵک ئەندامێکی پێشوو وەک هاوژیان هەڵدەبژێرن لەبەر ئەم هۆیانەیە، یان لە هەر حاڵەتێکدا ئەو کەسەی لە نێو ڕێکخراوەکە خێزانی هەیە، دەزانێت پرسەکە چییە. تەنانەت مەسعود خودابەندەش، ئێستا بەوە دەزانێت تەواو چی بەسەردا هاتووە، ڕۆژنامەنووسێکی بەریتانی هێنا کە بۆ چەندین ساڵ بەزەیی بەموجاهیدینی خەلق دەهات و تەنانەت جارێکیان دوای خولێکی بنەڕەتی کەوتووە لە کەمپی ئەشرەف.

تەنیا ئاراش سامیتی پوور پێم دەڵێت ئەو بەجدی بەدوای هاوسەرێکدا دەگەڕا لە دەرەوەی ڕێکخراوەکە. وەک هەرزەکارێک لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا هێنراوەتە ڕیزەکانی موجاهیدین، دوای ئەوەی دەکەوێتە داوی خۆشەویستی یەکێک لە منداڵە دزراوەکان کە ناوی ئیلهامە، هەر ئەمەش پەلکێشی کردە نێو ڕێکخراوەکەوە. بەشەرمەوە زەردەخەنەیەکی دێت و دەڵێت " ئێستا بەکچێکی جوان ئاشنا بوومە. نازانێت موجاهیدین هەر چیش بوونە، دەبێ ئەوەی پێ بڵێم. لە پێنجشەممەدا چووینە سەر گۆڕی باوکم. ئێمە پێکەوە دەچینە سوپەرمارکێت و دەچینە سەر چیاکانیش."

سامیتی پوور دەڵێت زۆر بیری لە خاڵە باش و خراپەکانی ئەوەی دەکردەوە کە هاوسەرێک لە نێو موجاهیدیندا هەڵبژێرێت. دەسگیرانەکەی، ئیلهام پاش هەموو

شتێک ئەندامێکی موجاهیدین بوو. دەڵێت " من هەمیشە دەمویست خێزانەکەم کەسێکی سیاسی نەبوایە. زۆر بیرم لەوە کردەوە کاتێ لە زیندانی ئێرانی بووم. ئیلهام سیاسی بوو، ئەو منی پەلکێش کرد و بەسەرمدا زاڵ بوو. من نامەوێ ئەوە دووبارە بکەمەوە."

گەلێ لە موجاهیدانی پێشوو دێنە ئەوروپا و دووبارە بەتەنیا دەژین. لە ڕاستیدا، لە تەنیاییی جیهانی نێو ڕێکخراوەکە دەچنە نێو تەنیایی جیهانێکی گەورەوە. من لە دوورخراوە ئێرانییەکانی ترم گوێ لێ دەبێت کەوا بەبێ متمانە سەیر دەکرێن. کاتێ دەڵێی من موجاهیدم، بەلایەنی کەم تۆ دەزانی ئەمە واتای چییە، بەڵام کاتێ دەڵێی من ڕێکخراوەکەم بەجێ هێشتووە ئەمەیان زۆر ڕوون نییە. ڕەنگە تۆمەتەکان ڕاست بن کە سیخوڕیکردنە بۆ حکوومەتی ئێرانی.

وێڕای ئەمەش، ئۆپۆزسیۆنە ئێرانییەکان لە تاراوگەدا کەمتر ڕەخنە لە موجاهیدینی خەلق دەگرن لە چاو ئەو ڕەخنەیەی لەو ئێرانیانەی دەگرن من لە نێو ئێراندا قسەم لەگەڵ کردوون. لە دەرەوەی ئێران، ڕێکخراوەکە زۆر زیاتر سوود لەو گومانانە وەردەگرێت لە چاو ئەو سوودەی لە میرەکانی وەردەگرێت. ڕەخنە هەیە، بەڵام لە کۆتاییدا ڕق لە ڕێژیمی مەلا شیعییەکان لەو گومانانە دەباتەوە لەمەڕ جیهانی کاروباری نێو موجاهیدینی خەلق.

ئەمە تاکە ڕێگەیە بتوانم بڕیاری بێ وێنەی مەرجان مالیک باس بکەم، کە ماوەیەکی زۆر پێ چوو تا لەگەڵ کچەکەیدا خۆی ئاشنا بوونەوە، بەڵام خێرا دوای وەرگرتنی مافی پەنابەریەتی لە هۆڵەندا، بڕیار دەدات بگەڕێتەوە ئێران. بوونی پێوەندی لەگەڵ ئێرانییە ئاساییەکان لە هۆڵەندا شتێکە زۆر بەدەگمەن ڕوودەدات، هەروەها تەنیاییەکەشی زۆر پەستی دەکات، بۆیە بڕیاری چوونەوە بۆ ئێران دەدات.

بەڵام ئاخۆ بەڕاستی ئێران چ بڕ باشترە بۆ ئەو! ئەمە پرسیارەکەیە، چونکە چەند ئەندامێکی پێشووم بینی لە ئێران کە دوورەپەرێز و تەنیان، هەرچەندە هیچ درێغییان نەکردووە لە شاردنەوەی ئەمە. زۆر خۆشحاڵ بوون باسی ئەو کاتە بکەن بۆ من لە نێو ڕێکخراوەکەدا، بەڵام بەرامبەر بەئێرانییەکان حەز دەکەن بێدەنگ بن لە بارەی ڕابردوویان لە نێو گرووپێکی بەرەنگاری کە لە لای دوژمن، لە عێراقدا، شەڕیان

دەکرد. هەروەها ناوی موونافقین ڕۆڵی خۆی هەیە کە سەرکردە ئاینییە ئێرانییەکان خستبوویانە پاڵ موجاهیدین. لەبەرئەمە دەترسن لە بەرسقی توندوتیژی باوەڕدارە ڕادیکاڵەکان. لە پاڵ ئەوەش ئەو ناوە بەتەواوی برینەکانیان سارێژ ناکات، بۆیە یارمەتیدەر نییە لە دروستکردنی پێوەندیی نوێ.

هەروەک مالیک، گەلێ لە کۆنە ئەندامان لە دەرەوەی ڕێکخراوەکە خەمۆکی دایان دەگرێت. نەک هەر تەنیا تێکشکاون و متمانەیان بەژیانیان و بەهاوڕێکانیان نەماوە، بگرە ئەو ئامانجەشیان لە دەست چووە کە چەندین ساڵە هەموو شتێکیان لە پێناودا خەرج کردووە، یان هەر هیچیان نەکردووە.

زۆربەی کۆنە ئەندامان دەڵێن تا ئێستاش کۆشش دەکەن لە پێناو ئێرانێکی ئازاد و دیموکراتدا، بەڵام ئێستا بەم کارە هەڵدەستن بەبێ توندوتیژی. ئاراش سامیتی دەربارەی ئەو ئێرانە قسە دەکات کە ئێستا ئەو مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و دەڵێت "ئێرە بەهەشت نییە، بەڵام دۆزەخیش نییە." هەروەها ئەو هەستەی خۆی بەوشە دەردەبڕێت کە زۆربەی ئەندامان هەمان هەستیان هەیە " من باوەڕم بەو حکوومەتە نییە کە من پاڵپشتی نیم، بەڵام خەبات دژی ئەو مەرج نییە بەڕێگەیەکی توندوتیژی بێت. توندوتیژی ڕێگەیەکی باش نییە. بگرە تەنیا ئاگری توندوتیژی خۆشتر دەکات."

یەک شت ڕوونە بۆ هەموو کۆنە ئەندامان، سامیتی پووریش هیچ گرفتێکی نییە ئەمە بەدەنگێکی بەرز بڵێت " موجاهیدین چی تر هەڕەشەیەکی گەورە نین بۆ سەر ئێران. لێرە زۆر بەدەگمەن پشتیوانانی ڕێکخراوەکەی ماون، ئێرانییەکانیش هەرگیز پاڵپشتی شەڕێکی چەکداری ناکەن. بۆ چەندین ساڵ من پێم وابوو موجاهیدین لە عێراق دەتوانن چل هەزار کەس بنێرنە نێو ئێران و خەڵکی ئێرانیش لە نێو شارەکاندا پشتگیرییان بکەن. بەڵام من لە شارەکاندا بووم، خەڵک تەنیا مژوڵی ژیانی خۆیانن. گەر موجاهیدین بهاتنایە ئەو شارانە، خەڵک یان ئەوەتا لە دەستیان ڕایان دەکرد یانیش دژیان دەوەستانەوە. کەس نایەوێت پێوەندییان پێوە بکات."

دوای چەندین مژوڵبوون و گفتوگۆ ئەوەم بۆ ڕوون بووەتەوە ئەگەر بۆ ماوەی چەندین ساڵ واز لە هەمو شتێک بهێنیت بۆ ئامانجێک کە لە دیوێکی ئاینییەوە

باوەڕت پێی هەبووە، ئەوا زۆر زەحمەتە ئیتر بتوانی بەبێ ئەو ئامانجە بژیت. لەبەر هەندێ، هەندێکیان ئامانجێکی نوێیان لە ژیانی خۆیاندا دۆزیوەتەوە، لە هاوکاریکردن و یارمەتیدانی کۆنە ئەندامان، یان لە خەبات بۆ تەقاندنەوەی ڕێبازەکە و ئاشکراکردنی نهێنییەکانی، یانیش بەهۆی پێ داگرتن لەسەر ئەوەی سەرکردایەتیی موجاهیدین دەبێ بچنە بەردەم دادگە و بەرگری لە کردارەکانیان بکەن. ئاراش سامیتی پوور دەڵێت " زۆر حەز دەکەم لە بەردەم دادوەردا هەموو شتێک لە بارەی ئەوانەوە بڵێم، بەتایبەتی ئەگەر دادگایەکی نێودەوڵەتی بێت."

عەلی ڕەزا میرازگەری دەڵێت " من تووڕەترین کەسم لە ڕەجەوی. لە مریەم نا، چونکە ئەو وەک بووکەشووشەیەک بوو بەدەستی ڕەجەوییەوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت من ڕقم لێی بێتەوە، بەڵام دەبێ ڕێبازەکەی هەڵبوەشێتەوە. چونکە ڕق سەرچاوەی زیاتربوونی توندوتیژییە. دەبێ دادگایی بکرێت، ئەمە لە باشترین بەرژەوەندیی هەموو کەسێکدایە. من باوەڕم بەسزای مەرگ نییە. حەز دەکەم بەدەستی خۆم نان بدەمە ڕەجەوی لە نێو زینداندا." ئەم ڕستەیەی کۆتاییی بەهەستێکی تۆڵەوە وت.

عەلی قەشقەویی هاوڕێی، پێی وایە زۆرترین زانیاری دەبێ کۆ بکرێتەوە و کار بکرێت بۆ ئەوەی جارێکی تر شتێکی لەم جۆرە ڕوو نەداتەوە. عەلی دەڵێ "بەمردنی ڕەجەوی، کەس بەنهێنییەکانی ئەو سیستمە نازانێت، کەس بەڕێگەی بیرکردنەوەی ئەو کابرایە نازانێت، کەس نازانێت ئەو بیرۆکانەی لە کوێوە بۆ هاتوون. ئەمە تەنیا ئەو کاتە ڕوون دەبێتەوە، ئەگەر لە بەردەم دادگایەکی یاساییدا دادگایی بکرێت."

حوسێن فورقانی، دوای چەندین ساڵ بەجێ هێشتنی ڕێکخراوەکە لە حاڵەتێکی دەروونیی خراپدایە، ئێستاشی لەگەڵدا بێت وێڵە بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارانەی بۆ ماوەیەکی درێژ تووشی پەتایان کردبوو. لەو ئیمێلانەی بۆ منیان دەنێرێت، پەستی و نیگەرانییەکەی ڕوونە لە بارەی ئەوەی جیهان تا ئێستا نازانن مەسعود ڕەجەوی چەندە دڕندەیە، هەروەها ئەوەش دەڵێت کە هاوڕێکانی لە کەمپی ئەشرەف دەبێ ڕزگار بکرێن. بەڵام ئەو نایەوێت ڕەجەوی بمرێت و دەڵێت " ڕەجەوی نابی جارێ بمرێت. دەبێ وەڵامی پرسیارەکانی من بداتەوە. خەباتی ئێمە بۆ ئەوەیە ئێستا بانگی

بکەین و بیرەکانی بۆمان ڕوون بکاتەوە."

ئەو ڕاپۆرتەی ڕێکخراوی مافەکانی مرۆڤ لە ساڵی ٢٠٠٥دا بڵاوی کردەوە لە بارەی ئەو چەوساندنەوەیەی لە نێو موجاهیدیندا هەبووە، وا لە بیست و دوو کۆنە ئەندامی ئەو ڕێکخراوە دەکات، نامەیەکی کراوە بۆ ڕێکخراوی مافەکانی مرۆڤ بنووسن و داوای ئەوە بکەن موجاهیدینی خەلق بهێننە بەردەم دادگایەکی نێودەوڵەتی. هەروەها باسی ئەوەش دەکەن زۆر بەخۆشحاڵییەوە ئامادەن بەڵگەی تێروتەسەل و پێویست لە بارەی موجاهیدین بدەن بەدەستەوە.

فەرەح کەریمی دوای بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی پێمی وت ئەو دەیەوێت زانیاریی تەواو کۆ بکاتەوە بۆ ئەوەی مەسعود ڕەجەوی پێ بهێنێتە بەردەم دادگای نێودەوڵەتیی لاهای، لەسەر دۆزی کردەی ئاگری نەمر، کە تیایدا خوشکەکەی دەکوژرێت. فەرەح دەڵێت " ئەمە زۆر باش دەبێت و دەچێتە نێو مێژوو، هەروەها بۆ قوربانییەکان و پێشکەوتنی ئێرانیش چونکە تاکو ئێستا، هیچ کەس بەرپرسیارەتیی هیچ کارێکی لە ئەستۆ نەگرتووە وەک کردەی باڵیۆزی ئەمەریکا، ئەشکەنجەدانەکان، یان بۆ شەڕ لەگەڵ عێراق. ئەمە دەبێ ڕوو بدات، ئەگەر تۆ کۆشش دەکەیت بۆ کولتوورێک کە مافەکانی مرۆڤ بەرز ڕابگیرێت و چاودێری بکرێت، دەبێ ئەو دادگاییکردنە ڕوو بدات."

# پشکی نۆیەم

## گەنج و ساویلکە بەئاسانی هەڵدەخەڵەتێن

ڕاستییەکەی، ئێستاش نازانێت چی بەسەردا هاتووە. تەنیا بەدوو ڕۆژ، یاسر عیزەتی قسەی لەگەڵ دەکرێت و پێوەندی بەفیرقەی گەنجانی موجاهیدینی خەلق لە عێراق دەکات. سەرەڕای خۆزگە و حەزی بۆ ئازادی و نەبوونی هەست و سۆز بۆ ڕێکخراوەکە، ئەو ڕێکخراوەی بە ١٠ساڵی لە عێراق دەیرفێنێت و چەندین دایک و باوکی ساختە و هەتیوخانەی پێ دەکات، ڕێگە بەخۆی دەدات قسەی لەگەڵ بکرێت. دواجار بەحەڤدە ساڵی دەهێنرێتەوە عێراق.

پەیداکردنی ئەندامی نوێ هەمیشە زۆر گرینگ بووە بۆ موجاهیدین. هەندێ ئەندام لە ئەورووپا هیچ شتێکی تر ناکەن جگە لە پەیداکردنی ئەندام نەبێت. بۆ نموونە، ئەو ئافرەتەی لە کۆڵن هەموو هەوڵێکی خستە گەڕ بۆ ئەوەی بڕوا بەیاسر بێنێت، ڤیدیۆ و کۆبوونەوەگەل و ڕاپۆرتی دانیشتنی ڕۆژانەی ڕەجەوی زەوینەیەکی بەپیتی دروست کردبوو تا لەسەر ئەو زەوینەیەدا توانیان بەتەواوی پەلکێشی بکەنە نێو ڕێکخراوەکەوە. یاسر باسی ئەو دوو ڕۆژە دەکات کە ئەو ئافرەتە بەچڕی لەگەڵیدا بوو و هەوڵی دا، یاسر دەڵێت " ئەو ئافرەتە زۆر نەقۆڵا بوو. من دڵنیام لەوە. ئەو ئافرەتە باسی خوا و باسی ئیسلامی بۆ کردم. باسی دایک و مامی کردم چۆن لەبەر خراپیی ڕێژیمی ئێران مردن. پێی وتم، بۆ ئەوەی تۆڵەی ئەوان بکەمەوە دەبێ بەناوی شەهیدەکانەوە بچمەوە ئێران چونکە من گەلی ئێرانم خۆش دەوێت. من ئێستاش سەرم لەوە دەرناچێت چۆن من ئەو کاتە باوەڕم بەو شتانە کرد. نازانم چیم بەسەر هات، هەر ئەوەندە دەزانم دوای دوو ڕۆژ بڕیارم دا بچم بۆ عێراق."

لە ساڵانی یەکەمدا لە ئێران، ئەندامی نوێ پەیدابوون بەهۆی کۆواری نایاساییەکان کە لە لایەن موجاهیدینەوە دەردەچوون. پاش چوونی ڕەجەوی بۆ پاریس، پەیداکردنی ئەندام بەزەحمەت کەوت و دەبوایە ڕاستەوخۆ بگەڕێن بەدوای

ئێرانییەکان لە تاراوگە. لە نەوەتەکاندا کردەیەکی چڕوپڕی پەیداکردنی ئەندام دەستی پێ کرد، ئەمەش بەمەبەستی زۆرکردن و فرەوانکردنی موجاهیدین. دوای ئەوە ئەو منداڵانەیان هێنایەوە کە ساڵی ١٩٩١ عێراقیان لێ قەدەغە کرا و لە هەمان کات ئەوانەی ئەندامیان پەیدا دەکرد هەموو هاوڕێکانی خۆیان هێنا، هەروەها کوڕ و کچەکانی ئەو کەسانەشیان هێنایە نێو ڕێکخراوەکە کە هاوسۆز بوون لەگەڵ موجاهیدین. نەدا حەسەنی، ئەو کچەی ئاگری لە خۆی بەردا لە ساڵی ٢٠٠٣ لە پێناو ئازادکردنی مریەم ڕەجەوی لە زیندان، نموونەیەکی ئەمەیە. دایک و باوکی ئەو کچە هاوسۆزی موجاهیدین بوون، ئەو کچە لە ڕێگەی ئەوانەوە بەو ڕێکخراوە ئاشنا دەبێت، لەبەر هەندێ کاتێ داوای لێ دەکرێت پێوەندی بکات بەبەتالیۆنی گەنجانی موجاهیدین، زۆر بەئاسانی پەسندی دەکات.

زۆر ئاسانتر لە ئاراش سامیتی پوور، کە نەدا لە واشنتن چاوی پێی دەکەوێت کاتێ نەدا بەمەبەستی "پەروەردەی سیاسی" چووەتە ئەوێ: ئەم پەروەردە سیاسییە بۆ ئەو زۆر پێویست بوو پێشی ئەوەی بچێتە عێراق، لێرە، چیرۆکی سامیتی پوور بەکار دێنم بۆ ئەوەی نیشانی بدەم کردەی مێشک تێکدان و پەیداکردنی ئەندام و بەمەزەبکردنیان لە لایەن موجاهیدینەوە چۆن کار دەکات.

پرسی ئاراش سامیتی پوور، منداڵێک لە دایک و باوکێکی سکیولاری ئێرانی کە کەمێک لە بارەی موجاهیدینەوە دەزانن، تەنیا خۆشەویستی بوو ببێ بەمایەی ئەوەی بەئاسانی مێشکی بۆ لای موجاهیدین بچێ. پوور دەکەوێتە داوی خۆشەویستی لەگەڵ یەکێک لە منداڵە دزراوەکان کە ناوی ئیلهامە. پوور دەڵێت " دایک و باوکی ئەو کچە لەگەڵ موجاهیدین بوون لە عێراق. کچەکە وات ئیلهام لەگەڵ مام و مامۆژنی دەژیا کە هەردووکیان دوو پلەداری گەورە بوون لە نێو موجاهیدین."

سامیتی پووری بێ خەم لە ژووری کۆنفرانسی ڕێکخراوێک دانیشتووە بۆ کۆنە ئەندامانی موجاهیدین لە تاران، قۆڵەکانی لەسەر مێز دادەنێت و فێر دەبێت. ئینگلیزییەکەی بێ خەوشە، بەڵام تۆزێک بۆنی ئێرانی و کەمێکیش ئەمەریکاییی لێ دێت. کاتێ هەندێ کاغەز و فایل هەڵدەگرێت، ئەو دەمچاوم کەوتە سەر. خۆی دەڵێت " من ڕاهێنانم دەکرد، ڕاستەش بووم لە نووسین." ئەو کاتە بوو چاوەکانی لە دەست و پەنجەم داگرت.

چیرۆکی سامیتی پوور لەگەڵ ئەو هەولانە دەست پێ دەکات کە دایک و باوکی گرتوویانەتە بەر بۆ بەجێ هێشتنی ئێران. بۆ ماوەیەکی کەم لە بەریتانیا و فلیپین و ئیمارات و دواجاریش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەژیت: کاتێ خێزانەکەی کۆچ بۆ وڵاتی ئەمەریکا دەکەن لە ساڵی ١٩٩٦. لەوێ لە نۆرفۆلک، لە ویلایەتی ڤێرجینیا زانستی کۆمپیوتەر تەواو دەکات.

دەڵێت " لەوێ چەند گەنجێکی ئێرانیم بینی، لەگەڵ چەند منداڵێکی هەتیو. بوومە هاوڕێیان." ئیلهامیش یەکێکە لەوان، دواتر سەری بۆ دەخورێت و خۆشی دەوێت.

ئیلهام زۆر بەخێرایی پەلکێشی دەکاتە نێو موجاهیدین. سەرەتا پێکەوە بێگوناهانە دەست دەکەن بەدامەزراندنی یانەیەکی فارسی لە قوتابخانەکەیان، کە ئیلهام سەرۆک و ئەویش سکرتێر. چالاکییەکانی ئەو یانەیە سیاسی نەبوون. بۆ نموونە، لە جەژنی نەورۆزاندا کۆبوونەوە بۆ گەنجەکان رێک دەخەن. بەلام پاشان ئیلهام سامیتی پوور دەباتە نێو کۆبوونەوەکانی موجاهیدینی خەلق، کە مەڵبەندی سەرکردایەتییان لە ئەمەریکایە لە ناوچەی فۆڵ چێرچ، کە نزیکە لە واشنتنۆنی پایەتەخت. سامیتی پوور دەڵێت " ئەم شوێنە وەک باڵیۆزخانەیەکی نهێنیی موجاهیدین بوو." لەوێ پێکەوە گوێ لە وتارەکان دەگرن و سەیری کاسێتە ڤیدیۆکانی ڕەجەوی دەکەن.

ئاراش سامیتی پوور منداڵێکی پرشنگدارە، حەزی لە شیعر نووسینە و کەیفی بەوەرزش دێت. زۆر مەیلی لە مۆسیقایە و دواتر دەبێتە جەماوەرێکی سەرگەرمی وۆکمان بەمۆسیقای پۆپی فارسی، وەک ئەو گۆرانییانەی کە لە لایەن هونەرمەندە ئێرانییەکانەوە دەچرێن لە تاراوگەدا، کە بەم دواییە لە ئێرانیش زیادییان کردووە. پوور زۆر غەریبی ئێران دەکات، زۆر ڕاستگۆیانە بۆ من دانی پێدا دەنێت " بەلام ئەو کاتە نەمتوانی بگەڕێمەوە، چونکە دەبوایە بچمە خزمەتی سوپا و ڕیزەکانی سەربازی."

بە پێچەوانەی دایک و باوکی، ئەو زۆر حەزی لە سیاسەتە. کاتێ لە قوتابخانەی ئامادەیی بوو لە ئێران، پێوەندیی هەبوو لەگەڵ نووسەر و شاعیران، کە زۆربەیان دواتر دوور خرانەوە لە وڵات چونکە ڕێژیم ڕقی لە نووسینەکانیان دەبووەوە. دایک و

باوکی زۆر خەمیان لەو پێوەندییانە دەخوارد چونکە ئەم جۆرە پێوەندییانەی ئەوساکە هەرگیز بەبێ مەترسی نەبووە لە ئێران. پاشان پێوەندییەکانی لەگەڵ ئیلهام لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا، هەروەها پێوەندییەکانی لەگەڵ موجاهیدین لە ڕێگەی ئیلهامەوە دوو خەمی گەورەی دایک و باوکی بوون. دوای هەموو شتێک، گرووپەکە مێژوویەکی پڕ لە توندوتیژییان هەیە لە ئێران. ئەوەی پێوەندیی بەوانەوە هەبێت، هیچی تر لە ئێران ساغ نابێت.

بەڵام ئاراش کەوتووەتە داوی خۆشەویستی و دەیەوێت زۆرترین کات لەگەڵ ئیلهامدا بەسەر ببات. کەچی ئیلهام وای لێ دەکات بکەوێتە ململانێ لەگەڵ خۆیدا چونکە ئاراش نایەوێت ژیانی بکەوێتە مەترسییەوە و نەتوانێت جارێکی تر بگەڕێتەوە ئێران لە ئەنجامی پێوەندیکردنی بەسیاسەتی موجاهیدینەوە. هەروەها ئەوەش دەزانێت کە ڕەوشی ئێران ئەوەندە تۆقێنەر و ترسناک نییە لەچاو ئەوەی باسی لێوە دەکەن، لە دڵەوە دانی پیا دەنێت و دەڵێت "سەرەتا من هەر باوەڕیشم پێیان نەبوو. من مام و خاڵەکانم هەموو بۆ حکوومەت کاریان دەکرد و لەو کەسانە بوون خۆبەخشانە لە شەڕی عێراق-ئێراندا دژی عێراق شەڕیان دەکرد.

بەڵام ئیلهام ژیرانە هەستەکانی ئاراش بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت، وای لێ دەکات بیخاتە نێو سیاسەتیشەوە هەرچەندە کەیفی بەسیاسەت نەدەهات. هەروەک لە چیرۆکەکانیدا بەدیار دەکەوێت. ئاراش دەڵێت " ئێوارەکیان، ئێمە لە ماڵی چەند هاوڕێیەک بووین و ئیلهام داوای لێ کردم لەگەڵیدا بچمە ناو خۆپێشاندانێک. منیش وتم " نەخێر، چونکە من دەمەوێ بگەڕێمەوە ئێران." ئیتر لێمان بوو بەدەمەقاڵێ. لە کۆتاییدا پێی وتم موجاهیدین دەیەوێت خۆپێشاندان بکەین لە کاتی یاریی نێوان ئێران - ئەمەریکا لە جامی جیهانی لە شاری لیۆنی فەرەنسیدا. باوەڕی پێ هێنام لەگەڵیدا بچم. ئەوان خەرجیی هەموو شتێکیان کرد و منیش بەدەرفەتێکی باشم زانی بچمە فەرەنسا."

ئاراش بەوە دەزانێ ئەگەر بچێت ئەوا هەنگاوێکی گرینگ دەهاوێت بەرەو موجاهیدین، چونکە لە وێنە و لەسەر تەلەفزیۆندا دەبینرێت، ئەویش لەو خۆپێشاندەرانە دەبێت چەند دروشمێک دژی ڕێژیمی ئێرانی هەڵدەگرێت لە یاریی

ساڵی ١٩٩٨دا کە زۆر بەهۆشیاری لە تاران تاوتوێ کرا و بەهەند وەرگیرا. موجاهیدین ئەم وێنانە بۆ ماوەی چەند ساڵ لە نێو کۆوارەکانیاندا بڵاو دەکەنەوە. ئاراش سامیتی پوور لەگەڵ خۆی قسە دەکات لە بارەی ئەمە. کاتێ دەگەڕێتەوە ڤێرجینیا، ئەم ڕێکخراوە بەتەواوی پێیەوە دەنووسێت.

کاتێ ڕێکخراوەکە داوای لێ دەکات بەنیو دەوام کاریان لەگەڵدا بکات، ئاراش ڕازی دەبێت. ئەی حەزەکانی گەڕانەوەت بۆ ئێران؟ ئاراش بژارەکانی شی دەکاتەوە و دەڵێت " من ئەو کچەم خۆش دەویست. من وامدەزانی موجاهیدین کەسانی باشن و لە پێناو ئازادیدا خەبات دەکەن. باوەڕم پێ بکە لە دەرەوەی عێراق باشترین ڕووی خۆیان نیشان دەدەن. لە دەرەوە کەسانی دیپلۆماسین، کەسانی زۆر باشن، زۆر بەخۆشی و بەڕێزەوە قسەت لەگەڵدا دەکەن. بەڵام هەرکە چوویە ناویانەوە، ئەم شتانە بە ژوورەوە نابینیت."

پاڵەپەستۆی ئەم کوڕە ئەویندارە بەرزتر دەبێتەوە کاتێ باوکی ئیلهام بۆ یەکەم جار دوای حەوت ساڵ خۆی بەدیار دەخات. هیچ کات نەماوە بۆ ناڕەزایی دەربڕین لە بارەی ئەو بێدەنگییە دوورودرێژەی. پەیامەکە سادەیە: کچەکەی دەبێ لە عێراق پەیوەندیی پێوە بکات. ئەمەش بۆ سامیتی پوور ئاکامی گەورەی لێ دەکەوێتەوە. چەند ساڵ دوای ئەمە، ڕاشکاوانە دانی پێدا دەنێت چەندە ترساوە لە لەدەستدانی خۆشەویستەکەی. جا بۆ ئەوەی هەمیشە لەگەڵیدا بێت و بەردەوام بیبینێت، باشترین کار ئەوەیە لەگەڵیدا بچێتە نێو موجاهیدین.

من دەمەوێ بزانم چۆن دایک و باوکی ئاراش بەرسڤی ئەم کارەیان دایەوە. لە سەرەتادا دزەکردنی کوڕەکەیان بۆ نێو موجاهیدین زۆر پێ ناخۆش بوو و زۆریش لە لایان گران بوو. ئاراش بەوردی پێیان ناڵێت پاش ئەوە چی دەکات. بەڵام کاتێ دایک و باوکی دەزانن کار بۆ موجاهیدین دەکات، بێگومان ئەو کارە ڕەت دەکەنەوە. ئاراش دەڵێت " دایک و باوکم وتیان ئێمە تۆمان بەخێو و گەورە کردووە، ئێستاش ئەوانە دەیانەوێت تۆ لە ئێمە بکەنەوە و لە ئێمەت بسەنن."

تا ئەو کاتەی بەتەواوی دامەزرا لە نێو موجاهیدین، پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ دایک و باوکیدا هەبوو، تەنانەت پەیوەندییەکی زۆر نزیکیش. تەنیا پەیوەندیی لەگەڵ

باوکیدا زۆر باش نەبوو، ئەویش بەپێی قسەکانی ئاراش لەبەر جیاوازیی تەمەن. پاشان ئاراش بەدەنگێکی دۆڕاوەوە پێم دەڵێت "بەهۆی نەخۆشیی شێرپەنجەوە، ئەو کاتەی من لە عێراق بووم، مرد."

دایک و باوکی لەسەر هەق بوون و ڕاستیان دەکرد. موجاهیدین هەموو شتێک دەکات لە پێناو زەوتکردن و دوور خستنەوەی کوڕەکەیان لەوان. ئاراش دەڵێت "موجاهیدین بەدرێژی قسەیان لەگەڵدا کردم و وتیان: پیاو و ئافرەت پێمان دەڵێن ئێمە باشترین ڕێکخراوین خەبات دەکەین لە دژی ڕێژیمی ئێران. ئەو ڕێژیمەی خەڵکی ئازار دەدات و دەکوژێت. دەبێ تۆش یارمەتیمان بدەی. هەروەها پیاوێک ئەمەی پێ وتم لە کۆلێژی پزیشکی بوو لە ئیتاڵیا ئەو کاتەی بڕیار دەدات پێوەندی بەموجاهیدینەوە بکات. پیاوەکە وتی ئەوان پێیان وتم "ئێمەش خێزانمان هەیە، بەڵام ئەگەر تۆ بەگوێی ئەوان بکەیت، ئەی باشە کێ لە پێناو ئازادیی ئێراندا خەبات بکات؟" بەم شێوەیە بڕوایان بەمن هێنا، چونکە مێشکم پڕ بووبوو هیچی تر نەمتوانی بیر بکەمەوە. ئەو کاتە تەمەنم بیست و دوو ساڵ بوو و لایەنی سۆزداریم زاڵ بوو بەسەرمدا." دوای هەموو ئەم شتانە ئاراش سامیتی پوور ماڵەوە و دایک و باوکی بەجێ دەهێڵێت. پاشان، فەرمانی پێ کرا ئاڵا هەڵگرێت لە دژی ڕێژیمی ئێرانی کاتی یاریی نێوان ئەمەریکا و ئێران لە نیویۆرک. ئەو کاتە دەگیرێت و ئەوجا زیاتر هەست بەوە دەکات پابەستەیە بەموجاهیدینەوە. دوایی بەتەواوی باوەڕی دێت لەگەڵیاندا بێت. خێزانەکەی نەیاندەزانی موجاهیدین چی دەکەن و چی ناکەن! زۆر ئەشکەنجە و ئازار دران لە زیندانەکانی ئێراندا. پاشان باسی متمانەی خۆی دەکات بەموجاهیدین، دەڵێت "بەتەواوی باوەڕم پێیان هەبوو. هەرچییەکیان پێ وتبام، باوەڕم دەکرد."

کاتی سەرۆکی ئێران خاتەمی ساڵی ١٩٩٨ دێتە نیویۆرک و لە کۆبوونەوەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا وتارێک پێشکێش دەکات، موجاهیدین دەیانەوێت خۆپێشاندان بکەن لە دژی. ئەمەش بۆ ئاراش سامیتی پوور بەهەموو باوەڕی خۆی ڕووبەڕووبوونەوەیەکی زۆر سەیرە. بەپێکەنینەوە دەڵێت "دەزانی من لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە ساڵی ١٩٩٧دا دەنگم بۆ خاتەمی دا. پێکەوە لەگەڵ

باوکم بۆ ئەو دەنگمان دا. پێم وابوو ئەو کابرایەکی باش دەبێت بۆ ئێران. ئێستاش هەر لەو باوەڕەدام. تەنها من لە ئێرانم و دەبینم هەموو ئەو شتانەی گۆڕاون، بەهەوڵەکانی خاتەمی بووە."

ئەو هەستانە، بەتێکەڵاوییەک لەگەڵ ئیرەییدا، دەبێ زۆر بێزاریان کردبێت کاتێ گوێبیستی ئەو ئەرکە بوو ئیلهام لەگەڵ هاوڕێیەکیدا جێبەجێی دەکات. تێبینیی ئەوەم کرد هێشتا زۆر بەگەرمی قسە لەم بارەیەوە دەکات، تەنانەت ئێستا پێنج ساڵ بەسەر چووە. بەپێی پلانەکان، ئیلهام و کوڕەکە دەچن بانگەوازی چەند دروشمێک دەکەن لە نێو ئاپۆڕەی خەڵک لەو کاتەی خاتەمی وتارەکەی لە بەردەمی کۆبوونەوەی گشتیدا پێشکێش دەکات. بەڵام دەزگای هەواڵگریی فیدراڵ FBI دەستگیریان دەکات.

سامیتی پوور دەڵێت "یەکێک، سیخوڕێک ناپاکیی لێ کردوون." پرسیارم لێ کرد بۆچی ئەو زۆر دڵنیایە لەمە و ئاخۆ دزەکردنی ئەو زانیارییە لە نێو موجاهیدینەوە هاتووە. بیر لەو پرسیارە دەکاتەوە و ئەگەرەکان دەستنیشان دەکات، پاشان بەدوودڵییەوە دەڵێت "بەڵێ، پێم وایە لە نێو موجاهیدەکان خۆیانەوە ئەو زانیارییە دزەی کردووە. من ئێستا دەزانم ئەوان خۆیان ئەم جۆرە شتانە دەکەن بۆ ئەوەی ئاسایش بەو شتانەوە مژووڵ بکەن." ئەرکەکە دواجار لە لایەن یەکێکی ترەوە جێبەجێ کرا. کەناڵە ڕاگەیاندنەکانی ئەمەریکا باسی ئەوە دەکەن ئێرانییەکی تەمەن ٣٧ ساڵان دەتوانێت لە ئاسایش دەرباز بێت و بەدەنگێکی بەرز خاتەمی سووک بکات، هاواری دەکرد خاتەمی جەلادە، خاتەمی بکوژە بکوژ!

پاش ئەمە سات بەخێرایی دەڕوات. کاتێ ئیلهام لە زیندانی ئەمەریکا ئازاد دەکرێت، بەپاسپۆرتێکی ساختە دێتەوە عێراق. ئاراش نایەوێت لە ئیلهام جیا بێتەوە، لەوێ بەچەند هەفتەیەک کارەکانی بەمەزەبکردنیان تەواو کرد. هەفتەیەک دوای ئەوە ئاراش بەپاسپۆرتی یاساییی ئێرانیی خۆی بەدوای ئیلهامدا دێتەوە عێراق لەگەڵ کوڕ و کچێک لە تەمەنی خۆیدا. ئەمە ساڵی ١٩٩٩ ڕووی دا.

ئاراش دەڵێت "هەرکە گەیشتینە نێو کاپەکە یەکسەر لێک جیا کراینەوە. ئەوەی ڕاستی بێت قەت بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو جیاوازییەکی زۆر هەبێت لە نێوان

موجاهیدەکانی ئەمەریکا و ئەوانەی نێو عێراق. لە ئەمەریکا کاتمان بەیەکەوە بەسەر دەبرد و دەچووینە کافتریا و یانەکانیش. لەوی دەمانتوانی گوێ لە مۆسیقا بگرین و یاریی کۆنکانیش بکەین. بۆیە کاتێ هاتمەوە عێراق سی دی و هێدفۆنەکەم لەگەڵ خۆم هێنا، بەڵام زوو لێیان سەندم. پێمیان وت ئەمە دژی یاساکانی ئێمە نییە بگرە سی دی و شتی وا دژی ئاینەکەمانە."

سامیتی پوور نارەزایی دەردەبڕێت. ئەو شتە نەبوو ئەو بۆی هاتبوو. ئەی باشە ئیلهام کوا؟ هەندێ جار لە دوورەوە دەیبینێت، ئەویش لە کاتی کۆبوونەوە گەورەکان لەگەڵ مەسعود و مریەم ڕەجەویدا. لە کەمپی ئەشرەف تەنیا لەگەڵ پیاواندا کاری دەکرد، ئەوی نەدەبینی.

کۆبوونەوەی هەفتانە کە لەوێ ئەنجام دەدرا جارسیان کردبوو، چونکە هەموو جارێ پێی دەوترێت هێشتا تەواو لەگەڵ ڕەوشەکەدا ڕانەهاتووە. دەڵێت "هەرچییان بویستایە دەیانوت، ڕیسوا و سووکیان دەکردی. تۆ نەتدەتوانی بەرگری لە خۆت بکەیت چونکە هەر قسەت کردبوایە ئەوان خراپتریان پێ دەکردی. میرەکەمان زۆر قسەڕەق و ڕووشکێن و ئیهانەچی بوو. ئیتر وردە وردە خۆم ون کرد لەوێ، چونکە هیچی تر بەرگەم نەما و هیچم پێ نەدەکرا."

خراپترین شت ئەوەیە تۆ تەنیا بۆ ساتێکیش ناتوانی خۆت دوور بخەیتەوە لە بارودۆخەکە و کەسیش نییە دەردەدڵی خۆتی لە لا باس بکەیت. لەم بارەیەوە ئاراش سامیتی پوور دەڵێت "ئەگەر تۆ لێرە لەگەڵ سەرۆکەکەت کێشەت هەبێت، لە کۆمەڵگەیەکی ڕاستەقینەدا، تۆ دەتوانی بچیتەوە ماڵەوە و پرسەکە لای خێزانت یان هاوڕێکانت باس بکەیت. بەڵام ئەمە لەوی حەرامە. هەر قسەیەکی لابەلا لەگەڵ هەر یەکێک بەنایاسایی دادەنرا. چەندین جار منیان لە خەتدا گرتووە."

هەوڵدان بۆ قسەکردن لەگەڵ ئیلهام یان یەکێک لەو هاوڕێیانەی ئەمەریکا لە کاتی کۆبوونەوە گەورەکاندا کارێکی مەحاڵە، چونکە میرەکان بەشێوەیەکی زۆر تایبەت چاودێریت دەکەن، سامیتی پوور پێم دەڵێت لە کاتی یەکێک لە کۆبوونەوەکاندا یەکێک لە هاوڕێ کۆنەکانی ئەمەریکای لێی نزیک دەبێتەوە و قسەی لەگەڵدا دەکات، هەر ئەوەندەمان زانی میرەکە هات و بەخێرایی لە تەنیشت ئەو هاوڕێیەم وەستا. " پاشان

پرسیاریان لێ کردم چیم وتووە و ئەویش چی وتووە، ئایا قسەکردن لە نێوان دوو کەسدا حەرامە؟ دەبوایە هەموو شتێکم نووسیبا."

ئاراش هەرگیز ناتوانێت جارێکی تر قسە لەگەڵ ئیلهامدا بکاتەوە. ساڵێک دوای ئەوە زۆر پەشیمان دەبێتەوە. زۆر بەخەمناکییەوە دەڵێت " ئێمە هەردووکمان زۆر لە یەکتر نزیک بووین." بەڵام پیاو و ئافرەت بەتەواوی لە نێو موجاهیدیندا لە یەکتر جیا دەکرانەوە. باشە گەنجێکی وەک سامیتی پوور چی لە وزە سێکسییەکانی بکات؟ هیچ شتێک نییە بتوانن بیکەن جگە لە گفتوگۆکردن لە کاتی کۆبوونەوەکانی ڕۆژانەدا. پەستی و بێزاریی سامیتی پوور گەیشتبووە لووتکە.

سامیتی پوور ئەو کۆبوونەوانەی زۆر پێ ناخۆش و تۆقێنەرە. بەپێکەنینەوە پێم دەڵێ "بەزۆر وایان لێ کردم بەشدارییان لەگەڵدا بکەم. دەیانوت: شتێکی باشە ڕاستگۆ بیت و هەموو شتێکیان دەربارەی خۆتەوە پێ بڵێی. ئەگەر هیچ قسەت نەکردایە، پێیان دەوتی: باشە تۆ خۆت بەچی دەزانی. کاتێ پێشنیازم کرد بۆیان کەوا دەتوانن سوود لە ئەزموونی کۆمپیوتەریم وەرگرن، هێرشیان کردمە سەر. پێیان دەوتم، تۆ لێرەیت بۆ خەباتکردن یان بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی کۆمپیوتەر؟ میرەکە پێی وتم: دەبێ خۆت لە کۆمپیوتەر دوور بخەیتەوە."

سەرەڕای سووکایەتی و قسەی ڕەق و ناخۆش، توندوتیژی شتێکی ئاساییە لە کاتی کۆبوونەوەکاندا تەنیا بۆ ئەوەی ویستی ئەندامە نوێیەکان بشکێنن. پوور دەڵێت "من بەچاوی خۆم بینیومە چۆن لە یەکێک دەدەن لە کەنەدا کە وتبووی من باوەڕم پێتان نییە و هەمووی درۆیە. ویستم خۆم تێ وەردەم و بچمە نێوانیانەوە، بەڵام سەیری دەوروبەری خۆم کرد بەتەنیا بووم..."

وردە وردە سامیتی پوور دەبێتە مرۆڤێکی داخراو. دەڵێت پێیان وتم "تۆ تاکە کەسی کێشەت هەیە. ئەگەر بیرەکانی تۆ لەگەڵ ئێمەدا یەک نەگرێتەوە، ئەوا خۆت لە بیر بکە چونکە بیرەکانی ئێمە ڕاستن." ئیتر دوای شەش مانگ باوەڕم کرد و بوومە یەکێک لەوان."

موجاهیدین دەبێتە خێزانی سامیتی پوور. خێزانە ڕاستەقینەکەی هیچی تر بۆ ئەو گرینگ نییە. ئەو کاتە باوکی دەمرێت. ئایا خەم بەمردنی باوکی دەخوات و تێک

دەچێت؟ دەمەوێ ئەوە بزانم، سامیتی پوور دەڵێ: بەڵێ. کاتێ هەواڵی مردنی باوکی پێ دەگات زۆر خەمناک و دڵتەنگ دەبێت. بەڵام بۆی نەبوو ئەو هەستانەی خۆی دەربخات، دەترسا لەوەی نەوەک لە نێو کۆبوونەوەکاندا بەرسڤی نەرێنیی هەبێت، ئەگەر هەیبوایە ئەوا سزا دەدرا. دەڵێت "کاتێ ڕۆژی وەرزشکردن هات، بۆ ماوەی پێنج کیلۆمەتر ڕۆیشتین. کراسێکم لەبەردا بوو وێنەی ڕەجەویی لەسەر بوو. ویستم ئەوە نیشان بدەم من تەرخان کراوم بۆ ڕەجەوی نەک بۆ باوکم. هەوڵم دەدا خێزانم لە بیر بکەم."

دوای شەش مانگ لە کەمپی ئەشرەف، ڕەجەوی پێشوازی لە ئاراش سامیتی پوور و چوار پیاوی تر دەکات. ئەمە لووتکە بوو، چونکە ڕەجەوی بەرزترینیان بوو. " ڕەجەوی دەپەرسترا و لە سەروەی هەمووان بوو."

پێشوازییەکە بۆ ئەوان زۆر تایبەت بوو. چەندین ساڵ دوای ئەوە، سامیتی پوور هێشتا ئەمەی زۆر بەجوانی لە بیرە و دەڵێت "ڕەجەوی ئێمەی ماچ کرد. ئایەتێکی بۆ من لە قورئانی پیرۆز خوێندەوە و وتی: سوپاس بۆ خوا کە مرۆڤێکی باشی وەک تۆی بەئێمە بەخشیوە. مریەمیش پێی وتم کەوا خێرا گەورە بوومە."

لە کاتی کۆبوونەوەکەدا، ڕەجەوی دەچێتەوە سەر بابەتی مردنی باوکی و دەڵێت " باوکت مرد و تۆی بەمن بەخشی. من ئێستا بەرپرسیارم لە تۆ." سامیتی پوور دەڵێت " ڕەجەوی ئەکتەرێکی زۆر باشە، زۆر بەباشی دەتوانێت هەموو ڕق و کینەکانی خۆی کپ بکات لە بەرامبەر یەکێکی تردا."

سامیتی پوور گەڕایەوە سەر هەستە بنچینەکانی، چونکە سەرەتا نەیدەویست هیچ شتێک لەگەڵ مەسعود ڕەجەویدا بکات، تەنیا دەیویست شتێک لەگەڵ مریەمی شۆخ و شەنگدا بکات کە چەندین کەس لە نێو موجاهیدین بۆی لێ درا بوون و پێی سەرسام بوون. دەڵێت "بەڵام ئەمە گۆڕا لەبەر قسەکانی و ڕەفتارەکانی. زمانی جەستەی، کە خۆی دەجووڵێنێت و سەرنج دەدات، زۆر مەزنە. تەنانەت ئێستا نامەیەکیشم بۆ نارد و پێم وت تۆم خۆش دەوێت."

سامیتی پوور لەمە دەڕوانێت و دەزانێت چۆن ئەم شتانەی بەسەر هاتووە. یەکەم جار لە خێزانەکەی جیا دەکرێتەوە، پاشان دەهێنرێتە عێراق کە لەوێ ڕێگەی پێ

نادرێت قسە لەگەڵ هاورێکانیدا بکات، هیچی تر لەوی ئیلهام نابینێتەوە و بەتەواوی دەکەوێتە دەستی پیاوەکانی ئەوێ. بۆیە دەڵێت "ئەگەر پیاو و ئافرەت لە یەکتر جیا بکەیتەوە و پاشان بیانهێنیەوە لای یەک بێ ئەوەی هیچ جۆرە پێوەندییەکیان هەبێت، ئەوا کەس دڵخۆش نابێت و کەس قسە لەگەڵ کەسدا ناکات."

ڕەجەوی هەموو شتێکیان لێ زەوت دەکات، تەنانەت سێکسیش، بۆ ئەوەی بیانکاتە مرۆڤگەلێکی جیاواز لەوانی تر. مرۆڤگەلێکی پڕ لە ڕق و بێ ئومێدی، کە ئامادەن هەرچییەک ئەو بیەوێت ئەنجامی بدەن. هەروەها بەردەوام یەک شتیان بۆ دووبارە دەکرایەوە: تۆ بەبێ ڕێکخراوەکە و بەبێ ڕەجەوی هیچ نیت. هەوڵ دەدەن هەموو کەسێک وەک یەک لێ بکەن. بەم شێوەیەش کارەکانیان سەر دەگرێت. سامیتی پوور دەڵێت " کاتی جلەکانی خۆم وەرگرت، زۆر خۆشحاڵ بووم. جلەکانم ماچ کرد و پێم وابوو ئەمانە جلی ئەو شەڕوانانەن لە پێناو سەربەخۆییدا گیان دەبەخشن. من ئەو جۆرە کەسە بووم."

کە سامیتی پوور نامەیەک بۆ ڕەجەوی دەنووسێت و پێی دەڵێ تۆم خۆش دەوێت، ئەو کاتە موجاهیدین دەزانێت سامیتی پوور ئامادەیە بۆ کارکردن. پاشان مەشقێکی سەرەتاییی سەربازی لە کەمپی ئەشرەفدا پێ دەکەن و دواتر دەچێتە بەسرە و بەغدا. گرووپێکی بچووکی پێنج کەسی، دواتر دوو کەسی دەتوانن چەندین هێرش بکەنە سەر ئێران. سامیتی پوور وەک نیشانەنگێو ڕاهێنرا بوو و دەبوایە دوو کەس لە نێو ئێراندا بکوژێت، ئەوانیش: بەڕێوەبەری پۆلیس و سەرنووسیاری ڕۆژنامەی کەیهان. "منیش پێم وابوو ئەو دوو کەسە شایەنی مردنن."

ئەم ئاراشەی بەهیچ شێوەیەک لەو ئاراشە گەنجەی ئەمەریکا ناچێت کە شیعرێکی لە کۆوارێکی ئەمەریکاییدا بڵاو کردەوە. بەڕەقی دەڵێت "من وا نەبووم، من هەرگیز بیرم لەوە نەکردووەتەوە بتوانم یەکێک بکوژم یان باوەڕم بەوە بێت بتوانم ئەم کارە بکەم. من مرۆڤێکی زۆر ئاسایی بووم. تەنانەت لە قوتابخانەشدا جارێک لە جاران بەشەڕ نەهاتووم. بەڵام ئامێری مێشک شووشتنەوە باش کاری خۆی کرد. منیان گۆڕی بۆ ئەو کەسەی خۆیان دەیانەوێت. من بەراوردی خۆم دەکەم لەگەڵ ئەو کەسانەی لە پاڵ هێرشی ١١ی سێپتێمبەردا بوون، هەروەها خۆشمان (ئەندامانی

موجاهیدینی خەلق) بەراورد دەکەم لەگەڵ ئەواندا: هەمان سیستەمە."

ئەو سیستەمانە ئیمان بەخراپی بەکار دەهێنن، ئاراش دەڵێت ڕەجەوی سەرکردەیەکی ڕوحانییە، خەلیفەی خوایە لەسەر زەویدا. ئەو موجاهیدانەی لە ئەرکەکانی دژی ئێراندا دەمرن، بەشەهیدی ئیمان دادەنرێن، بۆ ئامانجی گشتی کە ئەویش لادانی ڕێژیمی ئێرانە و بەپیرۆز ناوزەد دەکرێن.

سامیتی پوور دەڵێت "دایکم جۆرە ئیسلامێکی تری فێر کردووم. ئیسلامی من نوێژ ناکات، بەڕۆژوو نابێت و ناچێتە مەککە. ئیسلامی من یارمەتیی ئەوانی تر دەدات. هیچ جیاوازییەک نابینم لە نێوان ئەوەی ڕەجەوی ئیسلام بەهەڵە بەکار دەهێنێت و هەروەها ئەو ڕێگەیەش کە ئوسامە بن لادن بەکاری دەهێنێت بۆ ناوزڕاندنی ئیسلام. هەردووکیان دەڵێن ئەمە ئیسلامە، هیچ ڕێگەیەکی تر نییە. تاکە جیاوازی لە نێوانیاندا ئەوەیە بن لادن سوننییە و ڕەجەوی شیعییە."

سامیتی پوور تاکە کەس نییە ئەو بەراوردە بکات. گەلێ لە کۆنە ئەندامانی موجاهیدین خاڵی وێکچوون بەدی دەکەن لەگەڵ ڕادیکاڵە گەنجەکان لە نێو ئەو گرووپە سوننییانەی دەستیان هەیە لەگەڵ تۆڕی قاعیدەدا. پرسیارەکە ئەوەیە، ئاخۆ خاڵە هاوبەشەکان دەچنە ئەودیو ئامانجی گشتی "شەڕ لە پێناو خوا" کە موجاهیدینی خەلقی شیعی و ئوسامەی سوننی هەیانە. لە گەلێ هەوڵدا بۆ تێگەیشتن لەوەی چۆن یەکێکی وەک ئاراش سامیتی پوور و نەدا حەسەنی هان دراون ژیانی خۆیان لە پێناو ڕێکخراوێک یان سەرکردەیەکدا ببەخشن. هەروەها سەرنجی ئەو کەسانەشم داوە کە پێوەندییان بەهێزەکانی گرووپە موسڵمانە ڕادیکاڵەکانەوە کردووە، یەکسەر تێبینیی ژمارەیەک خاڵی هاوبەشم لە نێوان ئەوان و موجاهیدینی خەلقدا کردووە. بۆ نموونە، ڕێگەی پەیداکردنی ئەندام، سیستەمی هێواشی تەنیایی و چەند جارەکردنەوەی یەک ڕاستی، تا دەگەیتە ئەو خاڵەی تۆ لێیەوە باوەڕیان پێ دەهێنیت. ئەوەی دەمهەژێنێت ئەوەیە ئەو سیستەمە تەنیا کار لەو کەسانە ناکات لەو ڕێکخراوە نزیکن، وەک منداڵانی موجاهیدەکان یان لە دۆخی قاعیدەدا، ئەو گەنجانەی لە ژینگەیەکی تەواو سوننی گەورە بوونە. بگرە ئەو سیستەمە کار لە کەسانی دەرەوەی ڕێکخراوەکەش دەکات، وەک یەکێکی عەلمانی لە

جۆری ئاراش سامیتی پوور و ئەوانی تری نێو ئەم کتێبە و ڕۆئاواییەکانی وەک ریچارد ڕێید و پیاوێکی بەریتانی کە پێڵاوەکانی بۆمبڕێژ دەکات لە پاریسەوە بەباڵەفڕ دەچێت بۆ مایامی، یاخۆ یەکێکی وەک جۆن ووکەر لیندی، ئەو ئەمەریکاییە مەسیحییەی دەبێتە موسڵمان و مەشقی پێ دەکرێت لە کەمپی موسڵمانە توندڕەوەکان لە ئەفغانستاندا.

کاتی هەندێ لە ڕاپۆرتەکانی دەزگای هەواڵگریی هۆڵەندیم خوێندەوە و بیریشم لەوە دەکردەوە، چەندین خاڵی هاوبەشم بۆ ڕوون بووەوە، وەک: لە پەیداکردنی ئەندام بۆ جیهاد لە هۆڵەندا، لە ڕووداوەوە بۆ ئارەزوو لە مانگی دوازدەی ساڵی ٢٠٠٢، کەمپەکانی پەنابەریش بەشوێنی شیاو دانراون بۆ پەیداکردنی ئەندام بۆ گرووپە سوننییە ڕادیکاڵەکان. یەکسەر بیرم بۆ موجاهیدینی خەلق چوو، کە چەندین ئەندامیان لە نێو کەمپی پەنابەران لە ئەوروپادا دەست کەوتووە.

لە نموونەی ئاراش سامیتی پوورەوە ئەوە دەردەکەوێت کە دووەم وەچەی کۆچبەران لە تەمەنی هەرزەکاریاندا زۆر هەستیارن، بەخێرایی و بەئاسانی مێشکیان دەشۆرێت بۆ ئەم جۆرە ڕێکخراوانە. دەزگای هەواڵگریی هۆڵەندی دەگاتە ئەو ئەنجامەی هەمان ڕێگە ڕاستە بۆ جیهادییەکان، ئەو موسڵمانە ڕادیکاڵییانەی حەز دەکەن بمرن لە پێناو باوەڕەکەیاندا. نەک هەر تەنیا بەهۆی تەمەنەکەیانەوە بەئاسانی هەڵدەخەڵەتێن، بگرە بەبیروباوەڕێکی قووڵەوە دەکەونە نێو شەڕەوە، هەروەها کاریگەریی دروستی باوان و ڕێکخراوەکان لەسەر ڕەفتاریان تا ڕادەیەک ڕۆڵی هەیە لە جۆشیان بۆ کارەکە."

باوانی سامیتی پووریش وا پێ دەچێت نەیانتوانیبێت زۆر دژی ئەو پاڵەپەستۆیەی موجاهیدین بووەستنەوە، لەبەرئەوەی نازانن بەشێوەیەک دژی ئەو پاڵەپەستۆیە بووەستنەوە کە موجاهیدین دەیکاتە سەر کوڕەکەیان. هیچ بیرۆکەیەکی ڕوونیان نییە لە بارەی ئەوەی کوڕەکەیان بەتەواوی چی دەکات. هەمان شت ڕاستە بۆ گەلێ لەو باوانە پەنابەرانەی کە منداڵەکانیان بەرەو گرووپە موسڵمانە ڕادیکاڵەکان دەچن.

پێم وانییە ئەم کێشەیە تەنیا بۆ دایک و باوکانە. دەزگای هەواڵگریی هۆڵەندا AIVD ڕوونی دەکاتەوە کەوا کۆمەڵگە ئیسلامییەکانی نێو هۆڵەندا هەموو جار

ناتوانن درک بەجدییەت و سروشتی گرفتەکە بکەن. هەمان شت بۆ کۆمەڵگە ئێرانییەکانی تاراوگە ڕاستە، کە زۆر جار زۆر کەم شت دەزانن لە بارەی پێشینەی موجاهیدین و ڕێگە بەخۆیان دەدەن زۆر بەسانایی دەسخەڕۆ بکرێن لە لایەن سەتەلایەتەکانی ئەو ڕێکخراوانەوە. سەرەڕای ئەوەش، زۆربەی ئەوانەی لە تاراوگەن دەتوانن بگەنە ئامانجی سیاسیی ڕێکخراوەکە، ئەویش ڕقێکی زۆرە لە ڕێژیمی ئێران. بۆیە ئەگەر ئەو ڕێکخراوە هەوڵی دا مێشکی منداڵی یەکێک لەمانە بشوات، ئەوا ناتوانن وا بەئاسانی دەنگیان هەڵبڕن و بڵێن واز لە منداڵەکانمان بێنن!

بۆچی خەڵک ڕێگە بەخۆیان دەدەن بەئاسانی لە لایەن گرووپ و ڕێچکە ڕادیکاڵەکانەوە بکرێنە ئەندام؟ زۆر جار کۆمەڵناسەکان دەگەنە ئەو ئەنجامەی کە ئەو کەسانەی کەمترین شتیان هەیە بیدۆڕێنن، ئاسانترین نێچیرن بۆ ئەو ڕێکخراوانەی وەک موجاهیدینی خەلق. من پێم وایە دەتوانی چەندین گرووپی موسڵمانی ڕادیکاڵی پۆلێن بکەیت کە هەمان ڕێچکە و ڕێبازیان هەیە بۆ مێشک شووشتن. ئەو کەسانە نێچیرن چونکە هیچ دەسکەوتێکی کۆمەڵایەتی یان ئابوورییان نییە، چونکە وا هەست دەکەن ڕیسوا و بێ کەسن و داهاتوویان لێڵ و شێواوە. یان لەبەرئەوەی بێزار بوونە لە ڕێژیمی سیاسیی وڵاتەکەیان، هەروەک پسپۆڕی ئەمەریکایی لە بواری تیرۆر بەناوی جێسیکا ستێرن لەم بارەیەوە شت دەنووسێت. بەڵام لە هەمان کاتیشدا جیهانی مۆدێرن خۆیشی یەکێکە لە هۆکارەکانی ئەمە، ئەویش لەبەر نەهێشتنی هەڵبژاردنی شتەکان و نەبوونی دڵنیایی. ئەو گەنجانەی بەدوای سەقامگیریدا دەگەڕێن دواجار خۆیان لە نێو ئەو گرووپانەدا دەبینییەوە کە دەتوانن دڵنیاییان پێ ببەخشن لە فۆرمی چەند یاسا و دیسپلینێکی سەربازی و کۆت و زنجیر کراودا.

دەزگای زانیاریی هۆڵەندی دەگاتە هەمان ئەنجام لە نێو پرۆفایلەکانی مێشک شووشتنی هۆڵەندییەکان. بۆ گەورەترین گرووپ، پەنابەرە گەنجەکان لە وەچەی دووەم و سێیەمدا، دۆخێکە کە بەپێی دەزگای زانیاری، بۆ ئەو گەنجانە بەدوای ناسنامەیاندا دەگەڕێن. گازاندە لە کۆمەڵگەی هۆڵەندی دەکەن ڕێزیان لێ نانێن لە ڕووی ئاین و ئیتنییەوە، هەروەها ئەوانەش لە لایەن دایک و باوکیانەوە لە بیر کراون. شەڕوانە ئیسلامییەکانی پێشوو کە پسپۆڕن لە پرۆسەی پەیداکردنی ئەندام و

مێشک شووشتن هەستێکی بەرز دەبەخشن بەگەنجەکان، وایان لێ دەکەن خۆیان بێنە ناو پرسەکە و هەستی برایەتی و زانینی ناسنامەیان پێ ببەخشن. ئەوانیش وا هەست دەکەن بەشێکن لە شەڕی نێوان باشە و خراپەدا، ڕێگەیان پێ نیشان دەدات و وەڵامی پرسیارە وجودییەکانیان دەداتەوە کە بەدوایدا وێڵن.

ئاخۆ ئەمە هەمان دۆخە بۆ موجاهیدینی خەلق کاتێ ئەندام پەیدا دەکەن، ئەندامێکی وەک ئاراش سامیتی پوور؟

بێگومان هەمان دۆخ و هەمان ڕێگەیە. سامیتی پووریش گومانی لە ناسنامەی خۆی هەیە لەبەر زۆریی گەشتکردنی دایک و باوکی. ئەو کوڕە لە چەندین وڵاتدا ژیاوە. ئێستا سەر بەچ وڵات و قەوارەیەکە؟ دەیەوێت بگەڕێتەوە ئێران، بەڵام ئەمە مەحاڵە چونکە دەبێ بچێتە ڕیزەکانی سوپای ئێران و خزمەت پێشکێش بکات. هەروەها ئەو ڕێژیمەش کە لە ئێران هەیە سەرنجی ئەو ڕاناکێشێ. لە ئەمەریکا دەژیت، ئینگلیزییەکی باش دەزانێت بەڵام بەوڵاتی خۆی نازانێت، ئەمە زۆر بەڕوونی دیارە کاتێ یانەیەکی فارسی دادەمەزرێنێت.

ئەو یەکێکە لەو موجاهیدانەی لەو چەند دەیەی ڕابردوودا مێشکی شۆردرا و چووە ڕیزەکانی موجاهیدینەوە، بەڵام ناکرێ سیمبۆلی بەسەدان گەنج بێت. چیرۆکی یاسر عیزەتیش لە چیرۆکی سامیتی پوور زۆر جیاوازە. بەڵام یەک شت هەیە هەردوو کوڕ هاوبەشن تیایدا لەگەڵ هەموو ئەوانی تر، ئەویش ئەوەیە ئەوان بەدوای ناسنامە و ڕێز و پلە و پایەدا دەگەڕێن، هەروەها لەبەرئەوەی ئەوان لە یەک ڕێگەدان، بەئاسانی لە لایەن ڕێکخراوە ڕادیکاڵەکانەوە بەئاسانی مێشکیان دەشۆردرێت و دەچنە نێو کارەکەوە.

چەندین لێکۆڵینەوەی تر هەیە لەسەر پرۆسەی پەیداکردنی ئەندام لە لایەن موسڵمانە ڕادیکاڵەکان ئەنجام دراون، وەک پرۆسەی موجاهیدینی خەلق. بەحوکمی چەند خاڵێکی هاوبەش، زیاتر بەدوای وەڵامدا گەڕام بۆ ئەو پرسیارەم: بۆچی خەڵک ڕێگە بەخۆیان دەدەن لە لایەن ئەو گرووپە ڕادیکاڵییانەوە زەوت بکرێن و تێکوپێک بشکێنرێن؟

لەو گفتوگۆیانەی پسپۆڕی تیرۆر جێسیکا ستێرن لەگەڵ موسڵمانە ڕادیکاڵەکاندا

بەدیار دەکەوێت بۆچی ئەو کەسانە پێوەندی بەو جۆرە گرووپانەوە دەکەن. وێڕای هۆکاری ئایدیۆلۆجی، چەندین هۆکاری تر هەن، وەک ئەو برادەر و برا و خوشکانەی بوونەتە ئەندام، بوونە ئەندام لە گرووپێکی سەربازیدا، یان هێزی سەرنجڕاکێشانی ژیانێک لە دەرەوەی کۆمەڵگەیەکی ئاسایی، یان هێزی سەرنجڕاکێشانی چەکەکان، یان ئەو بێهێزانەی کە دەیانەوێت هەست بەبەهێزی بکەن. ستێرن هەموو ئەو هۆکارانە بەم شێوەیە کورت دەکاتەوە " خۆشی، قازانج، هێز، ئیمتیاز، هاوڕێیەتی و پارە." زۆر کەس مێشکی تێک دەدرێت بەهۆی دڵنیایی لە ژیان بەڕێگەیەکی ئاینی، ئەو گرووپانەش ئەو دڵنیاییە پێشکێش بەو ساویلکانە دەکەن. پاش ئەمانەش پاڵپەستۆیەکی گەورەی کۆمەڵایەتی هەیە: هەموو کەسێک هەرەوەزە، تۆ ناتوانی لە پشتەوە بمێنیتەوە. یان: تۆ دەبێ تۆڵەی براکەت، خوشکەکەت یان باوکت بکەیتەوە.

لەبەرئەوەی تۆڵە بۆ گرووپە موسڵمانە ڕادیکاڵییەکان و بۆ موجاهیدینیش چەکێکی بەهێزە. سەرکردەیەکی حەماس بۆ جێسیکا ستێرن دەدوێت و دەڵێت " ئیسلام دەڵێت چاو بەچاو. ئێمە باوەڕمان بە تۆڵەکردنەوەیە. گەر یەکێک لە جیهاد بمرێت، ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی خۆشە." گەنجێکی ئێرانی بەناوی نەسرین دادخان لە کاتی سەردانێکی بۆ باوکی لە کەمپی ئەشرەف پێی دەوترێت ڕەنگە کەمێک دوا بکەوێت، بەڵام ئەمە هەرگیز درەنگ نییە ئێستا تۆڵەی مردنی دایکی بکاتەوە کە لە لایەن ئێرانییەکان لە سێدار درا. ئەو ڕقەی هەستی ئێمە و ئەوانی بەهێز کرد زۆر گرینگە بۆ ناسینی ئەو جۆرە گرووپانە.

پارە وەک پاڵنەر و هاندەرێک، وەک ستێرن باسی لێ دەکات، ڕۆڵێکی وەها گرینگ ناگێڕێت لە نێو موجاهیدین بۆ پەیداکردنی ئەندام چونکە لە چینی هەژارەوە نەهاتوون، بەڵام لە نێو گرووپە موسڵمانە ڕادیکاڵەکان پارە ڕۆڵێکی کاریگەری هەیە بۆ ئەندامان چونکە زۆربەیان لە چینێکی هەژارەوە دێن. بەڵام ڕێکخراوە تیرۆریستییە ئیسلامییەکان وەک بەشێک لە کادرەکانی خۆیان ئەندام پەیدا دەکەن، نەک لە بەشێکی ناگرینگ، لە چینی ناوەڕاست، کە هەموو ئەمانە لە نێو کۆچبەران و ئەوانەی گەڕاونەتەوە ماڵی خۆیان پەیدا دەبن، هەروەها ناڕازیبوون و سەر لێشێوان دوو هۆکاری بەپێتن بۆ چوونە نێو ئەو ڕێکخراوانەوە. هەروەک لە نێو موجاهیدیندا،

پارە ڕۆڵێکی سەرەکی نابینێت لە کاتی پەیداکردنی ئەندامدا، بەڵام ڕۆڵێکی زۆر گەورەی هەیە دوای پەیداکردنی ئەندام.

ستێرن دەگاتە ئەو ئەنجامەی موسڵمانە ڕادیکاڵەکان بۆ نموونە لە پاکستان و ئەندەنووسیا، کە پایەی بەڕێوەبردن و هەڵسوڕاندنیان هەیە لە ڕێکخراوەکانی خۆیاندا، مووچەکەیان یەکسانە یان زیاترە لەو کارەی ڕۆژانە لە نێو کۆمەڵگەدا دەیکەن. لەبەر هەندێش بەپەرۆش نین بۆ هەبوونی کارێکی ئاسایی لە ژیانی خۆیاندا. لە کاتێکدا نووسینگەکانیان دەکەوێتە گەڕەکێکی هەژارنشین و پیس و تۆزاوی، بەڵام سەرکردەکان لە خۆشترین ژیاندا دەژین، ئەمەش زیاتر سەرنجی یاوەرەکانیان ڕادەکێشێت. مەسعود و مریەم ڕەچەوی لەم بارەیەوە شتێکی کەمتر و خراپتر ناکەن لەچاو سەرکردە موسڵمانەکان تر: چەنیدن خانووی جوانیان هەیە، گرانبەهاترین جلوبەرگ دەپۆشن و باشترین خواردن دەخۆن.

لەگەڵ ئەوەشدا بەراوردکردنەکە ئا لەوێدایە، کاتی گەنجە موسڵمانەکان چاو دەبڕنە بەخشیشی گەورەتر لەوە، ئەویش کاتێ خۆیان دەتەقێننەوە پارەیەکی زۆر دەدرێت بەخێزانەکانیان لە لایەن ڕێکخراوەکەیانەوە. ئەمە هۆکارێکی گرینگە بۆ حەزی هەژاران و دایک و باوکی نەخوێندەوار چونکە بەمە هەڵدەخەڵەتێن: " منداڵەکەیان پێشکێشی خوا دەکەن." موجاهیدەکان هەموو پارەی خۆیان دەبەخشن بەڕێکخراوەکە و دواتر خێزانەکانیان دەرۆزە دەکەن بۆ پارەی زیاتر. کەس لەو کەسە دەوڵەمەندتر و باشتر نییە وەک شەهیدێک دەمرێت. ئەوە تەنیا ڕێکخراوەکەیە قازانج دەکات: مردنی ئەوان دووپاتکردنەوەی ئایدیۆلۆژەکانی ڕێکخراوەکەیە، دووپاتکردنەوەی ڕق و کینەیانە لە ڕێژیمی ئێرانی. سەبارەت بەموسڵمانە ڕادیکاڵەکان ڕق لە دژی بێ باوەڕەکان بەکار دێت، یان ئەوەتا لە دژی ڕێژیمە گەندەڵەکەیان یانیش لە دژی ڕۆئاواییەکان.

من وای بۆ دەچم ئەوانەی کاریان پەیداکردنی ئەندامە، هەر لە سەرتاوە پلان و بەرنامەیان بۆ هەموو ساویلکەیەکی نوێ هەیە، چونکە هەم گرووپە موسڵمانەکان و هەمیش موجاهیدینی خەلق ئەندامی پیشە جیاجیا کۆ دەکەنەوە. هەموو کەس نابێتە سەرباز و هەموو کەسیش مەرج نییە شەهید بێت. ڕێکخراو پێویستی بەخەڵکی هەیە

کاره ئاساییەکان بەڕێوە ببەن، ببنە سەرکردە و مەشق بەوانی تر بکەن، خەڵکیان پێویستە بۆ زانیاریی نهێنی و هەتا پێویستیان بەچێشتلێنەر و خزمەتگوزاریش هەیە: خۆ ئەوانە خۆیان ناتەقێننەوە. ئەوەی ئەو هەموو ڕێکخراوە پێکەوە دەبەستێتەوە ئەوەیە هەموویان دڵسۆزن بۆ سەرکردەکەیان یان بۆ ئامانجێک، کە مەسعود خودابەندە ناو لەو ئامانجە دەنێت "وێرانکردن"، لە کاتێکدا ستێرن ناوی لێ دەنێت "ڕیسوایی".

ئەو گەنجە تۆقیوانەی ڕێژیمی ئێران ئەندامێکی خێزانیانی کوشتووە هاتوونەتە نێو موجاهیدینی خەلقەوە، هەروەها ئەوانەشی ناتوانن بەشداریی ژیانی سیاسیی ئێران بکەن لەبەر ڕێژیمەکانی شا و خومەینی، ئەوانیش هاتوونەتە نێو موجاهیدینەوە. لە فەلەستین، هەروەها لە شوێنەکانی تری جیهانی عەرەب، ڕیسوابوونی دانیشتوان بەگشتی ڕۆڵێکی گرینگ دەگێڕێت لە گەشەکردنی گرووپە موسڵمانە ڕادیکاڵەکان. ڕیسوابوون و سووکایەتی پێکردن لە لایەن داگیرکەرێکەوە، وەک ئەوەی لە فەلەستین، یاخۆ لە لایەن ڕێژیمێکی دەسەڵاتدار، ڕیسوابوون و سووکایەتی پێکردن بەهۆی هەژاری و بژاردەیەکی دەوڵەمەند، ئەمانە هەمووی دەبنە هۆی ئەوەی خەڵک ڕوو لەو ڕێکخراوانە بکەن. بەگشتی، دەتوانی بگەیتە ئەو ئەنجامەی کەوا کێش و نارەزاییی ئەو جۆرە گرووپە تیرۆریستیانە، پاڵنەرە خوێنەویستەکانیان، هەندێ جار زۆر زیادەڕۆییی تێدایە، بەڵام هەمیشە ڕەگی لە ڕاستیدا ڕوواوە.

خەڵک لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا بەردەوام هەست بەسووکی و ڕیسوایی دەکەن چونکە ڕۆئاوا هەرێمەکەیانی دابەش کردووە بۆ سەر چەند دەوڵەتێکی جیاواز، هەروەها ئیسلامی سیاسیش ئەم ڕاستییە بەکار دێنێت بۆ سوود و مەرامی خۆی. بیرمەندێکی گرینگ لە دنیای ئەمڕۆی ئیسلامی سیاسیدا، کە کاریگەرییەکی زۆریشی هەبوو لەسەر ئوسامە بن لادن، بریتییە لە عەبدوڵڵا عەزامی فەلەستینی، کە جارجار خەڵکی دووبارە دەگەڕێنێتەوە لای ئەو کارانە کاتێ بانگەوازی جیهاد ڕادەهێڵێ. من ئەم حاڵەتە بۆ سەر موجاهیدەکان وەردەگێڕم: ڕیسوابوون سووکبوونی گرووپێکە چەندین کەسیان لە دەست داوە و خۆشیان توانیویانە هەڵبێن

لە ژێر دەستی شا و جارێکی تر گیریان خواردەوە بەدەستی ڕژێمەکەی خومەینی.

لە کتێبی "ئۆبسێرڤەر جۆرنالیست" کە جەیسن بێرک لەسەر قاعیدە نووسیویەتی، فایلێکی ترم لەسەر موسڵمانی تیرۆریست دۆزییەوە، بێرک دووپاتی دەکاتەوە موسڵمان تیرۆرست نین بگرە موسڵمانی تیرۆریست دروست دەکرێت. بێرک دەڵێ "ڕێگە بەرەو تیرۆر بەو هەستە دەست پێ دەکات کە شتێک هەڵەیە و دەبێ ڕاست بکرێتەوە." بێرک لە لایەک چالاکە ڕۆشنبیرەکان ناو دەبات کە بەهۆی بێئومێدی و ڕقیان لە حکوومەتەکەیان لەوەی چەندین بەڵێنیان جێبەجێ نەکردووە، ملی ئەو ڕێگەیە دەگرن. لە لایەکی تریشەوە ناوی ئەو نەوەیە دەبات لە کۆتاییی نەوەتەکاندا سەری هەڵدا، بەڵام گەندە ڕادیکاڵەکان بوونە ئیسلامێکی بنەڕەتی و میللی.

من دەتوانم بێ ماندووبوون ئەمە لەسەر موجاهیدینی خەلق جێبەجێ بکەم. لەوێش تێکەڵەیەک لە ڕۆشنبیران دەبینی، زۆربەیان پسپۆڕن لە بواری تەکنۆلۆجیا، کەمێکیان نەبێت ئاستی زانستیان نزمە، دەگەڕێن بەدوای ڕادیکاڵێک بەڵام لە سەرووی هەموویان لە ڕەوشێکی سادەدا، یان ڕەوشێک ئەوان بەئاسانی تێی نەگەن، بەڵام ئەمە لە هەر حالەتێکدا دەبێ بەرەو ئامانجێکی سادە بچێت دواتر بتوانن بەئاسانی پاڵپشتی بکەن. ئامانجی موجاهیدینی خەلق بریتییە لە ئێرانێکی ڕزگار لەگەڵ ژیانێکی باشتر بۆ ژن و منداڵ، بەڵام ئامانجی گرووپە ئیسلامییە تیرۆریستەکان بریتییە لە جیهانێک تیایدا ئیسلام سەنگی مەحەک بێت و هەموو بێدادییەکان بسڕێتەوە.

بێرک نموونەیەک لەسەر ئەوە دەهێنێتەوە چۆن کوڕێکی پاکستانیی تەمەن ١٧ ساڵ لە چینێکی هەژار دەبێتە تیرۆریست. ئەو کوڕە هەست دەکات لە نێوان بەرداشی مەلاکان و کەناڵە مۆزیکییە ڕۆژئاواییەکاندایە وەک ئێم تی ڤی. "ئەگەر حەزەکانی پەسند بکات و بیەوێت ببێتە بەشێک لە جیهانی ڕۆژئاوا، ئەوا دەبێ ئەو ڕاستییە بزانێت هەرگیز ناگاتە ئەو خۆشییانە ئەگەر جێگرەوەیەکی نەبێت، شێوەیەکی نیو هێندەی ژیانی ڕۆژئاوایی کە هاوتەمەنەکەی هەیەتی لە لەندەن یان لە لۆس ئەنجلۆس. جلەکانی هەرگیز وەک هی ئەوانی لێ نایەت. هەرگیز ڕەنگی پێستی وەک هی ئەوانی لێ نایەت و دەرفەتیشی بۆ سێکس پێش ژنهێنان قەت بۆ ڕێک

ناکەوێت. جێگرەوەکەش ئەوەیە هەموو شتێک سەرکۆنە بکات و ڕەتیان بکاتەوە کە پێوەندییان بەڕۆئاواوە هەیە، ئەمەش لە بەرژەوەندی ئیسلامێکی ڕادیکاڵی بەهێز و تۆکمەدایە."

پرسەکە لێرەدا ئەوەیە جیاکارییەکانی خۆت لە پشتەوە بەجێ بهێڵیت بەهۆی بەرزکردنەوەی خۆت لە سەرووی هەموو ئەو شتانەوە. هەروەک چۆن موسڵمانە ڕادیکاڵەکان خۆیان لەپێشتر دەزانن لەچاو بێ باوەڕەکان، موجاهیدینی خەلق وا دەزانن ئەوان لە سەرووی هەموو ئێرانییەکانی ترەوەن. ئەوەندە هەست بەگەورەیی دەکەن قسە لەگەڵ کەسدا ناکەن. ئەمەیە دڵنیابوونی ئەوان کەوا بەرەو کوێی بردوون، وەک دڵنیابوونی مەسعود ڕەجەوی کە بەسەرکردەی ڕۆحانی خۆیانی دەزانن، وا دەزانن ڕەجەوی پتر بەرەو لای خوایان دەبات.

بێرک وەسفی ئەوە دەکات: چۆن گەنجێکی عەلمانیی کورد لە باکوری عێراق گەورە بووە، ئەو گەنجە بەڵگەنامەی هەیە کەچی تا ئێستا دانەمەزراوە و بێکارە، کاتی خۆی لە مزگەوت بەسەر دەبات. دواجار گەرموگوڕی و هاوڕێی نوێ سەرنجی ڕادەکێشن. ئەو گەنجە کوردە داوەت دەکرێت بۆ لێکۆڵینەوەیەکی بەگرووپ و لەوێ گوێی لە چەندین مەزەبی بیرمەندی ڕادیکاڵی دەبێت و پێیان ئاشنا دەبێت. ئەمە خۆشە: قورئانی پیرۆز لە پێشی دادەنێن و کەمێکی لێ تێ دەگات. پاشان ئاشنا دەکرێت بەو گەنجانەی تر کە باوەڕیان بەشیکردنەوە و لێکدانەوەی ڕادیکاڵییانەی ئیسلام هەیە. ئەو گەنجە کوردە هەست دەکات هەموو پێشوازیی لێ دەکەن و ئاسوودە دەبێت، ئەوجا کوڕەکە دەڵێت "ئێمە وامان هەست دەکرد دەتوانین شتەکان بگۆڕین. ئێمە دەمانتوانی هەموو شتێک ڕاست بکەینەوە لە نێو نیشتمانەکەماندا. ئەوەی ئوسامە و مامۆستاکانم وتیان ڕاست دەرچوو. ئەگەر هەر کەسێک ئەوە بکات لە نێو قورئاندا نووسراوە، هەموو شتێک ڕاست و دروست دەبێت. ئەوە تەنیا بێباوەڕەکان بوون لە نێو حکوومەت ئەمەیان وەستاندبوو، هەروەها هاوکارەکانی ئەمانە لە نێو جوولەکە و خاچپەرستەکاندا. ئێمە دەبێ دژی هەموو ئەوانە بوەستینەوە و شەڕ بکەین." ئەو کوڕە کوردە دەچێتە نێو بنکەیەکی پۆلیس و ئێلەگێکی پڕ لە تەقەمەنی لەبەر دەکات. بەڵام پێش ئەوەی خۆی بتەقێنێتەوە دەتوانن بیگرن.

ئەو گەرموگوڕییە، ئەو هاوڕێیەتییە و ئەو دڵنیابوونەی کە تۆ دەتوانی شتێک ڕاست بکەیتەوە، کاری خۆی کرد و چووە سەر. سەیری چیرۆکی ئاراش سامیتی پوور بکە، چۆن دەچێتە نێو ئەو شوێنە. ئەوانەی ئەندام پەیدا دەکەن دەزانن چۆن قسە لەگەڵ گەنجەکاندا بکەن. نزیکەی هەر هەمان شتیش بەسەر یاسر عیزەتیدا هات، ئەوەی کە ئەو نەیتوانی بەهیچ شێوەیەک تێ بگات. دوای چەند ساڵێک لە نێو خێزانی تر و ژیان لە نێو هەتیوخانەدا، ئافرەتێک هەیە گەرمیی پێ دەبەخشێت، وەک گەورەیەک مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و باوەڕی نوێی پێشکێش دەکات، ئەویش: شەڕ لە پێناو کۆمەڵگەیەکی نموونەیی لە نێو خاک و نیشتمانی خۆتدا. تەنیا بەماوەی دوو ڕۆژ دەبێتە موڵکی ئەوان و دەچێتە ژێر ڕکێفیان. لە ئێران هەر هەمان ئەو پرۆسانە ڕوو دەدەنەوە. گەنجە ئێرانییەکانیش زۆر بێهێزن و بەئاسانی دەست دەدەن بەمەزەبکردن لە لایەکی ڕادیکاڵییەوە. بیر لەو هەڵکەوتە دەکەمەوە کە میلیشیا ڕادیکاڵەکان ئێستاش دەتوانن ئەندامی نوێی تێدا پەیدا بکەن، هەرچەندە ماوەی چەند ساڵە کپ و بێدەنگ وەستاون بەهۆی پاڵەپەستۆی چاکخوازەکانەوە.

وەسفەکانی بێرک لە بارەی ئەوەی چی بەسەر گەنجە موسڵمانە سوننەکاندا دێت، یارمەتیم دەدات ئەوە شی بکەمەوە بۆچی گەنجە ئێرانییە شیعەکان سەرنجیان بۆ لای ئاینی موجاهیدینی خەلق چوو. یەکەم شت، ڕێژیمی شا هەبوو بەهیچ شێوەیەک لایەنی ئۆپۆزسیۆنی پەسند نەدەکرد و هەژاریش ڕوو لە زیادبوون بوو. دوای شۆڕشی ١٩٧٩، حکوومەتێکی ئاینی هەیە ناتوانێت یان حەز ناکات ڕەگی ئەو خەم و نەهامەتییان بنبڕ بکات. بۆیە ئەمە ئایدیۆلۆجیایەکی بێ وێنەیە تیایدا مارکسیزم و ئیسلام دەست لە ناو دەستدا دەڕۆن، کە دەبێ بێدادییەکان بسڕنەوە و بەرەو کۆمەڵگەیەکی نموونەیی بەڕێ بکەون.

لە هەردوو گرووپدا، پەیداکەری کۆن کە کاریگەرییەکی گرینگی هەیە بەسەر قوتابییەکانی و ڕۆڵێکی باش دەگێڕێت. یەکێک زانیاریی هەبێت، بتوانێت سەیری شتەکان بکات، یەکێ ڕێز لە تۆ دەگرێت و لەبەر ئەو تۆ باوەڕ بەمە دەکەیت. بۆ نموونە، سوورییەکان لە گرووپی هۆفستادی هۆڵەندی گەنجە موسڵمانە ڕادیکاڵەکان کە لە کۆتاییی ساڵی ٢٠٠٤ لە لاهای دەستگیر کران، ئەم ڕۆڵەیان دەگێڕا. سەبارەت

بەئاراش سامیتی پوور، ئەندامێکی کارگێڕی لە واشنتۆنی پایەتەختی ئەمەریکا توانی مێشکی ئاراش تێک بدات و بیکاتە ئەندام، هەروەها ئەو کابرایە زۆر ڕێزی لە پیاو و ئافرەت دەگرت و دەیزانی چۆن وا لە ڕێکخراوەکە و ئامانجەکانی بکات زۆر جوان و سەرنجڕاکێش بن لە لای ئاراشدا، هەروەها توانی باوەڕی پێ بکات ئەو زانیارییانەی ئەو ئێستا لەسەر ئێران هەیەتی هیچ نین و زانیاریی خۆیان ڕاست و دروستن. سەبارەت بەیاسر عیزەتی، ئەو ئافرەتە تەنیا بەدوو ڕۆژ توانی لە خشتەی ببات و باوەڕی پێ بکات.

جەیسن بێرک تێبینیی ئەوەش دەکات کە پرۆسەی مێشک شووشتنی گەنج و پیاوی خەمناک بۆ نێو ئیسلامێکی چەکداری توندڕەو، زۆرجار لە قۆناغێکی هەستیاری ئەم پرۆسەیەدا، پیاوێکی بەتەمەن وەک ناوەندێک کار دەکات بۆ ئەوەی ڕوحی تۆڵە لە نێویاندا دروست بکات بۆ جیهاد و بیگۆڕێت بۆ کردار. ئەو کەسانە لە تەمەنی ٤٠ ساڵیدا دەبن کاتێ لە کەمپەکانی ئەفغانستان مەشقیان پێ کراوە، زۆر جار لە بۆسنیا و چیچانیش شەڕیان کردووە، زۆرجار مافی پەنابەرییان وەرگرتووە لە ڕۆئاوا و چوونەتە نێو حەرەمی کۆمەڵگەی ئیسلامی و لە نێو مزگەوتێکی ڕادیکاڵیدا ژیاون. بێرک دەگاتە ئەو ئەنجامەی هەندێ جار پەیداکردنی ئەندام زۆر ئاسانە، بەڵام لە لایەکی ترەوە، هەتا ئەگەر بەمەزەبکردنیش نەبێت، ئەو کەسەی پەیدای دەکەن ژیرانە و بەهۆشیاری و هێواشی ئامادەی دەکەن بۆ جێبەجێکردنی شتێک.

لە نێو موجاهیدیندا، ئەندامی تازە وەک هاوسۆزێک دەست بەپیشەکەی دەکات و پاشان وردە وردە بەرز دەکرێتەوە تا دەگاتە بەرزترین پلە لە نێو عێراق. بەرزکردنەوە واتە پاداشت وەردەگرن و بەشدار دەبن لە بەشێکی گرینگی کردەیەکدا. ئەندامە تازەکان دەیانەوێت بەڕاستی پاشگەز ببنەوە و بگەڕێنەوە. هەر بەرپرسیارییەتیەکی زیادە کە دەخرێتە ئەستۆیان، زیاتر چەسپیان دەکات بەڕێکخراوەکەوە، هەروەک لە چیرۆکی ئاراش سامیتی پووردا بۆمان ڕوون دەبێتەوە.

هەروەک لە قاعیدە، موجاهیدین و گرووپە تیرۆریستەکانی تر کاسێتی ڤیدیۆیی و وتار و ئازار و ئەشکەنجەدان ڕۆڵێکی گرینگیان هەیە لە پەیداکردنی ئەندامی تازەدا.

چونکە بەهۆی ئەمانەوە نیشانی دەدەن ڕێکخراوەکە بۆچی دامەزراوە و ئامانجی چییە.

هەروەها جیاکردنەوەی هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ باش سەری گرتووە. وا لە گەنجی بێئومێد و تێکشکاو دەکات هەموو وزە و توانای خۆی بۆ ئامانجێک یان ئامانجێکی هاوبەش تەرخان بکات کە لە لایەن ئەوانەوە لە ناخیدا چێنراوە. ئاراش و یاسر سەریان سوڕما کاتێ لە ئەشرەف لە ئافرەتان جیا کرانەوە، هەروەها لەو کچە گەنجانەش جیا کرانەوە کە لە ڕۆئاوا دەیانناسین. ئاراش و یاسر باسی بێئومێدی و نامۆیی ئەوانی تر دەکەن، بەڵام دوور نییە خۆشیان ئەم شتانەیان بەسەر هاتبێت. هەستی بێئومێدی و نامۆیی وای لە هەندێ گەنج کرد بوو خۆیان بتەقێننەوە تەنیا بۆ ئەوەی بگەن بە ٧٢ حۆرییەکەی بەهەشت، هەر بۆیە پێش ئەوەی هێرشە خۆکوژییەکە بکەن دەچوونە ئاودەست و کیر و گونیان پاک دەشووشت! ئەمە وای لە هەندێ موجاهیدین کرد ببن بەهۆمۆسێکسواڵ، کە یاسر عیزەتی زۆر لەم کارە دەترسا. کەواتە شەرمی ئەندامان لە ئەنجامدانی ئەم کارە، دەیکردن بەنێچیرێکی ئاسانتر بۆ موجاهیدین تا مێشکیان قۆرخ بکەن.

بیرۆکەی سەرەکی لە پەیداکردنی ئەندامی نوێدا ئەوەیە، ڕەنگە هیچ شتێک لە نێوان ئەندام و ڕێکخراوەکەدا ڕوو نەدات. یەکەم شت دوورەپەرێزخستن و تەنیاییە، پاشان دەیانخەنە نێو قاڵبێکی ڕادیکاڵی، پاشان دروشمیان لە مێشکدا دەچەقێنن. مەگەر دروشمێک وجودی هەبێت لە لای ئەوانەی ئەندام پەیدا دەکەن لە نێو گرووپە ڕادیکاڵەکاندا. ترسەکە دەکەوێتە یەکەم شوێن ئەویش خێزانە، کە نزکترین کەسن لە ئەندامە تازەکە و دەتوانێت کاریگەری هەبێت بەسەریاندا. واتە ئەگەر لە خێزانەکەیان دوور خرانەوە، ئەوا زۆر بەئاسانی پێوە دەبن.

ئاراش سامیتی پوور لە دایک و باوکی جیا دەکرێتەوە، هەروەها لە عێراق ناهێڵن هیچ جۆرە پێوەندییەکی هەبێت بەدایک و باوکیەوە. هەمیشە ئەوە بەئەندامەکان دەوترێت دەبێ خۆیان لە خێزانەکانیان و خۆشەویستانیان دوور بخەنەوە و جیا بکەنەوە بۆ ئەوەی بتوانن بەتەواوی خۆیان تەرخان بکەن بۆ ئامانجە سەرەکییەکە. هەتا بیرکردنەوە دەربارەی دایک و باوک و ئەندامانی ماڵەوە حەرامە، چونکە ئەوانە

دوورت دەخەنەوە لە ئامانجەکەت و ناپێکیت. بۆ ئەمەش، موجاهیدین بەتەواوی پشت بەسەرۆکەکەیان، مەسعود ڕەجەوی دەبەستن.

قاعیدە هەمان شت دەکات لە کاتی پەیداکردنی ئەندامدا: بەجۆرێک مێشکی ئەندامەکانیان تێک دەدەن واز لە خێزانەکانیان و خۆشەویستانیان بهێنن بۆ ئەوەی کارەکەیان بەباشی بکەن و بگەنە ئامانج. ڕاستت دەوێ، ئەوانەی ئەندام پەیدا دەکەن بەقوربانییەکانیان دەڵێن خێزانێکی نوێ و باشتریان دەست دەکەوێت: وەک ئەو گرووپەی خۆیان ئێستا بەشێکن تیایدا.

بەشێکی گرینگ لە پرۆسەی دوور خستنەوە لە ناسنامە و هەموو شتێکی خۆت وەرگرتنی ناوەکی نوێیە: موجاهیدەکان لە نێو ڕێکخراودا ناوێکی نوێ لە خۆیان دەنێن، زیاتر ئەو ناوانە هەڵدەبژێرن هی هاوڕێیەکیانە و لە خەباتدا مردووە، یان ناوی شەهیدێک. ئەندامانی تۆڕی قاعیدە کە بەشداری دەکەن لە کردەی خۆکوژیدا هەمان شت دەکەن. بۆ نموونە ناوی هاوەڵێکی پێغەمبەر (د. خ.) لە خۆیان دەنێن، هی ئەو کاتەی سەرەتا لە مەککە خەباتیان دەکرد لە دژی بێ باوەڕەکاندا. گرووپەکانی نێو تۆڕی قاعیدە وا لە ئەندامە تازەکان دەکەن دەست لە ژینگە و دەوروبەریان هەڵگرن، وایان لێ دەکەن تەنیا قورئانی پیرۆز بخوێنن و چی تر نا. هەندێکیان مووچە وەردەگرن و لەسەر ڕێکخراوەکە دەژین، بۆیە قەت واز لەو ڕێکخراوە ناهێنن چونکە ئەو مووچەیەی وەری دەگرن زۆر زیاترە لەوەی لە دەرەوە بەدەستیان دەکەوێت. لە کۆتاییدا زۆربەیان لە خوێندن دادەبڕێن: وەک ئەوەی بەسەر محەمەد عەتادا هات کە قوتابیی بەشی بیناسازی بوو لە هامبۆرگ، چونکە قاعیدە ئامادەی دەکرد بۆ هێرشەکەی ١١ی سێپتەمبەری ساڵی ٢٠٠١.

هەروەها لە نێو موجاهیدینی خەلقیشدا چەند حاڵەتێک هەیە لە خوێندن دابڕوان و تەنانەت ڕێگەیان پێ نەدراوە پسپۆڕییەکەیان جێبەجێ بکەن. هەمان شت ڕاستە بۆ جەنگاوەرە موسڵمانەکان. لەبەر هەموو ئەم هۆیانەیە، گەڕانەوە بۆ کۆمەڵگە و ژیانی ئاسایی زۆر زەحمەتە.

تۆ ناتوانی بەهیچ شێوەیەک قاعیدە لەگەڵ موجاهیدینی خەلق لە هەموو خاڵەکاندا بەراورد بکەیت. وێڕای خاڵە هاوبەشەکانیان، چەندین خاڵی جیاوازیشیان هەیە.

گرینگترین جیاوازی ئەمەیە، قاعیدە کارەکانی تەرخان دەکات بۆ بێ باوەڕە ڕۆئاواییەکان و خەڵکی سەرانسەری جیهان دەکاتە قوربانی، بەڵام موجاهیدینی خەلق زۆربەی ئامانجەکانیان بریتین لە ئێرانییەکان.

جیاوازییەکی تریش ئەوەیە بیروبۆچوونیان جیایە لە بەرامبەر ئافرەتدا. لە پێناسەی داخراوی ئیسلامدا کە موسڵمانە ڕادیکاڵەکان پابەندن پێیەوە، ئافرەت ئەو بوونەوەرەیە شەرەف و ئاورووی دەچێت، ئافرەت بریتییە لە شەرەف و نامووسی خێزان. بۆیە دەبێ ئەو بوونەوەرە بەسەلامەتی لە ماڵەوە لە پشت پەردە و نێو لەچەکەوە بپارێزیت، ئەگینا شەرەف و ناموست دەکەوێتە سەرپشت.

ئەمە زۆر جیاوازە لە نێو موجاهیدەکان چونکە ئەوان ڕێگە بەئافرەت دەدەن بەشداری بکات لە سوپادا، لە نێو پەیکەری ڕێکخراوەیی خۆیاندا تەنانەت ئافرەتیان لە سەرووی پیاویشەوە داناوە. هەروەک لە چیرۆکی ڕوبابە شاروخیی بەتەمەندا بۆمان ڕوون دەبێتەوە. موجاهیدین ئافرەت بەکار دەهێنێت بۆ بڕینی سنوور و ئەنجامدانی کردەکانی ئەودیو سنوور چونکە کەمتر بەرچاون و کەس نایانناسێت. هەروەها لەبەرئەوەش کە ئافرەت پاڵنەری زیاتر هەیە و دەیانەوێت زووتر خۆیان بسەلمێنن. ئەو مەشقەی ئاراش سامیتی پوور وەری گرت پێش هێرشەکەی بۆ ئێران، هەمان مەشق درایە چەندین ئافرەت. هەرچەندە مەشقەکە بەجیا بوو چونکە ئافرەت بەئافرەتی دەوتەوە، بەڵام مەشقەکەیان وەرگرت و ئامادە کران بۆ ئەو هێرشەی لە مەشقەکەدا پێیان وترا بوو.

لەوێ خاڵێکی هاوبەشی تر هەیە چونکە بەپێی ڕاپۆرتەکان، قاعیدە کەمپێکی تایبەتی دامەزراندووە بۆ ئەوەی مەشق بەئافرەت بکات تیادا: ئەم ئافرەتانە دەبوون بەشەهیدی پاڵێوراو، بۆ نموونە: ئەو ئافرەتانەی لە فەلەستین و بۆسنیا هێرشیان دەکردە سەر ئیسرائیل و ڕووسیا لەو جۆرە ئافرەتانە بوون. قاعیدە لە عێراق ئافرەتی بەکار دەهێنا بۆ کردەی خۆکوژی کاتێ پیاوەکان هیچی تر نەیانتوانی بێنە ناو سنووری عێراقەوە و لە بازگە دەرباز نەدەبوون. هەڵکەوتەکە ئەوەیە کە FBI ئەمەریکایی دەستی کردووە بەگەڕان بەدوای ئەو ئافرەتانەی لە لایەن تۆڕی قاعیدەوە کراون بەئەندام لە پێناو ئەنجامدانی کردەی خۆکوژیدا.

جیاوازییەکی ڕوونی تر لە پەیداکردنی ئەندامدا ئەوەیە، گەنجە موسڵمانە ڕادیکاڵەکان وەک خۆبەخش خۆیان تەرخان دەکەن، بێ کێش و بەربەست، بەئاسانی دەچنە کەمپەکانی مەشق و ڕاهێنان لە ئەفغانستان و پاکستان و کشمیر. دوو گەنجی هۆڵەندی بوونە سەردێری هەواڵەکان لە هۆڵەندا لە ساڵی ۲۰۰۱ کاتێ لە کشمیر تەقەیان لێ دەکرێت و دەکوژرێن. هەوڵیان دابوو مەشقیان پێ بکرێت لە یەکێک لە کەمپەکانی گرووپە موسڵمانەکانی پاکستان لە کشمیردا. هەروەها لە هێرشەکانی تونێلی لەندەن لە مانگی تەمووزی ساڵی ۲۰۰٦ پاکستان دەستی تێدا هەبووە.

هەرچەندە ئەندامانی موجاهیدین لە ئێران لە ساڵانی حەفتا و هەشتاکاندا پێوەندییان کرد بەڕێکخراوێکی سیاسیی ئەو سەردەمە بەهەمان سۆزەوە، پاش ئەوە تەنیا پاڵەپەستۆ و بەمەزەبکردن هەبوو. من شتێکی ترم هەیە لێرە زیادی بکەم، چەند ڕاپۆرتێک هەن لەسەر پاڵەپەستۆی جدیی دەروونی و هەتا ئازار و ئەشکەنجەدانی ئەندامە تازەکانی گرووپە موسڵمانە ڕادیکاڵەکان، ئەوانەی دەگەنە نێو کەمپەکان و حەز ناکەن ببن بەمرۆڤی توندڕەو و توندوتیژ.

بێگومان ئەمە شتێکە تۆ ناهێڵێت ڕوو بدات. بۆیە خاڵێکی هاوبەشی تر ئەوەیە ئەندامی تازەی گونجاو هەڵدەبژێردرێن بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی هەستیار بەمەزەب بکرێن. زۆر جار گەنجی موسڵمان، بەهۆی پێشینەکەیانەوە، زۆر پابەندن بەئامانجەکانی گرووپە تیرۆریستەکان. پێشەکی بن لادن و ئەوانەی دەوروبەری، هەر لە زووەوە کەسانی ناسراو بوونە. هەروەک چیرۆکگەلی لەمەڕ ڕێژیمی خوێناوی ساواکی دەزگای نهێنیی شا و لە سێدارەدان لە ژێر فۆرمی خومەینیدا، ئەمانە بوونەتە بنچینەی دروستبوونی بزووتنەوەی بەرەنگاریی وەک موجاهیدینی خەلق. بەڵام ئەمە بەس نییە. یەکێک ئەم کارە دەکات کە بتوانێت هەنگاوی دواتریشی پێ بکرێت: واتە هەستی لە هاوسۆزییەوە بگۆڕێت بۆ تۆڵە و کردەوە.

وێڕای ئەمانەش چەندین خاڵی هاوبەشی تریان هەیە، وەک: ستایشکردنی شەهید و خۆکوژەکان، بەڵێنی بەهەشت. هەروەها موجاهیدەکانیش بەڵێنی داهاتوویەکی گەش بۆ ئافرەت و منداڵەکانیان لە ئێران دەدەن. هێزی سەرنج ڕاکێشان هەیە لە

ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی خێزان لە نێو ڕێکخراوەکان و هەروەها ئەو دیاردەیەی مردنی ئەندامێکی خێزانێک بەدەستی حکوومەتی چەپەڵ پاڵنەرێکی باشە بۆ ئەوەی ببێتە ئەندام لە هەمان ڕێکخراو کە خێزانەکەت ژیانی لە پێناودا بەخت کردووە، دواتر ئەوانیش ژیانیان بۆ هۆکارێکی دروست بەخت دەکەن.

زۆربەی ئەم شتانە بەسەر ئاراش سامیتی پووردا هات لە زیندانی ئێراندا، دوا جار لەو خەونە ناخۆشەی تێی کەوتووە بەئاگا دێتەوە، کاتێ دەستگیر دەکرێت لە تاران نارنجۆکێکی لە دەستە و بەنیازە خۆی بتەقێنێتەوە. بەڵام بەزیندوویی دەستگیری دەکەن و پاشان هەست بەوە دەکات چیی بەسەردا هاتووە و ئەوجا بڕیار دەدات موجاهیدین بەجێ بێڵێت.

ئەوە کاریگەریی جیهانی دەرەوە بوو سامیتی پووری بەئاگا هێنایەوە. جیهانێک زۆر جیایە لەو جیهانەی ئەو بیری لێ دەکردەوە، ئەو جیهانەی ئەو وای لێ دەکرد بیر لە کوشتن بکاتەوە، ئەو جیهانەی زۆربەی ژیانی لە پێناودا بەفیڕۆ دا.

ئەم پرۆسەیە ئەوەش ڕوون دەکاتەوە بۆچی موجاهیدین و تۆڕی قاعیدە هەوڵی ئەوە دەدەن کاریگەریی دەرەوە نەهێڵن لەسەر ئەندامەکانیان بەهۆی دوور خستنەوەیان لە کۆمەڵگە و جێگیرکردنیان لە کەمپەکان کە بەتەواوی دوورەپەرێزن لە جیهانی دەرەوە. موجاهیدین پێوەندی لەگەڵ عێراقییەکاندا حەرام دەکات، هەروەها توانییان بیرۆکەیەک لای ئەندامەکانیان دروست بکەن لەسەر جیهانی دەرەوە کە ئەم جیهانە پیس و بێ سوود و بێ کەڵکە.

ئەو گرووپە موسڵمانانەی سەر بەقاعیدەن هەمان شت دەکەن: ئەوەی لەگەڵ بیرۆکەی ئەواندا نەبێت، ئەوا بێ باوەڕە یان لە بێ باوەڕانیش خراپترە: واتە خائین و ناپاکە، بۆیە تۆ دەبێ دژی ئەوانە بوەستییەوە و هەر کاتێک ڕێک کەوت بیانکوژی بێ ئەوەی لە سزا بترسیت.

دوای ئەوەی کەمپەکان لە ئەفغانستان و پاکستان هەڵدەوەشێنەوە، قاعیدە شێوازی کارکردنی گۆڕی بۆ کارکردن بەگرووپ: پێنج کەس لە ژێر دەستی میرێکدا دەبن و گرووپێک پێک دەهێنن، ئەو میرە بەرپرسە لە بڕیاردان و ناردنی ڕاپۆرت بۆ سەرکردایەتی و لەوەی درێژە بەنوێژکردنیان بدات. ئەمە بەتەواوی لە گرووپەکەی

موجاهیدین دەچێت کە چوار تا پێنج کەس لە ژێر دەستی بەرپرسێکن واتە لە ژێر دەستی میرێکن کە ڕاپۆرت دەنێرێت بۆ سەرکردایەتی لە بارەی گرووپەکەی خۆی.

پتەوکردنی نێوانی ئەندامانی گرووپەکە زۆر گرینگە، هەروەها بۆ ئەوەی بەسەنگەرێکی بەهێزەوە دژی جیهان بوەستیەوە، پێکهاتەیەکی سەربازی هەڵبژێردراوە. موجاهیدینی خەلق و گرووپە موسڵمانە توندڕەوەکان هەوڵ دەدەن بگەنە ئامانجەکانیان بەڕێگەی خەباتی چەکداری، لەبەر هەندێ مەشق و ڕاهێنانی سەربازیی پرۆفێشناڵ بەئەندامەکانیان دەڵێنەوە. ئەو مەشق و ڕاهێنانە ڕۆڵێکی هەیە بۆ پێکەوە بەستانەوەی ئەندامەکانی نێو هەر گرووپێک، بەڵام لەوەش گرینگتر ئەو هەڵکەوتەیە کە ئەندامەکان فێری ئەوە دەکەن گوێڕایەڵی ئەفسەرەکانیان بن، ئەگەر وا نەکەن ڕەنگە کردەکەیان هەڵبوەشێتەوە، ئەمەش دووبارە بەشێکی گرینگە لە پرۆسەی بەمەزەبکردن.

موجاهیدین بۆ مەشقە سەربازییەکانیان پشتیان بەسوپای عێراقی دەبەست، هەر ئەویش پڕ چەکی دەکردن. قاعیدە و گرووپە موسڵمانەکان لەگەڵ تالیبان لە ئەفغانستان پێکەوە کاریان دەکرد، هەروەک ئێستا ڕوونتر بووەتەوە لەگەڵ ئەفسەرە پلە بەرزەکانیش لە سوپای سەربازیی پاکستاندا کاریان کردووە.

دروشمی موجاهیدین ئەمە بوو: ئەوەی لەگەڵ ئێمەدا نییە دژی ئێمەیە. هەمان دروشم بۆ زۆربەی گرووپە موسڵمانە ڕادیکاڵەکان ڕاستە. "ئێمە دژی ئێوەین"، بەردەوام دووبارە دەکرێتەوە و لە نێو بیر و هزری ئەندامانادا چەسپی دەکەن. ئەم دووبارەکردنەوەیە لە کاتی مەشقە ئاینی و هزرییەکاندا ڕوو دەدات کە ئەمە بابەتێکی گرینگی پەروەردەی گشتیی موجاهیدەکان و گرووپە موسڵمانەکانی ترە.

لێتۆژەرەوەی ئەمەریکایی جێسیکا ستێرن دەڵێت کەمپەکانی مەشقکردنی قاعیدە و گرووپە موسڵمانە توندڕەوەکانی تر، بەزۆری بەکار دەهێنرێن بۆ بەهێزکردنی گەنجەکان بۆ ئەوەی چیرۆکەکە بەهی خۆیان بزانن. "چیرۆکەکەش بریتییە لەو دوژمنە خراپەی، بەپێی قسەکانی زەواهیری (دەستەڕاستی ئوسامە بن لادن) سەرکردایەتیی سەلیبییەتێکی نوێ دەکات لە دژی خاکی ئیسلام. زەواهیری دەڵێت دەبێ دژی ئەو دوژمنە بەشێوەیەکی سەربازی شەڕ بکەین چونکە ئەم شێوازە تاکە

زمـــانه ڕۆژئاوا تێی بگات. ئەم دوژمنـه بەئاســـانی بەهۆی گـــرووپی بچـــووکی شـەڕکەرانەوە دەترسێ. ئەوانەی مـەشقیـان پێ دەکرێت باش دەزانن چۆن لە خـانەی بچووک بچووکدا کاری خۆیان ئەنجام بدەن."

لە نێـو چیرۆکەکـەدا گـومـانت بۆ هەمـوو لایەنێک دەچێت بۆ دوژمنەکـەت . بەڕای مـوسـڵـمـانە توندڕەوەکـان ئـەم دوژمنە بریتـیـیـە لە ڕۆژئاوا، ئـەمـەریکا یان تـەنانەت حکوومەتەکانی خۆشیان ئەگەر دژی ڕێبەری ئیسلامی ڕادیکاڵی بجووڵێنەوە. بەڕای موجاهیدەکانیش هەمان چیرۆک هەیە لە بارەی شەڕانگێزێکەوە کە ئەویش بریتییە لە ڕێژیمی خـــراپی ئێـــران کـــە ئیـــســـلام چەواش دەکـــات، بـەڵام لێـــرەش دژە ئەمەریکاییەکان ئاهەنگی سەرکەوتنیان دەگێڕن.

وێڕای ئەمـــانە، من ســەرم ســوڕمــاوە لە خـاڵێکی تری هـاوبەش، بەڕێگەیەک چۆن مـامـەڵە لەگەڵ زانیاریدا دەکەن. ئەو زانـیارییە بریتـییە لە هێز، زۆر بەباشی بۆ نێو ئەوان دزە دەکات. وانەکانی مەسعود تەیبی ئەوەیە تۆ نابێ زانیـاری ئاڵوگۆڕ بکەیت چونکە قـاعـیـدەش ئەم زانیـاریـیـانە دەزانێت. جـۆن والکـەر لیندی، تـالیـبـانێکی ئەمـەریکاییـیـە ڕاپۆرت دەدات، بۆ نموونە کـە بێگانەی وەک خـۆی لە کـەمـپـەکـانی مـەشـقکردن داوایان لێ دەکـرێت بەشـداری بکەن لە مـەشـقێکی تر بۆ ئەنجامـدانی کـردەی بێگانەکـان. بەڕوونی پێی دەوترێت باسـی ئەم شـتـە لای ئەوانی تـر نەکـات. سەرکردەگەلی گرووپە موسڵمـانە توندڕەوەکان لە پاکستان کە لە پێناو کشمیرێکی سـەربەخۆدا شـەڕ دەکەن، زانیاری لە هاوەڵەکـانیان دەشارنەوە: ئەو زانیـارییـانەی لەگەڵ پارە و چەکی سوپای پاکستاندا کار دەکەن.

دۆش دادەمێن ئەگەر ئەندامە تازەکان گومانیان نەبێت لە بارەی ئەو شتانەی پێیان دەوترێت ئەنجامی بدەن، هەروەها لە بارەی ئەو ژیانەی ئەوان پێشەنگایەتیی دەکەن، بەتایبەتی لە سەرەتادا. ئاراش سامیتی پوور لە بارەی ئەو گومانەوە پێم دەڵێت کە لە پشـتـــەوەی مـێـشکیـدا ئازاری دەدات، بـەڵام هـەر زوو نامـێنێت چونکە پرۆسـەی بەمـەزەبکردن زۆر بەهێزە. هەروەها کـاتێ بیر لەوە دەکـەمـەوە چۆن چەند ئەندامێکی پێشووی موجاهیدین ئەمەم پێ دەڵێن، گەیشتمە ئەو باوەڕەی ئەوان گـرفتیان هەبووە لە درکـانـدنی ئەم شـتـانەدا. چونکە وا فێـر کـراون قسـە لای کـەس نەکـەن. بەڵام ئەو

ئامانجەی لە پێش ئەواندا دانراوە زۆر جدی و دروستە بۆیە ڕێگە بەخۆیان نادەن گوێ لەو گومانانە ڕاگرن.

ئەم بەراوردکردنە دەکرێ بەسەر ئەندامانی گرووپەکانی قاعیدەش جێبەجێ ببێت. ئەوان بێگومان چەند ساتێکیان هەیە زۆر بێهێز دەبن. بەڵگە هەیە یەکێک لە گومانلێکراوەکانی هێرشی ١١ی سێپتەمبەری ساڵی ٢٠٠١، زیاد جەراحی لبنانی، کە تاکە کەس بووە دەستگیرانی هەبووە و پەیوەندیشی لەگەڵ خێزانەکەیدا هەر نەپچڕاوە، زۆر گومانی هەبووە تا چەند ڕۆژێکی کەم پێش ئەنجامدانی هێرشەکە. تەلەفۆن بۆ خێزانەکەی دەکات و دەڵێت ئامادەی ئاهەنگی شووکردنی کوڕەزاکەی دەبێت، لە هەمان کاتی هێرشەکاندا، تەنانەت قات و کەرەواتێکی نوێش بۆ ئاهەنگەکە دەکرێت بۆ لەبەرکردن. ڕوون دەبێتەوە کە تەنانەت باڵەفڕوانێکی جێگرەوە لەبەر گومانە بەردەوامەکانی جەراح و مشتومڕەکانی لەگەڵ محەمەد عەتای سەرۆکی گرووپەکە ڕاهێنرا بوو: ئەگەر ئەو نەیکات ئەو باڵەفڕوانە جێگرەوەیان دەنارده شوێنی ئەو.

من زۆر پێ لەسەر ئەو خاڵە هاوبەشە دادەگرم کە لە نێوان گرووپەکانی قاعیدە و موجاهیدیندا هەیە ئەویش ئەوەیە: هەردووکیان زۆر بەچاکی دەتوانن وا لە ئەندامەکانیان بکەن بڕیارەکانی خۆیان بشکێنن و بچنە سەر قسەی ئەوان، هەتا گومانیان بۆ دروست دەکەن بۆ بڕیارەکانیان، وەک ئەوەی لە نێو مەزهەبێکی ئاینیدا هەیە. پاش ماوەیەک لە نێو ڕێکخراوەکەدا، هیچی تر ناتوانن بڕیاری خۆیان هەبێت، چونکە هەموو بڕیارەکان پێشتر دراوە بۆیان. ئەمە هەستێکی سەلامەتە، زۆر ئاسانە و زۆریش تەمبەڵت دەکات، مەسعود خودابەندەش دووپاتی ئەم قسەیەی سەرەوە دەکاتەوە. هەموو ئەندامان دەبێ ئەو کارە بکەن کە سەرکردەکانیان پێیان دەڵێن، دەبێ بێ هیچ گومان و ناڕەزای و ڕەتکردنەوەیەک کارەکە ئەنجام بدەن. بۆ نموونە، مردن لە پێناو ئامانجی پیرۆزدا.

# پشکی دەیەم

## تیرۆری باش و تیرۆری خراپ

یاسر عیزەتی بەبیری دێتەوە دەڵێت "ڕۆژی دوای هێرشەکەی ١١ی سێپتەمبەر، ئاهەنگێکی گەورە هەبوو. من بەهەزاران جار ئەو دیمەنەم بینی کە باڵەفڕەکان لە نیویۆرک خۆیان بەسەنتەری بازرگانیی جیهانیدا دەکێشن. هەر جارێک دیمەنەکەمان دووبارە دەکردەوە، هەموومان دەبوایە چەپڵە لێ بدەین."

یاسر عیزەتی یەکێکە لە هەڵاتووەکانی موجاهیدین و پێم دەڵێت هەواڵی هێرشەکانی قاعیدە زۆر دڵخۆشکەر بوون لە نێو موجاهیدیندا. موجاهیدین لە خۆشییاندا، کێک و شیرینیی بەسەر ئەندامانیدا بەشییەوە، تەنانەت زیندانییەکانیش، هەمیشە بەم ڕێگەیە خۆشیی خۆیان بەرامبەر بەشتێک دەردەبڕی. بۆ چەندین مانگ، وێنەی نێو کۆواری تایم بەدیوارەکانی بینایەکی موجاهیدینەوە بوون کە خەڵک لە نێو تاوەرەکاندا خۆیان فڕێ دەدەنە خوارەوە.

لە کۆبوونەوەیەکی گەورەی ڕۆژێک دواتردا، مەسعود ڕەجەوی وتارێکی پێشکێش کرد تیایدا پەردە هەڵدەماڵێت لەسەر ئەو شتەی ناوەڕۆکی تیرۆریستیی ڕێبازەکەی تیادا حەشار دراوە. ڕەجەوی بەسوپای وت "سەیر کەن، بزانن پیاوێکی پارێزگار لە نێو چیاکانەوە چی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کرد، ئێمەش بەو هەموو کەرەستەی خۆمانەوە تا ئێستا هیچمان لە ئێران نەکردووە!" یاسر بەجدی ئەمەی پێ وتم. بۆیە منیش پێم وت: لەم قسەیە دڵنیایت؟ سەری ئەرێی بۆ لەقاندم و دووبارەی کردەوە.

لێرەدا، مەسعود ڕەجەوی خۆی پێوەندییەک لە نێوان ڕێکخراوەکەی و قاعیدەدا دروست دەکات، هەروەها ئەو کردەوە تیرۆریستییانەی قاعیدە بەنموونە بۆ هاوڕێکانی بەکار دەهێنێت. باشە، ئاخۆ کۆنە ئەندامان ڕاستن، ئەوانەی منیان

ئاگەدار کردەوە لە مەترسیی موجاهیدین کە سروشتێکی تیرۆریستی هەیە؟ ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلق بۆ چەندین ساڵ لە نێو لیستی تیرۆریستەکانی ئەمەریکا و ئەوروپادا بووە، ئەمەش شتێکە موجاهیدین هەمیشە ناڕەزاییی بەرامبەر دەردەبڕێت. ئاخۆ ڕاستە، یان موجاهیدین بەڕاستی دوودڵی لەوە ناکات توندوتیژی و تیرۆر بەکار بهێنێت؟ پرسیارێکی تر خۆی قووت دەکاتەوە: چۆن موجاهیدین دژی ئەمەریکایی نین، ئەگەر پێشوازی لە توندوتیژییەکی لەم جۆرە بکەن؟"

چیرۆکەکان دەربارەی خۆشحاڵبوون بەهێرشەکانی قاعیدە بۆ سەر ئەمەریکا زیاتر بەدەردەکەون. یەکێک لە شاهێدحاڵەکان مەسعود تەیبییە، کە ساڵی ۲۰۰۱ پلەیەکی باڵای هەبوو لە نێو موجاهیدیندا. لە ساتی هێرشەکان، تەیبی لە نێو مەڵبەندی سەرکردایەتیی سوپادا بووە لەگەڵ ۱۵ ئەندامی تری سوپای ڕزگاریخوازی نیشتمانی. تەلەفۆنێکیان بۆ کرا کە "وا ئەمەریکا دەتەقێنرێتەوە". هەموویان حەپەسان و هەڵسانەوە. ستافی سوپا دەچنە بنکەی سەربازیی خۆیان، لەوێ بۆ یەکەم جار لەسەر شاشەی سی ئێن ئێن دیمەنەکانی هێرشەکە دەبینێت.

تەیبی دەگێڕێتەوە "حەپەسانی هەمووان لە نێو موجاهیدین دەبێتە خۆشی. دوای ئەوە موجاهیدین ئاهەنگ دەگێڕن. سەدای مۆسیقا دەچێتە ئەوپەڕی ئاسمان. هەموو ئەندامان بەشدار دەبن لە ئاهەنگەکە و پێکەوە ئەم گۆرانییە دەڵێنەوە "خەبات دژی ئەمەریکا"، کە گۆرانییەکە ۲۰ ساڵە لە لایەن موجاهیدینەوە دەوترێتەوە."

گۆرانییەکە بۆ دەربڕینی هەستە دژی ئەمەریکا و داگیرکەری، کە هەمیشە بەجدی لە لایەن موجاهیدینەوە وتراوە، بەڵام بەردەوام بەئاشکرا نەیدەوت و شاراوە بوو لەبەر جیهانی دەرەوە. هەروەک حکوومەتی ئێرانی، موجاهیدینی خەلق هەرگیز ڕۆژێک نەوەستاوە لە ناوهێنانی ئەمەریکا بەشەیتانی گەورە.

ئاراش سامیتی پوور لە بارەی ئەمەوە قسەم بۆ دەکات لە کاتی گفتوگۆمان لە تاران و دەگاتە ئەو ئەنجامەی موجاهیدین هەرگیز ڕاست نەبوونە و هەستی ڕاست و دروستی خۆیان نەدرکاندووە، دەڵێت "گرووپێکی ئەمەریکایی نین"، ئەم قسەیەی لە بارەی هەڤاڵانی پێشوویەوە بەبڕواوە کرد.

ئاراش زۆر کەم وشەکانی ئەم گۆرانییەی بەبیر دێتەوە. هەمیشە ڕاناوی ئێمە لە

بری ڕاناوی ئەوان بەکار دەهێنێت واتە مەبەستی کۆنە ئەندامانە لە نێو موجاهیدیندا. دەڵێت " ئێمە چەندین گۆرانی لەم جۆرەمان هەیە، بەڵام ئەمەیان بەناوبانگترین گۆرانی بوو. نزیکەی ٦ ئەمەریکایی لە ئێران لە ساڵانی حەفتاکان لە لایەن موجاهیدینەوە کوژران." لەبەر کوشتنی ئەو ئەمەریکاییانە، بڕیار درا ڕێکخراوی موجاهیدین بخرێتە نێو لیستی تیرۆریستانەوە.

ئاراش ئەم وشانەی بیر دێتەوە لە نێو گۆرانییەکە " گۆرانییەکە باسی شتێکی لەم جۆرە دەکات: لە سەرەتای شەقامەکە موجاهیدێک وەستاوە، پڕە لە ڕق. ئەی ئەمەریکا، لاچۆ و بڕۆ ئەگینا خوێنت بەلێشاو دەڕژێت."

کاتێ پرسیارم لە عەباس سادقی نەجات کرد لە بارەی ئەم گۆرانییە کۆنەی موجاهیدین، وتی "گۆرانییەکە شتێکی ئاوایە: ئەی ئەمەریکایی چەپەڵ لە شوێنێکی شاراوەی خۆت دێیتە دەرەوە و خوێنت بەلێشاو دەڕوات."

سادقی نەجات لە دەمی خۆیەوە باسی ئەوە دەکات دوای هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر، لە نێو کەمپی ئەشرەفدا چی ڕووی دا. ئەو ڕۆژە، کاتی نانی ئێوارە هەموو ئەندامە پلە بەرزەکان ئامادەی خوان بوون. مەهدی ئەبریشەمچی، کە دوای تەڵاقدانی مریەم بووە یەکێک لە سەرکردە گەورەکان و ناوی پیاوێکی ڕێزدار و بەشەرەفی پێ درا. ئەو پیاوە داوای لێ کرا هەرچی لە بارەی هێرشەکانەوە دەزانێت باسی بکات. ئەویش وتی "ئەوەی ناوی موجاهیدین لە نێو لیستی تیرۆریستەکان دابنێت، شایەنی ئەمەیە." پاشان وتەیەکی ماوی وت " ئێستاش نۆرەی پڵنگە ببەزێت." لەو ڕۆژە بەدواوە، ئەم وتەیە لە لایەن هەموو ئەندامانەوە چەندین جار دووبارە دەکرایەوە."

دیمەنە کاریگەرەکانی هەردوو تەلارە بەرزەکەی بازرگانیی جیهانی، چەندین جار لە نێو هۆڵی نانخواردن دووبارە کرایەوە، سادقی نەجات دەڵێت "لە مێژووی موجاهیدیندا، ئەمە یەکەم جارمان بوو هەواڵێکی ڕاستەوخۆ لەسەر ڕەوشی دەرەوە ببینین."

مەسعود تەیبی لە بارەی ڕۆژەکانی دوای هێرشەکانی قاعیدە، بیری دێتەوە کە مەسعود و مریەم ڕەجەوی لە هەموو ڕۆژانی تر زیاتر خۆشحاڵ بوون. هەروەها

باسی ئەوەش دەکات ماوەیەکی کەم دوای هێرشەکان، کۆبوونەوەیەکی گەورە لە نێو کەمپی ئەشرەف کە ٢٠٠٠ موجاهید و هەردوو ڕەجەوییەکەشی تێدا بوو، ساز کرا. تەیبی وەسفی ئەو ساتە دەکات "کاتێ ڕەجەوی هاتە ژوورەوە، دەموچاوی خەنی بووبوو." ڕەجەوی پرسیار لە ئامادەبووان دەکات ئاخۆ دەزانن چی ڕووی داوە، دوای ئەوەی باسی هێرشەکان کرایەوە هەموو خۆشحاڵ بوون و دەستیان بەچەپڵە لێدان کرد. کاسێتە ڤیدیۆییەکانی هێرشەکان جارێکی تر نیشان درانەوە. بۆ ماوەی نیو سات، شاشە گەورەکە هێرشەکان و کارەساتی دوای هێرشەکانی نیشان دا.

تەیبی دەڵێت "کە ئەوە تەواو بوو، ڕەجەوی دەسی بەدەمیەوە گرتبوو و دەستەکانی دەلەرزین بۆ ئەوەی نیشانی بدات خەمناکە. بەڵام تۆ دەتوانی خۆشحاڵی لە چاوەکانیرا بخوێنیتەوە. دواتر ڕەجەوی وتی " داوام لێ مەکەن هەڵوێستێک وەرگرم یان دەست بەشیکردنەوە بکەم چونکە لە نێو ئەو دیوارەدا کونێک هەیە و لە نێو کونەکەش مشکێکی دوو گوێ هەیە. دوای ئەم ڕۆژە، موجاهیدەکان بەهیچ شێوەیەکی ڕەسمی هیچ شتێکیان لە بارەی هێرشەکانەوە نەدەوت."

بەقسەی تەیبی، ئەمە تاکتیکێکی تایبەتی ڕێکخراوەکەیە کە بەئاشکرا هەڵوێست وەرناگرێت تا هەڵوێستی سیاسیی خۆیان بپارێزن، چونکە موجاهیدین نایەوێت بەدژە ئەمەریکایی ببینرێت و ناشیەوێت هاوسۆزیی خۆی بۆ قاعیدە بەئاشکرا نیشان بدات. لە لایەکی ترەوە، سەرکۆنەکردنی توندوتیژی بۆ وێنەی ڕێکخراوەکە شیاو نییە، نە بۆ ئەوانەی ژوورەوە، نە بۆ سەرۆک سەدام حوسێن و نە بۆ ئێرانیش.

تەیبی دەڵێت هەڵوێستی سیاسیی ڕێکخراوەکە. بەڵام مەبەستی لەمە برێتییە لە هەڵوێستی مەسعود ڕەجەوی لە جیهان و لە نێو ڕێکخراوەکەشدا. چونکە ئەوەی ئەوان دەیانویست کۆمەڵگەیەکی باشتر بوو لە ئێراندا، ئەمەش ئامانجێکە بەڕێگەی توندوتیژی دێتە دی. بەڵام لە هەر شوێنێکدا ئەو ئامانجە کاتێ لە دوای دووکەڵ و وشەی جوان و هزری نابەجێ ون بێت، توندوتیژی هەر دەمێنێتەوە. مەسعود ڕەجەوی مەزەبێکی لەو ڕێکخراوە دروست کردووە خەڵک دەبێ هەموو گوێڕایەڵی بن، یان بەکوێری و نەزانی، یانیش ئەوەتا بەزۆر و بەترس هەر دەبێ گوێڕایەڵی بن.

من سەیری گرووپێکی فارسیم کردووە بەناوی هەشاشین: ئەم ناوە لە ئەشاشینی

ئینگلیزییەوە وەرگیراوە واتە " بکوژ". خاڵە ویکچوەکانی ئەم ڕێخراوە لەگەڵ موجاهیدینی خەلقدا سەرنجیان ڕاکێشام. چەندین چیرۆکی جیاجیا هەیە لە بارەی یاوەرانی حەسەنی کوڕی سەباحەوە، کەوا پێ دەچێت لە نێوان ساڵانی ١٠٩٠ و ١٢٧٥ چالاک بووبن، دەیانویست فۆرمێکی پاکی ئیسلام بڵاو بکەنەوە. بۆ بەدیهێنانی ئەمەش، قوربانییەکانیان بەڕۆژی نیوەڕۆ دەکوشت و ژیانی خۆیان دەخستە مەترسییەکی گەورەوە. ئەو ژیانەی خۆیان وەک دیارییەکی پیرۆز سەیر دەکرد و لە پێناو هۆیەکی باشدا بەختیان دەکرد. موجاهیدینی خەلقیش زۆربەی قوربانییەکانیانی، سیاسەتوان و سەرکردە ئاینییەکان بوون. هەروەک موجاهیدین، بەباشە و خراپەیان وەرگرتبوو: ئەمەشیان لە ڕێگەی کوشتنی خەڵکی بێ تاوانەوە دەردەبڕی.

هەمان شت بۆ ئەندامانی گرووپە موسڵمانە ڕادیکاڵەکانی سەر بەقاعیدەش ڕاستە. ئاسمان و ڕیسمان لە هێڵێک دەدەن لە نێوان باش و خراپدا، زۆر جار بێ ئەوەی درکی پێ بکەن، خاڵە سنوورییەکان دەبڕن و دەگەنە خراپەکەی خۆیان و خەبات لە دژیدا دەکەن. ئەوان مەبەستیان پاککردنەوەی هەموو جیهانە، وا دەزانن کوشتنی دوژمنەکانیان کارێکی باشە و بەئەنجامدانی ئەم کارە دەبن بەمرۆڤی باش.

جەیسن بێرک لە کتێبەکەی خۆی لە بارەی قاعیدەوە دەنووسێت " ئەگەر وا بزانرێت بەهۆی ململانێیەکی گەورە لە نێوان باشە و خراپەدا کۆنترۆڵ دەکرێت، ئەوا دەتوانرێت هەموو کێشەکان شی بکرێنەوە. هەر تاکێک دەتوانێت ئازار و سووکایەتییە کەسی و گشتییەکان باس بکات. تەنانەت دەتوانێت باشتر گازاندە لە یەکێک بکات بۆ هەردوو شت ئازارەکە و سووکایەتییەکەش. سەیرکردنی جیهان وەک مەیدانێکی شەڕ، ئەم مەیدانەش وا لە تاک بکات هەموو زنجیرە ئەفسانە و کولتوور و چاوکانییە ئاینییەکان ڕێک بخات، ئەمەش قۆرخکردنی دەسەڵاتە. ئەوانەی بەشداری دەکەن لەم ململانێ گەورەیەدا، شەڕوانی پیرۆز و بەهێز و شکۆمەندن و شایەنی ڕێز و پێزانینن."

ژمارەیەکی زۆری ئەو توخمانەی ڕەجەوی بەکاری دەهێنێت بۆ هاندانی خەڵکەکەی

تا هەرچی ئەو دەیەوێت بۆی بکەن، لە لایەن قاعیدەشەوە بەکار دەهێنرێن، چونکە هەروەک چۆن ڕەجەوی بۆ موجاهیدەکان پیاوێکە لە نێوان موجاهید و خوادا، ئوسامەش بەهەمان شێوەیە، هەمان ڕۆڵی هەیە، هەرچەندە بەشێوەیەکی ڕەسمی نا بەڵام لە ڕووی سۆزەوە بۆ ئەندامانی ئەو گرووپانەی سەر بەتۆڕی قاعیدەن. هەردووکیان نازناوێکیان هەیە. یەکێک لە ناوەکانی ڕەجەوی لە بنەڕەتەوە لە پێشینەی ڕێکخراوێکی چەپەوە هاتووە. ڕەجەوی پێی دەوترێت "برا". بەڵام بۆ موجاهیدەکان، وەک ئوسامە بۆ ئەندامەکانی، وەک ڕابەرێک یان وەک میرێک یان پیرێک وایە. ئەم ناوانە هەموویان هەمان واتایە هەیە و دەربڕی ڕێزلێنانن بۆ خەلیفەیەکی ژێری ئیسلام.

ئەم بەشە لە بارەی تیرۆری موجاهیدینی خەلقە. بەڵام مەبەستی تەواو لە تیرۆر چییە؟ چەندین پێناسە هەیە بۆ ئەم چمکە. ئەوەی لای یەکێک بەتیرۆر دادەنرێت، لای یەکێکی تر بەخەبات لە پێناو ئازادی دادەنرێت. چەندین گفتوگۆ لە بارەی ئەمەوە کراوە و چەندین مشتومڕی لەسەر ئەنجام دراوە.

لێرەدا، تیرۆر بەم شێوەیە پێناسە دەکرێت: بریتییە لە کرداری هەڕەشەئامێزی پڕ لە توندوتیژی دژی شەڕنەکەران، بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە، بۆ تۆقاندن یان بەواتایەکی تر بۆ کارتێکردن لە خەڵک. ئەمە پێناسەیەک گشتییە من لە توێژەری ئەمەریکایی جێسیکا ستێرنم وەرگرتووە، چونکە وەسفی هێرشبەرەکە بەکراوەیی بەجێ هێڵراوە، دەکرێ ئەمانە بێت (دەوڵەت، گرووپ یان تاک) هەروەها ئامانجەکانیش بەکراوەیی ماونەتەوە، دەکرێ ئەمانە بن (سیاسی، ئاینی و یان شتێکی تر).

سەرکردە تیرۆریستەکان هانی یاوەرانیان دەدەن هێرشە تیرۆریستەکان جێبەجێ بکەن بەهۆی بەڵێن پێدانیان بەپاداشت لە نێو بەهەشتدا (لە نێو هەموو پاداشتەکاندا حەفتا و دوو حۆرییە جوانەکە زۆر باوە)، یان بەهۆی ترساندن و هەڕەشەی سزادانەوە لە ڕۆژی دواییدا ئەگەر هیچ شتێک نەکەن. گەلێ لەوانەی ئەو هێرشانە جێبەجێ دەکەن، شەڕی پیرۆز یان جیهاد بەئەرکێکی مەزنی موسڵمانان دادەنێن هەروەک مەزنایەتیی نوێژکردن و خێرکردن. بۆ ئەوان توندوتیژی جۆرە

باجێکە دەبێ بیدەن تاوەکو موسڵمانەکان ڕۆژێک بێت ببن بەخەلیفەی سەر زەوی، بۆ ئەوان ئەم توندوتیژییە لە پێناو وێنەیەکی ئایدیالی جیهانە: واتە دەوڵەتێکی ئیسلامیی یەکگرتوو.

پاشان لە موجاهیدین دەڕوانم. ئەوان پێیان وایە میرەکەیان یەکێکە لە لایەن خوداوە هەڵبژێردراوە و دەبێتە سەرکردەی داهاتووی ئێران. بۆ ئەوان، توندوتیژی و قوربانیدان بەژیانیان کارێکە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، جا ئاخۆ پاداشت دەکرێنەوە لە بەهەشت یان نا. پاداشتی ئەوان بریتییە لە دەوڵەتێکی ئێرانی ئازاد هەموو کەس تیایدا یەکسان و دڵخۆش و ئاسوودە بژین. دەتوانین بڵێین موسڵمانە ڕادیکاڵەکان جۆرێک لە خۆپەرستییان پێوە دیارە، خۆزگە بۆ پاداشتێکی کەسی دەخوازن، لە کاتێکدا موجاهیدین پاداشتەکەیان تەنیا لە بەدیهێنانی ئامانجەکەیاندا دەبینن.

موجاهیدێک کە لە سەردەمی شا هەڕەشەی کوشتنی لێ دەکرێت، دەڵێت "گەورەترین خۆزگەی ئێمە ئەوەیە خوێنمان لە پێناو گەلەکەماندا ببەخشین. ئەگەر من سنگی خۆم بدەمە بەر گوللە، ئەوا باش دەزانم خوێنی من دەڕژێت لە پێناو ئازادکردنی گەلی ئێراندا." جیهادییەکی پاکستانی بۆ جێسیکا ستێرن قسە دەکات و دەڵێت " من هەموو ڕۆژێک نزا بۆ مردن دەکەم. کاتێ لە خەونمدا قورئانی پیرۆزم خوێند، بڕیارم دا ژیانی خۆم بۆ جیهان بەخت بکەم. ئەگەر لە کاتی جیهادا بمرم، ئەوا دەچمە بەهەشت. خوا پاداشتم دەداتەوە. ئەوەیە خەونی من."

ئایا مردن بۆ موجاهیدین تەنیا گەیشتنە بەهۆکارێک یان ئەنجامێکی باش؟ نەخێر، ئەو موجاهیدەی هێرشی تیرۆریستی ئەنجام دەدات لە ئێران ڕەچاوی ئەوەی کردووە ڕەنگە نەژیت، بەڵام تەنیا بۆ چەند کەسێکیان مردن تاکە ڕێگەیە بۆ گەیشتن بەئامانجی ڕاستەقینە، ئەوەی خۆی دەتەقێنێتەوە دەبێ جیاواز لە سەربازێکی ئاسایی مەشقی پێ بکرێت. سەربازەکە خولێکی تایبەتی وەردەگرێت بۆ ئەوەی بژیت و ئەزموونەکەی دواتر بەکار دەهێنرێت.

لەوەیاندا جاوازن، خۆتەقێنەوەیەکی پاکستانی لە کەرتی غەزە ڕاپۆرت دەنێرێت کاتێ هاوڕێیەکی، ئامۆزاکەی یان هاوەڵێکی خۆی تەقاندووەتەوە و گەیشتووەتە پلەی شەهید. ئەم خۆکوژانە مەشقێکی تایبەتی وەردەگرن، پێش ئەوەی خۆیان بتەقێننەوە

بەکامێرای ڤیدیۆ وێنەی خۆیان دەگرن وماڵئاوایی دەکەن. سەبارەت بەمانە، پرسەکە زیاتر ئایدیۆلۆجیایە تا هۆیەکی سەربازی بێت.

هەڵبژێردراوەکانی نێو موجاهیدین، وەک عەلی ڕەزا میرازگەری و ئاراش سامیتی پوور مەشقیان پێ دەکرێت بۆ ئەنجامدانی هێرش، بەڵام نابێ بمرن لە کاتی هێرشدا. ئەمە واتای ئەوەش نییە خۆیان نەتەقێننەوە لە کاتی پێویست، هەروەک سامیتی پوور نیشانی دا کاتێ دەستگیر دەکرێت و لە ناو بنکەی پۆلیس لە تاران سەری نارنجۆکەکەی دەکاتەوە. هێندەی نەمابوو شەهید ببێت، ئەمەش خۆزگەیەک لە نێو موجاهیدین و لە نێو گرووپە موسڵمانە ڕادیکاڵەکانیشدا. بەتێڕوانینێکی فرەوانتر: لە کولتووری ڕۆهەڵاتی ناوەڕاستدا زۆر جۆری تر بەشەهید دادەنرێیت، بۆ نموونە: ئەو کوردە سوورییانەی ساڵی ٢٠٠٤ بەهۆی ململانێیەکەوە مردن بەشەهید ناویان دەهێنرێت. ئەوانەی ڕۆژانە دەمرن بەهۆی هێرش دژی ئەمەریکاییەکان لە عێراق بەشەهید دادەنرێن. لە تارانی پایەتەختی ئێراندا دیوارێکی گەورە هەیە ناوی هەموو ئەوانەی لە شەڕی عێراق-ئێران و شۆڕشی ساڵی ١٩٧٩دا مردوون بەشەهید تۆمار کراون. هەروەها ڕەوشێکی نالەبار بۆ خۆتەقێنەوەکان، ئەوانەی دەیانەوێت شەهید بن، ئەوەیە ئیسلام ڕێگە بەخۆکوشتن نادات و حەرامی دەکات. هەروەک لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە نابێ بەدەستی خۆت خۆت بکوژی." وێڕای ئەمەش، لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر محەمەد (د.خ)دا هاتووە هەر یەکێک بەچەقۆ خۆی بکوژێت، دەبێ لە نێو ئاگری دۆزەخ تا هەتایە ئەم کارە دووبارە بکاتەوە، هەروەها ئەوانەی ژەهر دەخۆنەوە یان خۆیان لەسەر چیاوە فڕێ دەدەنە خوارەوە.

لەبەر هەندێ، سەرکردە موسڵمانە ڕادیکاڵەکان پەنا دەبەنە بەر ئایەت و فەرموودەکانی تر، دەڵێن هێرشی خۆکوشتن نابێ بەخۆکوشتن دابنرێت، بگرە دەبێ بەکاری شەهیدان دابنرێت (ئیجیتیهاد). ئیتر خواش پاداشتی شەهیدان دەداتەوە. لە قورئاندا هاتووە دەڵێ ئەوانەی خۆیان لە پێناو خوادا خەبات دەکەن، نەمرن، نەخێر ئەمانە نامرن بگرە لە لای خوا دەژین و دیارییەکانیان وەردەگرن.

باشە بۆچی خەبات لە پێناوی خوادا ئەوەندە گرینگە؟ هەندێ جار ڕۆژئاواییە مۆدێرنەکان زۆر زەحمەتە لەمە بگەن. شەڕوانە موسڵمانەکان هەست دەکەن ئەمە

شـەڕە. ئەوان شـەڕوانـی پڕ لە شـانازین لە نێـو خـەباتێکدا شـەڕ دەکـەن لە دژی ئەو دوژمنەی بەهـێزەی دەیەوێت بێهـێزیان بکات، سووکـایەتیـان پێ بکات و دواتر لە ناویان ببات، هەروەک جەیسن بێرک دەینووسێت.

بە ڕای مـوسـڵـمـانـە توندڕەوەکـان، ئەم خـەبـاتـە مـاوەیەکی زۆری پێ دەچێت، لە قسـەکانی ئوسامـە بن لادنیشـەوە ڕوون دەبێتەوە، بێرک لە کتێبەکەی بەم شێوەیە قسـەکـانی دەنووسێت " ئێـمـە پێمـان وایە لـە سـەرەتای ئەم شـەڕەداین. بۆیە ئەگـەر کـوژراین، دەسـتگیر کـراین یان دوژمـنانی خـوا سـەرکـەوتن، ئێـمـە نابێ ئـەوە لە بیر بکەین ئەمە ڕێگەیەکی دووردرێژە، هەر ئەم ڕێگەیەشە مـوسڵمـانەکان دەبێ تا ڕۆژی دوایی بەسەریدا بڕۆن."

مـوجاهیـدەکان زۆر خـۆگر و ئارام نین. ڕەجـەوی چەندین جار بەڵێنی بەهاوەڵانی خـۆی داوە حکوومـەتی ئێـران لە مـاوەی شـەش مـانگی داهـاتوودا لەناو دەچێت و دەڕووخێت، دەبێ ئەوانیش بۆ ئەمە ئامادە بن. بەڵام ئەو خۆنەگرییە زۆر پێوەندی بەو هەڵکەوتەوە هەیە کە پاداشتی ئەوان بەهەشت نییە، بگرە ژیانە لە ئێرانێکی ئازاددا. ئەوەی لە ڕێکخراوەکەدا هەردەم دووبارە دەکرێتەوە، هەمیشە هەموو پرسیارەکانیش لە لایەن ڕەجـەوییـەوە بەکـردارێکی توندەوە وەڵام دەدرێتـەوە، لەو هەڵکەوتەوە سەرچاوەی گرتووە کە ڕۆژە مەزنەکە (ڕووخانی حکوومەتی ئێران) بۆ مـاوەی شەش مـانگی تر دوا خـراوە. ڕەجـەوی زۆر شـتی لە مـاو و هەمـوو جۆرە دەروونناسـەکـان وەرگرتووە، بەڵام سـەرکردە مـوسڵمـانە ڕادیکاڵەکان باشتر تێ گەیشتوون ئەم جۆرە سنوورانە لەگەڵ ئەو نەمرایەتییە یەک ناگرێتەوە کە ئەوان بۆی تێ دەکۆشن، کەچی موجاهید ئەم شتانە بۆ پەیداکردنی ئەندامیش بەکار دەهێنێت.

لەبەر هەندێ، ڕەجـەوی شـەرم لەو چاوکانییانە ناکات بۆ نەمری، چونکە ئەو خۆی بەهێـزێکی پیـرۆزی شیـعی دەناسـێنێت و ئەم خـەباتەشی لە نەوەکـانی، حـەسـەن و حـوسـێن، بۆ مـاوەتەوە دژی خـەلیـفـەی فـەرمـانڕەوا. خـەبـاتی ئەوان جـەنگێکی ڕزگاریخـوازی بوو لە پێناو جیـهانێکی کـۆمـەڵایەتـی و باشـتـری ئیسـلام، بۆیە ئەو ئێستـا لەسـەر ئەم خەباتەی بەردەوام دەبێت. ئەو قسانەی ڕەجـەوی بۆ خۆی دروستی کـردوون وەک، سـەرکـردەی ڕوحـانـی و نوێنەری خـوا لەسـەر زەوی، ڕێگەی پێ دەدات

خۆی لەگەڵ دوامین و دوازدەمین ئیمامدا بەراورد بکات، دوامین خەلیفەی پێغەمبەر کە بەپێی قسەی شیعەکان، ون بووە و ڕۆژێک دادێت بگەڕێتەوە.

کەواتە ڕوون دەبێتەوە ڕەجەوی ئاین دەکاتە یەکێک لە پاساوەکانی خۆی و ناوەندێک بۆ گەیشتن بەدەسەڵاتی سیاسی. گرووپە موسڵمانە سیاسییەکان هەمان کار دەکەن. بۆ نموونە، گرووپە فەلەستینییەکانی وەک حەماس و حزبوڵڵا پەنجە بۆ پیرۆزیی قودس بۆ موسڵمانەکان درێژ دەکەن، دەشیکەن بەهۆکارێک تا ئیسرائیل کۆتایی بەداگیرکاری بهێنێت، هەروەها وەک پاساوێکیش بۆ بەکارهێنانی خۆتەقاندنەوە و توندوتیژی. ئاخۆ ڕەجەوی بەچ ڕێگەیەک دەگاتەوە سەر کاتی نەوەکانی پێغەمبەر، چونکە زۆربەی سەرکردە موسڵمانکان دەگەڕێنەوە بۆ کاتی نەوەکانی پێغەمبەر و ئەولاتریش. ئەو سەرکردە موسڵمانانە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامیی ئایدیال هی سەردەمی پێغەمبەر و ماوەی دوای ئەویش بەکار دەبەن، ئەو کاتەی کە ئیسلام بێ وەستان بەهەموو جیهاندا بڵاو دەبووەوە. بێگومان، هەموو سەرکردەکانی گرووپە تیرۆریستییە ئاینییەکان بەو سەردەم لێ دەخورن، تەنیا ڕەجەوی نەبێت. دواجار هەموویان لە یەک خاڵدا یەک دەگرنەوە ئەویش: دەسەڵاتە.

هەر لەم چوارچێوەیەدا هیجرەش هەیە کە موسڵمانە ڕادیکاڵەکان ئاماژی پێ دەکەن، واتە: جێهێشتنی ناوچەی دوژمنان بۆ ئەوەی هێزێکی نوێ لە ناوچەیەکی بێ لایەن دروست بکەیت، هەروەک پێغەمبەر محەمەد وای کرد کاتێ لە مەککەوە چوو بۆ مەدینە. چەند ساڵێک دواتر، بەهێزێکی باش بەهۆی چەندین هاوەڵەوە گەڕایەوە و دەستی بەسەر مەککەدا گرتەوە. ئوسامە بن لادن و هاوەڵانی هەمان کاریان ئەنجام دا چونکە بەهیجرە چوونە ئەفغانستان، دواتر بۆ سۆماڵیا و سودان و بۆسنیا و عێراق و چیچیان. خێزانەکانیشیان لەگەڵ خۆیاندا برد و لەوی خۆیان دامەزراندەوە، بەنیازی ئەوەی ڕۆژێک بەهێزێکی زلەوە بگەڕێنەوە ولاتەکانی خۆیان و حکوومەت بڕوخێنن و خۆیان ببنە حکوومەت.

دەتوانین ئەمە لەگەڵ ڕۆیشتنەکەی موجاهیدین بۆ فەرەنسا و پاشان بۆ عێراق بەراورد بکەین، هەرچەندە ئەمەی موجاهیدین هیچ نیازیکی ئاینیی لە پاڵەوە نەبوو. تەنیایی و دوورەپەرێزییان لە عێراق بەمەبەستی ئەوە بوو ڕۆژێک بتوانن بەهێزێکی

باشەوە بگەڕێنەوە ئێران و لەوێ دەسەلاتە بگرنە دەست. بەلام هەرگیز نەگەیشتنە ئەو مەرامە. پرسیار لێرەدا ئەوەیە: ئەگەر ئەمە ڕۆژێک بۆ موجاهیدین ڕاست بێت کە بەهێزێکی باش بگەڕێنەوە ئێران، ئەی باشە بۆ موسڵمانە توندڕەوەکان ڕاستە؟

یەکێک لەو شتانەی لە تەواوی گفتوگۆ لەگەڵ کۆنە ئەندامانی موجاهیدین هەر لە لام مایەوە ئەو بیرۆکەیە بوو کە ئەوان پێشەنگی بەشەکانی تری جیهانن. ئەمە خەیالبلاوییەکانی کابرای شکۆمەند "ڕەجەوی" بوو کە ئەم خاڵە هاوبەشەیان هەیە لەگەڵ موسڵمانە ڕادیکاڵەکاندا. باوەڕیان وابوو چالاکییەکانیان بۆ هەموو کەس گرینگترین شتن. خۆیان بەموجاهید، شەڕوانانی خوا دەزانن، خۆیان بەشەهید و پیرۆز دەزانن. هەروەها لەبەرئەوەی گرووپەکەیان لە هەموو گرووپەکانی تر باشترن، موجاهیدەکان نایانەوێت گوێیان لە هیچ شتێکی بێت لە بارەی هاوکاری و هەرەوەزیی هەر گرووپێکی تری ئۆپۆزسیۆنی ئێران. ئەوەی ڕازی نەبێت بەشیکردنەوەی ئەوان بۆ قورئانی پیرۆز، بێ باوەڕە. پێم وایە ئەمە دوایەمین وێنەی جیهانە، لەگەڵ ئەو شێوازەی کە ناسنامەیان تیایدا وابەستەیە بەفیکر و گرووپە ئاینییەکەیان، کە بەرەو جیهانێکی نامرۆڤانەیان دەبات تا لە بەرامبەرەکەیان هەڵگەڕێنەوە و بیانکوژن.

بۆ نموونە، حەماس ئەو واقیعە چەواشە دەکات کە قوربانیانی خۆیان لە هێرشەکانی ئیسرائیلدا چەند سڤیلێکی بێ تاوانن. سەرکردەکانی گرووپەکە قسە لەسەر کارەساتەکانی شەڕەکە دەکەن، هەمان شت دووبارە دەکەنەوە کە ئەمەریکاییەکان لە عێراق بەکاری دەهێنن کاتێ بۆمبێک دەتەقێتەوە و خەڵکی سڤیل دەکوژرێن. هەرچەندە قورئانی پیرۆز کوشتنی ئافرەت و منداڵی حەرام کردووە، بەلام حەماس دەڵێ ئێمە منداڵی ئیسرائیلی دەکوژین چونکە ڕۆژێک دێت دەبنە سەرباز بۆ ئیسرائیل، کاتێک ئیسرائیلییەکان لە ڕاپەڕینی فەلەستینیدا چەندان منداڵی فەلەستینیان کوشت: حەماس وتی ئەمانە بێ گوناه دەکوژن.

لە ناوچەی یاخیبووانی کشمیر، جیهادییەکان نەک هەر تەنیا سیاسەتوان و بەرپرسی حکوومی دەکوژن لەبەر هۆی سیاسی، بگرە ئەو سڤیلانەش دەکوژن کە گومانیان لێ دەکەن سیخوڕی بۆ حکوومەت دەکەن. هەبوونی گومان لەسەر

سڤیلێک، بەسە بۆ کوشتنی. ئەمە هەمان شتە لە نێو موجاهیدینی خەلقدا هەیە. تیمە تیرۆرییەکان فەرمانیان پێ دەکەن کەوا زۆر بەئاسانی شوانەکانی سەر سنووری عێراق و ئێران بکوژن، گوایە ئەو شوانانە کار بۆ دەزگای نهێنیی ئێران دەکەن. مەسعود ڕەجەوی هەمیشە لە بارەی سڤیلییەکان لە ئێران لە لایەن موجاهیدین پاساو بۆ هاوەڵەکانی دەهێنێتەوە و دەڵێت "ئەوانە قوربانین، بۆیە دەبێ گەلی ئێرانیش قوربانی بدەن تاوەکو ڕزگاریان بێت."

دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە شەهیدە گەنجەکان (ژمارەیەکی کەمتر بریتین لە ئافرەت) ژیانیان لە پێناو خەباتدا بەخت دەکەن، دەبن بەچەکێکی هەرزان بۆ سەرکردەی گرووپەکانی موجاهیدین. مەشقکردن بەخۆتەقێنەرە زۆری تێ ناچێت، هەر ئەوەندەی دەوێت هەر جارە و یەک کەس مەشقی پێ دەکرێت. هەر هێرشێک بەمەبەستی دروستکردنی بەرسڤێکە، بەئەنجامدانی ئەم کارەش هاوکاریی زیاتر بۆ ڕێکخراوەکە بەدەست دێت. دوای هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر، تیمێکی نوێ سەریان هەڵگرت بەرەو کەمپەکانی مەشق و ڕاهێنان لە ئەفغانستان. شەڕی دژی تیرۆری ئەمەریکایی لە دوای ئەو هێرشانەوە دەستی پێ کرد، خزمەتەکەی تەنیا بەهێزکرنی ویستی موسڵمانە ڕادیکاڵەکان بوو تا خۆیان بەخت بکەن لە پێناو بڕوادا. گرووپێکی فەلەستینیی وەک حەماس چەندین ئەندامی نوێ و خۆتەقێنەری بەدەست دەکەوێت کاتێ هێرش دەکاتە سەر ئیسرائیل و ئەوانیش بەتوندی وەڵام دەدەنەوە.

من وەک ڕۆژنامەنووسێک ناتوانم نکووڵی لەوە بکەم کەوا کەناڵەکانی ڕاگەیاندن ڕۆڵێکی گرینگ دەگێڕن لەم پرسەدا. کاتێ لە بارەی پرسێکی وا ڕاپۆرتێک پێشکێش دەکرێت ڕۆژنامەنووسەکان پەیامەکە دوورتر دەگەیەنن. ئەوەی هەستیار بێت، بەهەندی وەردەگرێت و دەچێت پێوەندی بەخەباتەکە دەکات بۆ جیهاد. هەروەها موجاهیدینیش "مردنی قارەمانانە"ی ئەندامەکانی تیمە تیرۆرییەکانیان بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر لە نێو کەناڵەکانی ڕاگەیاندندا دەقۆزنەوە و باسی دەکەن، هەروەها باسی ئەوەش دەقۆزنەوە شەڕوانەکانیان لە نێو زیندانەکانی ئێران و هێرشە دوژمنکارییەکانی ئێران بۆ سەر کەمپەکانی ئەوان لە عێراق. ئا بەم شێوەیە چەندین

جار لە میدیاکانەوە حکوومەتی ئێرانی بەحکوومەتێکی بکوژ و دوژمن دەژمێرن، بەمەش دەتوانن جارێکی تر چەندین ئەندامی نوێ و چەندانی خۆبەخشی تر بەدەست بێنن بۆ هێرشە تیرۆرییەکانیان دژ بەئێران.

جێسیکا ستێرن دەنووسێت "کاتێ چەند گەنجێک هەست بەجیاکاری و سووکایەتی دەکەن شەڕی پیرۆز ئەو کاتە دەست پێ دەکات، کاتێکیش سەرکردەکان دەزانن چۆن ئەو گەنجان بقۆزنەوە و بەهەر هۆیەک بێت بەتەواوی هاوکاریی داراییان دەکەن و یارمەتییان پێشکێش دەکەن."

کاتێ بەدوای خاڵە وێکچووەکاندا دەگەڕام، کە یارمەتییان دام ئاستی تیرۆری موجاهیدینی خەلق بزانم، چەندین خاڵی جیاوازیشم بۆ دەرکەوت. موسڵمانە ڕادیکاڵەکان و موجاهیدین ناتوانن ببنە دوو ڕووی یەک دراو. ئەمەش تەنیا لەبەر ئەو هەڵکەوتە نییە کە گرووپێکیان سوننییە و ئەوەی تریان شیعییە، لەبەرئەوەش نییە موسڵمانە توندڕەوەکان دەچنەوە سەر چاخی سەرەتای ئیسلام و ئەمڕۆش شیعەکانی ئێستا بەناپاک دەزانن.

لە جێبەجێکردنی هەموو هێرشە تیرۆریستەکاندا، جیاوازییەکی زۆر گرینگ هەیە. مەسعود ڕەجەوی کۆنترۆڵی تەواوی سەرکردایەتیی ڕێکخراوەکەیە و هیچ شتێک بێ زانین و ئاگەداریی ئەو ڕوو نادات. کردەکان زۆر بەچاکی بیری لێ دەکرێتەوە ئینجا جێبەجێ دەکرێن. بەڵام کردارەکان لای موسڵمانە ڕادیکاڵەکان زۆر بەوردی بیریان لێ ناکرێتەوە. زۆرجار دەرفەتی هاوپەیمانییەتییەک ڕێک دەخەن و پلانێک دادەڕێژن و چاو دەبڕنە یارمەتیی کەسانی نێو تۆڕی قاعیدە: یارمەتیی پارە و میکانیزمی جێبەجێکردن. پلانەکان لە کەمپەکانی ئەفغانستاندا، دادەڕێژرێن بەڵام زۆر بەسستی جێبەجێ دەکرێن لەبەر نەبوونی ئەو یارمەتییانە.

ئەو کەسانەی، کە بەسەرکەوتوویی مەشق لە نێو کەمپەکاندا تەواو دەکەن، پاش ئەوەی دەچنەوە ماڵ بەشدارییان پێ دەکرێت لە هێرشە تیرۆریستییەکاندا. وەک نەریت بن لادن خۆی هیچ لە بارەی کردەوەکانەوە نازانێت، بەڵام هەندێ جار تەنیا ئەوەی گوێ لێ دەبێت کە پلان دادەڕێژرێن و پارە و مەشقیان پێویستە. موجاهیدین ئەم جۆرە خۆکوژە لەخۆڕایانە ناناسن.

بەڵام ئەو شێوەیەی گرووپە موسڵمانەکان و موجاهیدینی خەلق لەسەری دامەزراون چەندین خاڵی وێکچوو لە نێوان هەردوویاندا دەخاتە ڕوو. هەردووکیان هێڵێکی سەربازی بەکار دەهێنن و فەرماندە و فیرقەشیان هەیە. ئەوان هەمیشە لە نێو شەڕدان و کەمپی مەشق و ڕاهێنانیان هەیە بۆ فێرکردنی کادیرەکانیان لە بواری سەربازی و هزری و ئایدیۆلۆجییەوە.

هەردوو گرووپ پشتیوانییان هەیە لە گرووپە موسڵمانە ڕادیکاڵەکانەوە، پشتیوانەکان بریتین لەو هاوسۆزانەی دوای تەواوبوونی مەشقەکانیان لە نێو کەمپەکان دەچنەوە شوێنی دانیشتنیان لە ڕۆئاوا و چاوەڕێ دەکەن فەرمانیان پێ بکرێت بۆ ئەنجامدانی شتێک، یانیش چاوەڕێی ئەفسەرێکی چالاک دەکەن تا لە هێرشێکی تیرۆریدا بەکاریان بهێنێت. ئەو کاتەی لە ماڵەوەشن بەردەوام هاتوچۆی ئەو مزگەوتانە دەکەن کە ئیمامە ڕادیکاڵەکان وتاریان لێ دەخوێننەوە و بەردەوام ئاگر خۆش دەکەن. لە نێو موجاهیدیندا، پشتیوان بریتین لەو هاوسۆزانەی لە چەند وڵاتێکی جیاجیای ڕۆئاوادا دەژین، هەفتانە لە ڕێگەی کاسێتی ڤیدیۆیی و ئەو کۆبوونەوانەی لە لایەن ئەفسەرە موجاهیدەکانەوە ڕێک دەخرێن بەشداری لە پرۆسەی بەمەزەبکردن و مێشک شووشتنەوە دەکەن. ئەگەر پێویستیشی کرد ئەوا بۆ خۆپێشاندان و مانگرتن و خۆسووتاندن و کارەکانی تر بەکار دەهێنرێن. لە نێو هەموو گرووپەکاندا، بەشداریکردن لەو کردانەی بەقسە دەوترێن هەندێ جار بەمردن کۆتایی دێت.

لێرەدا کرۆکی تیرۆری موجاهیدینی خەلق دەردەکەوێت، هەروەها بەچاوی مەسعود خودابەندەش بەم شێوەیەیە: "ئەو ڕێگەیەی بەکار هات بۆ بەرسڤی گرتنی مریەم، خۆسووتاندن، ئەوە دەردەخات ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە تیرۆریستن. ئەگەر تۆ بێ ئەوەی هیچ پرسیارێک بکەیت و خۆت بکوژیت، ئەوا بێگومان ئامادەشی بۆ کوشتنی یەکێکی تر بێ ئەوەی هیچ پرسیارێکیش بکەیت."

وەک ئەو سەربازە بەریتانی و ئەمەریکاییانەی کە سووکایەتییان بە دیلە عێراقییەکان کرد، نەک هەر ئەمە بگرە بەشانازییەوە وێنەی کردارەکانیان گرت، ئەو سەربازانە لە نێو بیری خۆیاندا کار لە پێناو هۆکارێکی باشدا دەکەن، بەهەمان

شێوە گرووپە موسڵمانە ڕادیکاڵەکان چەندین کردەی تیرۆرییان کردووە و وێنەشیان بەڤیدیۆ گرتووە. پاشان فیلمەکان لە ڕێگەی ئینتەرنێت و کەناڵە سەتەلایتە عەرەبییەکانەوە بۆ هەموو جیهان بڵاو دەکەنەوە و خۆشیان نیشانی دەدەن: ئەم کردارە سەرنجی کەسانی زیاتر ڕادەکێشن، ئیتر سەرکەوتووشن لە ئەنجامدانی ئەم کارەدا. لە ئینتەرنێت فیلمەکان بازاڕێکی باشیان هەیە و بەردەوام داونلۆد دەکرێن. لە ئەفغانستان چەندین کاسێتی ڤیدیۆیی لەسەر مەشق و ڕاهێنانەکان دۆزراونەتەوە: چۆنیەتیی ڕووتکردنی یەکێک لەسەر شەقام، چۆنیەتیی برینی باڵەخانەیەک، چۆنیەتیی گرتنی چەند بارمتەیەک، هەموو فەرمانەکانیش بەزمانی ئینگلیزی دەدرێنە کادیرەکان. لەم ڕووەوە جێسیکا ستێرن دەگاتە ئەو ئەنجامەی توندڕەوەکان لە سەرەتا مەشقیان پێ دەکرێت بۆ ڕاکێشانی زۆرترین سەرنجی کەناڵە ڕاگەیاندنییەکان.

تۆمارکردنی ئەم کارانە لەسەر کاسێتی ڤیدیۆیی لە نێو موجاهیدینیش ڕۆڵێکی گرینگ دەگێڕن، مەبەستەکەش ڕوونە. لە نێو ئەوانیش بۆ شانازی و لووتبەرزییە. بۆ ئەندامی تازە، ئەو کاسێتانە بۆ کاری سەربازی بەکار دەهێنرێن، نیشانی دەدات چۆن مریەم ڕەجەوی وەک فەرماندەیەکی سەربازی فەرمان دەدات. هەروەها هێرشە تیرۆریستییە سەرکەوتووەکان لە ئێران نیشانی ئەندامە تازەکان دەدەن. بەڵام ئەمانە هەرگیز لەسەر ئینتەرنێت دەست ناکەون و وەک کاسێتەکانی جیهادییەکان بەشێوەیەکی بەرفرەوان بڵاو نابنەوە.

گرووپە جیهادییەکان چەندین ماڵپەڕی ئینتەرنێتیان هەیە، هەروەها موجاهیدینیش گەلێک ماڵپەڕی ئینتەرنێتیان هەیە. بەڵام ماڵپەڕەکان بەناوی موجاهیدینەوە یان یەکێک لە نێو ڕێکخراوەکەیان نین بگرە هەمیشە بەهۆی ئارمەکەیان دەناسرێنەوە کە وێنەی ڕۆژ و شێرێکی لە سەرە، یان بەهۆی وێنەی مریەم ڕەجەوییەوە، هەروەها لە ڕێگەی ئەو ڕاپۆرتانەی لەسەر ئەوانەی دژی ئێران دەوەستنەوە (واتە موجاهیدینی خەلق) و ئەو سیخوڕانەی کار بۆ ڕێژیمی ئێرانی دەکەن (هەمیشە کۆنە ئەندامان) دەناسرێنەوە. ئەو ماڵپەرانە بەچەندین زمان پەخش دەکرێن و پرۆپاگەندەی زۆر بەهێزیشیان لەگەڵدایە.

پاشان هاوکاریی دارایی ئەو شتانە دێت کە لە سەرەوە باسمان کرد. ئەو گرووپە تیرۆریستییانە سوپاسی ئەو موسڵمانانە دەکەن کە لە ڕێگەی ڕێکخراوە خێرخوازییە ئیسلامییەکانەوە دیاری دەبەخشن. ئەمەش دوای کارەساتی ۱۱ی سێپتەمبەر ڕوون و ئاشکرایە. ئوسامە بن لادن توانیی خۆی بگەیەنێتە زۆر لەو فەندە خێرخوازییانە. گەلێک ڕێکخراوی خێرخوازی هەیە بەکراوەیی پارە کۆ دەکەنەوە بۆ قوربانیانی خەباتی ناوچە فەلەستینییەکان. ئەو هاوکارییە داراییانەش دیارین بۆ خێزانی شەهیدەکان لەوانەی یارمەتیی ئەو کەسەیان کردووە خۆی بتەقێنێتەوە. لە نێو موجاهیدیندا بەفرۆفێڵ پارە کۆ دەکرێتەوە. بۆ چەندین ساڵ پارە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا کۆ دەکەنەوە بۆ قوربانیانی ژێر دەستی ڕێژیمی ئێران، کەچی پارەکە دەدەن بەچەک.

وێڕای ڕێکخراوە خێرخوازەکان بۆ کاری خێر، کە گرووپە موسڵمانەکان خۆیانی پێ دەردەخەن و یارمەتیی بێوەژن و خێزانی شەهیدەکان دەدەن، نەخۆشخانە دەکەنەوە و قوتابخانەی خوێندنی قورئان دەکەنەوە، پارە بۆ ئەم کارە لە چەندین سەرچاوەی ترەوە دێت. زۆر لە گرووپە تیرۆریستەکان چەکیان لە جبەخانەی چەکی ئوسامە بن لادنەوە لە ئەفغانستان بەخۆڕایی هێناوە و ناشتوانن بەبێ یارمەتیی داراییی ئوسامە بوونیان هەبێت.

لە هاوکاریی ڕێکخراوە خێرخوازەکان گرینگتر، هاوکاریی وڵاتانە بۆ ئەو گرووپانە. پارە بۆ هاوکاریی شەڕ لە دژی ڕووس لە ئەفغانستان لە لایەن ئەمەریکا و پاکستان و عەرەبستانی سعودییەوە دەهات. پاکستانییە ڕادیکاڵەکان و گرووپە هیندییە موسڵمانەکان، کە چالاکن لە ناوچەی پڕ ئاریشەی کشمیر، چەک و پارە لە دەزگا هەواڵگرییەکان و سوپای هەردوو لای سەر سنوورەوە وەردەگرن. یارمەتیی ئەوان نەبوایە، شەڕ لە کشمیر دەمێک بوو تەواو بووبوو. لە ڕاستیدا، جەنگاوەرەکان سوپای تایبەتی بوون، زۆرجار کەس درکی پێ نەدەکردن، وەک موجاهیدەکان لە جەنگی کەنداوی ساڵی ۱۹۹۱ و دوای ئەوەش کاتێ وەک سوپایەکی تایبەت بۆ سەدام حوسێن شەڕیان کرد.

موجاهیدین مەزەبێکە دەرهاوێشتەی ڕێکخراوێکی چەپی دەسەڵاتخوازە، کە

سوپای تایبەت بەخۆی و دەزگای نهێنی خۆی هەیە، دوای بەجێ هێشتنی ئێران چوونە ژێر ڕکێفی چەند وڵاتێکی ترەوە. بەیارمەتیی عێراق، توانییان سوپای تایبەت بەخۆیان دامەزرێنن و چەکیان لە جبەخانەی چەکی سەدام وەردەگرت. هەر عێراقییەکانیش یارمەتیدەر بوون لە دامەزراندنی دەزگایەکی نهێنیی چڕوپڕ. فەرەنسییەکانیش هەمان هاوکارییان کردن کاتێ ڕەجەوی مەڵبەندی سەرکردایەتیی لە پاریس بوو.

جارێکی تر ئەمە ئاستی تیرۆری موجاهیدین دەسەلمێنێت. چونکە گرووپێکی ئۆپۆزسیۆن، کە ڕەجەوی ناوی ئۆپۆزسیۆنی لێ ناوە، چی پێویستییەکی بەدەزگای هەواڵگریی نهێنی هەیە؟ بۆ چاودێریی خەڵکی خۆیان، بەڵام بێگومان ئەم دەزگایە زۆر گەورەتر بوو لە چاودێریکردنی خەڵک. لەو بەڵگەنامانەی دەستیان بەسەر داگیرا لە کاتی هێرش بۆ سەر مەڵبەندی سەرکردایەتی لە پاریس، ئەوە دەردەکەوێت ئەو دەزگایە ڕاستەوخۆ دژی کۆنە ئەندامانی خۆیان و چالاکە سیاسییە ئێرانییەکانی تر و ڕەخنەگران لە ڕۆئاوا بوو. یەکێک لە ڕفاندنەکان لە کۆلن لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤، کە هەرچەند بووە مایەی تووڕەییەکی زۆر، خرایە ئەستۆی ئەو دەزگایەوە. ئەندامانی ئەو دەزگایەی موجاهیدین زۆر ڕۆڵیان هەبووە لە بڕوا پێکردنی ئافرەتاندا وەک نەدا حەسەنی کە لە تەممووزی ساڵی ٢٠٠٣دا خۆی سووتاند.

مەسعود خودابەندە، کە خۆی چەندین ساڵ دەستی هەبوو لەگەڵ ئەو دەزگا نهێنییەدا، باسی ئەوە دەکات بەشێکی گەمارۆی نێودەوڵەتیی دژی عێراق دەکەوێتە ئەستۆی هێنانی کەرەستەی قەدەغەکراو بۆ نێو وڵاتەکە. کارمەندە نهێنییەکانی دەزگای موجاهیدین لەلایەن عێراقییەکانەوە چەندین پرۆژەی تریان پێ سپێردرا بوو، وەک گواستنەوەی کەرەستەی هەستیار و ناردنی نامە و هەروەها بۆ کاری هەواڵگری لە ڕۆئاوا و ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست.

خودابەندە دەڵێت "نازانم چەند لە زانیارییە نهێنییەکان مانەوە دوای ڕووخانی بەغدا، بەڵام دەتوانم ئەوە بڵێم چەند بەشێکی لە لایەن دەزگای نهێنیی ئەمەریکاوە بەهاوکاریی ئیسرائیل بەکارهێنران." ئەم قسانە نەبوونی متمانە دیار دەخەن کە گەلێ لە کۆنە ئەندامانی موجاهیدین هەیان بووە. پێیان وابوو مەسعود ڕەجەوی بۆ چەندین ساڵە پێوەندییەکی باشی پاراستووە لەگەڵ دەزگای هەواڵگریی نهێنیی

ئەمەریکادا، ئەمەش تەواو پێچەوانەی ئەو وتارە سیاسییانەیە کە لە لایەن ڕێکخراوەکەوە دژی ئەمەریکا دەخوێندرانەوە.

ڕەنگە پێوەندییەکی هەمان شێوە لە نێوان بن لادن و دەزگای هەواڵگریی ئەمەریکاشدا CIA هەبێت، هەرچەندە جەیسن بێرک دەڵێت ئەم پێوەندییە هەرگیز ڕاستەوخۆ ڕووی نەداوە، چونکە پارەی ئەمەریکایی بەڕێگەی پاکستانەوە بۆ گرووپە چەکدارەکان دەچووە ئەفغانستان. کەواتە بن لادن هەرگیز ڕاستەوخۆ پارەی لە ئەمەریکاوە وەرنەگرتووە.

موجاهیدانی پێشوو دەڵێن بەڵگەی بەهێزیان هەیە بۆ هەبوونی پێوەندی لە نێوان سەرکردەکانیان و ئەمەریکاییەکاندا. یەکێک لەوانە حوسێن فورقانییە کە بەهیچ شێوەیەک هیچی تر متمانە بەڕەجەوی ناکات چونکە ڕەجەوی شتێکی دەگوت هەرگیز نەیدەگەیاندە سەر بگرە کارێکی تری دەکرد. حوسێن نموونەیەکم لە جەنگی کەنداوی ساڵی ١٩٩١ بۆ دەهێنێتەوە، کاتێ موجاهیدین ئەرکی ئەوەیان پێ دەسپێردرێت ڕاپەڕینی کوردان لە باکوری عێراق کپ بکەنەوە. حوسێن دەڵێت، "سەدام و ڕەجەوی لە پێوەندیدا بوون لەگەڵ ئەمەریکادا، ئەگەر وا نەبێت، بۆچی ئەو هەلیکۆپتەرانەی کە موجاهیدین دژی کوردان بەکاریان دەهێنا سنووری ناوچەی دژە فڕینیان دەبڕی لەسەر عێراق، تەنیا پێیان وترا بنیشنەوە، بۆچی تێکوپێک نەشکێنرا یان تەقەیان لێ نەکرا و نەخرانە خوارەوە؟ ئەمەریکاییەکان لە کفری یارمەتیی ئێمەیان دا و پێشیان وتین: ئێوە پێویستتان بەو هەلیکۆپتەرانە نییە، ئێمە لێرەین بۆ یارمەتیی ئێوە. ئەمەریکاییەکان نەیاندەویست ڕزگاریان بێت لە سەدام حوسێن، بەڵام دەیانویست بێ هێزی بکەن."

سەمەد نەزاری هاوڕێی حوسێن زیاتر لەم بارەیەوە دەدوێت "هەمیشە سەدام و ڕەجەوی پێکەوە لەگەڵ ئەمەریکادا کاریان دەکرد. ئەمەریکاییەکان نەیانویست لە ساڵی ١٩٩١دا سەدام لە ناو ببەن، چونکە دەیانزانی کورد و شیعە ڕاستەوخۆ یارمەتی لە ئێرانەوە وەردەگرن. ئەمەش بیرۆکەیەکی باش نەبوو بۆ ئەمەریکاییەکان: چونکە هەم هەرێمی کوردستان و هەمیش هەرێمی شیعە دەکەوتنە ژێر کاریگەریی ئێرانەوە."

ڕاستی ئەوەیە ئەمەریکاییەکان بۆ چەند مانگێک خۆیان تێکەڵ نەکرد، لە کاتێکدا شیعە لە باشوور و کورد لە باکور لە لایەن سەربازانی موجاهیدین و پیاوانی سەدامەوە سەر دەبڕان. تەنیا ئەو کاتەی هەموو جیهان دەستی کرد بەهاواری شەرم لەبەرئەوەی چەندان ملیۆن کورد عێراقیان بەجێ هێشت و چوونە نێو چیاکان و لە برسان مردن، ئینجا یامەرتییان پێ گەیشت، ئەو کاتە لەسەر ئەم خاڵە تایبەتییە، پاسەوانیی ناوچەی دژە فڕین کرا. بەڵام هەموو پسپۆڕگەل کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەمەریکاییی پشتی سەدامیان گرت کاتێ بینیان وا خەریکە لەناو دەچێت، ئەوان نەیانویست سەدام لەناو بچێت بەهۆی ڕاپەڕینەکانی کورد و شیعەوە بۆ ئەوەی بەردەوام سەدام وەک کارتێکی سیاسی دژی ئێران و سووریا و عەرەبستانی سعودی بەکار بێنن. لەبەر ئەم ڕۆڵەی سەدام، بۆ چەندین ساڵ هێشتیانەوە و تەنانەت هەر لەبەر هەندێش لە شەڕ لەگەڵ ئێراندا، بەچەک و زانیاری هاوکارییان کرد.

شتێکی زۆر سەیرە بۆ ڕێکخراوێک، بەسەرێک زۆر بەکراوەیی هەڵوێست دژی ئەمەریکا وەرگرێت و بەسەرێکی ترش لەگەڵیدا بێت، بەڵام ئاساییە موجاهیدینی خەلق ڕۆڵی لەم یارییەدا هەبووبێت. پێم وایە هاوتا و هاوبەشێکی پڕ بەهای ئەمەریکاییەکان بوون، چونکە هاوکاریی سەدامیان دەکرد و پێشینەیەکی ئێرانیان هەبوو و پێوەندیشیان باش بوو لەگەڵ سعودییەکاندا کە لقی خێرخوازیان لە بانکی لەندەن پڕ کردبوو لە پارە بۆ چەندین ساڵ هاوکاریی ئەم گرووپانە. لە ساڵی ٢٠٠٧دا قسە هەیە گوایە شازادەیەکی سعودی بەناوی بەندەر، باڵیۆزی پێشووی ئەمەریکا، بڕی ٧٥٠ هەزار دۆلاری بەخێر داوەتە موجاهیدین. پێوەندیی ئەمەریکاییەکان لەگەڵ سەدامدا هەر لە ڕێگەی سعودییەکانەوە بووە.

من باش ڕەچاوی ئەوە دەکەم وەزیری کاروباری دەرەوەی ڕەجەوی بەناوی محەمەد موهدسین ساڵی ١٩٩١ هەفتانە لە نێوان واشنتۆن و بەغدادا هاتوچۆی دەکرد. پرسەکە زۆر لەوە نزیکە پەیام و نامەی بۆ سەدام هێنابێ، کە ئەو کاتە زۆر دوورەپەرێز بوو لە دنیا بەهۆی گەمارۆی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە.

بەڵام ئاخۆ پێوەندیی نێوان دەزگای نهێنی ئەمەریکا و موجاهیدین چەندە نزیک بوون، بۆ ماوەیەکی درێژ کەس بەمەی نەزانیوە تا چەند ئەندامێکی پێشوو بەم

پێوەندییانەیان زانی. تا ئەو ساتەش، ئەمەریکاییەکان چەندین ساڵ پێشتر، موجاهیدینی خەلقیان لە لیستی هاوکاران و هەوڵەکانی خۆیان دانابوو بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی ئێران وەک نەتەوەیەکی مەترسیدار ببنەوە کە بەشێوەیەکی نایاسایی پەرە بەچەکی ئەتۆمی دەدات.

ساڵی ٢٠٠١ لقی سیاسیی موجاهیدین، ئەنجوومەنی نەتەوەیی بۆ بەرەنگاربوونەوە NCR، هێشتا لە ئەمەریکا قەدەغە نەکرا بوون، هەر لەو کاتەش لە ڕێگەی سەتەلایتەکانەوە بەوێنە ئەو شوێنانەیان لە ئێران بۆ ئەمەریکا ئاشکرا کرد کە یۆرانیۆم دەپیتێنن. لەبەر هەندێ، کەس پرسیاری لەوە نەکرد چۆن NCR ئەم زانیارییەی وەرگرت. موجاهیدینی خەلق هیچ سەتەلایتی نییە تا ئەم وێنانەی پێ بگرێت، هەروەها هێرشکرنیش بۆ چەندین ساڵ بۆ سەر خاکی ئێران سنووردار کرابوو لەبەر هێرشە تیرۆریستییەکان، هەموو ئەمانەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە هەرگیز موجاهیدینی خەلق نەیتوانیوە ئەو زانیارییانە بەهەر شێوەیەک وەرگرێت. ئەی باشە چۆن بێ چوونە خاکی ئێران ئەو زانیارییانە وەرگیران؟ ئەنجوومەنی بەرەنگاربوونەوە چەندین جار ئەو دەسکەوتە دووبارە دەکاتەوە گوایە وێنەی شوێنێکی گومانلێکراوی گرتووە لە تاران، وێنەکانی تونێڵەکەش نزیکە لە شوێنی ناتانز بۆ پیتاندن. هەروەها جارێکی تر، ئەمە بێ هیچ پرسیارێک ڕوو دەدات: واتە هیچ پرسیارێک لەسەر ئەوە ناکرێ بنەڕەتی ئەو وێنانە لە کوێوە هاتوون.

پێم وایە و زۆریش پێ دەچێت، وێنەکان لە سەتەلایەتی سیخوڕیی ئیسرائیلەوە وەرگیرابن. ئیسرائیل هەمیشە چاوی لەسەر کۆماری ئیسلامیی ئێرانە چونکە بەدوژمنی سەرەکیی خۆیانی دادەنێن، ئەوە بۆ چەندین ساڵە زۆر لە نزیک و بەوردییەوە چاودێریی ئێران دەکەن. ئیسرائیلییەکان لەوە دەترسن ئێران لە پرۆسەی دروستکردنی مووشەکی ئەتۆمیدا بێت کە ئەو مووشەکە دەتوانێت بگاتە خاک و زەویی ئیسرائیل. وێنەکانی سەتەلایەتی ئیسرائیل، لە ڕێگەی دەزگای نهێنیی ئەمەریکاوە دراونەتە ئەنجوومەنی نەتەوەیی بەرەنگاربوونەوەی سەر بەموجاهیدین، تا ئەوانیش نیشانی خۆیانی بدەنەوە.

ڕێکخراوەکە زۆر شیاوە بۆ ئەو سیناریۆیەی پارێزگارە نوێیەکان لە نێو کارگێڕیی

بووشدا دایانڕشت، بەهاوکاری لەگەڵ حزبی لیکودی ئیسرائیلی، کە یەکسەر لە ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست کاری بۆ کرا، بۆ ڕووخانی حکوومەتی ئیسلامی لە ئێران. سیاسەتوانە پارێزگارەکان بۆ ئەم سیناریۆیە ڕۆڵی سوپای ڕزگاریخوازی موجاهیدینی خەلق لە عێراق بەگرینگ دەزانن، وەک هەمان هاوپەیمانی پێشووی باکور لە ئەفغانستان، هەروەها لەگەڵ ئەو ڕۆڵەش کە بینییان بۆ ئەحمەد چەلەبی و کۆنگرەی نیشتمانیی عێراق لە کاتی ڕووخانی سەدام حوسێندا.

بزووتنەوە سیاسییەکانی تر ئەم گرووپە بەناوەندێک دەزانن بۆ بەرپاکردنی شەڕێکی نوێ لە نێوان عێراق و ئێراندا، بەئەنجامدانی ئەم کارەش ئێرانییەکان زۆر سەرقاڵ دەکەن و پێیان ناکرێت هیچی تر هەڕەشە لە ئیسرائیل و ڕۆئاوا بکەن. ئەمەش بێگومان تەنیا ئەو کاتە ڕوو دەدات کاتێ عێراق ببێتە خاوەن حکوومەتێکی سەقامگیر. کاریگەریی ئەم شەڕە چاوەڕوانکراوەی نێوان عێراق و ئێران دەبێتە هۆی لەناوچوونی حکوومەتی ئیسلامی لە ئێران: هەموو شیکردنەوە و لێکدانەوەکانیش بەو ئاراستەیەدا لە پرسەکە دەڕوانن.

کاتێ بۆ چەندین ساڵ موجاهیدینی خەلق لە نێو لیستی گرووپە تیرۆریستەکانی ئەمەریکادا بوو، سیاسەتوانە پارێزگارە ئەمەریکاییەکان، بەسەر بەرەی ئەنجوومەنی نەتەوەیی بەرەنگاربوونەوەدا هەڵدەشاخن (کە ئێستا تەواو ڕوون و ئاشکرایە) وەک بزووتنەوەیەک لە پێناو دیموکراسی و دەوڵەتی عەلمانیی ئێراندا خەبات دەکەن.

ئەم هاوکارییەش ڕاستییە، چونکە سیاسەتوانە نێودارە کۆمارییەکان بەرگری لە ئەندامانی ڕێکخراوەکە دەکەن کاتێ لەسەر جێبەجێکردنی چالاکیی نایاسایی دەستگیر دەکرێن. بۆ نموونە ساڵی ٢٠٠٠، کاتێ جۆن ئاشکرۆفت، ئەوساکە هێشتا سیناتۆر بوو لە میسوری، نامەیەک بۆ جانێت ڕینۆ دەنووسێت (وەزیری داد)، پاشان کۆواری نیوز ویک دواتر بەمە دەزانێت کە ئاشکرۆفت بەرگریی لە مەهناز سەمەدی دەکات کە ئێرانییەکە لە ئەمەریکا و وەک پەنابەرێکی سیاسی دەژیت. مەهناز لە کەنەدا دەگیرێت چونکە بێ ڤیزایەکی باوەڕپێکراو لەوێ بووە. باشە بۆچی ئاشکرۆفت ئەم هەوڵەی بۆ دەدات و بەرگریی لێ دەکات؟

کەنەدییەکان پێیان وایە مەهناز سەمەدی پێوەندییەکی نزیکی هەیە لەگەڵ موجاهیدینی خەلق و ئەوێی بەجێ هێشتووە و چووەتە ئەمەریکا. ئا لێرەدا ڕوون دەبێتەوە پێوەندییەکانی ڕاگرتووە لەو کاتەی داوای مافی پەنابەرێتیی کردووە لە کەنەدا، ئەمەش لەگەڵ دەزگای کۆچدا گرفتی بۆ دروست دەکات. سیناتۆر ئاشکرۆفت لە لای وەزیر ڕینۆ بەرگریی لێ دەکات و دەڵێت "چالاکێکی زۆر ڕێزداری مافەکانی مرۆڤە"، ئەم وەسفەش لە لایەن چەندین ئەندامی کۆنگرێس دووبارە دەکرێتەوە کە بەرگری لە موجاهیدین دەکەن. چالاکێکی مافی مرۆڤ؟ مەهناز سەمەدی فەرماندەی تانکە لە سوپای ڕزگاریخوازی نیشتمانی، هەروەها بەپێی هەندێ سەرچاوەی تر ئەفسەری پێوەندییەکانیشە لە نێوان موجاهیدین و دەزگای نهێنیی سەدام حوسێندا. من باوەڕ ناکەم ئاشکرۆفت بەپێشینەی ئەو ئافرەتە نەزانێت، چونکە نوێنەری ئەنجوومەنی نەتەوەیی بەرەنگاربوونەوە لە ئەمەریکا عەلی ڕەزا جەفارزادە، میوانێکی بەردەوامی نووسینگەی ئاشکرۆفتە.

سەمەدی لە ئۆتاوا دەستگیر دەکرێت، لە نێو باڵەخانەیەکدا کە زۆر دوور نییە لە باڵیۆزخانەی ئەمەریکاوە لە کەنەدا. ئایا مەهناز سەمەدی ڕۆڵی هەبووە لە پێوەندییەکانی نێوان موجاهیدین و سەدام و سی ئای ئەی ئەمەریکایی؟ هەرچییەک بێت، دوا جار لەگەڵ دەزگای کۆچ ڕێک دەکەوێت و ڕێگەی پێ دەدرێت بمێنێتەوە. ئاشکرۆفت ئەو کاتە وەزیری داد دەبێت.

چەند ساڵێک دواتر، هەمان ئەو جەفارزادەیە نوێنەری ئەنجوومەنی نەتەوەیی بەرەنگاربوونەوە، وەک شرۆڤەکارێکی ئێرانی بەکرێ دەگیرێت بۆ تەلەفزیۆنی فۆکسی ئەمەریکاییی پارێزگار. هەروەها داوا لە سیاسەتوانە پارێزگارەکانی ئەمەریکا دەکات وەک تۆم تانکریدۆ و بۆب فیلنەر لەگەڵ مێژوونووس دانیال پایپس کە لە کارگێڕیی بوش دەبێ پێوەندییەکانیان لەگەڵ موجاهیدینی خەلقدا بەکاربهێنن وەک کارتێکی ترسێنەر دژی ئێران، تا حکوومەتی ئێرانی هەمیشە ئەو ترسەی هەبێت و دوور بکەوێتەوە لەو دوژمنکارییەی لەگەڵ ئەمەریکادا. ئەم داوایە زۆر لە نێو کەمپی پارێزکارە نوێیەکان دووبارە کرایەوە: موجاهیدین بەکاربێنە، وەک ناوەندێکی پاڵەپەستۆ بۆ سەر ئێران تا بەرنامەی ئەتۆمییەکەی بوەستێنێت، یان ئەوەتا

موجاهیدین تاکە ئۆپۆزسیۆنن دەتوانن جێگەی مەلاکان بگرنەوە.

موجاهیدینیش خۆشحاڵی خۆی دەردەبڕێت لە بەرامبەر هێرشەکانی سەر سەنتەری بازرگانیی جیهانی، گۆرانی دژی ئەمەریکا دەچڕن، کار بۆ سەدام دەکەن و چەندین خاڵی وێکچوویان هەیە لەگەڵ گرووپە تیرۆریستەکانی سەر بەتۆڕی قاعیدە. هەروەها لە هەمان کات، وا بەدیاریش کەوت هاوڕێیەکی نزیکی پارێزگارەکان کە زۆر نزیکن لە سەرۆک بوش، سەرۆکی شەڕی دژی تیرۆر. لە هەمان کاتدا هەر ئەم موجاهیدینەیە لە نێو لیستی بوشە بۆ گرووپە تیرۆریستەکان، ئەی وا نییە؟ ئەمە شتێکە بەلایەنی کەم چەند پرسیارێک قووت دەکاتەوە. هەمان شت ڕاستە بۆ ڕۆڵی ڕەجەوی، کە بەشێکە لە سەرکردایەتیی بنەڕەتی موجاهیدین، کە لەسەر پەتی دژە ئەمەریکایی و دژە داگیرکاری یاری دەکەن. باشە یەکێکی ئاوا چۆن هاوکاریی ئەمەریکا دەکات کە ڕقی لێیەتی؟ مەسعود ڕەجەوی ناسووڕێتەوە و پڕوپاگەندەی ئەو هاوکارییە بکات. لە ناوەوە چەند کەسانێک نەبن بەم پێوەندییە دەزانن. زۆربەی ئەندامان تەنیا ئەوە دەزانن موجاهیدین ڕقی لە ئەمەریکاییەکان دەبێتەوە، هەروەها ئەوەش دەزانن شەیتانی گەورە تەنیا ئەو کاتە بەکار دەهێنرێت کە سوودی بۆ موجاهیدین هەبێت. بەڵام مەسعود ڕەجەوی زۆر باش توانیویەتی ئەندامەکانی زۆربەی کات بەتاریکی بهێڵێتەوە و هیچ زانیارییەکیان پێ نەگات.

ڕەجەوی خۆی بەکەسێکی باش دەزانێت. لە کاتی گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتی و ئەندامانی ڕێکخراوە تیرۆریستییە ئیسلامییەکان، جێسیکا ستێرن دەگاتە ئەو بڕوایەی کەمێک لە ڕاستییەکانی لەو ئەندامانە وەرگرتووە. دەڵێت "بەڵام ڕاستی پرسێک نییە بۆ تیرۆریستان و ئەوانەی هاوکارییان دەکەن. ئەوە هەڵخەڵەتاندن و ئازار و ئەشکەنجەیە کە دەبنە تیرۆریست، نەک ژیری."

سەمەد نەزاری، کە چەندین ساڵ پلەیەکی بەرزی هەبوو لە سوپای ڕەجەویدا دەڵێت " ڕەجەوی ئامادەیە هەموو شتێک بکات تا دەسەڵاتەکەی بپارێزێت. حەز دەکات دۆقە لەگەڵ هەموو کەسێکدا بکات بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات و لای ئاساییە هەموو بنەماکانی لە پێناو دەسەڵاتدا لە ناو ببات." حوسێن فورقانی هاوڕێی سەمەد بەتوندی دەڵێت "بەڵام هەر خۆی هیچ بنەمایەکی نییە. ڕەجەوی

لەسەر حیسابی بەهاکانی ئێمە یاری دەکات، هەروەها لەسەر حیسابی بەها نێودەوڵەتییەکانیش. یەکەم جار دژی داگیرکاری بوو، ئێستاش کار لەگەڵ ئەمەریکا و ئیسرائیلدا دەکات."

جێسیکا ستێرن وەسفی ئەوە دەکات تا چ ڕادەیەک هەندێ لە سەرکردەکانی موسڵمانە ڕادیکاڵەکان سەرکردەی پراگماتیکین. ئەو گرووپە موسڵمانانەی دەیانەوێت هەموو جیهان بکەنە ئیسلام بەهۆی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی لە کشمیر، ڕێگە بەخۆیان دەدەن سوپای پاکستانی بەسەریاندا زاڵ بێت. لە ڕاستیدا، شەڕ لە پێناو کشمیر بووەتە تاکە هۆی بوونیان، چونکە ئەو شەڕە پارەیان بۆ کۆ دەکاتەوە و بەو پارەیەش دەژین، چونکە بەئیسلامکردنی هەموو جیهان دەمێکە ڕەت کراوەتەوە. ئا لێرەدا بۆم دەردەکەوێت موجاهیدین بەپارەی سەدام حوسێن بۆ چەندین ساڵ وەک پێنجەم لایەنی ژێردەستەی سەدام کارەکانیان ڕاپەڕاندووە.

ڕەجەوی ئایدیۆلۆجیای ڕێکخراوەکەی دەگۆڕێت بۆ ڕێبازێکی شەخسی لەگەڵ بۆنی ئیسلام و بۆنی خەبات لە پێناو ئازادیدا. هەروەها ئوسامە بن لادنیش چەندین جار ئامانج و مەرامەکانی خۆی دەگۆڕێت. لە سەرەتا، ئوسامە دژی ڕێژیمە ناپاکەکانی ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست وەستایەوە، ئەو ڕێژیمانەی ئیسلامی ڕاستەقینەیان بەجێ هێشتووە و ڕێگە بەئەمەریکا دەدەن داگیریان بکات. یەکەم بانگەشەی بۆ شەڕی پیرۆز لە ساڵی ١٩٩٢ دژی سەربازانی ئەمەریکایی بوو لە عەرەبستانی سعودی و قۆچی ئەفریقیا. دووەم بانگەشەی لە ساڵی ١٩٩٦ بوو کە بریتی بوو لە لیستێکی ٤٠ لاپەڕەی تیرۆرەکانی ڕۆئاوا بەرامبەر بەموسڵمانان کراون. لە ساڵی ١٩٩٨، سێیەم بانگەشەی کرد و فەتوایەکی دا دژی هاووڵاتیانی ئەمەریکایی، چونکە ئەمەریکا چەندین تاوانیان دژی موسڵمانان لە سعودیە و عێراق و دەوڵەتە ئیسلامییەکان ئەنجام داوە. چوارەم بانگەشەی ساڵی ٢٠٠١ بوو کە جەخت دەکاتە سەر ناوچە داگیرکراوەکان لە لایەن ئیسرائیلەوە.

جێسیکا ستێرن دەڵێت "بن لادن زۆر نزیک بوو بێتە ماڵەوە، بەڵام ڕێگەکەی درێژ بووەوە و تێبینیی ئەوەی کرد تێڕوانینەکەی بۆ ئیسلام پشتیوانیی کەمی ئەو موسڵمانانەی کۆ کردەوە کە دەیویست پێیان بگات. بەهۆی بەکارهێنانی پرسی

سۆزداریی داگیرکردنی فەلەستین لە سەرانسەری جیهانی ئیسلامیدا، هەوڵی دا دڵ و بیر و ناخی موسڵمانە ئاساییەکان داگیر بکات."

جەیسن بێرک شتێک بەیەکێک لە گرفتەکانی بن لادن دەزانێت، ئەویش ئەوەیە، زۆربەی هەرە زۆری موسڵمانان باسی ڕەخنە و کێشەکانی ئەو دەکەن بەڵام کەس نایەوێت و ئامادە نییە کارێک بکات بۆ توندڕەوی و ئەو ڕێگەیەی ئەو گرتوویەتە بەر. هەرچەندە زۆر لە موسڵمانان ناڕەزایی دەردەبڕن بەرامبەر ئەو هێرشە خوێناوییانەی ئوسامە ئەنجامیان دەدات، بەڵام زۆریش هەن بەو پیاوە سەرسامن کە بەرامبەر ئەمەریکای لەخۆبایی و چارەنەویست دەوەستێتەوە.

هەمان شت ڕاستە بۆ موجاهیدینی خەلق. ناڕەزایی موجاهیدین لە ڕێژیمی ئێران بۆ چەندین ساڵ بەملیۆن کەس لە دەرەوە و ناوەوەی وڵات پشتگیری دەکرد. هەرچەندە ئۆپۆزسیۆن چەند ساڵێک لە ژێر حوکمی نێوانڕۆی سەرۆک خاتەمیدا کەمتر توندوتیژ بوون لە جاران، ئۆپۆزسیۆن هەر دژی حکوومەتێکی چەوسێنەر دەوەستێتەوە. بەڵام ڕێیەکان و ئامانجی دەوڵەت (خەباتی چەکداری کە لە کەمپەکانی خاکی دوژمنەوە «عێراق» جێبەجێ دەکران) لە ژێر سەرکردایەتیی مەسعود ڕەجەوی بەتەواوی ئاڵوگۆڕ نەکران.

دەتوانی چی لە موجاهیدین چاوەڕێ بکەیت ئەگەر بەڕاستی ڕۆژێک لە ڕۆژان دەسەڵات لە ئێران بگرنە دەست و ئەگەر ڕەجەویش کوتلەیەکی نوێی دامەزراند وەک کوتلەی دوژمنە کۆنەکەیان: دوا شای سەرۆکی ئێران؟ ئایا ئەو کاتە شوێنێک پێشکێش بەئۆپۆزسیۆن دەکەن، لە کاتێکدا ئۆپۆزسیۆن بەتەواوی قەدەغەیە لە نێو ڕێکخراوەکەدا؟ ئاخۆ دان بەمافی ڕۆژنامەوانیدا دەنێن، لە کاتێکدا میدیاکانیان بەسانسۆرترین میدیان لە هەموو جیهاندا؟ ئاخۆ ڕەوشی نێو زیندانەکان باشتر دەکەن، لە کاتێکدا خۆیان ئازار و ئەشکەنجەی دیلی نێو زیندانەکانیان دەدەن؟ ئاخۆ ئەو گەندەڵییە نەگریسە ڕیشەکێش دەکەن لە ئێران، لە کاتێکدا چەندین ساڵە پارە لە ڕێگەی ساختەکاری و گومڕایی و دەسخەرۆکردنی ئەوانی ترەوە بەدەست دێنن؟

ئەو پرسیارانە گرینگتر و پڕ پاڵەپەستۆتر دەبن کاتێ سەیری ئەو چالاکییە نایاسایییانە دەکەین کە موجاهیدین بەئەنجامدانیان تاوانبارە. موجاهیدین

بەپاسپۆرتی ئەندامەکانی تر گەشت دەکەن کە فیزەی پێویستیان هەیە بۆ وڵاتێکی ئەوروپایی دیاری کراو. زۆرجار گوێم لەوە بووە پاسپۆرتیان دەسکاری کردووە، بۆ نموونە ساڵی ١٩٩١ کاتێ ژمارەیەکی زۆر منداڵ لە عێراقەوە گوێزرانەوە ئەوروپا، چەند ساڵێک دواتر دووبارە پاسپۆرت دەسکاری کرا کاتێ هەمان ئەو منداڵانەیان لە رۆئاواوە هێنایەوە نێو عێراق. تەنانەت لە پاریس بەشێکی تایبەتی هەیە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە. مەسعود خودابەندە پێمی وت دەزگای هەواڵگری نهێنیی عێراق لە نێو دەزگای هەواڵگریی رەجەوی فێری ئەو و هاوەڵەکانیان کردووە چۆن پاسپۆرت دەسکاری بکەن و هەروەها فێریان کردوون چۆن بەئاسایی بەنێو باڵەفرگەدا تێپەڕ بن بێ ئەوەی کەس هەستیان پێ بکات.

لێرە چەند خاڵێکی هاوبەش هەیە لەگەڵ گرووپە موسڵمانە توندڕەوەکاندا. بۆ نموونە ستێرن و بێرک دەنووسن خزمەتی سەربازیی خەڵکی سقیل بەشێک بوو لە مەشق و ڕاهێنانی نێو کەمپەکانی ئەفغانستان و پاکستان. وانەکانی ئەو مەشقانەش ئەمانە بوون: تیرۆریزم، دەسکاریکردنی پاسپۆرت و بەڵگەنامەکان، مامەڵەکردن لەگەڵ ژەهر، دانانەوەی مین، هەروەها کۆرسێک لەسەر ئەوەی چۆن نەهێڵیت پۆلیس پێت بزانن و خۆدەربازکردن لە پۆلیس. کاتێ هێرشە کرایە سەر خانەکانی تۆڕی قاعیدە، چەندین پاسپۆرتی دەسکار و ئامێری دروستکردنی پاسپۆرتی دەسکار دۆزرانەوە. هەندێ لە دیلە ئافرەتەکان، بەتایبەتی ئەوانەی هۆڵەندا، دەڵێن هیچ کارێکی تریان نەکردووە جگە لە دەسکاریکردنی پاسپۆرت بۆ ئەندامەکانیان. لەو پیاوانەی دەستگیر کراون لەسەر ئەنجامدانی هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر، ئەوە ئاشکرا دەبێت هەندێکیان تەنیا پاسپۆرتیان دەسکاری کردووە. توندڕەوەکانی تر، پێش ئەوەی بتوانن هێرشەکانیان جێبەجێ بکەن دەستگیر دەکرێن، ئەوە دەردەکەوێت کە تەنیا تاوانبارن بەدەسکاریکردنی کرێدیت کارت و تەنانەت دزین و برینی ڕۆژانە.

جیهادییە عەرەبەکان نەک هەر تەنیا پاسەپۆرتی یەکتریان بەکارهێناوە، بگرە ناسنامەی یەکتریشیان بەکارهێناوە. ڕۆژنامەیەکی بۆسنایی ئاشکرای دەکات کەوا جیهادییەک، خۆی و خێزانە بۆسنییەکەی دوای شەڕ هەر لە بۆسنیا دەمێننەوە، پاش

ئەوەی دەمرێت ئاشکرا دەبێت ئەو پیاوە نییە چەندین ساڵە پێیان زانیوە. ناسنامەی جیهادییەکی تری بەکارهێناوە، ئەوی تریش دەچێتە ئەمەریکا و پێوەندیی هەبووە لەگەڵ گومانلێکراوانی ١١ی سێپتەمبەر. هەروەها ئەوەش زانراوە کە ئەندامانی موجاهیدینی خەلق چەندین ناسنامەی جۆراوجۆریان هەبووە. هەندێکیان لە کاتی داوای مافی پەنابەری لە وڵاتانی ڕۆئاوا ناوێکی نوێیان لە خۆ ناوە و پاسپۆرت و ناسنامەی نوێیان وەرگرتووە کە بۆ چەندین ساڵ بەکاریان هێناوە. هەروەها ئەوەش ئاشکرا بووە کە قاعیدە و موجاهیدینی خەلق ئەو پارەیەی بەناوی خێرخوازییەوە وەریان گرتووە هەموویان لە تیرۆریزمدا خەرج کردووە، ئەمەش بەچالاکییەکی نایاسایی دادەنرێ. هەمان شت ڕاستە بۆ ئەو ڕێکخراوە ناحکوومییانەی بازرگانی بەچەکەوە دەکەن، وەک ئەوەی لە پاکستان ڕووی دا.

باشە چ ناوێک لەو حاڵەتە دەنێیت کاتێ ڕێکخراوێک سەربازەکانی بەکرێ بداتە وڵاتێک کە تیایدا تەنیا میوانە، ئەویش بەمەبەستی کپکردنەوە و دامرکاندنەوەی ڕاپەرینی گەلێکی ستەمدیدە لە دژی ڕێژیمی ئەو وڵاتە؟ پێم وا نییە ئەو کارانەی موجاهیدینی خەلق دژی کوردان ئەنجامیان دا لە لایەن یاسای نێودەوڵەتییەوە دادگایی بکرێن و لێپێچینەوەیان لەگەڵ بکرێت.

ئەندامێکی پێشووی موجاهیدین سوێندی بۆ من خوارد کە ڕێکخراوەکەی لە ناوەڕاستی نەوەتەکاندا سەربازی ڕەوانەی ئەفغانستان کرد بۆ هاوکاریی تالیبان. ئەو ئەندامە تاکە سەرچاوەی منە، بەڵام پێم باش بوو هەر باسی بکەم. وێڕای ئەمە، دەبێ ئاماژە بەوەش بکەم کە خاڵە هاودژەکانی نێوان تالیبان و موجاهیدین زۆر سەیرن: سوننەی ڕادیکاڵ بەشیعە دەڵێت ناپاک. لەوەش سەیرتر هاوپەیمانێتییەکانی نێوانیانە. پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ هەیە لە نێوان موجاهیدین و قاعیدەدا، کە ئەوەی دواتریان ئەوساکە هێشتا وەک جۆرێک لە ئاژانسی دامەزراندن بۆ شەڕوانە ئیسلامییەکان کاری دەکرد، چونکە قاعیدە بەئاشکرا یارمەتیی موجاهیدینی دەدا لە گەشتکردنیان لە خانەی میوانانەوە لە پاکستان بۆ شەڕوانە ئیسلامییەکان لە ئەفغانستان.

ئەندامێکی پێشوو پێمی وت ئەم پرسە لە لووتکەدا بوو لە نێو ڕێکخراوەکەدا، زۆر

جار لەسەر هەندێ ڕووبەڕووی پیاو گەورەکان دەبوونەوە. مەهدی ئەبریشماچی ئەوەی دووپات کردەوە کە بەڕاستی موجاهید ڕەوانەی ئەفغانستان کراون، دەڵێت "ئەگەر ڕەوانەکردنی سەرباز بۆ ئەفغانستان دژی ئێران بێت، ئەوا ئامادەین نەک هەر تەنیا لەگەڵ ئەفغانستان بگرە ئامادەین لەگەڵ شەیتانیشدا کار بکەین." ئەندامانی تر کە ئاگەداری چیرۆکی تالیبان نەبوونە دەڵێن ئەم قسەیە ڕاستە، بەڵام هێشتا حەز ناکەن قسەی لەم جۆرە بکەن. عەلی قەشقەوی دەڵێت "سەدامیش یەکێک بوو لەو ئامێرانە سوودمان لێ وەردەگرتن بۆ دژایەتیی ئێران. هەر شتێک بۆ گەلی ئێران بێت، ئێمە ڕێگەمان پێ داوە و کردوومانە."

هەرەوەزی لەگەڵ سەدام حوسێندا زۆر چڕوپڕ بوو. ئەو قسەیە ڕاستە کە موجاهیدین چەندین ملیۆن دۆلاریان پێ درابوو لە داهاتی نەوتی عێراق، بەڵام ئەو پاداشتە لە پای چی بوو، تا ئێستا ڕوون نییە. ڕەنگە لەبەر هاوکاریی موجاهیدەکان بووبێت بۆ دەربازکردنی تانکەرە نەوتییەکان لە دەرەوەی گەمارۆی ڕەسمیی ئابووری. یان پاداشتی ئەوە بووبێت کە موجاهیدین چەندین کەرەستەی کیمیاوییان بەقاچاخ هێنابێتە عێراق تا سەدام بۆ چەکی نوێ بەکاریان بهێنێت، بەڵام هەر زوو پشکنەران ئەو کەرەستانەیان نەهێشت: مەسعود خودابەندە ئەمەی پێ وتم.

بەڵام دەکرێ لە هەموو ئەم شتانە خراپتریش هەبێت، ئەگەر ڕاپۆرتەکانی دەرەوەی عێراق لە ناوەڕاستی ساڵی ٢٠٠٧دا ڕاست بن. لە وەتەی ڕووخانی سەدام، موجاهیدین لە نێو عێراق وەک مشەخۆر لەسەر هاوکاریی ئەو گرووپە سوننییانە دەژین کە بەرەنگاری کاریگەریی ئێرانی لەسەر وڵاتەکە دەبنەوە. سوننە توندڕەوەکان لە عێراق ڕقیان لەو شیعانەیە کە دەسەڵاتیان بەدەستە و بەبەشێک لە ئێرانیان دادەنێن. بەڵام هیچ گرفتیان نییە لەوەی کە ببن بەیەک تیم لەگەڵ شیعە ئێرانییەکاندا ئەگەر ئەوانیش هەمان دوژمنیان هەبێت: ئەویش ڕژێمی تاران.

کەمپی ئەشرەف کەوتووەتە پارێزگای دیالە لە عێراق. قاعیدە چەند بەشێکی ئەو پارێزگایەی کۆنترۆڵ کردووە، کە ئێستا پێی دەوترێت "دەوڵەتی ئیسلامیی عێراقی" و هەر قاعیدەشە بەرپرسە بۆ زۆربەی ئەو توندوتیژییەی لەو پارێزگایەدا ڕوو دەدەن. لەبەر هەندێ سەرۆک هۆزە سوننییەکان پێوەندییان بەچەند هێزێکەوە کردووە بۆ

ئەوەی بتوانن بەرەنگاری قاعیدە ببنەوە و دژیان بوەستنەوە. یەکێک لەو سەرۆک هۆزانە دەڵێت کە موجاهیدین هاوکاریی دارایی ژمارەیەک گرووپی چەکداری بەعسی ڕووخاو دەکەن، کە سەر بەقاعیدەن و لە گوندەکانی چواردەوری کەمپی ئەشرەف دامەزراون. (پارە) ئامێرێکی زۆر بەهێزە بۆ ئەنجامدانی هێرشە تیرۆریستییەکان لە تەواوی عێراقدا، ئەو پارە خەرجکردنەش بەشێکە لە هەڵمەتە دزێوەکانی قاعیدە بۆ تێکبەردانی سوننە و شیعە تاوەکو لە نێو عێراقدا لە دژی یەکتر بووەستنەوە و ڕەوشەکە ئارام نەبێت. لەبەر هەندێ نووری مالیکیی سەرۆک وەزیرانی عێراق چەندین جار دووپاتی کردووەتەوە کە ئەو موجاهیدینی خەلق بەڕێکخراوێکی تیرۆریستی دادەنێت و نابێ هیچ شوێنێکیان هەبێت لە نێو عێراقدا.

ناڕەحەتیی ئەو کەسانەی لە نێو موجاهیدینەوە دژی ئەو جۆرە کارانە دەوەستنەوە لەم چەند ساڵەدا ڕووی لە زیادی کردووە. بەڵام موجاهیدین وەک زیندانییەک وایە، دەرچوون لێی وەها ئاسان نییە. بەجێ هێشتنی گرووپێکی موسڵمانی توندڕەو کارێکی زۆر ئاستەمە، ئەوانەش کە دەستبەرداری ئەو گرووپە ببن دووچاری گەلێ تەنگوچەڵەمە دەبنەوە. تەنانەت قسەکردنیش لەسەر ئەم بابەتە زەحمەتە. ڕووبەڕووبوونەوەی کراوە دژی سەرکردایەتیی موجاهیدین و ئەو گرووپە توندڕۆیانە دەبێتە هۆی چاندنی گومان لە نێو ناخی ئەوانی تردا. جێسیکا ستێرن ڕێگە بەشەڕوانێکی ناقایلی پاکستانی دەدات لای ئەو ناڕەزایی دەربارەی ئەو هەڵکەوتە دەربڕێت کە یازدە هاوەڵی ئەو پاکستانییە بەگوللە کوژراون لەبەرئەوەی گوێڕایەڵی فەرمانەکان نەبوونە. ئەو پاکستانییە پێی وایە ساڵانە لە کشمیر ۳۵ تا ٥٠ ئەندامی گرووپە تیرۆریستەکان دەکوژرێن لە لایەن هاوەڵانی خۆیانەوە هەر لەبەر هەمان هۆی ئەوەی گوێڕایەڵ نەبوون بەفەرمانەکان. هەروەک ئەوەی بەسەر حوسێن فورقانی و هاوەڵەکانیدا هات کاتێ شۆڕشی کوردەکان لە ساڵی ۱۹۹۱دا کە تانکەکانیان لە لایەن سەربازانی خۆیانەوە تێکوپێک شکێنران.

سەدای ئەو ناڕەحەتییەی، لە لایەن موجاهیدیانی پێشووەوە هەبووە لە بەرامبەر کار و کردەوەکانی سەرۆکی ڕێکخراوەکەیان، بەدەنگی بەرزی شەڕوانێکی خانەنشینکراو لە کشمیر بەگوێماندا دەزرینگێتەوە کە ستێرن دیمانەیەکی لەگەڵدا

ساز کردووە. ئەو شەڕوانە ناڕەزایی لای ستێرن دەکات و دەڵێت ئەو سەرکردانە وا لە نێو دەریاری پارەدا دەگەوزن، خەباتی ئەمانە هیچی تر خەباتێکی ئاینی نییە، بگرە خەباتێکە لە پێناو بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی پاکستانی. ئەو هەڵکەوتانە لە جیهادییەکان شێردراوەتەوە، وەک ڕەوشە ڕاستییەکەی نێو عێراق و ئاستی هاوکاری لەگەڵ سەدام لە ئەندامانی موجاهیدین شێردرابووەوە.

ئەو پاکستانییە دەڵێت "کاتێ دەبینم چۆن ئەو گەنجانەی کشمیر ژیانی خۆیان پێشکیش بەو شتە دەکەن پێیان وایە جیهادە، من هەست بەپەشیمانییەکی قووڵ دەکەم. وا هەست دەکەم ئێمە دەستپێشخەری ئەو توندوتیژییە بووین. ئێمە هۆکاری ئەو وێرانکارییە بووین. من لەو بڕیارە پەشیمانم خەڵکم ڕەوانەی ئەو ڕێگەیە دەکرد. لەگەڵ هەر نەوەیەکی نوێ بناوانگری ئیسلام ناشیرینتر و ناشیرینتر دەبێت. ئەم نەوەیە جگە لە ڕق هیچ شتێکی تر نابینێت. گەشتێکی پڕ لە ئازار و کەسەرە. تاڵ و ترش وەک خواردنی لیمۆیەک وایە. ڕق ژەهرە. گەر ڕقت هەبێت ئەوا واتە خۆت ژەهراوی کردووە. ڕق ڕق دروست دەکات. ناتوانی ئازادی بەڕق بچێنیت." ئەمە شتێکە موجاهیدەکان پێیەوە پێگیرن. حوسێن فورقانی دەڵێت "بنچینەی موجاهیدین و مەسعود ڕەجەوی بریتی بوو لە ڕق دژی ڕێژیمی ئیسلام، ئێمەش پڕ بووین لەو ڕقە. ئێمە ڕۆژانە دەرزیی ڕقمان لێ دەدرا. خومەینی هەموو منداڵەکانی ئێمەی کوشت. جگە لە دەستدرێژیی سێکسیی نێو زیندانییەکانی ئێران گوێمان لە هیچی تر نەدەبوو. ئا بەم فیشاڵە ڕێکخراوەکە یەککرتوو بوو."

ئەوەی سەرکەوتوو بووبێت لە بەجێ هێشتنی موجاهیدین، ئینجا درک بەوە دەکات چەندە زەحمەتە بەبێ ئەوان بژیت. جێسیکا ستێرنیش دوای گفتوگۆی لەگەڵ ئەندامانی ڕێکخراوە تیرۆریستەکان دەگاتە ئەو ئەنجامە و دەنووسێت " پاککردنەوەی جیهان بەهۆی شەڕی پیرۆز بریتییە لە خووێک. ئەو خووە یان ئەو شەڕە پیرۆزە سنووری نێوان ئێمە و ئەوان دیاری دەکات، قایلکردنی ئارەزووەکانی مرۆڤە بۆ ناسنامەیەکی دیار و ئامانجێکی دیاریکراو لە ژیان، هەروەها ئەو شەڕە دەوڵەتێکی پاک و پڕ لە خۆشی دروست دەکات."

ئەم شرۆڤەیە موجاهیدەکانیش لە سەری دەڕۆن. لەم بارەیەوە حوسێن فورقانی بۆ

من دەدوێت " موجاهیدین خوویان بەمەسعود ڕەجەوی گرتووە: سەیری بکەن و گوێی بۆ شل بکەن." عەلی قەشقەوی کە سەرکردایەتیی هێرشە تیرۆریەکانی لە ئێران کردووە و جێبەجێی کردوون، دەڵێت " ئەو کەسانەی بۆ ماوەی سەرووی بیست ساڵی لە نێو موجاهیدین، ناتوانن هیچی تر بیر لە خۆیان بکەنەوە. مەسعود ڕەجەوی هەمیشە لەو باوەڕەدا بوو کە هاوەڵەکانی ناتوانن بەبێ ئەو هیچ کارێک بکەن." ئاراش سامیتی پوور دەڵێت "من زۆر شانازی بەخۆمەوە دەکەم کە توانیم ئەم کارە بکەم و جێیان بهێڵم." مەسعود خودابەندە دەگاتە ئەو باوەڕەی کە ئەو کارەی ڕەجەوی کردوویەتی کارێکی نایاسایی نەبوو و هەروەها هەمان کێشە بۆ دادوەرە ڕۆئاواییەکان سەرهەڵدەدات کاتێ دەیانەوێت تاوان بخەنە ئەستۆی گرووپە موسڵمانە توندڕەوەکان. " ڕەجەوی مێشکی هاوەڵەکانی پاوان دەکرد، بەڵام ئەوە کارێکی قەدەغەکراو نییە، ئەمە کێشەی ئێمەیە."

پرسیارەکە ئەوەیە ئاخۆ ئەوانەی مێشکیان پاوان کراوە چی بەچی دەکەن ئەگەر ئامانجە بنەڕەتییەکەیان لەناو بچێت؟ ئاخۆ موجاهیدین لە نێو کەمپەکان چاوەڕێی هەمان ئەو شتانە دەکەن بەسەریان بێت کە لە کاتی گەڕانەوەدا بەسەریان دێت. ئەو سەربازە ئەفغانییانەی کاتێک لە ماڵ دەبوون، هەر ئەوەندەیان دەزانی ناتوانن هیچی تر بکەن جگە لە ئەنجامدانی شەڕی پیرۆز، ئەگەر ئەو ئەفغانییانە ڕێگەشیان پێ بدرێت بچنەوە ماڵ ئەوا هەر بیریان لای شەڕی پیرۆزە.

من بەراوردی ئەو دەرچووانەی لە کەمپە ئەفغانییەکان مەشقیان وەرگرتووە، لەگەڵ هەنگی بکوژدا دەکەم، کە جۆرە هەنگێکن دەیان جار مەترسیدارتر و دوژمنکارترن لە هەنگە ئاساییەکی تر. بەڵام تەنیا ئەو کاتە تێبینیی ئەو مەترسییەیان دەکەیت کە هێرشت بۆ دەهێنن و پێتوە دەدەن. ئەفغانییەکان لە جەزائیر دەرکەوتن، لە بۆسنیا و چیچیانیش دەرکەوتن، ئەوەی ڕاستی بێت لە هەموو شوێنێکن لە وەتەی ڕووخانی ڕووس لە ئەفغانستان و بوونەتە سەرچاوەی ململانێیەک کە ئیسلامیشیان تێوە گلاندووە. جگە لە مەشقەکانی نێو کەمپە ئەفغانییەکان، چالاکییەکانی خۆیان بەخۆڕایی ئەنجام دەدەن، جا بەهاوکاری و پارەی بن لادن بێت یان نا.

بۆ نموونە، جێسیکا ستێرن ئاماژە بەمەترسیی هەزاران تامیل تایگەری دەکەن کە

له ڕووداوی پرۆسەیەکی سەرکەوتووی ئاشتی لە سریلانکا بێ کار دەبن. ئەمان تیرۆریستی مەشق پێکراو و ئامادەن، کە سەرۆک وەزیرانی هیندستان و سەرۆکی سریلانکایان کوشت. ڕەنگە زۆر بەباشی قاچاخ بەخەڵکییەوە بکەن، یان کارێک لە نێو حکوومەتە نوێیەکەی تامیل بدۆزنەوە، هەروەها بۆ بەرزترین پلە خزمەتەکانیان پێشکێش دەکەن. ئەمەش دەکرێ ببێتە گرووپێکی تیرۆریستی تر.

لەبەر هەندێ ستێرن زۆر هەوڵی کڕینی زانیارییەکانیان دەدات بۆ ئەوەی دەزگا هەواڵگرییەکان سوودیان لێ وەرگرن و هەڵیانوەشێننەوە. ئاماژە بەوەش دەکات کە "بۆ هەندێ گرووپی تیرۆریستی بەوانەشەوە کە سەر بەقاعیدەن، گەر بمێننەوە ئەوا گرینگتر دەبن لەو کێشەیەی دەیانەوێت چارەسەری بکەن."

ئەم خاڵەی کۆتایی کەیسێکە لە نێو موجاهیدینی خەلقیشدا هەیە. ڕەجەوی و ئەوانەی دەورپشتی زۆر حەز دەکەن بەردەوامی بەڕێبازەکە بدەن. بەبۆچوونی من ئەمەریکاییەکان لە عێراق ئەو یارییەیان کرد. چونکە نەیانویست هیچ شتێک دژی موجاهیدین بکەن لە عێراق، وەک هەڵوەشاندنەوەیان یان بەناچاری بیانگەڕێننەوە ئێران، حکوومەتی عێراقیش هەر ئەم کارەی دەوێت.

جارجار چەند ئەندامێک بەهەر چۆنێک بێت خۆیان لە ژێر دەستی ڕەجەوی دەرباز دەکەن، کە دوای بەجێ هێشتنیان زۆر جار پێش ئەوەی گەشتی ئەورووپا بکەن لە ئێران بۆ ماوەیەک چاودێری دەکرێن. لەو جۆرە هەڵاتووانە کێشەیەکی وایان نییە. ئەوان پێشتر خۆیان لە ڕەجەوی دوور خستووەتەوە و دەتوانن دەست بەڕێگەیەکی تر بکەن و ئەو خووەی موجاهیدین لە ناخیاندا هەیە نەهێڵن. هەروەها ئەگەر سەیری ئەو کەسانە بکەیت کە ساڵی ٢٠٠٣ بەهۆی ئەمەریکاییەکانەوە لە کەمپی ئەشرەف جیا کرانەوە، هەروەها ئەوانەش کە بەیارمەتیی خاچی سوور دەچنەوە ئێران، ئەوە بەدیار دەکەوێت ئەمانە هەموو ئەندامی ئاسایین. زۆربەیان پیاون، چونکە ئافرەتان لە پلەی سەرکردایەتیدان.

ئەوەی لە کەمپی ئەشرەف دەمێنێتەوە کرۆکی موجاهیدینن. ئەو خەڵکانەن کە ڕەجەوییان لێ پێک هاتووە. لە کەیسی موجاهیدیندا، ئەو ئەندامانە بریتین لە هەنگە بکوژەکان و زۆر مەترسیدارن. یان ئێستا پێکەوە لە عێراق دەمێننەوە یان لە لایەن

ئەمەریکاییەکانەوە دەرفەتیان پێ دراوە شانەکانی خۆیان بەجێ بهێڵن، چونکە سەرکردایەتی کاتێک دەیویست ڕا بکات. ڕوون و ئاشکرایە ئەو موجاهیدانەی لە کەمپی ئەشرەفن هیچ نازانن لە بارەی ئەوەی چی ڕوو دەدات لە جیهان، جگە لەو سەتەلایتەی ئێستا جارجار هەیانە. سەرکردەکانی موجاهیدین، وێڕای چەند سەد کەسەکەی ڕەجەوی، هەوڵ و کۆششیان زۆر داوە تا ڕێبازەکە بپارێزن و هەرچییەک بێت بمێنێتەوە. دوای هەموو شتێک، گەیشتوونەتە ئەو ئاستەی ناتوانن لە هیچ شوێنێکی تر دامەزرێنەوە. زۆر حەز دەکەن و هەموو شتێکیش دەکەن تەنیا بۆ ئەوەی لە پەتەکە دانەبڕێن.

یاسر عیزەتی باسی یەکێک لە سەرکردەکانی کەمپی ئەشرەف دەکات کە بۆ ماوەیەک هاوکاریی نەدەکرن. بەرەنگاری کەس نەدەبووەوە، زیندانیش نەکرابوو، بەڵام ڕەتی ئەوەشی دەکردەوە بەشداری لە کۆبوونەوە و چالاکییەکاندا بکات. " ئەو سەرکردەیە هەر ئەوەندە دەزانێت دەبێ لە ژوورەوە بمێنێتەوە، چونکە دەزانێت لە دەرەوە گرفتێکی زۆری دەبێت و لە سێدارەش دەدرێت. هەمان شت ڕاستە و بەسەر باوکمدا هات. پێم وابوو ئەویش حەزی دەکرد ڕێکخراوەکە بەجێ بهێڵێت. بەڵام ئەوە دەزانێت کە هەر زیندانییەک بچێتە ئەوروپا، دووچاری مەترسیی و تاوانێکی گەورە دەبێتەوە و لە لایەن کۆنە ئەندامانەوە دادگایی دەکرێت. خەڵکی لە جۆرە بارودۆخێکی ئاوا ناخۆشدا، دەتوانن زۆر شت بکەن. ئەو پشیلەیەی بخرێتە گۆشەیەک و زۆری بۆ ببەیت پەلاماری زۆر سەیر دەدات.

لە وەتەی هاوکاریی سەدامیان لێ بڕاوە و کۆچ لە ئەوروپا و عێراق بەردەوامە، دەبێ ئێستا ڕێکخراوەکە چەند ترسناک بێت؟ ئەم پرسیارەم ڕووبەڕووی کۆنە ئەندامان کردەوە. ئەوانیش دەڵێن ئێستا ڕێکخراوەکە زۆر ترسناکە، بەتایبەتی بۆ ئێمە، هەروەها بۆ ئەوانەش ترسناکە پشتیان تێ دەکەن و دژیان دەوەستنەوە. بەڕای حوسێن فورقانی مەترسیی موجاهیدین لە ئەوروپا لە نێو چەندین ڕێکخراوی تردایە و شاراوەیە، کە بەم دواییانە ئەم ڕێکخراوانە دامەزراون و پێوەندییان زۆر نزیکە لەگەڵ سەرکردەکانی موجاهیدیندا و کاریشیان لەگەڵدا دەکەن. ئەو هەڵکەوتەی کە ڕێکخراوەکە توانیی بڕوا بە ١٠ کەس بهێنێت تا خۆیان بسووتێنن لە پێناو مریەم

ڕەجەویدا، خراپترین جۆری ترسە، هەروەها هەوڵیان داوە ئەندامێکی پێشوو بەڕۆژی نیوەڕۆیە لە شەقامێکی قەڵەباڵغی شتومەک کڕین لە ئەڵمانیا بڕفێنن، هەروەها لە مانگی شەشی ساڵی ٢٠٠٧دا پەنجا موجاهیدین بەچەقۆ و بوتڵی شکاوەوە هێرشیان کردە سەر چەندین ئەندامی دیاری پێشووی موجاهیدین لە پاریس.

ئەوە ڕوون بووەتەوە کە سەرکردایەتیی موجاهیدین لە عێراق، هەرچەندە لە ژێر کۆنترۆڵی ئەمەریکاییەکانە، تا ئێستاش دەتوانن فەرمان بەداروودەستەکەیان بدەن لە ئەوروپا. بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی پێوەندییەکی نزیک هەیە لە نێوان سەرکردایەتیی موجاهیدین لە کەمپی ئەشرەف و ئەو سەرکردانەی ساڵی ٢٠٠٣ چوونە ئەوروپا. هەروەها بەڵگەی بەردەست هەیە لەسەر ئەوەی پێوەندی هەیە لە نێوان مریەم ڕەجەوی و مەهدی ئەبریشماچی لە پاریس و سەرکردایەتی لە کەمپی عێراق. یاسر بەپێکەنینەوە بەمن دەڵێت "ئێمە نوکتەمان پێی دەکرد کاتێ دوای ئەو هەموو ساڵە لەگەڵ خێزانەکەیدا گەڕایەوە."

وێڕای ئەوەش، یاسر ئەوەشم پێ دەڵێت ئەندامان لە ئەوروپا زۆر جار سەردانی عێراق دەکەن. چەندین ئەندامی پلە بەرز لە ئەوروپا وێنەیان گیراوە لە کاتی خۆپیشاندانەکان بۆ ئازادکردنی مریەم ڕەجەوی، پاش چەند مانگێک ئەو ئەندامانە لە نێو کەمپی ئەشرەف بینراون. ئەو ئەندام خێزانانەی هاوسۆزن بۆ موجاهیدین، بۆ نموونە دایکی ئیلاه و ئەلمیرە و کە دیسان کچێکی تری بووە لە ئەشرەف، لە ئەوروپاوە هێنراونەتە کەمپی ئەشرەف بۆ ئەوەی هەستی ئەو ئەندامانە بگێڕێتەوە کە گومانیان تێ کەوتووە. ڕوون و ئاشکرایە دەزگای هەواڵگریی نهێنی ئێستا کاری خۆی دەکات و هەنگە بکوژەکان نێردراونەتە دەرەوە.

پێ ناچێت تا ئێستا مەسعود ڕەجەوی لە دەرەوەی کردارەکە دابنرێت. هەرچەندە ئێستا خۆیشی بۆ ماوەیەکی درێژە هیچی نەکردووە، بەڵام دەبێ چەندە مەترسیدار بێت ئەگەر بەردەوام بێت؟ فورقانی وەسفی هێرشە تیرۆریستییەکان دەکات دژی ئامانجە ئێرانییەکان لە ئەوروپا و دژی کۆنە ئەندامان و نەیارانی موجاهیدین. لە وەتەی ئەمەریکاییەکان چەکیان بەموجاهیدین داناوە لە عێراق، لەم ساتەدا ناتوانن بەهیچ شێوەیەک هێرش لە نێو ئێراندا بکەن. لێرەدا دەگەڕێینەوە سەر قسەکانی

مەسعود خودابەندە: دەبێ ئەندامانی نێو ئەم ڕێبازە زۆر سەرقاڵ بکرێن بۆ ئەوەی بەهیچ شێوەیەک بیریان بۆ شۆڕش دژی ڕێبازەکە نەچێت.

هەر لەبەر هەندێشە مریەم ڕەجەوی درێغی ناکات لە دیمانەیەکدا لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٥دا کە متمانە و دڵنیاییی خۆی دووپات دەکاتەوە. موجاهیدینی خەلق بەردەوام بوونی دەبێت، ئەمە بۆ مریەم ڕاستییەکە. بۆیە بەکەللەڕەقییەوە بۆ کۆواری نیوز ویک دەڵێت " چەند هەوڵێک هەبووە بۆ پەیداکردنی چەند تاکێک یان بۆ هەڵوەشاندنەوەی چەند بەشێکی ڕێکخراوەکە، بەلام ئەم هەولانە سەرکەوتوو نەبوونە."

تا ڕەجەوی و دارودەستەکەی مابن، شەڕ لە پێناو دەسەلات لە ئێراندا هێشتا زۆری ماوە تەواو بێت، چونکە لەگەڵ ئەمەریکاییەکاندا هاوپەیمانێکی نوێ کار بۆ ئەرکەکان دەکات.

# کۆتایی

## دوژمنی دوژمنم دۆستمه

پێش چەند مانگێک لە داگیرکردنی عێراق لە ٢٠٠٣، مەسعود ڕەجەوی لەسەر سەکۆیەکەیەوە قسە بۆ هەزاران ئەندامی خۆی دەکات. لەسەر تەختەیەک چەند هێلێک دەکێشێت و نەخشەیەکی سادەی ناوچەکە دروست دەکات و دەڵێت " سەیرکەن، هەموو وڵاتێک لە ژێر دەستی ئەمەریکادایە، ئەگەر عێراقیش داگیر بکات، ئەوا تەنیا ئێران دەمێنێتەوە. ئەگەر عێراق داگیر بکەن، ئەوجا نۆرەی ئێران دێت."

یاسر عیزەتی ئەمەی بیر دێتەوە، لای ئەو وەک دوێنێیە. هەرچەندە لە سێپتەمبەری ٢٠٠١دا کاتێ ئەمەریکاییەکان وەک نێچیرێک بەتەڵەی قاعیدەوە دەبن ڕەجەوی ئاهەنگ دەگێڕێ، کەچی هەمان ئەو ئەمەریکایەی ئەو کات بەدوژمنی خۆی دەزانی، ئێستا بەدەربازکەری خۆی تەماشای دەکات. یاسر کۆبوونەوەکە بەو هەستە بەجێ دەهێڵێت کە ئەمەریکاییەکان یارمەتیی موجاهیدین دەدەن بۆ ڕزگارکردنی ئێران.

ئەم پرسیارەم کرد "ئایا ڕەجەوی زۆر درێژەی دا بەم قسانەی؟" یاسر وەڵامی دامەوە "نەخێر، زۆر درێژەی بەقسەکانی نەدا. بەڵام وەک سەرکردەیەکی دژی بزووتنەوەی داگیرکار تۆن و گۆکردنی زۆر بەهێز بوو." ئەمجارە یاسر هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشا و وتی "ڕەجەوی وتی، ئەگەر ئەمەریکا بێتو ئێمە بەدیل بگرێت، ئەوا زیندانێکی ئەمەریکایی زۆر باشترە لە زیندانێکی ئێرانی. کونجی گوانتانامۆ باشترە لە زیندانێکی ئێرانی."

چەند مانگێک دوای ئەوە ئەمەریکاییەکان عێراقیان داگیر کرد، موجاهیدین فەرمانیان لە سەرکردایەتییان وەرگرت تەقە لە ئەمەریکاییەکان نەکەن، چونکە ئەمەریکاییەکان نەهاتوونە بۆ سەدام حوسێنی برای پشتی ڕەجەوی؟ کەواتە ئەمجارە بۆچی موجاهیدین هاوکاریی سەدام ناکەن؟ من وای بۆ دەچم مەسعود

ڕەجەوی پێشتر بەڵێنی داوە هاوکاریی ئەمەریکاییەکان بکات، تاوەکو پێستی خۆی لە کاتی ڕووخانی سەدامدا ڕزگار بکات، بەتایبەتیش بۆ دەستکەوتنی هاوبەشێکی نوێ لە شەڕ دژی ڕێژیمی تاران.

لە بەرسڤی موهەدیسین، وەزیری کاروباری دەرەوەی ڕەجەوی، دەگەمە ئەو ئەنجامە، کاتێ لە ئاداری ۲۰۰۳ ئەوە ڕوون دەبێتەوە لە داگیرکردنی عێراقدا ئەمەریکاییەکان کەمپی موجاهیدینشیان بۆمباران کرد. یاسر عیزەتی ئەوەم پێ دەڵێت کەوا خۆی و هاوەڵەکانی پێشبینیی ئەوەیان دەکرد بەر هێرشەکەی ئەمەریکا بکەون لەبەرئەوەی هاوکاریی سەدامیان کردووە، بۆیە بەلێشاو بۆ باکوری عێراق گوێزرانەوە. بەڵام موجاهیدین باوەڕ بەوە ناکەن کاتێ گوێیان لەوە بوو ئەمەریکایی هێرشیان کردە سەر کەمپەکان. هەروەها خێرا دوای ئەمە، ئەوە ڕوون دەبێتەوە بۆچی لە دیمانەکاندا باسی ئەو ڕێکەوتنانە دەکەن کە لەگەڵ ئەمەریکاییەکان کردوویانە بۆ مانەوەی موجاهیدین.

ئەگەر بەڕاستی ئەو جۆرە ڕێکەوتنانە بوونیان هەبێت، ئەوا چەند پرسیارێک لە بارەی پێشینەی بۆمبارانەکەوە قووت دەبنەوە. ئاخۆ ئەو بۆمبارانەی موجاهیدین هەوڵێک بوو بۆ شاردنەوەی هاوکارییەکانی ڕەجەوی بۆ سەدام، یان ئەوەتا پنتاگۆن ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ سی ئای ئەیدا پشتگوێ خستووە؟ وەڵامی ئەو پرسیارانە هەرچییەک بێت، ڕاستییەکە ئەوەیە وێرانکردنی کەمپەکانی موجاهیدین سنووردار بووە و تەنیا وێرانکردنی باڵەخانە سەربازییەکانی بوو، ئەوەتا تا ئێستاش کەمپی ئەشرەف بەنەڕووخاوی ماوەتەوە.

کاتێ دوا جار ئەمەریکاییەکان دەست بەسەر کەمپی ئەشرەفدا دەگرن، ئەمە باشترین فێڵە بۆ پاراستنی مەسعود ڕەجەوی و داروودەستە نزیکەکەی لە هێرشی تۆڵەسەندنەوەی عێراقییەکان، کە خەریکبوو ئەنجام بدرێ. چەند مانگێک دوای داگیرکردنەکە، بەگوێرەی یاسر عیزەتی لە کەمپی ئەشرەف، ئەوەم بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ڕێکەوتنەکان گەیشتوون و لە لایەن ڕەجەوی و ئەمەریکاییەکانیشەوە پەسند کراون. هەرچەندە ئەمەریکاییەکان پاسەوانی کەمپەکە دەکەن، بەڵام زۆر ئاگەداری ئەوەش دەبن کە لە ناوەوە چی ڕوو دەدات.

دوای ڕووخانی بەغدا لە ٩ی نیسانی ٢٠٠٣، بەهەزاران شەڕوانی موجاهیدین لە باکور و شوێنەکانی تری عێراق دەگەڕێنەوە کەمپی ئەشرەف. هەموو بنکەکانی تر ڕووخێنران. سەرەتا، موجاهیدین ڕێگەیان پێ درا چەکەکانی خۆیان بپارێزن، یان بەلایەنی کەمەوە پاکیان بکەنەوە و لە نێو کۆگەکان یان ئەو شوێنەی لێیان کۆ دەکردنەوە هەڵیان بگرن. بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک ڕێگەیان پێ درا کۆنترۆڵی ڕێگەکانی چواردەوری ئەشرەف بکەن و بازگەی خۆیان هەبێت. بەڵام تا مانگی ئایاری ٢٠٠٣ی پێ نەچوو کە بەتەواوی ملکەچی ئەمەریکاییەکان دەبن و ئەوانیش چەکیان پێ دادەنێن.

بەپێی ڕاپۆرتەکانی ئەمەریکا، ئەو کاتە ٣٨٠٠ کەس لە نێو کەمپی ئەشرەف جارێکی تر کۆ دەبنەوە. هەر خێرا بەسەدانیان بەئەمەریکاییەکان دەڵێن حەز دەکەن لە سەرکردایەتی دابب‌ڕێن و بەتەواوی لەوانی تر جیا ببنەوە. لە مانگەکانی داهاتوودا، کاتێ دەزگای لێکۆڵینەوەی فیدراڵ FBI دیمانە لەگەڵ یەکە یەکەی ئەندامەکاندا دەکات، ژمارەی ئەم گرووپە دەگاتە ٦٠٠ کەس. بەپێی قسەکانی یاسر عیزەتی لەو ٦٠٠ کەسە یەک ئافرەتی تێدا نەبوو.

بۆ ئەوەی لە ئەمەریکاییەکان بگەیەنن کە خەڵکی باشن، موجاهیدەکان سینیی سەتەلایت دەهێننە ناو کەمپەکە. یاسر دەڵێت بۆ ئەوەی نیشانیان بدەین ئێمە ئازادیمان هەیە. بەڵام بەپێی قسەی یاسر کەم کەس سەیری تەلەفزیۆنی کرد. یاسر دەڵێت " گەر تۆ لەگەڵ گرووپێکی جگەرە نەکێش بیت، ئەوا زۆر زەحمەتە بتوانی جگەرەیەک داگیرسێنی. موجاهیدین بناوانگرن، لە نێو ئەمانەشدا تەلەفزیۆن ئاسایی نییە. ئەگەر تۆ لە نێو کەسانێک بیت هەرگیز سەیری تەلەفزیۆن نەکەن، زۆر زەحمەتە بڵێیت من سەیر دەکەم."

لە ژێر پاڵەپەستۆی ئەمەریکاییەکاندا، بێگومان شتێک هەر دەگۆڕێت. زیندانییەکان هەڵوەشانەوە، کە کارێکی بێ سوود و بێ کەڵک بوو لە لایەن موجاهیدینەوە دەکرا، هەروەها کۆبوونەوە درێژەکانیش تەواو بوون کە بەم دواییە سەدا نەوەدی کاتی ئەندامانی دەبرد. یاسر دەڵێت بێزاری و قسەڵۆک و تێڕامان شوێنی زیندان و کۆبوونەوەکانیان گرتەوە. ئەمەریکاییەکان تەنیا لە ناکاو ئەو

بەشانەیان دەپشکنی کە لە ژێر کۆنترۆڵی سەرکردایەتیدا بوو. جگە لە ڕەجەوی، کە لە هەر شوێنێک بێت، هەر کۆنترۆڵی هەیە، ئەمەش ڕوون دەبێتەوە کە خزم و کەس لە ئێرانەوە سەردانی ئەوانیان دەکرد. سەرکردایەتی چاودێرییەکی باش دەکات و ئەوە دڵنیا دەکاتەوە کە دەبێ ئەندامێک ئامادە بێت ئینجا دەتوانێت قسە لەگەڵ خزم و کەسیان بکات، یان بەرپرسی زیاتر ئامادە دەبوون بۆ ئەوەی نەهێڵن قسەی زیاد بکەن و قسەی سۆزداری یان ڕەخنە بگرن.

لەو کاسێتە ڤیدیۆییانەی لە پاریسەوە نێردراون، مەسعود ڕەجەوی وەڵامی ڕەوشە نوێیەکە دەداتەوە. بۆ نموونە، یاسر عیزەتی دەڵێت، ئێستا هیچی تر چەکیان نەماوە و کارەکانیان وەک جاران نییە. بۆ یەکەم جار دوای چەندین ساڵ، ڕێگە درا کتێبی نوێ هاتە نێو کەمپی ئەشرەفەوە. مریەم دەڵێت "ئێران پێویستی بەچینێکی نوێ و باش مەشق پێکراو دەبێت کاتێ موجاهیدین کۆنترۆڵ دەگرنە دەست." یاسریش دەڵێت "ئەو گەمژانەش باوەڕیان پێ دەکرد. وەک بڵێی خەڵک وا لە ئێران چاوەڕێی ئەوان دەکەن ڕزگاریان بکەن."

ساڵی ٢٠٠٤، کۆڕەوێک دەستی پێ کرد، سەرەتا بەو کەسانەی توانییان لە دەروازە والاکانی سنوورەوە ڕا بکەن. بەڵام لە کۆتایی هەمان ساڵدا، یەکەم ئەندامی موجاهیدین گەیشتە نێو ئێران دوای ئەوەی لە لایەن خاچی سووری نێودەوڵەتییەوە ئازاد کرا. بەڵام دەستەی سەرکردایەتیی موجاهیدین ڕێگەی بەخاچی سووری نێودەوڵەتی نەدا بچێتە نێو کەمپەکەوە، بۆ ئەوەی ڕێکخراوەکە بتوانێت تەنیا یارمەتیی ئەو کەسانە بدات کە بۆ ئەمەریکاییەکان دەستنیشان کراون و خۆشیان حەزیان دەکرد لە عێراق بچنە دەرەوە. لە ئاداری ٢٠٠٥، بەپێی ڕاپۆرتێکی ڕێکخراوی چاودێریی مافی مرۆڤ، ئەمەریکاییەکان زیاتر لە ٣٥٠٠ کەسیان لە نێو کەمپی ئەشرەفدا هێشتبووەوە. لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٧، ژمارەی دڵسۆزەکانی ڕەجەوی گەیشتە ٢٥٠٠ تا ٢٨٠٠، لەگەڵ ٣٠٠ تا ٤٠٠ پیاوی تر لە نێو کەمپەکە لە لایەن ئەمەریکاییەکانەوە دەپارێزران.

ڕۆیشتنی ئارەزوومەندانە هەر مەحاڵ بوو. دەروازەکە پاسەوانی دەکرا، لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٥، ئەمەریکاییەکان دیسان ئەرکی پاسەوانیکردنیان دایەوە

دەست موجاهیدین، تەنیا هەندێ سەرکردە بۆیان هەبوو لە کەمپەکە دەرچن. بۆ نموونە بۆ شت کڕین، دەبوایە ئەمەریکاییەکان پاسەوانییان بکەن چونکە زۆر عێراقی هەبوو هەستی تۆڵەکردنەوەیان هەبوو دژ بەهاوڕێ کۆنەکانی دیکتاتۆری ڕووخاو.

مانگی جارێک سەرکردایەتیی موجاهیدین سەرۆک هۆز و شێخی گوندەکانی چواردەوری کەمپی ئەشرەفیان داوەت دەکرد. ئەم هەڵسوکەتەش جۆرێک بوو لە هەراسانکردنی ئەو سەرۆک هۆز و شێخانە. سەرکردە سوننییە لۆکاڵەکان دڵخۆش بوون و بەخێرهاتنیان دەکردن. یاسر بیری دێتەوە و دەڵێت " هەموو جاری ٢٠٠ تا ٤٠٠ میوانمان هەبوو." کەمپی ئەشرەف دەکەوێتە ناوچەیەک کە چواردەوری هەمووی دژی ئەمەریکاییەکانن. لەو شوێنەدا چەندین گرووپی سوننیی ڕادیکاڵ کار لە دژی ئەمەریکاییەکان دەکەن.

لە هەمان کاتدا، قسە هەیە دەڵێن موجاهیدین زۆر هاوکاری سوننە ڕادیکاڵەکان دەکات و هاوکاریی داراییی هێرشەکانیشیان دەکات لە دژی شیعە عێراقییەکان، لەبەر هەندێ حکوومەتی عێراقی لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٧ کۆبوونەوەی پلاندارێژراوی نێو کەمپی ئەشرەفی وەستاند کە چەندین سیاسەتوانی سوننی بەشداریی ئەو کۆبوونەوەیان دەکرد. حکوومەتی عێراقی لە هەموو ئەو ڕێگەیانە نزیک دەبێتەوە کە دەچێتە نێو کەمپەکە و هەڕەشە دەکات و دەڵێت ئەوەی بەشداریی ئەو کۆبوونەوەیە بکات دەستگیری دەکەین. هەشت ئەندامی دەزگای هەواڵگریی نهێنیی موجاهیدین، کە پێوەندییان بەردەوام بوو لەگەڵ گرووپە سەربازییە سوننییەکاندا، دەستگیر کران، لێپێچینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت و دەخرێنە بەردەم دادگاوە.

ڕوون و ئاشکرایە سەرکردایەتیی موجاهیدین بۆ چاککردنی پێوەندییەکانیان لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا زۆر بەپەرۆشن، بەتایبەتی لەگەڵ کۆنە هاوڕێیانی سەدامدا. ڕەجەوی زۆر نیگەران دەبێت بەوەی موجاهیدەکان خۆیان بەتەنیا دەزانن لە عێراقێکی دوژمنکاردا کاتێ ڕۆیشتنی حەتمیی ئەمەریکاییەکان نزیک دەبێتەوە.

دوای داگیرکردنی عێراق بۆ ماوەیەکی درێژ ئەوە ڕوون نییە کە چی بەسەر موجاهیدیندا دێت. حکوومەتی گوازراوەییی عێراق دەڵێت دەبێ هەموویان بدرێنەوە

دەستی ئێران. تارانیش لە لایەن خۆیەوە بەڵێنی لێبووردنێکی گشتیی دەرکرد بۆ هەر موجاهیدێک کە پەشیمانیی خۆی بەرامبەر تاوانەکان دەربڕی و خۆی دوور بخاتەوە لە ڕێکخراوەکە. ئێران ئەو بەڵێنەی دەباتە سەر کاتێ چەند موجاهیدێک لە کەمپی ئەشرەف هەڵدێن. دەڵێن ئەمەریکاییەکان حەزیان لەوە دەکرد ئەو گرووپە بەکار بهێنن بۆ ئاڵوگۆڕکردنی دیل تاوەکو ئەو ئەندامانەی قاعیدەیان دەست بکەوێت کە لە ئێراندا دەستبەسەرن.

لە کەشوهەوای پڕ لە ئاژاوەی عێراقی دوای داگیرکردن، بانگەشەی ئاگرێکی گەورە بڵاو دەبێتەوە، پشکنینیش مەحاڵە ئەنجام بدرێت. ئەندامانی حزبی بەعس لە نێو کەمپی ئەشرەفدا خۆیان شاردبووەوە، موجاهیدینیش وەک پاسەوانی شەخسی بۆ وەزیرێکی عێراقی بەکرێ گیرابوون. ڕاپۆرتێک هەیە ئەم شتانە بەلێڵی باس دەکات. چەندین سەرچاوە لە عێراق دەڵێت لە مانگی ئابی ساڵی ٢٠٠٤، موجاهیدین لە لایەن ئەمەریکاییەکانەوە بەکارهێنران بۆ کپکردن و هێورکردنەوەی ڕاپەڕینی شیعە لە نەجەف و بەغدا و شاری سەدردا.

ئەزموونەکانی ڕابردوو ئەوە بەتەواوی دەردەخەن کە موجاهیدین ڕۆڵێکی باش دەگێڕن لەو کردانەی دژی گێرەشێوێنەکان ئەنجام دەدرێن. ئەگەر ڕەجەوی توانیبێتی بڕوا بەدارودەستەکەی بهێنێ سڤیلی کورد بکوژن گوایە لە ژێرەوە پاسداری ئێرانن، ئەوا هیچ کێشەیەکیان لەوەدا نییە شیعە تێکدەرە عێراقییەکان بەهەمان شێوە تەماشا بکەن.

یاسر عیزەتی ئەم گومانە دووپات دەکاتەوە، ئەوەم پێ دەڵێت کە ڕادیۆی موجاهیدین لەو کاتەی قسە لە بارەی سەدرەوە دەکات: سەدر کار بۆ ئێران دەکات و دەیەوێت ڕێژیمێکی ئاینیی سەر بەتاران دامەزرێنێت. ڕێژیمێکی شیعیی ئێرانی لە بەغدا بێگومان دەبێتە هۆی تەواوبوونی تەمەنی موجاهیدین لە کەمپی ئەشرەف. ئەم پرۆپاگەندەیە کاتی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ی کوردانم بیر دەخاتەوە، کاتێ دەیانوت پاسەوانەکانی کۆماری ئێران هاتوون بۆ دەستگیرکردنی موجاهیدین.

سەرچاوەکانی تر دەڵێت کاتێ لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٣ موقتەدا سەدر سەردانی ئێرانی کرد، پێشنیازی ئەوەی بۆ مەلاکان کرد کە ئەو دەبێ کار لەگەڵ موجاهیدیندا

بکات. ئێرانییەکان بەم پێشنیازە ڕازی نەبوون، بەڵام داوای ئەوەیان لێ کرد ڕاپۆرت لەسەر بزووتنەوەکانی ئەو گرووپە لە عێراق بنێرێت. دیارە سەدر ئەم داوایەی پەسند کردووە. لە چەند مانگێکی دواتردا، سەدر لە ناکاو بڕە پارەیەکی زۆری بۆ مووچەی میلیشیاکانی دەست دەکەوێت، میلیشیای سەدر لە ئەنجامدا بەم مووچەیە باشتر گەشە دەکەن.

پاشان لە مانگی یازدەی ساڵی ٢٠٠٣، ئۆتۆمبیلێک چوار کەسی موجاهیدینی هەڵگرتبوو بەرەو ئەوروپا دەچوو بۆ بەرزکردنەوەی وورەی هاوڕێکانیان لە کەمپی ئەشرەف، لە ڕێگەی ئوردن دەکەونە نێو بۆسەوە. هەر چوار کەس دەکوژرێن. یەکێکیان بریکاری نهێنیی ئێرانە، بەپێی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان لە هۆڵەندا دژەی کردووەتە نێو موجاهیدینەوە. هیچ سەرسام نیم بەوەی ئەم هێرشە لە لایەن میلیشیای سەدرەوە ئەنجام درابێت. بۆ چەندین مانگ بێدەنگییەک باڵی بەسەر کەمپی ئەشرەفدا کێشا. تەنیا لە تەمموزی ساڵی ٢٠٠٤ ئەمەریکاییەکان قسەیەکی ڕوون بەموجاهیدین دەڵێن و دڵنیایان دەکەنەوە کەوا لە ڕێگەی ڕێکەوتننامەی ژنێفەوە پارێزگارییان لێ دەکەن. بەڵام، گومان و نادیاریی چارەنووسی سەرکردەکانیان بەردەوام دەبێت.

لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤، کۆواری نیوز ویکی ئەمەریکایی لە ڕاپۆرتێکدا دەڵێت ئەمەریکاییەکان لێپێچینەوەیان لەگەڵ هەموو ئەندامانی موجاهیدیندا کردووە و ٤٠ ئەندامیان دەخرێنە پێش دادگاوە. بێگومان عێراق خۆی دەیانباتە بەردەم دادگا سەبارەت بەتاوانەکانیان دژ بەمرۆڤایەتی و تاوانگەلی شەڕ. ژمارەیەکیان هەر بەدەستبەسەری مانەوە و چاوەڕێی دادگایان دەکرد. ماڵپەڕی "ئاسایشی جیهانی" لە ڕاپۆرتێکی کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤دا دەڵێت ئەمەریکاییەکان لە نێو کەمپی پێشووی موجاهیدیندا لە نزیک فەلووجە ٢٨ موجاهیدیان دەستبەسەر کردووە.

بەڵام ئەو موجاهیدانەی ڕێکخراوەکەیان بەجێ هێشتووە دەڵێن سەرکردە گەورەکان لە عێراق نەمابوون و گوێزرابوونەوە بۆ ئەمەریکا بۆ ئەوەی زانیاریی ورد و پێویست بدەن بەئەمەریکاییەکان لە بارەی سەدام و چەکە بەکۆمەڵکوژەکانیەوە کە ئەمەریکاییەکان نەیاندەتوانی بیدۆزنەوە، بەتایبەتیش زانیاری لە بارەی ئێران.

هەموو ئەمانە لە ژێر دروشمی ئەو ژیرایەتییە کۆنەی نێو ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست ئەنجام دران، ئەویش: دوژمنی دوژمنم هاوڕێمە. بەم ڕێگەیە، تەنانەت شەیتانی گەورەش دەکرێ ببێتە هاوڕێت. مەهدی ئەبریشماچی دەیوت "ئەگەر هەر شتێک یا لایەنێک یارمەتیمان بدات لە خەباتمان دژی ئێرانی دوژمنمان، ئەوا ئێمەش هاوکاریی دەکەین ئەگەر شەیتانیش بێت."

سەبارەت بەکۆنە ئەندامان هیچ گومانێک لەم بارەیەوە نییە کە ئەمەریکاییەکان هاوپەیمانی نوێی مەسعود ڕەجەوین. یەکێک لە میدیای موجاهیدین دەنووسێت چۆن ڕەجەوی هەوڵی ئەوە دەدات ئەم هاوپەیمانێتییە بەئەندامانی خۆی بفرۆشێتەوە. میدیای موجاهیدین باسی سی سیناتۆر و پەرلەمانتاری ئەمەریکایی دەکات کە پشتگیری لە موجاهیدین دەکەن، هەروەها باسی ئەوەش دەکات هاوکاری لە لایەن ئەمەریکاییەکان و ڕۆئاواوە بۆ موجاهیدین دەچێت. ئەو ئەمەریکایەی لە نێو کەمپی ئەشرەفدا دەیانپارێزێت لە عێراقییەکان، ئێستا بەمەزنترین ڕزگارکەری خۆیانی دەزانن. ئیتر ئەم مێشکی ئەندامانی موجاهیدین بەوە دەشۆنەوە کە ئەمەریکاییەکان دەیانپارێزن و هاوکارییان دەکەن لە ڕووخاندنی ڕێژیمی ئێراندا.

پێم وایە مەسعود ڕەجەوی بەباشی حیسابی خۆی کردبوو پێش ئەوەی ئەمەریکا عێراق داگیر بکات، لە کاتێکدا زۆریش لەوە دڵنیا بوو ئەو هاوڕێیەتییەی لەگەڵ سەدام حوسێن لە کاتی خۆیدا باشتر بووە لە نەبوون. ڕاستییەکە ئەوەیە موجاهیدین زۆر بەچاکی توانییان لە بن گوێی پارێزگارە ئەمەریکاییەکان بخوێنن و بەسەریاندا هەڵبلێن کاتی سەرەتای ساڵی ٢٠٠١ لەگەڵ جۆرج بوشدا هاتنە دەسەلات.

موجاهیدین یەکێک بوو لە خاڵە ناکۆکەکانی نێوان دۆناڵد ڕامسفیڵدی وەزیری بەرگری و کۆڵن پاولی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا. ڕامسفیڵد دەیویست دژی ئێران بەکاریان بهێنێت، بەڵام پاول دژی ئەم پلانە بوو. پاول زیاتر لەگەڵ ئەو پلانە بوو کە بیانگۆڕێتەوە بەئەندامانی تۆڕی قاعیدە لە نێو زیندانەکانی ئێراندا. من پێم وایە ئەم ناکۆکییەی نێوان پنتاگۆن و وەزارەتی دەرەوە هۆیەک بوو بۆ درەنگ بڕیاردان لە بارەی موجاهیدین و کەمپەکەیان لە عێراق.

سـەمـەد نەزاری دەپرسـێت "ئاخـۆ سی ئای ئەی دەزانێ چی دەکـات؟" بەگاڵتەجارییەوە دەڵێت "ئاخۆ ئەمەریکاییەکان ئەوەندە گەمژەن بیانەوێت سەدامێکی نوێ دروست بکەن، هەوڵ بدەن موجاهیدین وەک ئامێرێک لە ناوچەکە دژی ئێران بەکار بێنن؟"

ئەوەی بیری بێتەوە چۆن داگیرکردنی عێراق لە لایەن ئەمەریکاوە ڕووی دا، لە کاتی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردنی بوشدا باس نەکرا، هەرچەند کردەی سەربازییان بۆ سەر عێراق ڕەت دەکردەوە کەچی لە ژێرەوە پلانیان بۆ دادەڕشت، دوا جار بەناچاری بەئەنجوومەنی ئاسایشدا تێ پەڕی. بۆیە ئێران دەبێ حیسابێکی باش بۆ خۆی بکات. لە وەتەی دووبارە هەڵبژاردنەوەی، جۆرج دەبلیو بوش کراوە ئەوە دەرکەوت هیچ پلانێکی سەربازی بۆ سەر ئێران نییە، لە کاتێکدا نیازی سەرەکی ئەوەیە نەهێڵێن مەلاکانی ئێران پەرە بەچەکی ئەتۆمی بدەن. بەڵام لە هەمان کاتیش، بەڵێن بەئێرانییەکان دەدات یارمەتییان بدات لە بەدەستهێنانی دیموکراسیدا گەر پێکەوە ڕاپەڕن، هەروەها هەڕەشەی هێرشیش دەکات ئەگەر ئێران نیازە ئەتۆمییەکانی ئاشکرا نەکات.

لەسەر ئەو پرسیارەی ئاخۆ بچنە ئێران یان نا، سەرەتای ٢٠٠٥، دوو کەمپی جیاواز هەبوو. لە حالەتی عێراق، جێگری سەرۆک دیک چینی و وەزیری بەرگری ڕامسفیلد و پنتاگۆن بڕیارەکەیان بردەوە. ئێستا هەر هەمان ئەو لایەنانەن دەیانەوێت موجاهیدین لە لیستی گرووپە تیرۆریستەکان دەربهێنن، لەبەرئەوەی بزووتنەوەی دیموکراسی و بەرەنگاری و هاوپەیمانی تازە لە دایک بوون، بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی لەبەرئەوەیە بەباشی لەسەر کردەوە تێکدەرییەکان ڕاهێنراون.

ئەمەش یەک دەگرێتەوە لەگەڵ حەزەکانی گرووپێکی پارێزگار کە لە ساڵی ٢٠٠٥ەوە سوورن لەسەر ئەوەی ئەمەریکا ڕێگەی سێیەم بگرێتە بەر لە ئاست ئێران. لێژنەی سیاسەتی ئێران پێکهاتووە لە پسپۆڕانی ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست کە هەندێ جار کاریان کردووە بۆ هەندێ لایەنی وەک کۆشکی سپی و پنتاگۆن و وەزارەتی دەرەوە و دەزگا هەواڵگرییەکان، ئەمانە باسی ئەوە دەکەن ڕێژیمی ئێران لە ڕێگەی هاوکاریی ئۆپۆزسیۆنی ئێران لە تاراوگەوە بێتە گۆڕین، نەک لە ڕێگەی کردەوەی

سەربازییەوە کە ڕەنگە ئاکامی مەترسیداری لێ بکەوێتەوە، بگرە ئەو گۆڕانە دەبێ بەڕێگەی دیپلۆماسی و شێوازگەلەوە بێت. کەواتە بەهۆی پێشخستنی موجاهیدینی خەلق وەک پارتێکی ئۆپۆزسیۆن دەکرێ ئەو گۆڕانە بێتە دی.

ئەمەش دڵی مریەم ڕەجەوی خۆش دەکات، هەروەک لە دیمانەیەکی لەگەڵ نیوز ویک لە شوباتی ٢٠٠٥ دەردەکەوێت. دەڵێت "من تەواو گەیشتوومەتە ئەو باوەڕەی کە ئەمەریکاییەکان درک بەوە دەکەن چارەسەر بریتییە لە هێزێکی ئێرانی کە بتوانێت بناوانگرە ئیسلامییەکان لە ناو ببات کە ئێستا دەسەڵاتی ئێرانیان بەدەستە." ئێستا موجاهیدین بەبەردەوام باسی ڕێگەی سێیەم دەکەن کاتێ باسی ڕۆڵی خۆیان لە ئێران دەکەن.

داوای لێژنەکە لەگەڵ داوای مریەم ڕەجەوی لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٥ یەک دەگرێتەوە، ئەویش ئەوەیە: لابردنی مۆرکی تیرۆر بەسەر موجاهیدینەوە و یارمەتییان بدەن بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی ئێران، ئیتر دوایی هەموو شتێک ئاسایی دەبێتەوە. نامەی مریەم بۆ سەرنووسیاری ڕۆژنامەی هێرالد تریبیون نامەیەکی ڕێکوپێکە، لەبەر هەندێ لەو ڕۆژنامە بەناوبانگەدا بڵاو دەکرێتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەندین هەڵەی تێدایە و ورد نییە.

هەڵەی لۆجیکی لە نامەکەی ڕەجەویدا بەدی دەکرێت، ئەویش ئەوەیە هەموو شتێک ئاسایی دەبێتەوە ئەگەر موجاهیدین هاوکاری بکرێت لە ڕووبەڕووبوونەوەی مەلاکانی ئێراندا. ڕاستییەکە ئەوەیە ئێرانییەکان نایانەوێت هیچ شتێک لەگەڵ ئەو گرووپەدا بکەن. هەروەها ناشیانەوێت شۆڕشێکی نوێ بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا، وتەبێژەکانی موجاهیدین ئاماژە بەوە دەکەن کە دیموکراسی لە ئێران هیچی تر لە ڕێگەی شێوازی ئاشتیخوازییەوە بەدەست نایەت. چۆن ڕژێم بەتەواوی دەگۆڕێت، ئەمە پرسیارێکی ڕەجەوییە لە نامەکەیدا بەبێ وەڵام و بەکراوەیی بەجێی هێشتووە.

گرینگترین وردنەبینی لە نامەی ڕەجەوی ئەو بانگەشانەن گوایە موجاهیدین دیموکراسین و شایەنی ئەوە نین ناوی تیرۆریستیان پێوە بێت، هەروەها باسی ئەوەش دەکات چەندین سیناتۆری ئەمەریکایی موجاهیدین بەڕێکخراوێکی ڕەوا و بەرەنگاریکار دادەنێن. ئەم خاڵەیان ڕاستە چونکە ژمارەیەک لە سیاسەتوانە

پارێزگاره ئەمەریکاییەکان، ئەوانەی تا ڕادەیەکی زۆر کاریگەریيان هەیە لەسەر جۆرج دەبلیو بوشەوە ئەم بۆچوونەیان لەمەڕ موجاهیدین هەیە. گرووپێک کە ۳۰ ساڵ هەڵبژاردنێکی تری سەرۆکایەتی نەکەن ناکرێ پێی بگوترێ دیموکراسی، یەک سەرکردەیان هەیە و بانگەشەی ئەوەش دەکەن سەرکردەی هەموو ئێرانە، هیچ شێوازێکی گفتوگۆی پەسند نییە و بەئارەزووی خۆی و بێ هیچ هۆیەک ئەندامان و ئەفسەران دادەمەزرێنێ و دەردەکات. چۆن دەکرێ بڵێین گرووپێک بڕوا بەئەندامانی دەکات خۆیان بسووتێنن و خۆیان بتەقێننەوە دژی خەڵکی سڤیلی ئێرانی، ڕێکخراوێکی تیرۆریستی نییە. لە ڕاستیدا، ئەم ماستە مووێکی تێدایە.

کاتێکی زۆر پێش داگیرکردنی عێراق، لە کۆشکی سپی و پنتاگۆن هەموو ئامادەکارییەک کرابوو بۆ هێرشەکە، ئێستاش هەمان ئەو ئامادەکارییانە بەڕێوەن بۆ ئێران. لە ڕاستیدا، وا دیارە ئەمەریکاییەکان لە هاوینی ۲۰۰٤ەوە ئەندامەکانی موجاهیدین لە کردە نهێنییەکانی هەرێمە ئێرانییەکاندا بەکار دەهێنن. ڕۆژنامەنووسی لێکۆڵەوەی ئەمەریکایی بەناوبانگ، سیمۆر هێرش بۆ یەکەم جار ئەمەی لە ساڵی ۲۰۰٥دا ئاشکرا کرد. هێرش ڕاپۆرتێکی لە ڕۆژنامەی نیویۆرکەردا بڵاو کردەوە کەوا حکوومەتەکەی بوش وا خۆی ئامادە دەکات بۆ هێرشێک بۆ سەر ئێران و وەک بەشێکیش لەم هێرشە چەندین کردەی نهێنیی ئێستا لە بواری جێبەجێکردندان بۆ کۆکردنەوە زانیاری لە بارەی ئێران.

هێرش باسی ئەو کادیرە لۆکالە بەکرێگیراوانە دەکات کە لەگەڵ تیمەکانی ئەمەریکادا کار دەکەن. کێ باشتر و گونجاوترە لە ئەندامانی موجاهیدینی خەلق بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو کارە نهێنییانە؟ بێگومان ئەندامانی هەواڵگریی نهێنی زۆر بەچاکی لەلایەن سەدام حوسێنەوە ڕاهێنراون. هێرش ناوی هیچیان نابات، بەڵام یەکسەر دێنە خەیاڵ کە ئەمانە کێن. هەر هیچ نەبێ، ئەمانە ئەگەر بچنە ناو ئێران کەمتر گومانیان لێ دەکرێت لەچاو قژ زەردێک و سوورەیەکی ئەمەریکایی، ئەمان وڵاتەکە دەناسن و زمانیش دەزانن، هاوکات باشترین مەشقیان پێ دراوە و چاودێرییەکی باش کراون: کەواتە ئەمانە لە هەموو کەسێکی تر بەسوودترن بۆ ئەم کارە. جگە لەمانەش، وەک سوپای دڵسۆزی سەدام، ئەوەیان نیشان داوە چەندە دڵسۆزن و پێگیرن بەکارەکان. ئەگەر ئەمەریکاییەکان بەتەواوی بیر لە پلانی هێرش بۆ سەر

ئێران بکەنەوە، ئەوا ڕەچەوی هێشتا تەواو نەبووە و دێتەوە نێو گۆڕەپانەکە. بەڕای هێرش، مەبەستی کردە نهێنییەکان بریتییە لە کۆکردنەوەی زانیاری لە بارەی بەرنامەی ئەتۆمیی ئێران و تێکوپێک شکاندنی پێگەکان ڕۆکێکی وردئەنگێو.

ڕێی ماکگەڤن، کە کادیرێکی پێشووی سی ئای ئەیە، لە بەرنامەی مۆنیتەر لە شاشەی کەناڵێکی ئەڵمانی دووپاتی کردەوە کە موجاهیدین بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنرێن. دەڵێت " بەنێو سنووری ئێرانیدا دەنێردرێنە نێو ئێران بەمەبەستی کردەوە نهێنییەکان: لەوێ چەندین سانسۆری تەکنۆلۆژی دەچەقێنن بۆ چاودێریکردنی بەرنامەی ئەتۆمیی ئێران، کە هێمایان لەسەرە بۆ ئەوەی ببن بەنیشانەی هێرشە ئاسمانییەکان، هەروەها کەمپی نهێنی دادەمەزرێنن بۆ چاودێریکردنی پێگە سەربازییەکان لە نێو ئێراندا، هەروەها بۆ ئەنجامدانی کاری گێرەشێوێنی و تێکدەرانە دەنێردرێنەوە ئێران."

لە هەمان بەرنامەدا، کارمەندێکی پێشووی پنتاگۆن بەناوی کارن کویتکۆویسکی وتی "موجاهیدینی خەلق ئامادە دەکرێن بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانەی ئێمە شەرمان پێیانە و هەوڵیش دەدەین بێدەنگییان لێ بکەین. بەڵام ئێمە بەوردی ئەو موجاهیدانە بۆ ئەو جۆرە کارانە بەکار دەهێنین."

سی ئای ئەی و پنتاگۆن بەشێوەیەکی ڕەسمی تەنیا نکووڵی لەو شتانە دەکەن. بەڵام گۆواری نیوز ویک باسی ئەوە دەکات پشتیوانانی موجاهیدین لە نێو کۆنگرێسی ئەمەریکایی، کە لە هەوڵی ئەوەدان ڕێکخراوەکە لە لیستی تیرۆریستان بسڕنەوە، بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەو کارانە تەنیا بۆ کۆکردنەوەی زانیارییە و دەبێ زانیارییەکانیش زۆر ورد و هەستیار بن."

سێمۆر هێرش لە ڕۆژنامەی نیویۆرکەر چەندین جار دەگەڕێتەوە سەر ئەم پرسە و لە نیسانی ساڵی ٢٠٠٦ دەنووسێت کەوا سی ئای ئەی پێشتر خەڵکی لە ئێران هەر هەبووە و بوشیش بەردەوام ڕاست بووە لە دروستکردنی ئاژاوە لە ناو ئێراندا بۆ ئەوەی نەتوانن پلانی بەرنامەی ئەتۆمی دابڕێژن. عەقیدی خانەنشینکراو سام گاردینیەر لە هێزی ئاسمانیی ئەمەریکایی باسی ئەوە دەکات کەوا بەڵگەی هەیە ئەمەریکاییەکان بۆ ماوەیەکە کار لە نێو ئێراندا دەکەن. ناڕەزایی دژی ئەوە

دەردەبڕێت چونکە ئیدارەی بوش ئەم کارە دەکات بێ ئەوەی کۆنگرێس ئاگەدار بکاتەوە، بەپێی یاساش دەبێ کۆنگرێس ئاگەدار بکرێتەوە.

دوای ئەمە، پشکێنەری پێشووی چەک و پسپۆڕی تەناهی سکۆت ڕیتەر دەگلێتە نێو ئەو مشتومڕەوە، ئاماژە بەموجاهیدینی خەلق و ئۆپەراسیۆنەکان لە ئێران دەکات وەک ئەوەی هیچیان کەمتر نییە لە کردەی شەڕ، دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە بەئەنجامدانی ئەم کارانە شەڕ دەمێکە لە نێو ئێراندا دەستی پێ کردووە. لە ئاداری ساڵی ٢٠٠٧ بۆ بەرنامەی ڕادیۆیی "ئێستا کاتی دیموکراسییە" دەڵێت "ئێمە خۆمان لە قۆناغی شەڕێکی ڕاگەیەنراودا دەدۆزینەوە. کارگێڕی بوش سیاسەتی گۆڕینی ڕێژیمی هەیە. ئەمەریکا بۆ ئەم گۆڕینە سوپا بەکار دەهێنێت، ئەوەی ڕاستی بێت، سوپا دەمێکە بەکارهێنراوە."

مەسعود ڕەجەوی هیچ قسەیەکی نەکردووە لە وەتەی لە چەند مانگێک پێش داگیرکردنی عێراقەوە دوا وتاری خۆی پێشکێش کردووە. مەسعود خودابەندە، لەبەرئەوەی چەندین ساڵ لە نێو هەواڵگریی نهێنیی موجاهیدیندا کاری کردووە ئاگەداری زۆر شتە، ئەمە وەک بەشێک لە ڕێکەوتن دەزانێت لەگەڵ ئەمەریکاییەکاندا. ڕەجەوی لە بەرچاوان ون بوو، لەبەرئەوەی ڕووی گرووپێکی تیرۆرە و هاوکاتیش پارێزکارەکان هەوڵی خۆیان دەدەن لە ڕێگەی مەریەمەوە کە بۆ موجاهیدینی ئێستا پەسندترە تا ئەم ڕێکخراوە وەک گرووپێکی دیموکراسیی ئێران بناسێنن.

بۆ ڕای من ئەمە ئەوە شی دەکاتەوە بۆچی ئەمەریکاییەکان کەمپی ئەشرەف چۆڵ ناکەن، وێڕای ئەوەی چەندین جار سیاسەتوانە عێراقییەکان ناڕەزاییان لە هەمبەر بوونی موجاهیدینی خەلق لە نێو عێراق نیشان داوە. ئۆپەراسیۆنەکان دەتوانرێت بەئاسانی ڕێک بخرێن لە نێو کەمپەکەوە، کە زۆر نزیکە لە سنووری ئێران. موجاهیدین لەم جۆرە ئۆپەراسیۆنانەدا ئەزموونی هەیە، ئەم ئەزموونەشیان لە کاتی ئەو هەڵمەتە تیرۆریانەدا بەدەست هێناوە کە لە نێو ئێراندا بەئەنجامیان گەیاند. هەروەها ئەمەریکاییەکانیش دەتوانن بەئاسانی کۆنترۆڵیان بکەن لە نێو ئەو کەمپەدا.

لە مانگی ئایاری ساڵی ٢٠٠٧، کاتێ ئەمەریکاییەکان دوا جار لەگەڵ ئێرانییەکان دادەنیشن بۆ ئەنجامدانی یەکەم گفتوگۆ و دانووستاندنی ڕاستەوخۆ دوای ٣٠ ساڵ، موجاهیدین بۆ هەندێ شەڕ زۆر باش بوون لەسەر مێزی کۆنفرانسەکە لە بەغدادا. تاران داوای ئەوە دەکات ئەو کەمپە لە عێراق هەڵبوەشێتەوە و نەمێنێت، هەروەها ئەندامانی موجاهیدینیش بدرێتەوە بەخاچی سووری نێودەوڵەتی. بۆ ئەوەی بتوانن دووبارە پێوەندی بکەن بەخێزانەکانیانەوە و بەڵێنی ئەوەش دەدات هەر یەکێک بیەوێت بگەڕێتەوە ئێران، ئێران لێی دەبووڕێت. بەڵام ئەمەریکاییەکان پێشنیازێکی پێچەوانەی ئێرانییەکان دەکەن: دەڵێن تەواوی کەمپەکە و سەرنشینەکانی دەگوازنەوە بۆ مەغریب.

ئەو پێشنیازەی ئەمەریکا زۆر سەیرە. بۆ من ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئەمەریکاییەکان دەیانەوێت نیوەی پێشنیازەکەی ئێران جێبەجێ بکەن و هاوکات ناشیانەوێت موجاهیدین لە دەست بدەن. دەیانەوێت ئەم گرووپە ببەنە شوێنێکی سەلامەتی وەک مەغریب کە هاوپەیمانێکی دڵسۆزی ئەمەریکایە، بۆ ئەوەی وەک سپێر جارێ لەوێ بیانپارێزن و لە کاتی پێویستدا بەکاریان بێنن. گەر گفتوگۆکەیان لەگەڵ ئێران نەگەیشتە ئەنجامێکی باش ئەوا وەک پاڵەپەستۆیەک دژی ئێران بەکاریان دەهێنن. یاخۆ وەک سیخوڕی مەشق پێکراو دەنێردرێنەوە ئێران ئەگەر کاتێک ویستیان بەڕێگەی سەربازی بچنە نێو ئێرانەوە.

ڕوون و ئاشکرایە تاران لەگەڵ ئەوەدا نییە کەمپەکە بۆ هیچ وڵاتێکی تر بگوازرێتەوە، ئێران دەیەوێت لە دەستی ئەو ڕێبازەی موجاهیدین دەربازی بێت. گفتوگۆی مێژوویی لە بەغدا، کە بەشێوەیەکی ڕەسمی دەربارەی ڕەوشی ئەمنی بوو لە عێراق، بێ هیچ ئەنجامێکی ڕوون کۆتایی پێ دێت.

نوێپارێزکارەکان، بەسەرکردایەتیی چینی و ڕامسفیلد، پێیان وایە ئۆپەراسیۆنە سنووردارەکان لە نێو ئێران بەسن بۆ وروژاندنی دانیشتوانی ئێرانی تا دژی مەلاکان بووەستنەوە. ئەمە سیناریۆیەکە ڕێی تێ دەچێت لە لایەن مەسعود ڕەجەوییەوە نووسرابێتەوە، چونکە بۆ ماوەی چەندین ساڵە بانگەشەی ئەوە دەکات گەلی ئێران دژی سەرکردەکانیان دەوەستنەوە هەر کاتێک موجاهیدین بتوانێت بچنە

نێـو تارانەوە. شـتـێـک مـریـەم ڕەجـەوی بەردەوام دووبارەی دەکـاتـەوە، بۆ نمـوونـە لە هـاوینی ۲۰۰۷دا، کـاتی دیمانە لەگـەڵ ئاژانسی ڕۆژنامـەوانی UPIدا دەکـات و باسی گـەمـارۆ دەکـات، دەڵێت "دەبێ گـەمـارۆی ئابووری و نەوت لـەسـەر ئێران دابنرێت و مەلاکان پەراوێز بخرێن." هـەروەها داوا لە سەرۆک بوش دەکات تەنیا ئەم کارە بکات، ئیتر کارەکـانی تر لـەسـەر دانیشـتـوانی ئێران و موجاهیدینە و بەئاسانی ئەنجام دەدرێن.

ڕەجـەوییـەکـان ئەو هـەڵکەوتە پشـتـگوێ دەخـەن کە ئێرانییـەکان ئەوەیان پێ خـۆش نەبوو کـاتێ ڕەجـەوی لـە ۱۹۸۸ هـەوڵی ئەمــەی دا، هـەروەهـا ئەو هـەڵکـەوتـەش کـە موجاهیدینی خـەلق هیچ پشتیوانییەکی نییە لە نێو دانیشتوانی ئێراندا. وێڕای ئەمەش، کاتێ داوای گەمارۆ دەکەن بۆ سەر ئێران، ئاگایان لەوە نییە زیانێکی گەورە بەخـەڵکی سـڤیلی ئێرانـی دەکـەوێت. لەگـەڵ هـەموو ئەو هەڵکەوتانەشدا، هـێشـتـا نوێپارێزکـارەکان بەلای هێڵی موجاهیدەکاندا دەڕۆن. بەڵام گرووپی موجـاهیدین جێگرەوەیەکی سیاسیی دروست نییە بۆ هیچ کەس لە ئێران. هۆشداریی پسپۆڕان دووپاتی ئەوە دەکـەنەوە کـە ئێرانییـەکـان پاڵپـشـتی سـەرکـردەکـانیـان دەکـەن لە بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمیدا، پشتیشیان دەگرن ئەگەر کردەکانی ئەمـەریکا هیچ کاریگەرییان نەبێت لە سەریان.

ئێستا کێ بەردەوام دووپاتی پێشینەی تیرۆریستی موجاهیدینی خـەلق دەکاتەوە؟ پیـاوچاکە عـێراقـیـیـەکـەی سـەر بەئەمـەریکا حـوکم دراوە لەسـەر دەسکاریی بانک، هەروەها سـەرکردە خوێن لەسـەر دەستـەکـانی هاوپەیمانی باکوری ئەفغانستـان. ئەمـەش ئەمەریکاییەکانی نەوەستان و هەر سوور بوون لەسـەر پەسندکردنیان وەک هاوبەشی خۆیـان. هەر لە سەرەتاوە ڕوون بوو ئەو جیـهادییە ئیسلامـیـیانەی دژی ڕووسیـا وەسـتـانەوە لە ئەفـغـانسـتـان، زۆر بەتوندی دژی ئەمـەریکاش دەوەسـتنەوە. دروشـمـی " کۆتایی شـتـەکـان دەسەڵێنێت" دووبارە و سێ بارە کـرایەوە، بێ ئەوەی هیچ بیرێک لە ئاکامەکانی داهاتوو بکەنەوە.

ڕێی مـاکگەڤن، کـادیری پێشـووی سـی ئای ئەی لەسـەر تەلەفـزیۆنی ئەڵمـانی لە بارەی موجاهیدینەوە دەڵێت " ئێمە لە ڕابردوو ئەوانمان بـەڕێکخراوێکی تیرۆریستی

دادەنا. جا بەڕاستی ڕێکخراوێکی تیرۆریستین. بەڵام ئێستا تیرۆریستی ئێمەن، ئێمەش بێ دوودڵی ڕەوانەی ئێرانیان دەکەینەوە."

دەگەڕێمەوە سەر ئەو گفتوگۆیەی لە ئەڵمانیا ئەنجامم دا. عەلی قەشقەوی و یاسر عیزەتی لەوێ بوون. قسەمان لە بارەی بەکارهێنانی موجاهیدینەوە لە لایەن ئەمەریکاییەکان و وتارەکەی هێرش دەکرد. قەشقەوی وتی "ئەمەریکاییەکان باش دەزانن موجاهیدین کێن و چ کارەن و تا چ ڕادەیەکیش شەڕخوازن. بەڵام ئێستا ئەمەریکا کاری پێیانە. موجاهیدینیش لە ناوچەکە زۆر بێ هێز بوونە، بۆیە هیچ هەڕەشەیەک ناکەن. پێم وایە ئەمەریکاییەکان وەک ئامێرێک سەیری موجاهیدین دەکەن بۆ بەدەستهێنانی ئەنجامی کۆتاییی یارییەکە لە بەرژەوەندی خۆیاندا."

بەڵام ئەمە بۆ هەردوو لا سەر دەگرێت و باشە. بۆ مەسعود ڕەجەوی، ئەمەریکاییەکان ئامێرێکن بۆ وەرگرتنی دەسەڵات لە ئێران. یاسر عیزەتی باسی دوا هەژدە مانگی لە کەمپی ئەشرەف دوای داگیرکردنی عێراق دەکات و دەڵێت " بۆ ئەوەی وامان لێ بکەن گۆڕان پەسند بکەین، بەئێمەیان وت شەڕکردن دژی ئەمەریکا خزمەتێکی زۆر بەبەرژەوەندی ئێران دەگەیەنێت. پێیان وتین بۆ ئێمە باشترە هاوکاریی ئەمەریکاییەکان بکەین، ئەمە لە بەرژەوەندیی ئێمەدایە، چونکە دوژمنی ئێمە ئێرانە نەک ئەمەریکا. ئێمە دەبێ یەکەم جار دەسەڵات لە ئێران وەرگرینەوە و لەوە دڵنیا بین چەکی ئەتۆمی نەمێنێت، پاشان دەتوانین حیسابێکیش بۆ ئەمەریکا بکەین."

یەکێک لە کۆنە ئەندامانی موجاهیدین دەڵێت "هەمان شتیان پێ دەوتین لە بارەی عێراقەوە: هەر کاتێک بەهاوکاریی سەدام دەسەڵات لە ئێران بگرینە دەست، زۆر فرەوانتر و بەهێزتر دەبین لە عێراق و وامان لێ دێت تۆڵەی ئەو شەڕە درێژە خوێناوییە بکەینەوە."

دوژمنی دوژمنم دۆستمە: ئەم قسەیە هەم بۆ ئەمەریکاییەکان هەمیش بۆ مەسعود ڕەجەوی دەشێ. ئاخۆ ئەمەریکاییەکان ئاگایان لەوە هەیە پشتگیریی هێزێک دەکەن کە سەرکردەکەیان سەرۆکایەتیی سوپایەکی ڕۆبۆتی مێشک شۆراوە دەکات کە هەر کاتێک بارگاوی بکرێنەوە لە بەرژەوەندیی سەرکردەکەیان هەموو شتێک دەکەن؟ کاتێ

ئەمەریکا دەڵێ "موجاهیدین تیرۆریستی ئێمەن" ڕەنگە ئەمە هەمان ئاکامی ئەو وتەیەی لێ بکەوێتەوە " جیهادییەکانی ئێمە" کە دوای ڕووخانی ڕووس لە ئەفغانستان دەوترا؟

لەبەر ترسی کاریگەریی ئایەتوڵڵا خومەینی لە عێراق، ئەمەریکاییەکان دوای شەڕی کەنداو شیعە عێراقییەکانیان کردە قوربانی، هاوکات بەڵێنیان پێ دابوون لە کاتی ڕاپەڕین دژی سەدام حوسێن یارمەتییان بدات. ئاخۆ ئەمەریکاییەکان درک بەوە دەکەن تا چ ڕادەیەک موجاهیدین کاریگەریی جێگرەوەکانی ئایەتوڵڵایان لەسەر دەبێت؟ لەوەش گرینگتر ئەوەیە: ئاخۆ درک بەوە دەکەن مەسعود ڕەجەوی بەهیچ شێوەیەک لە خومەینی باشتر نابێت؟ بۆیە لەوانەیە دوژمنی دوژمنم لە کۆتاییدا ببێتە دوژمنی خۆشم؟

* جیاوازیی نێوان وەزارەتی بەرگری و وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا لە مانگی ئایاری ۲۰۰۷دا زیاتر دەرکەوت کاتێ وەزارەتی دەرەوە ڕای گەیاند موجاهیدینی خەلق لە لیستی ڕێکخراوە تیرۆریستەکان لانابرێت. بۆ پشتیوانیکردنی ئەو بڕیارەش، وەسفێکی تێروتەسەلی ڕێبازی موجاهیدینی بەدوادا دێت ئەو گرووپە بەڕێکخراوێک پێناسە دەکات لە تیرۆر و توندوتیژی ناترسێت و مێشکی ئەندامەکانی دەشواتەوە و پاڵپەستۆیان دەخاتە سەر. گرووپێک دەستی هەبووە لە داگیرکردنی باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە تاران لە ساڵی ۱۹۷۹دا، ئێستاش سەرەڕای هەوڵی ئەمەریکاییەکان، هەرگیز ئەندامێکی موجاهیدین بەئەنجامدانی ئەو کردارە نایاساییانە تۆمەتبار نەکراوە.

# پاشکۆ

وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا

ڕاپۆرتێک لەسەر تیرۆریزم پێشکێش دەکات

لە لایەن نووسینگەی هاوئاهەنگیی دژە تیرۆر لە ٣٠ی نیسانی ٢٠٠٧ بڵاو کراوەتەوە

## ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان

ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلق MEK، ئەی کەی ئەی، ئێم کەی ئۆ، موجاهیدینی خەلق. کۆمەڵگەی قوتابیانی ئێرانییە موسڵمانەکان، ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەرەنگاری NCR، ڕێکخراوی شەڕی پیرۆزی گەلی ئێران، سوپای ڕزگاریخوازی نیشتمانیی ئێران، ڕێکخراوی موجاهیدینی گەلی ئێران، ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەرەنگاریی ئێران، سازمانی موجاهیدینی خەلقی ئێران.

## وەسف

موجاهیدین MEK هەوڵی ڕووخاندنی ڕێژیمی ئێران دەدات بەشێوەیەکی توندوتیژ و بەرپرسیشە لە کوشتنی چەندین سەرباز و خەڵکی سڤیلی ئەمەریکایی لە سالانی حەفتاکاندا. سەرکردەگەل و ئەندامانی موجاهیدین لە سەرانسەری جیهاندا توانای خۆیان بەرەوپێش دەبەن و کردەوەی تیرۆریستی لە ئەوروپا و ڕۆهەلاتی ناوەڕاست و ئەمەریکا و کەنەدا و وڵاتانی تردا ئەنجام دەدەن.

موجاهیدینی خەلق لە سالانی شەستەکاندا سەری هەڵداوە. وەک یەکێک لە بزووتنەوە سیاسییە هەرە توندڕەوەکان دژی بنەماڵەی پەهلەوی و پێوەندییەکانیان لەگەڵ ئەمەریکادا وەستانەوە. ئایدیۆلۆجیای موجاهیدین چووەتە ئەودیو توخمەکانی مارکسیزم و ئیسلام و فێمنیزم. دوای بەشداریکردنیان لە شۆڕشی ئیسلامی لە ساڵی ١٩٧٩دا، گرووپەکە بەخێرایی شوێنی خۆی لە نێو دڵی گەلی ئێراندا کردەوە.

حکوومەتی نوێی ئێران لە ژێر سەرکردەی باڵا خومەینیدا چەندین ئەندامی موجاهیدینی دەستگیر کرد و وای لە سەرکردەکانیش کرد ڕا بکەن بۆ ئەورووپا. لە ۱۹۸٦، سەرکردە و چالاکەکانی موجاهیدین لە فەرەنسا ڕاگوێزران و پەناگەیەکیان لە عێراق لە لایەن سەدام حوسێنەوە پێ درا. گرووپەکە پلانی دارشت و کردەوەی تیرۆریستیی ئەنجام دەدا دژی ڕێژیمی ئێرانی بۆ ماوەی سی دەیە لە بنکەکانی عێراق و ئەورووپاوە. وێڕای ئەمەش، بنچینەی پارە کۆکردنەوەی فرەوانتر کرد و تواناکانی خۆی بەرەوپێشتر برد و زۆر بەجدی کاری کرد بۆ فرەوانکردنی پێگەکانی لە ئەورووپادا. سەرەڕای کارە تیرۆریستییەکانی بەنهێنی، موجاهیدین خۆی وەک ڕێبازێکی ئاینی دەخستە ڕوو. ئەندامەکانی بەنێو پرۆسەی بەمەزەبکردندا تێپەڕیون و مێشکیان بەمێژووی ئێران و ئایدیۆلۆجیایەکی تەسک پڕ کراوە. ئەندامەکان داوایان لێ دەکرا خۆیان لە هەموو شتەکانی تری ژیان دوور بخەنەوە و هەفتانەش دەبێ بەشداری لە پاکتاوی ئایدیۆلۆجیدا بکەن. جگە لەمانەش، منداڵ لە تەمەنی گەنجیدا لە دایک و باوکی جیا دەکرایەوە. مریەم ڕەجەویی سەرکردەی موجاهیدین ڕێبازێکی کەسیی تایبەت بەخۆی دامەزراند. خۆی بەجێگری پێغەمبەر محەمەد (د.خ) دەزانێت و لە لایەن ئەندامەکانی بەسەرۆکی ئێران لە تاراوگە تەماشا دەکرێت.

## چالاکییەکان

هەڵمەتی بەرفرەوانی گرووپەکە لە دژی حکوومەتی ئێران پرۆپاگەندە و تیرۆر بەکار دەهێنێت بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی و لە لایەن چەندین ڕێژیمەوە پاڵپشتی کراوە، لەوانە ڕێژیمی سەدام حوسێن. لە ساڵانی حەفتاکاندا، موجاهیدین چەندین سەرباز و خەڵکی سڤیلی ئەمەریکایی کوشت کە لە پرۆژە بەرگرییەکان لە تاراندا کاریان دەکرد و هەروەها هاوکاریی پیلانەکەی ساڵی ۱۹۷۹یان کرد کە هێرشێک بوو بۆ سەر باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە تاران.

ساڵی ۱۹۸۱، سەرکردایەتیی موجاهیدین هەوڵی دا ڕێژیمی نوێی ئێران بڕووخێنێ، بەڵام هێزەکانی ئاسایشی ئێرانی لە بەرسڤێکی باشدا تێکوپێکی شکاندن. موجاهیدین چەندین هێرشیان بەبەکارهێنانی بۆمب کردووە وەک هێرشێک

دژی سەرۆکی نووسینگەی پارتی کۆماری ئیسلامی و نووسینگەی سەرۆک وەزیران، کە نزیکەی ٧٠ ئێرانی پلە بەرزیان تێدا کوشت، لەوانەش سەرۆکی داد بەناوی ئایەتوڵڵا محەمەد بەهەشتی، سەرۆک محەمەد عەلی ڕەزایی و سەرۆک وەزیران محەمەد جەواد باهنەر. ئەم هێرشانە بوونە هۆی ڕاپەڕینێکی میللی لە دژی موجاهیدینی خەلق و هەڵمەتێکی چڕوپڕی حکوومەتی ئێرانی بۆ سەر موجاهیدین و ناچارکردنیان بۆ هەڵاتن بەرەو فەرەنسا. بۆ ماوەی ٥ ساڵ، موجاهیدین درێژەی بەهەڵمەتە تیرۆریستییەکانی دا لە مەڵبەندی سەرکردایەتیی خۆی لە ئێران. ساڵی ١٩٨٦ لە لایەن فەرەنساوە دەرکران، سەرکردەکانی موجاهیدین پەنایان بردە بەر ڕێژیمی سەدام حوسێن بۆ هاوکاریی دارایی و شوێن و مەشق پێکردن. لە کۆتای ساڵی شەڕی عێراق و ئێران ١٩٨٠-١٩٨٨، بەغدا موجاهیدینی خەلقی پڕ چەکی سەربازی کرد و هەزاران موجاهیدی بەکار هێنا بۆ هێرشی خۆکوژی دژی هێزەکانی ئێران. پێوەندیی موجاهیدین لەگەڵ ڕێژیمی پێشووی عێراقی تا ساڵانی نەوەتەکان بەردەوام بوو. لە ساڵی ١٩٩١دا، ئەم گرووپە هاوکاریی پاسەوانی کۆماری عێراقیان کرد و بۆ سەرکوتینەوەی شیعە و کوردەکانی عێراق کە دژی ڕێژیمی سەدام حوسێن ڕاپەڕیبوون، ڕۆژنامەکان بڵاویان کردەوە کە مریەم ڕەجەوی هانی ئەندامەکانی دەدا کورد بخەنە ژێر تانککانی بەعسەوە. ساڵی ١٩٩٢، موجاهیدین چەند هێرشێکیان کردە سەر باڵیۆزخانەکانی ئێران لە ١٣ وڵاتی جیهاندا، بەمەش توانای خۆیان نیشان دا کە دەتوانن چەندە کاریگەر بن. لە نیسانی ساڵی ١٩٩٩، موجاهیدین چاویان بڕییە ئەفسەرە سەربازییەکانی ئێران، جێگر و سەرۆکی هێزەکانی سوپای ئێرانیان کوشت: جەنەراڵ عەلی سەیاد شیرازی.

لە نیسانی ساڵی ٢٠٠٠، موجاهیدین هەوڵی دا فەرماندەی مەڵبەندی نەسر بکوژێت، کە سەر بەئاژانسی تاران بوو و بەرپرسی هاوئاهەنگیی سیاسەتەکانی عێراق بوو. کردەوەی دژە ئێرانییەکان لە کاتی "ئۆپەراسیۆنی مەزن"ی ساڵی ٢٠٠٠ زیادی کرد کاتێ گرووپەکە ژمارەیەکی زۆر هێرشی کردە سەر ئێران. یەکێک لەو هێرشانە برێتی بوو لە هێرشی هاوەن بۆ سەر سەرکردایەتیی ئێران لە تاران کە ئۆفیسی سەرکردایەتیی باڵا و سەرۆکی ئێرانی تێدا بوو. لە ٢٠٠٠ و ٢٠٠١، بەهاوەن چەند هێرشێکیان کردە سەر پێگە سەربازییەکانی ئێران و باڵەخانە

حکوومییەکانی ئێران لە نزیک سنووری عێراق-ئێران. هەروەها لە ۲۰۰۱، FBIی ئەمەریکایی حەوت ئێرانیی لە ئەمەریکا دەستگیر کرد کە ٤٠٠ هەزار دۆلاریان بۆ موجاهیدین ڕەوان کردبوو: ئەم فەندەش بۆ کڕینی چەک بەکار هات. کاتێ لە سەرەتای پرۆسەی ئازادی عێراق بارەگاکانی موجاهیدین لە لایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە بۆردومان کران، موجاهیدین بەمەبەستی ئاگربەست دانووستاندنی لەگەڵ هێزەکانی هاوپەیماناندا کرد و ئارەزوومەندانە چەکە قورسەکانیان دایەوە دەست کۆنترۆڵی هاوپەیمانان. لە ۲۰۰۳وە، نزیکەی ٣٤٠٠ ئەندامی موجاهیدین لە کەمپی ئەشرەف ماونەتەوە لە ژێر چاودێریی هێزەکانی هاوپەیمانان.

لە ۲۰۰۳دا، دەسەڵاتدارانی فەرەنسا ١٦٠ ئەندامی موجاهیدینی گرت لە بنکەکانی خۆیان کە خەریکی هاوئاهەنگیی دارایی و پلاندانان بوون بۆ هێرشی تیرۆریستی. سەبارەت بەدەستگیرکردنی سەرکردەکەیان مریەم ڕەجەوی، ئەندامانی موجاهیدین ڕژانە سەر شەقامەکان و هەندێکیان ئاگریان لە خۆیان بەردا وەک نارەزایی دژی ئەم گرتنەی سەرکەردەکەیان. لە ئەنجامدا، دەسەڵاتدارانی فەرەنسی ڕەجەوییان ئازاد کرد. هەرچەندە بەنهێنی، ڕەجەوی لە ڕێگەی چەند کاسێتێکەوە دەرکەوتەوە و هانی موجاهیدەکانی دا لە سەرانسەری جیهان. بەپێی بەڵگە دوای ڕووخانی سەدام کەوتوونەتە دەست، موجاهیدین بەملیۆن دۆلاریان وەرگرتووە لە بەرنامەی نەوت بەرامبەر خۆراک لە سەدام حوسێنەوە لە ۱۹۹۹ تا ۲۰۰۳، بەم پارەیەش چەندین هێرشی تیرۆریستییان ئەنجام داوە. سەرەڕای دۆزینەوەی ١٢ لیستی لەم جۆرە هاوکارییانە، چەند بەڵگەیەکی تر و کاسێتی ڤیدیۆیی کاتێ سەدام حوسێن بەهەگبە پارە دەدات بەسەرکردە ناسراوەکانی موجاهیدین، هەروەها چەند کاسێتێکی تر کە چۆن مەشقیان کردووە لە بنکەکانی سەربازیی عێراقدا.

### هێز

ژمارەی ئەندامەکانیان دەگەیشتە چەند هەزار کەسێک لە تەواوی جیهان لەگەڵ پاریس و پایەتەختە سەرەکییەکانی تری ئەوروپا. لە عێراق، ٣٤٠٠ ئەندامی موجاهیدین لە کەمپی ئەشرەف کۆ دەبنەوە، پەناگەی سەرەکیی موجاهیدین لە باکوری بەغدا بوو کە تیایدا پێیان دەوترا کەسە پارێزراوەکان لە ژێر مادەی ۲۷ی

چوارەمی ڕێکەوتننامەی ژنێڤدا. ئەم مادەیە ئەو ئەندامانە ناگرێتەوە کە لە دەرەوەی کەمپی ئەشرەفن یان ئەوانەی سەر بەڕێکخراوی تیرۆریستین لە دەرەوە. لە ڕێکەوتنی ئاگربەستی ساڵی ۲۰۰۳، موجاهیدین زیاتر لە ۲۰۰۰ تانک و زرێپۆشی دایەوە. ژمارەیەکی بەرچاوی موجاهیدین ئارەزوومەندانە ڕێکخراوەکەیان بەجێ هێشت، چەند سەد کەسێکی تریش بەئارەزووی خۆیان ڕەوانەی ئێران کرانەوە. بەڵام هێشتا سەرکردەیەکی زۆری ئەو ڕێکخراوە هەر مابوونەوە، هەروەها ژمارەیەکی بەرچاوی ئەو پلەدارانەش کە چەک و بۆمبیان لە سەدام وەرگرتووە، بوونە بەجێگەی تێڕامانی زیاتر و سەرچاوەیەکی گرینگ.

## پێگەی ئەنجامدانی کارەکانیان

لە هەشتاکاندا، سەرکردەکانی موجاهیدین لەلایەن هێزەکانی ئاسایشی ئێرانییەوە ناچار کران بەرەو فەرەنسا هەڵێن. دوای ئەوەی فەرەنساش لە ساڵی ۱۹۸٦ دانی نا بەوەی هەقی حکوومەتی ئێرانە، لە خاکی خۆی دەری کردن و لە عێراق لەلایەن سەدام حوسێنەوە وەرگیران. ئیتر بارەگاکانیان لە فەرەنسا هەر دەمێنێتەوە و لە تەواوی ئەورووپاش کاری خۆیان دەکەن، جگە لەوانەش بەشێوەیەکی سەرەکی لە کەمپی ئەشرەف لە عێراق نیشتەجێ دەبن. هاوکاریی جیهانی بۆ موجاهیدین لە تەواوی ئەورووپا و ئەمەریکای باکوردا دەمێنێتەوە. کردەوەکانیان دژی پێگەکانی حکوومەتی ئێران بوو لە تەواوی جیهان و ئەورووپا و ئێرانیشدا. سوپای سیاسیی موجاهیدین و ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەرەنگاری، تۆڕێکی هاوکاریی جیهانیی هەبوو لەگەڵ هێزێکی پرۆپاگەندە لە تەواوی پایەتەختەکانی ڕۆئاوادا. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەنجوومەنی نیشتمانیی بەرەنگاری ستراتیجێکی پێشکەوتوویان هەبوو لە کەناڵەکانی گەیاندن و ڕاگەیاندنی تایبەت بەخۆیاندا.

## هاوکاریی دەرەوە

پێش ئەوەی پرۆسەی ئازادیی عێراق لە ساڵی ۲۰۰۳ دەست پێ بکات، موجاهیدین هەموو هاوکارییە سەربازی و داراییەکانی لە سەدام حوسێنەوە وەردەگرت. ڕووخانی سەدام حوسێن بووە هۆی ئەوەی موجاهیدین پشت بەڕێکخراوە پێشەنگەکان بۆ خێرخوازی لە کۆمەڵگەکانی دەرەوەی ئێران، ببەستێت.

# ژێدەرگەل ئەم کتێبە


- Ervand Abrahamian – The Iranian Mojahedin, 1989, Yale University Press, New Haven and London.
- Masoud Banisadr – Masoud .Memoirs of an Iranian Rebel, 2004, Saqi Books, London.
- Anne Singleton – Saddamís Private Army. How Rajavi changes Iranís Mojahedin from armed revolutionaries to an armed cult, 2003, Iran-Interlink UK.
- Karim Haggi Moni – Dossier of facts on the Peopleís Mojahedin Organization of Iran, 2003, Peywand Association, Arnhem.
- Mohammed Hoseyn Sobhani – Abu Ghraib Prison .I came from the land of pain and suffering, 2002, Iran-Peywand, the Netherlands.
- Iranian Cult Association DENA – The bomb ticks. Fight against the terror, 2001, Cologne.
- Alain Chevalrias – Brlvif .Au nom de Marx et de Mohamet, 2004, Paris.
- Farah Karimi and Chris Keulemens – The secret of the fire, 2005, Arena, Amsterdam.
- Jessica Stern – Terror in the name of God .Why Religious Militants Kill, 2004, Harper Collins, New York.
- Jason Burke – Al Qaida .Casting a shadow of terrorí, 2003, I.B.Tauris & Co, London.
- Bob Woodward – Plan of Attack, 2004, Simon and Schuster, New York.
- Graig Unger – The family Bush and the House Saud, 2004, Mets & Schilt, Amsterdam.
- Said Aburish – Saddam Hussein :The Politics of Revenge, 2000, Bloomsbury.
- Jane Corbin – Al Qaida .The terror network of Osama Bin Laden, 2002, Mets & Schilt, Amsterdam.
- Bernard Lewis – The Middle East, 2001, Phoenix Press.
- What went wrong ؟The clash between Islam and Modernity in the Middle-East, 2002, Phoenix Press.
- The crisis of Islam .Holy war and unholy war, 2003, Modern Library, New York
- Malise Ruthven – A fury for God, 2002, Granta.
- Maurits Berger – Islam under my skin, 2003, Uitgeverij Contact, Amsterdam.
- Geneive Abdo .Jonathan Lyons – Answering only to God .Faith and Freedom in 21st century Iran, 2003, Henry Holt and Company, New York.
- Mohammed Arkoun – Islam in Discussion. 24 questions over the Islam, 1993, Uitgeverij Contact, Amsterdam.